

# گۆڤاری
# ئەکادیمیای کوردی

ژمارە ٢٣ ساڵی ٢٠١٢

**دەستەی نووسەران**

| | |
|---|---|
| **پ.د. جەبار قادر** | **سەرنووسەر** |
| **د. ئازاد ئەحمەد** | **جێگری سەرنووسەر** |
| **عەبدوڵڵا زەنگەنە** | **بەڕێوەبەری نووسین** |
| **پ.ی.د. فارووق عومەر سدیق** | **ئەندام** |
| **پ.ی.د. دلێر ئیسماعیل حەقی شاوەیس** | **ئەندام** |
| **پ.ی.د. سەباح ڕەشید قادر** | **ئەندام** |
| **پ.ی.د. نوزەت ئەحمەد زێباری** | **ئەندام** |
| **پ.ی.د. هۆشەنگ فاروق جەواد** | **ئەندام** |

## لەم ژمارەیەدا

### بەشی کوری



### بەشی عەرەبی – القسم العربي



### بەشی ئینگلیزی – English part

# ڕێنماییەكانی بڵاوكردنەوە
# لە گۆڤاری ئەكادیمیای كوردی

١- گۆڤــاری ئــەكادیمیای كــوردی، كــە گۆڤــارێكی زانــستیی وەرزییــە، بــاس و توێژینەوەی زانستی لە بارەی كورد و كوردستان، دوای ئەوەی هەڵسەنگاندنی زانستییان بۆ دەكرێت، بڵاو دەكاتەوە، بۆیە دەبێ هەموو مەرجەكانی ڕێبـازی لێكۆڵینەوەی زانستییان تێدا ڕەچاو كرابێت. لێكۆڵینەوەكەش، كە مەرجە لـە بارەی كێشەیەكی زانـستییەوە بێـت و بیرۆكـە و لێكدانـەوەی نـوێی تێـدا بـێ، دەبێ لە هیچ شوێنێكی تر بڵاو نەكرابێتەوە، یا بۆ بڵاوكردنەوە وەرنەگیرابێت.

٢- زمانی كوردی زمانی سەرەكی بڵاوكردنەوەیە لە گۆڤاری ئەكادیمیای كـوردی ، بـەڵام ڕێگـەش دەدرێ لێكۆڵینـەوەی بـە نـرخ بـە هـەردوو زمـانی عـەرەبی و ئینگلیزی بڵاوبكرێنەوە..

٣ـ هــەر بابــەتێك كــە بــۆ گۆڤــاری ئــەكادیمیای كــوردی دەنێــردرێ ، پێویــستە ناوونیشانی باس، ناوی نووسەر، شوێنی كارەكـەی، پلـە و پایـەی زانـستی لـە سەر لاپەڕەی یەكەمی لێكۆڵینەوەكە نووسرابێت.

٤ـ دەبـێ پوختەیـەكی بـاس، بـە هـەردوو زمانەكـەی دی، لـە كۆتـایی باسـەكەدا بنووسرێت. ناشبێ پوختەكە لە ١٥٠ وشە زیاتر بێت و پێویستیشە توێژەر لـەو پوختەیەدا گرنگی و ئەنجامەكانی باسەكە بخاتە ڕوو.

٥- هەر كاتێ باس، لە لایەن هەڵسەنگێنەرانی زانستییەوە، بە ئەرێنی گەڕایـەوە، ئــەوا دەســتەی نووســەران ڕەزامەندینامــەی بڵاوكردنــەوە بــە توێژەرەكــەی دەدات.

٦- هــەموو باســەكان بــیر و بۆچــوونی نووســەرەكانیانن و مــەرج نییــە بــیر و ڕای دەستەی نووسەران بن.

٧- بۆ ئەوەی بابەت لەگەڵ ڕێنمایی و شێوازی بڵاوكردنەوەی گۆڤارەكەدا كۆكبێ، دەستەی نووسەران مافی سەرلەنوێ داڕشـتنەوە و لابردنـی هەنـدێ دەربـڕین و

دەستەواژەی هەیە، ئەوەش بە مەرجێ واتا و بیرۆکەی سەرەکیی توێژینەوەکە نەگۆڕێت.

٨- ئەگەر باسەکە لە بارەی پەیدۆزیی (تحقیق)ی هەر دەستنووسێکەوە بێت، ئەوا بنەما و ڕێبازە زانستییەکانی ئەم بوارە پەیڕەو دەکرێن و شەش لاپەڕەی کۆپیکراو لە دەستنووسەکە لەگەڵ باسەکەدا هاوپێچ دەکرێن.

٩- پەیڕەوکردنی ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانستی لە هەڵبژاردنی ناوونیشانی باس، توێژینەوەی بابەت، شێوازی بەکارهێنانی سەرچاوە و ڕێکخستنی پەراوێزەکان مەرجی بڵاوکردنەوەیە. هەر باسێك ئەم بنەما زانستییانەی تێدا فەرامۆش کرابێت، لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردیدا بڵاو ناکرێتەوە.

١٠- باسەکە، لە پاڵ دانەیەکی سەر CD، بە سێ دانە لە سەر کاغەزی (A4) چاپ دەکرێت بە مەرجێ ژمارەی لاپەڕەکانی، بە وێنە و نەخشە و لیستی سەرچاوەکانییەوە، لە (٢٥ ) لاپەڕە زیاتر نەبن و بە فۆنتی (١٥) بن و بە Ali-K- Sahifa نووسرابن.

١١ـ ئەگەر بابەتەکە وەرگێڕدرا بوو، دەبێ پەیوەندی بە لایەنێکی کولتووری کوردییەوە هەبێت (زمان، ئەدەب، مێژوو، ... هتد). مەرجیشە کە وەرگێڕانەکە لەو زمانەوە بێت کە لە بنەڕەتدا بابەتەکەی پێ نووسراوە. پێویستە دەقە ئەسڵەکەش هاوپێچ بکرێت.

١٢- لەکاتی پێویستدا گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی بەشێکی تەرخان دەکات بۆ خوێندنەوە و هەڵسەنگاندنی ئەو کتێبانەی لەبارەی کورد و کولتووری کوردییەوە نووسراون چ بە کوردی یان بە هەر زمانێکی دیکە، بە مەرجێك نووسەر ڕەچاوی پێوەر و ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانستی تیایدا بکات.

# مۆرفۆفۆنۆسینتاکس

پ. د. وریا عومەر ئەمین
ئەکادیمیای کوردی

( **دەمانبینیت** ) دارِشتەییێکی پۆلۆسینسیتیە[1] ڕستەییێکی لێڵە[2] لە قاڵبی وشەییێکدا ، بەلای کەمی ئەم دوو واتایە دەگەیێنیٚ:

**ا ــ تۆ ئێمە دەبینیت. (ئیستا)**

**ب ــ ئێمە تۆمان دەبینی. (جاران)**

واتا ڕستەی (دەمانبینیت) دوو بنجی هەیە. سیٚ جۆر یاسای گوێزانەوەی ڕێزمانی (سینتاکسی – مۆرفۆلۆجی – فۆنۆلۆجی) ، کە هەریەکە سەر بە ئاستێکە ، بەشداری دەکەن لە ئەنجامدانی.

ئەم باسە هۆی ئەم لێڵییە دەخاتە روو و زاراوە بۆ ئەم دیاردەیە پێشنیاز دەکات.

لە زمانی کوردیدا دوو جۆر ڕاناو هەیە. (جودا و لکاو) جۆر و ئەرکیان لەم خشتەیەدا خراونەتەڕوو:

| ژمارە | کەس | جودا | لکاو<br>ڕابردووی تێپەڕ<br>(A) | لکاو<br>ڕابردووی تێنەپەڕ و داهاتووی تێپەڕ و تێنەپەڕ<br>(B) |
|---|---|---|---|---|
| تاک | ١ | من | م | م |
| | ٢ | تۆ | ت | یت |
| | ٣ | ئەو | ی | ٠ ـ / ێت – ات |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| کۆ | ١ | ئێمە | مان | ین |
| | ٢ | ئێوە | تان | ن |
| | ٣ | ئەوان | یان | ن |

ڕاناوە لکاوەکان لەگەڵ کاردا دەردەکەون بۆ دەربڕینی ڕێکەوتن لە نێوان بکەر و کاردا. واتا ڕۆڵی بکەری دەبینن.

| ژمارە | کەس | جودا | لکاو | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | ڕابردووی تێپەڕ | ڕابردووی تێنەپەڕ | داهاتووی تێنەپەڕ | داهاتووی تێپەڕ |
| تاك | ١ | من | کرد ـ م | چوو ـ م | دەچـ ـ م | دەکە ـ م |
| | ٢ | تۆ | کرد ـ ت | چوو ـ یت | دەچـ ـ یت | دەکە ـ یت |
| | ٣ | ئەو | کرد ـ ی | چوو ـ | دەچـ ـ ێت | دەکـ ـ ات |
| کۆ | ١ | ئێمە | کرد ـ مان | چوو ـ ین | دەچـ ـ ین | دەکە ـ ین |
| | ٢ | ئێوە | کرد ـ تان | چوو ـ ن | دەچـ ـ ن | دەکە ـ ن |
| | ٣ | ئەوان | کرد ـ یان | چوو ـ ن | دەچـ ـ ن | دەکە ـ ن |

دەستەی (A) (م ـ ت ـ ی ـ مان ـ تان ـ یان) بە یەکەمی ئەم بەشانەی ڕستەوە دەلکێ ، بەم ریزە:

١) ـ بەرکاری ڕاستەوخۆ
٢) ـ بەرکاری ناڕاستەوخۆ
٣ ) ـ پێشبەند
٤) ـ یەکەم پێشگر
٥) ـ ڕەگی کار ........(یاسا ژ ١)

**واتا**

١ ـ ئەگەر بەرکاری ڕاستەوخۆ لە ڕستەکەدا هەبوو ڕاناوە لکاوەکە پێیەوە دەلکێ.

ـ ئەوان **دیاری ـ یان** بۆ ئازاد نەدەنارد.

٢ – بەرکاری ڕاستەوخۆ نەبوو بە بەرکاری ناڕاستەوخۆوە دەلکێ:

ئەوان بۆ **تۆ ـ یان** نە دەنارد.

٣ ـ بەرکاری ڕاستەوخۆش نەبوو بە پێشبەندەوە دەلکێ:

ئەوان **بۆ ـ یان** نەدەنارد.

٤ـ پێشپەند نەبوو بە پاشگری یەکەمەوە دەلکێ

ئەوان **نە ـ یان** دە نارد.

ئەوان **دە ـ یان** نارد

٥ ـ پاشگر نەبوو بە ڕەگی کارەوە دەلکێ :

ئەوان **نارد ـ یان**.

دەستەی (B) ( م ـ یت ـ ێت/ات ـ ین ـ ن ـ ن ) هەمیشە بە ڕەگی کارەوە دەلکێ.

...........(یاسا ژ ٢)

ڕاناوە لکاوەکان جگە لە ئەرکی ( بکەری) ئەرکی ( بەرکاری) ش دەبینن[٣]. واتا ڕاناوی جودای ڕستە دەشێ بە ڕاناوێکی لکاوی سەر بە هەمان کەس و ژمارە جێگیر بکرێ. ئەمە بە پێی ئەم یاسایەی لەم خشتەیەدا خراوەتە روو دێتە ئەنجام:

| ئەرك | کات | |
|---|---|---|
| | ڕابردوو | داهاتوو |
| بکەر | A | B |
| بەرکار | B | A |

واتا :

١ ـ ئەگەر (بکەر) سەر بە دەستەی (A) بێ ئەوە (بەرکارەکە) بە ڕاناوێکی لکاوی سەر بە دەستەی (B) جێگیر دەکرێ.

٢ ـ . ئەگەر (بکەر) سەر بە دەستەی (B) بێ .. ئەوە بەرکارەکە بە ڕاناوێکی لکاوی سەر بە دەستەی (A) جێگیر دەگرێ.

ڕاناوە جێگیرکراوەکە بە پێی یاساکانی شوێن ژ١ و ٢ شوێنی خۆیان دەگرن.

لە ڕستەی:

تۆ ئێمە دەبینیت.

تۆ ـ بکەرە

ئێمە ـ بەرکارە

دە ـ ئەسپێکتە ، ئامرازی بەردەوامییە.

بین ـ ڕەگی داهاتووی ( بینین) ـە.

بۆ جێگیرکدنی بەرکار ( ئێمە ) بە ڕاناوێکی لکاو:

١ ـ کاری ڕستەکە (بین) تێپەڕە و کاتەکەی (داهاتووە).بە پێی خشتە ژ ٣ گەر کات داهاتوو بێ بکەر لە دەستەی (B) دەبێ . لێرە ڕاناوی بکەری (یت) ـە کە سەر بە دەستەی (B) ـە.

٢ ـ بۆ (بەرکاری) روو لە دەستەکەی تر دەکەین. واتا دەستە (A). تێیدا (مان) بەرانبەر (ئێمە) یە.(مان) جێی ( ئێمە ) دەگرێ .

٣ – (مان) کە سەر بە دەستەی (A) یە ، بە پێی یاسای شوێن ژ 1 بە یەکەم پێشگرەوە دەلکێ ، کە ( دە ـ ) یە.

٤ – بە پێی یاسای (بکەرلادان) ی بە ئارەزوو دەشێ ( تۆ ) لاببرێ و رستەکە دەبێتە:

دە ـ مان ـ بین ـ یت

**دەمانبینیت** ...... ( تۆ ئێمە دەبینیت)

٥ – دەشێ (ت) ی ڕاناوی (یت) بەیاسایێکی بە ئارەزوو لابرێ ، لە ئەنجامدا ڕستەکە دەبێتە:

دەمانبینی

لە ڕستەی :

**ئێمە تۆمان دەبینی.**

ئێمە ـ بکەرە

تۆ ـ بەرکارە

مان ـ ڕاناوی لکاوی بەرکارییە.

دە - ئەسپێکتە، ئامرازی بەردەوامییە.

بینی ـ ڕەگی ڕابردووی ( بینین) ـە.

بۆ جێگیرکدنی بەرکار ( تۆ ) بە ڕاناوێکی لکاو:

١ ـ کاری ڕستەکە (بین) تێپەڕە و کاتەکەی (ڕابردووە). بە پێی خشتە ژ ٣ گەر کات رابردوو بێ بکەر لە دەستەی (١) دەبێ لێرە ڕاناوی بکەری (مان) ـە کە سەر بە دەستەی (A) ـە.

٢ ـ بۆ (بەرکاری) روو لە دەستەکەی تر دەکەین. واتا دەستە (٢). تێیدا (یت) بەرانبەر (تۆ) یە.(یت) جێی ( تۆ ) دەگرێ .

٣ – بە پێی یاسا ژ (2) دەچێتە شوێنی خۆی کە ڕەگی کارەکەیە.

٤ – (مان) بەڕەڵڵا بوو و بێ پەناگە مایەوە. بە پێی یاسای شوێن ژ 1 ئەگەر ئەگەر بەرکاری ڕاستەوخۆ و بەرکاری ناڕاستەوخۆ و پێشبەند لە ڕستەکەدا نەبوو ، دەستەی یەکەمی ڕاناوە لکاوەکان بە یەکەم پێشگرەوە دەلکێ. لێرە بە پێشگری ( دە - ) وە دەلکێ.

٤ – زمانی کوردی وەك زمانێکی (بکەر لاچ) دەشێ بە یاساییێکی بە ئارەزوو (ئێمە ) لابرێ و رستەکە دەبێتە:

دە - مان - بینی - یت

٥ – (ی) ی نیشانەی کاتی ڕابردوو و (ی) ی (یت) بەیاسای (تێکتوانەوە) دەبن بە یەك (ی).

دەمانبینیت...... (ئێمە تۆمان دەبینی)

**هەنگاوەکانی گوێزانەوەی ڕستەی (أ) و (ب) و بۆ هاوسیماکانیان لەم وێنەیەدا روونکراوەتەوە:**




سیمای ئەم ڕستەیە دەقاودەق وەك ئەوەی پێشترە. دوو ڕستەی جیا .. دوو واتای جیا. لە دوو کاتی ڕێزمانیی جیا ، لەئەنجامی سەپاندنی دەستەیێك یاسای گوێزانەوە بۆ گواستنەوەیان لە بنجەکانیانەوە بۆ سیماکانیان ... ڕێکەوت هەردووکی کرد بە هاوسیما و بوو بە هۆی لێڵییەکە[٤].

بە سەپاندنی یاسای لابردنی (ت) ی بە ئارەزوو ئەم ڕستەیە سیمایێکی تریشی دەبێ کە ئەمەیە:

دەمانبینی

لەم جۆرە دارشتنەدا سێ جۆر یاسا ( سینتاکسی – مۆرفۆلۆجی – فۆنۆلۆجی) ، هاوکات بەشدارییان کرد لە گوێزانەوەی ڕستەکان لە بنجەکانیانەوە بۆ سیماکانیان و لە چوارچێوەی وشەیێکدا دایانرشت.

گەر ئەو دارشتنانەی کە (مۆرفۆلۆجی و فۆنۆلۆجی) بەشداری دەکەن لە ئەنجامدانیان بە یاساکانی (مۆرفۆفۆنیمی) ناودەبرێن و ئەو دارشتنانەی کە (سینتاکس و مۆرفۆلۆجی ) بەشداری دەکەن لە ئەنجامدانیان بە یاساکانی (مۆرفۆسینتاکسی) ناو دەبرێن ، بەلای منەوە بۆ دارشتنی پۆلۆسینسیتیی لێڵ (مۆرفۆفۆنۆسینتاکس) زاراوەیێکی گونجاوە .

# پەراوێزەکان

١ ـ بۆ پێناسەی (پۆلۆسینسیتی) Polosynthetic سەیری ئەم وتارە بکە :

وریا عومەر ئەمین (٢٠٠٧) کوردی زمانێکی پۆلۆسینسیتییە. گ. نووسەری نوێ .

ژ ٣٦.

لە ل ١٥١ – ١٥٣ ی کتێبی ( پیتۆکەکانی زمانەوانی ) ئاراس ٢٠١١ ش دووبارە بڵاوبۆتەوە.

٢ ـ سەیری ئەم سەرچاوانە بکە:

وریا عومەر أمین (١٩٩٥) لێڵی لە زمانی کوردیدا. گ. ڕۆشنبیری نوێ. ژ ١٣٦ ل٦٦ – ٦٩.

لە ل ٢٩٣ – ٣٠٠ ی کتێبی (ئاسۆیەکی تری زمانەوانی) ئاراس ٢٠٠٩ ش بەرچاو دەکەوێ.

٣ – بۆ یاساکانی ئەم لایەنەی ڕێزمانی کوردی سەیری ئەم سەچاوانە بکە:

a) - Waria Omar Amin(1979) Aspects of the verbal construction in Kurdish. University of London. 2nd publishing 2011.by Kurdish Academy.

ب ) – وریا عومەر ئەمین ( ١٩٨٦) ڕێزمانی ڕاناوی لکاو. بغداد.

پ ) – __________ ( ٢٠٠٠) بەراوردییەك . گ. ڕۆشنبیری نوێ. ژ١٤٦ ل ١٦ – ٢٠.

٤ – ئەم دیاردەیە ، یەکەم جار لە ل ١٢ ی سەرچاوە ژ ٥ پێشکەش کرا و یاساکانی دەست نیشان کرا.

# سەرچاوەکان

1 - Carr, F. (1993) Phonology.Macmillan Press. London.
2 - Chomsky, N.A. (1965) Aspects of the theory of syntax. Cambridge, Mass. MIT Press.
3 – Katamba, F. (1993) Morphology. Macmillan Press. London.
4 - Waria Omar Amin (1976) Some fundamental rules of Kurdish syntax structure. University of London. Published by Kurdish Academy (2011)
5 - _______________ (1979) Aspects of the verbal construction in Kurdish. University of London.

## ملخص البحث

***الاستاذ الدكتور وريا عمر امين***
***الاكاديمية الكردية***

توجد في اللغة الكردية مجموعتان من الضـمائر المتصـلة الـتي تظهـر مـع الفعل للتعبير عن التوافق مع الفاعل يرمزان بـ A وتشـمل (م – ت – ی – مان – تـان – يـان) و B وتشـمل (م – يـت – x/ يَـت –ات – يـن – ن – ن).. مجموعة A التي تظهر كفاعل مع المتعدي الماضي ، تظهر كمفعول مع المتعدي المضارع. مجموعة B التي تظهر كفاعل مع المتعدي المضارع ، تظهر كمفعول مع المتعدي الماضي.

| الدور | زمن الفعل | |
|---|---|---|
| | ماضي | مضارع |
| فاعل | A | B |
| مفعول | B | A |

هذا البحث الذي هو بعنوان (التركيب الصرفصوتنحوي) محاولة لتفسير هـذا الجانب وتبيان سبب الغموض الذي يظهر في بعض الحالات في هذه التراكيب.

# Abstract

In Kurdish sentence verb agrees with the subject NP in number and person. Two sets of personal suffixes perform these tasks. Set (A) (m – t – i: - ma:n – ta:n – ya:n ) and set (B) (m – i:t – 0/ a:t / e:t - i:n – n – n). Apart from subject agreement , the personal suffixes occur as object also, in opposite tense. Their function are shown in the following table:

| Function | Tense | |
|---|---|---|
| | Past | Present |
| Subject | A | B |
| Object | B | A |

In applying transformational rules an ambiguity is created in some circumstances due to the application of some phonological rules. This paper which is entitled (Morphophonosyntax) , is an attempt to explain this phenomenon.

# پرۆسەی لەدایکبوونی زمانی ستاندارد

## کەیسی سۆرانی

هۆمەر دزەیی

### بەرایی

دەردی کورد هەر گەل و وڵاتە کەرت و پەرتکراوەکەی نییە، زمانەکەشی لەتلەتە. ماوەیەکیشە شارەزایانی زمان بیروڕا و پێشنیازی جیاجیا دەخەنە روو بۆ داتاشینی زمانێکی ستاندارد لەو هەموو دیالێکتانەی زمانی کوردی، زمانێك کە کوردی هەموو پارچەکانی کوردستان تێی بگەن و ببێت بەزمانی رەسمی بۆ هەموو کورد. ئەڵبەت ئەمە کارێکی وا ئاسان نییە و راستییەکەی وا تووشی بنبەستیشی کردووین. بەبیر و تێگەیشتنی من ئێمە جارێ دەبێت دەستبەرداری ئەم جۆرە هەوڵانە ببین و رێگایەکی لەوە سووك و ئاسانتر بگرینەبەر چونکە ئەمن وای تێ دەگەم کە وا دیارە ئێمە خۆمان کارەکەمان لەخۆمان سەخت و ئاڵۆز کردووە بۆیە سەرەدەری لێ دەرناکەین.

ئێمە بەسۆز و عاتیفەی نیشتمانپەروەرییەوە خۆمان بەو بیرۆکەیەوە شۆڕکردۆتەوە کە هەر چوار پارچەی کوردستان یەك وڵاتە و دانیش بەو سنوورە نێو نەتەوەییانەدا نانێین کە کوردستانیان ئاوا کەرت کردووە. هەر بەم بیرکردنەوەیەش دەڵێین کە کوردستان یەك وڵات بێت دەبێت گەلەکەشی یەك زمانی ستانداردی هەبێت، چۆن دەبێت یەك گەل و دوو زمانی ستاندارد؟! ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە و خۆهەڵواسین بەو بیرۆکە بۆ ئەمرۆ سەراب ئاسایە بەقسە خۆشە، بەڵام داخی بەجەرگم زۆر دوورە لە واقیع.

تۆ بتەوێت و نەتەوێت واقیعی سیاسیی ئەمرۆ دەڵێت کوردستان یەك وڵات نییە و هیچ بەشێکیشی سەربەخۆ نییە، ناشزانین کەی ئەو بەشانە یان یەکێك لەو بەشانە سەربەخۆیی وەدەست دێنن، ناشزانین تەنانەت ئەگەر سەربەخۆییشیان وەدەست هێنا کێ دەڵێت دەیانەوێت ببن بە یەك دەوڵەت. کێ دەڵێت ئەگەر

رۆژێك لەرۆژان توركیا بوو بەئەندامی یەکێتی ئەورووپا كە ئەوسا كوردستانەكەشی دەبێتە بەشێك لە ئەورووپا و كوردەكانی ئەوێ هەموو مافێكی دیموكراتییان وەك ئەورووپاییيەكان بۆ دابین دەكرێت، كێ دەڵێت هەنگی كوردی توركیا ئارەزووی دابڕان لە ئەورووپا دەكەن و خۆیان رەگەڵ كوردستانە ئاسیاییيەكانی دیكە دەدەن (ئەگەر سەربەخۆ بوون)و خۆیان دەكەنەوە بە ئاسیایی! ؟ هەڵەی ئێمە لەوەدایە كە هەر بەخەیاڵ –دۆنكیشۆت ئاسا– وا سەرگەرمی داتاشینی یەك زمانی ستانداردین بۆ كوردستانێكی ئەویش هەر بەخەیاڵ یەكگرتوو و ئەزموونی سیاسیی فاشیلی گەلی عەرەبی تەنیشت خۆمان لەبەرچاو ناگرین.

عەرەب 20 دەوڵەتی سەربەخۆی هەیە هەر هەمووشیان لەسەر دەریان، ئێمە یەك تاكە دەوڵەتمان نییە و هەرچوارلاشمان بە نەیار گیراوە. عەرەب پتر لە ٢٠٠ ملیۆنە، ئێمە زۆر كەمتر. عەرەب سەرچاوەیەكی ئابووری زۆر دەوڵەمەندی هەیە كە دونیا ماستاویان بۆ دەكات، ئێمە وا نین. عەرەب یەك ملیارد موسڵمانی دونیا پشتگیری لە كێشەكانی دەكەن، ئێمە دۆستمان لەناو ئەوانەدا زۆر كەمە. عەرەب ژمارەیەكی یەكجار زۆری هەیە لە زانا و بیرمەند و ئەدیب و شاعیر و رۆشنبیری لە ئاستی جیهانیدا، ئێمە ئەوەمان نییە. عەرەب زمانێكی ستانداردی زۆر دەوڵەمەندی هەیە كە هەموو گەلانی موسڵمانی دونیاش سوودیان لێ وەرگرتووە، ئێمە نیمانە. عەرەب بەو هەموو تواناییيە بەشەری و رۆشنبیری و ئابوورییەوە بۆ نزیكەی 60 – 70 ساڵ هەوڵێكی بێ هوودەیان دا و توانایەكی بەشەری و دارایی زۆریان بەفیڕۆ دا لە پێناو دامەزراندنی دەوڵەتێكی عەرەبیی یەكگرتوو كەچی لە ئاخیری دەسبەرداری بوون چونكە بۆیان نەچووە سەر. ئێ باشە بۆچی دەبێت ئەم یەكگرتنە سیاسییە بۆ كوردی كەم توانا مسۆگەر بێت كە ئێمە بەخەیاڵی خۆمان وامان بۆ داناوە! ؟ پتر لە 17 - 18 دەوڵەتی ئەمریكای لاتین هەن، برازیل بەدەر كە زمانەكەی پۆرتوگیزییە، ئەوانی دی خڕیان بە ئیسپانی قسە دەكەن، بۆچی نابن بەیەك دەوڵەت كە هیچ كێشەی زمان و دیالێكتیشیان وەك كورد نییە! دیارە مەسەلەكە هەر زمان نییە. ئێران و ئەفغانستان (زمانی پەشتووی لێ بترازێت) و تاژیكستان بە فارسی قسە دەكەن، بۆچی هەوڵی یەكگرتن لەناو یەك دەوڵەتدا نادەن! دیارە مەسەلەكە هەر زمان نییە. ئازەربایجان، ئۆزبەكستان،

تورکمەنستان، قیرغیزستان، تەتەرستان و چەچەن و تاڕاددەیەك كازاخستان و زۆر وردە نەژادی دیکەی ئاسیای ناوەڕاست و (ئویگورەکان)ی چینیش، خۆ ئەوانەیش گشتیان بە یەکێك لە زمانەکانی تورانی جیاجیا، بەڵام هەر تورکی قسە دەکەن بۆچی نابن بە یەك دەوڵەت! بۆچی لەگەڵ تورکیا نابن بە یەك؟ دیارە مەسەلەکە هەر زمان نییە.

با بڵێین ئەمریکا و بریتانیا کە هەردووکیان بە ئینگلیزی قسە دەکەن لێك دوورن، بەڵام خۆ بەشە ئینگلیز زمانەکەی کەنەدا سنووری لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکان یەکە، خۆ ئوسترالیا و نیوزیلاند لە تەنیشت یەکن، باشە بۆچی ئەمانە کە بەئینگلیزی قسە دەکەن و کێشەی دیالێکتیشیان نییە بۆچی نابن بە یەك دەوڵەت!؟ دیارە مەسەلەکە هەر زمان نییە. ئاڵمانیا و نەمسا و بەشێك لە سویسرا کە بەزمانی ئاڵمانی قسە دەکەن، فرانسە و مۆناکۆ و بەشێك لە بەلژیك و بەشێك لە سویسرا بە فرانسەیی قسە دەکەن، بەشەکەی تری بەلژیك لەگەڵ هۆڵەندا بەیەك زمان قسە دەکەن کە فلاماندییە، ڕۆمانیا و مۆڵداڤیا بە ڕۆمانی قسە دەکەن، ئەلبانیا و کۆسۆڤۆ بە ئەلبانی قسە دەکەن چەندەها دەوڵەتی ئەفریکای فرانکۆفۆن و چەندەها دەوڵەتی ئەفریکای ئەنگلۆفۆن خۆ ئەمانە هەموو سەربەخۆن و کەس ڕێیان لێ ناگرێت ئەگەر ببن بە یەك دەوڵەت، بۆچی نابن!؟ بۆچی ئێمە کە هێشتا دەوڵەت نین هەر لە ئێستاوە وامان داناوە یەك دەگرین و یەك زمانیشمان دەبێت!؟ دیارە ئێمەش خەونەکەی عەرەبمان لێ خواستوونەتەوە و وا دڵی خۆمانی پێ خۆش دەکەین دیارە وەك ئەوان دەمانەوێ بۆ خەونێك زیانێکی گەورەی بەشەری و ئابووری بۆ دەیان ساڵ لەخۆمان بدەین ئینجا لە ئاخیری بڵێین واللە کاکە ئەمە واقیعی نییە با دەستی لێ هەڵگرین.

من کەوا تۆزێك لە باسەکە لامداوە و خەریکی سیاسەتم هەر لەبەرئەوەیە کە ئێمە سیاسەت و زمانمان وا بەتوندی لێك گرێداوە کە لەخۆمان کردۆتە گلۆرەیەکی گرێ کوێرە و خۆمان خستۆتە ناو گێژەنێکی بێ سەرەدەر.

جا لەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕاستییانە باسکردن لە سازکردنی یەك زمانی یەکگرتوو بۆ هەموو بەشەکانی کوردستانی پچڕپچڕ بیرکردنەوەیەکی نازانستی و دوور لەواقیعبینییە و بەلای منەوە هەوڵێکی بێ بەر و بەرهەمە و تەنها لە سۆزی

عاتیفـەی ناسـیۆنالیزمەوە سـەری هەڵـداوە. رەنگـە سـەربەخۆیی و یـەکبوونی پارچەکانی کوردستان زۆر ئاسانتربێت لە یەکگرتنی شێوەزارەکانی زمـانی کـوردی و کردنیان بە یەك زمانی ستاندارد. چونکە دوور نییـە سـەربەخۆیی لەپڕێکدا و لـە ئـەنجامی گـۆڕانێکی دراماتیکی بـارودۆخی جیۆپۆلیتیـك لـە ناوچـەکەدا بێتـە دی هەروەك کە بۆ تیموری رۆژهەلات و بۆ کۆسۆڤۆ و بۆ ئەریتریا و بەم دواییـەش بـۆ باشـووری سـوودان رەخسـا، بـەڵام یـەکبوونی شـێوەزاری جیاجیـای زمانێـك و سازکردنی زمانێکی ستاندارد ئەمـەیان نـە بـەبڕیارێکی سیاسـی و نـە بـەگۆڕانێکی دراماتیکی باری سیاسی ناوچە دێتە دی، بەڵکو لە ئەنجامی پرۆسەیەکی مێـژوویی زۆر درێژخایەنەوە. جا ئـا ئـەم پرۆسـە مێژووییـە درێژخایەنەیـە کـە بابـەتی ئـەم باسەی منە بۆ ئەمڕۆ.

# بەشی یەکەم
## دەرگایەك بۆ ناو باسەکە؛ چۆن شێوەزارێك خۆی دادەسە پێنێ

### ١- دەرگایەك بۆ ناو باسەکە

زمـان، چەشـنی هـەموو ئۆرگـانیزمێکی زینـدوو، لـە دایـك دەبێـت، دەزێ و دەشمرێت، هەروەکو هەموو ئۆرگانیزمێکی زیندوو، زمانیش لە ژمارەیـەك سـەرایی (element) و پـەلوپۆی بنچـینەییەوە پێکهـاتووە کـە هـەموویان بەسـەریەکەوە هەبوونی ئەو زمانە دابین دەکەن.

وشـە شـانەیە واتـا یـەکێك لـەو سـەراییانەی element کـە ئۆرگانیزمەکـە بـە زۆربوونی بەهێز و، بە کەمبوونیشی کزو لاواز و تەمەن کـورت دەبێـت. باقـەوارە و فـۆرمی ئۆرگانیزمێـك لـەوەی دیکـەیان جیـاش بێـت، ئەگـەر زادەی یـەك تـوخم species بن، هەریەکن. ئینسان هەر ئینسانە با یەکێك کورتەبالاّ یەکێك کەڵەگـەت، یەکێك سپی ئەوی دی رەش بێت، سەگ هەر سەگە چ تاژی چ توولـە، ئـەمیبیاش هەر ئەمیبیایە با فۆڕمیشیان جیابێ. جا هـەر بـەم پێـوەرە هـەبوونی شـێوەزاری جیاجیا لەناو هەر زمانێکدا شتێکی زۆر ئاسایی و سروشـتانەیە و پێشـکەوتووترین زمانی ئەمڕۆکە لەکاتی خۆیـدا بـەقۆناغی فرەشـێوەزاریدا تێپـەڕیون و ئێسـتەش- گەرچی بەڕادەیەکی کەمتر- هەر ماویانە و لەوانەیە هەر بشیان مـێنێ. چـون هـەر نەتەوەیەکی یەکگرتووی ئەمڕۆ لە سەرەتای مێژوویدا بـریتی بـووە لـە ژمارەیـەکی زۆر لە ئێڵ و خێڵات و کۆچەر و شوانکارە و، لەپاشان شارستان و ئینجـا ناوچـەی فیئودالی City State تا گەیشتووەتە دۆخی دەوڵەتی نەتـەوەیی Nation Stateی ئەمڕۆکەی، زۆر ئاسـایی بـووە دانیشـتووانی هەریـەکێك لـەو ناوچـانە لەبـەر کزیـی هاتوچـۆ و زۆر هـۆی دیکـەش- هـەر بەشـێوەزاری ناوچـەی خـۆی دوابـێ و هـەر ئەوەشی بەزمانی خۆی دانابێ و هەڵبەتا هـەر وشـەی تایبـەت بـەو ناوچەیەوەشـی بەکارهێنابێ.

راسـتییەکەی، فـرە شـێوەزاری تیغێکـی دوو دەمـە، خراپیشـە و باشیشـە. لەلایەکەوە کۆسپێکە لەسەر رێی هەوڵدان بۆ یەکگرتنی زمان و کردنـی بـەزمانێکی ستاندەرد Standard بۆ نووسین، کە زمانی کوردی ئەمڕۆ نموونەیەکی زیندووە بۆ

ئەمە، لەلایەكی تریشەوە كۆڵێك وشەی جۆراوجۆر لەبەردەست زمانی یەكگرتوو دادەنێ كە ئەمەیان بتوانێت خۆی پێ بەڕێوە ببات، چونكە ئاشكرایە كە تاكە شێوەزارێكی هیچ زمانێك لە وزەیدا نابێ بەتاكی تەنیا دەرەقەتی ئەو هەموو ئاڵوگۆڕە بێ كە لەئەنجامی پێشكەوتنی تەكنۆلۆژی و ئابووری و سیاسی و كۆمەڵایەتییەوە بەسەر ژیانی نەتەوەیەكدا دێت.

هەرچۆنێك بێت، ئەمەش نابێ و ناشێ ئەوە بگەیەنێ كە تێكهەڵكێشانی هەموو شێوەزارەكانی زمانێك، لە توانایدا دەبێت پێداویستی پێشكەوتنی تەكنۆلۆژی دابین بكات، .... نەئا، چونكە ڕۆژ بەڕۆژ شتی وا نوێ و تازە بابەت پەیدا دەبێت، كە نێوی لەناو هیچ زمانێك و شێوەزاری زمانێكدا نییە و دەبێت بۆی ساز بكرێت، ئەمەش كردەوەیەكی زۆر سروشتانەی بەردەوامە لە هەموو زمانێكدا.

### ٢- چۆن شێوەزارێك خۆی دادەسەپێنێ

لەگەڵ ڕەوتی ڕۆژگار، یەكێك لە شێوەزارە جۆراوجۆرەكانی هەر زمانێك خۆی بەسەر شێوەزارەكانی دیكەدا دەسەپێنێ و زاڵ دەبێت. مەرجیش نییە ئەو شێوەزارە گەورەترینی زمانەكەی بێ، واتا مەرج نییە زۆرترین كەس قسەی پێ بكەن. بۆ، چۆن و كەی ئەم شێوەزارە جڵەوی بەدەستەوە گرتووە و بۆتە پێشەنگ و پێش قەرەوڵ، هۆ و فاكتەری زۆری بۆ هەیە، بەڵام گرینگ ئەوەیە كە ئەم شێوە زارە ئێستا وا باڵادەستە بەسەر هەموو ئەوانی تردا. لە ڕاستیدا ئەمەیش خۆی لەخۆیدا دەبێ دڵ خۆشكەرەوە بێت بۆ ئەوانەی كە پەرۆشی زمانەكەیانن. لە سەرانسەری ئیمپراتۆراتی بەرفرەوانی ڕۆمانیدا كە گەلانی ئیمپراتۆریەتەكە نەك هەر بە دیالێكتی جیاجیا، بەڵكو بە زمانی جیاجیا قسەیان دەكرد، زمانی دیوانی (ڕەسمی) هەر لاتین بوو. كەچی لاتین زمانی ناوچەیەكی چكۆڵانەی ناوەڕاستی ئیتاڵیای ئێستاكە بوو كە پێی دەگوترا لاتیوم Latium و پایتەختەكەشی ڕۆما بوو بۆیە بەزمانە لاتینییەكان (ڕۆمی) یان (ڕۆمانی)یش دەگوترێ.

زمانی ئیسپانیۆلی ئەمڕۆكە شێوەزاری ناوەڕاستی ئیسپانیایە كە بەو ناوچەیە دەڵێن كاستیا Castilla بۆیە ئیسپانییەكان خۆیان كە ناوی زمانەكەیان دێنن،

پتر بە (کاستییانا)ی ناودەبەن نەك (ئیسپانیۆل)، زمانی عەرەبی (فصحی) کە قورئانی پیرۆزی پێ نووسراوەتەوە لە سەردەمی خۆیدا شێوەزاری ئێڵی (بەنی قورەیش) بووە لە (مەکە)، زمانی (دەری)ی ئەمڕۆ لە ئەفغانستان، زەمانێك زمانی دەربار (= دیوان)ی شا بووە، بۆیە ئێستاش هەر پێی دەڵێن (دەری) کە لە وشەی دەربارەوە هاتووە.

زمانی ئاڵمانی نێوەڕاست — لێرەدا مەبەست لەنێوەڕاست لە ڕوانگەی زەمانی زمانەوەیە نەك مەکان— کە بە Mittelhochdeutsch ناسراوە و لە دەوروبەری ساڵانی (1450 - 1050)دا باو بووە، ئەو جۆرە زمانە بووە کە لە هۆف HOF واتا دیوانی شا و دیوەخانی میر و ئاغایاندا قسەی پێ دەکراو لە هی لادێ و سەوادی میللەت ناسکتر و بە ئیتیکێتتر و بژارکراوتر بووە. هەر لەبەر ئەوەشە کە ئێستاش لە زمانی ئاڵمانیی مۆدێرندا وشەی (hoeflich) مانای (بە ئەدەب و اصول) دەدات و وشەی (hoefich)یش واتای گران و سەنگین و کیبار و خانەدان دەگەیەنێ، هەردوو وشەش لە(هۆف) واتا دیوان و دیوەخانەوە وەرگیراون. ئەوە بوو کە شایەرانی ناوچە جۆراوجۆرەکانی ئەو شانشین و میرنشینانەی کە پێشتر هەریەکە بەزاراوای سەوادی میللەتی ناوچەی خۆی هەڵبەستی دەهۆنییەوە، لەو ڕێبازەیان لادا و وردەوردە روویان کردە شێوەی (هۆف) یانی شێوەی ئاخافتنی دیوان و دیوەخانی میر و مارکیزان. بێ گومان لێرەدا نابێ راستییەکی دیکەش لەبیر بکرێ کە پاداشت و خەڵاتکردنی ئەو شایەرانە لەلایەن دەسەڵاتدار و سوارچاکانی ئەو سەردەمەوە، ڕۆڵێکی گەورەی یاری کردووە کە شایەرەکان روو لەشێوەی ئاخافتنی دیوەخان بکەن و پشت لەشێوەی ئاخافتنی سەوادی میللەت و لادێ بکەن، چونکە لەوێ هیچیان پێ نەدەبڕا. بەهەرحاڵ لە ئاخروئۆخری ئەو (زەمانە زمانییەدا)، لە ساڵانی (1500 - 1450) کە شایاتی و میرایەتی و سوارچاکی وەك جاری جاران ئەوەندە باویان نەما و کۆمەڵگا بەرەو کۆمەڵگایەکی بازرگانییەوە دەڕۆیشت، ئەو بارەی زمانیش گۆڕا، هەر ئەوەش بوو کە لەدوای دامەزراندنی فێدەراسیۆنی بازرگانیی نێوان شارەکانی باکووری ڕۆژئاوای ئاڵمانیا کە پێی دەگوترا Hansestaedtebund، شێوەزاری ئەو هەرێمەی ئاڵمانیا کە زمانەوانان دواتری ناویان نا Mittelniederdeutsch لەو ناوەیەدا کرا بە برا گەورە و

بەرەبەرە پەلوپۆشی دەهاوێشت بۆ ناو ناوچەکانی زمانی ئاڵمانیی نێوەڕاست و خەریك بوو تەنگی پێ هەڵچنێ، بەلاّم هەڵوەشاندنەوەی ئەو فێدەراسیۆنە بازرگانییە بووە هۆی راگرتنی پەرەسەندنی ئەو شێوەزارەیش لەناو سنوورەکانی خۆیدا.

لە سەردەمی زمانی ئینگلیزیی نێوەڕاست Middle English (دەوروبەری سالاّنی 1500 - 1066)، شێوەی ئاخافتنی شاری لەندەن، کە گەورەترین شار و ناوەندێکی بازرگانیی گرینگ بوو، خۆی بەسەر هەموو شێوەزارەکانی دیکەی زمانی ئینگلیزیدا سەپاند، بەلاّم لەهەمان کاتیشدا خۆی موتربە دەکرد بە وشەمەنیی هەموو ئەو ناوچانەی کە دانیشتووەکانیان هاتوچۆی لەندەنیان دەکرد، بەم چەشنە شێوەزاری لەندەن کرا بە برا گەورەیەك و وەك دەڵێن بوو بە زمانی compromise واتا هەموو لایەك پێی رازی بوون. ئەمرۆ لە سویسڕا (لە بەشە ئەڵمانی زارەکەی) زمانی قسەکردن ئەڵمانی خۆیانە واتا ئەڵمانی سویسڕا کە زۆر زۆر جیاوازە لە زمانی ئەڵمانی ئەڵمانیا و نەمسا کەچی لە نووسین و ڕاگەیاندندا سویسڕییە ئەڵمانی زارەکانیش هەر ستانداردی ئەڵمانیا بەکار دێنن واتا (هۆخ دۆیچ Hochdeutsch).

# بەشی دووەم
# زمانی کوردی؛ ئەزموونی سۆرانی؛ شێوەزاری سلێمانی؛ موتربەکردنی شێوەزاری زاڵ بە وشەی زاراوەکانی دیکە

**٣- زمانی کوردی**

جا بەئومێدی سوود وەرگرتن لەم کورتە مێژووەی ئەو زمانانە، با بگەڕێینەوە بۆ وڵاتی خۆمان و بزانین چی بکەین باشە.

هەروەك پێشتریش باسم کرد، هیچ شێوەزارێك وەك تاکەسوار بەرگەی شاڵاوی ئاڵوگۆڕی ژیان ناگرێ، وشەمەنی هەر شێوەزارێك با چەند دەوڵەمەندیش بێ، هەر سنووردارە. خۆبەستنەوە بە وشەی یەك شێوەزار یان ئەوەتا پەکت دەخا یان تووشی بەکارهێنانی وشەی لایەدت دەکات، یانیش ناچارت دەکات دابنیشی و بیر لە داتاشینی وشەی نوێ بکەیتەوە. خواستنەوەی وشەی بێگانەو دارشتنی وشەی نوێ، دیاردەیەکی زۆر ئاساییی و تەندروستە و هەموو زمانێکی پێشکەوتووی ئەمرۆ ئەم رێگەیە دەگرن بۆ خۆگونجاندن لەگەڵ رۆژگاری خۆشرەودا، بەڵام با جارێ بەردێ لەسەر ئەم پرسیارە دابنێین تا کژی دێت و دەگەڕێینەوە سەری.

زمان و گیروگرفتی زمان زانستە و ناکرێ بەسۆزی نەتەوە پەروەرییەوە دەستی بۆ ببەیت، چونکە ئەگەر ئەوە بکەیت ئەوا بەدەردی عەرەبان دەچین کە لەوەتەی بەبیرمان دێ باسی (یەکیەتی سیاسی عەرەب) دەکەن کەچی هەر ئاسنی سارد دەکوتنەوە، چونکە هەر لە بەراییدا بەهەڵە و بێ پلانێکی ماقووڵ و ئاقڵانە دەستیان پێکرد کاتێ جەمال عەبدولناسر هات و یەکسەر دەستی بە (وەحدەی سیاسی) کرد لەنێوان میسر و سوریا، بەڵام چونکە ئەو (وڵاتە نوێ)یە کە ناویان نا(الجمهورية العربية المتحدة) لەسەر بناغەیەکی حیسابی ورد بۆنەکراودا بنیاد نرابوو و بەزۆری و بەشێوەیەکی ناسروشتی داسەپێنرابوو، سەری نەگرت و چەند بەخێرایی و بەپەلە دامەزرا، ئەوهاش بەخێرایی و بەپەلە تەپی و رما. بەرئاوەژووی ئەوە، تۆ ئەگەر سەرنجێك بدەیتە پرۆسەی دامەزراندنی (یەکێتیی ئەوروپاییEU) دەبینی کە لە 25/3/1957 بەکۆبوونەوەیەکی نێوان 6 وڵاتی ئەوروپای رۆژئاوا (فەرەنسا، ئەڵمانیا، ئیتاڵیا، هۆڵەندا، بەلژیك، لوکسەمبورگ) لە رۆما دەستی پێ

کرد و کۆمەڵێکیان دامەزراند بەناوی (کۆمەڵی ئابووری ئەوروپاییEEC)، لەپاشان ناوەکەی کرا بە (بازاڕی هاوبەش common market)، لەپاشانا گومرگیان کرد بەیەك ئینجا دەستیان بەهەنگاوی سیاسی کرد و پارلەمانی ئەوروپایی و ئەنجومەنی ئەوروپاییان دامەزراند، پاسەپۆرتیان کردە یەك و وا زۆرترایەتییان دراویشیان کردۆتە یەك.

جا وەك کە دەبینین، ئەوروپاییەکان کاری خۆیان زۆر بەپلان و بە شێنەیی کرد، دوور لە سۆزی نەتەوە پەروەری و ماڵەکەی خۆیان لەسەر بناغەیەکی زۆر پتەو و حیسابی وردبۆکراودا خشت بەخشت بنیادنا، کەوا سەری گرتووە و سەریش دەگرێ. من ئەم نموونەیەم بۆیە هێنایەوە تاکو کوردیش نەك هەر لەبواری یەکیەتی میللییەوە کە ئەمەیان بابەتی باسەکەی من نییە، بەڵکو لەبواری یەکیەتی زمانیشەوە کەڵکی لێ وەربگرێت و پەیڕەوی بکات.

زمانەوانیی کۆن و نوێی کورد و بێگانە چەند شێوەزارێکی سەرەکییان بۆ زمانی کوردی دەستنیشان کردووە کە مەبەستی من لێرەدا ئەوە نییە بچمە ناواخنیانەوە، بەڵام پێموایە زۆرترایەتی زمانەوانەکان ڕێکن لەسەر ئەوەی کە ئەوڕۆکە سێ دیالەکتی سەرەکی لە زمانی کوردیدا زیاتر لە بن – دیالێکتەکانی تر بەکار دەبردرێن: کوردی باکوور (کرمانجی)، کوردی نێوەڕاست (کە بەهەڵە لەناو خەڵکدا ناوی سۆرانی لێ نراوە) و کوردی گۆرانی–زازا، بەڵام من بۆ ئاسانکاری تێگەیشتن سۆرانی بۆ کوردی ناوەڕاست و کرمانجیش بۆ کوردی باکوور بەکاردێنم. خۆی ڕاستە ئەو سێ دیالێکتە ئەمڕۆ لە سەرانسەری کوردستان قسەیان پێ دەکرێ، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ تەنها سۆرانی (لە ئێراق و ئێران) و کرمانجیش (لە تورکیا و سوریا) بوونەتە شێوەزاری زاڵ و لە نووسیندا خۆیان فەرز کردووە. لەبەر ئەوە ئەو ڕێگایە ئاسانترەی کە من لە بەراییدا باسم کرد ئەوەیە کە دەبێت کوردستان بکەین بە (دوو زۆنی زمانی – two language zones) یان (دوو کوردستانی زمانیی)، دەبێ جارێ (دەڵێم جارێ) بیرۆکەی یەك کوردستانی گەورە و یەك زمانی ستاندارد لەبیر بکەین. لەو دوو کوردستانە زمانییەشدا وا دوو لەهجە بە پرۆسەی مێژوویی (نەك بەبڕیاری سیاسی) خۆیان داسەپاندووە، سۆرانی لە کوردستانی ئێراق و ئێران، کرمانجیش لە کوردستانی

تورکیا و سوریا. ئەو دوو شێوەزارە لە دەزگاکانی دەوڵەت و لە میدیا و لەخوێندنگاکاندا بەکار دەبردرێن. لێرەدا خزمەتکردنی زمانی کوردی لەوەدایە کەڵهوڕی و لەکی و گۆرانی و شکاکی لە ئێران و بادینانی و خانەقینی و فەیلی و هەورامی لە ئێراق و زازاش لە تورکیا لە دام و دەزگاکانی دەوڵەت (ئەگەر هەبوو) و لە میدیا و لەخوێندنگەکاندا سەر بۆ شێوەزارە زاڵەکەی لای خۆیان دابنەوێنن و خۆیان پەراوێز بکەن. من ئەم قسانە بەبێ بەڵگە ناکەم و هیوادارم قسە پێکەرانی کەلهوڕی و لەکی و گۆرانی و شکاکی و بادینانی و زازایش ئەم بۆچوونەم بەدەمارگیریی بۆ سۆرانی وەرنەگرن چونکە نموونەیەکی زیندووم وا لەبەر دەستدایە کە ئەزموونی سەرکەوتووی دیالێکتی سۆرانییە.

٤- ئەزموونی سۆرانی

شێوەزاری زاڵ لە نووسین و ڕاگەیاندندا لە کوردستانی ئێراق و ئێران، ئەمڕۆکە شێوەزاری سلێمانییە، یان ڕەنگە باشتریش بێ بڵێین لەسەر شێوەزاری سلێمانی بنیاد نراوە چون شێوەزاری سلێمانیش وەك 50 ساڵ لەمەوپێش نەماوەو گۆڕانێکی زۆری بەسەرداهاتووە. ڕاست نییە ئەمڕۆ مشتومڕ لەسەر ئەوەدا بکرێت بۆچی شێوەزاری من ستاندارد نەبێ، هی تۆ بێ؟ ئەگەر وا بیر بکەینەوە دەبێ لە کوردستانی نێوەڕاستدا بەو هەموو (بن — شێوەزارانە sub-dialects) بنووسین و بخوێنین کە لە هەر شارێکدا جیاوازە تا شارێکی دی. ئەگەر ئەمە بکەین ئەوا بەدەردی کوردەکەی گوتی (ئاوێ بێنەو دەستان بشۆ) و بەدەستی خۆمان ئاگر لە ماڵی خۆمان بەردەدەین. وەکو لە سەرەوەش گوتم هەموومان دەزانین کە شێوەی ئاخافتنی هەر شارێکی کوردستان تاڕادەیەك لەوەی دیکە جیایە. بەهەرحاڵ با بەزەییمان بەخۆمانا نەیەتەوە، ئەمە نەك هەر لە کوردستان، بەڵکو لە هەموو جیهاندا وایە، بەڵام ئایا دەکرێ تۆ هەموو شارێکی وڵاتەکەت ڕازی بکەیت؟ دەڵێن لە زەمانی عوسمانیدا شێوەزاری هەر شارێکی تورك لەوەی دی جودا بووە، بەڵام پاشتر شێوەزاری ئەستەمبۆڵ کە ئەمڕۆ پێی دەڵێن تورکی ئەستەمبۆڵی (Istanbul turkcesi) وردەوردە خۆی سەپاند و بوو بە ستاندارد.

حەوتوهەشتکردن لەسەر ئەوەی کامە شێوەزار بە بڕیارێکی سیاسی (بێ لەبەرچاو گرتنی پرۆسەی مێژوویی) بکرێ بەشێوەزاری ستاندارد بۆ (هەرێمێکی زمانیی کوردستان)، نەك هەر زانستانە و لۆژیك نییە، بەڵکو بۆ ئەوانەی کە لە ڕوانگەیەکی نەتەوە پەروەریشەوە سەیری کێشەکە دەکەن، ئەمە لە هەستی نەتەوایەتیشەوە دوورە و تەنیا کۆسپ و گاشەبەردان دەخاتە سەر ڕێی خۆڕسکی یەکگرتنی زمانی کوردی. خۆگرێدان بەناوچەپەرستی، لەم ڕووەوە، تەنها تووشی کۆڵانی بنبەستمان دەکات. خۆسەپاندنی شێوەزارێك، لە نووسین و خوێندندا، کردەوەی شەو و ڕۆژێك نییە، بەڵکو پرۆسەیەکە ئەگەر بەسەدانیش نەبێ بەدەیان ساڵ داژوا تا جێگیر دەبێ. لە کوردستانی نێوەڕاستدا شێوەزاری سلێمانی ئەو مەرجەی بەتەواوی تێدا بووە، لە کوردی باکووریش واتا کرمانجی لام وایە شێوەزاری بۆتانی گۆیەکەی بردۆتەوە. ئیتر چ پێویست بەوە ناکات لە (یەك هەرێمی زمانیدا) دوو ستاندارد واتا کرمانجی و سۆرانی بەکار بهێنرێن.

### ٥– شێوەزاری سلێمانی

لەوەتەی فەرمانڕەوایی بابانەکان و بەتایبەتی لەوەتەی یەکەم جەنگی جیهان، شێوەزاری ناوچەی سلێمانی، بەبێ پچڕان خزمەتی دەکرێت و تا ئێستا پتر لە هەموو شێوەزارەکانی دیکەی زمانی کوردی (باکوور و باشوور بەسەر یەکەوە) چاپەمەنی پێ نووسراوەتەوە و تەنیا شێوەزاریش بووە کە بۆ یەکەم جار لەمێژووی پەروەردەکردنی کوردیدا و بەردەوامیش لە خوێندنخانانندا وانەی پێ گوتراوەتەوە. یەکەم شێوەزاریش کە سۆرانی پەتی پێ نووسرابێتەوە هەر شێوەزاری سلێمانی بوو کاتێ کە تۆفیق وەهبی و عەبدوڵڵا گۆران و ئیبراهیم ئەحمەد پێشڕەویی ئەم ڕێبازەیان کرد. کۆڕی زانیاریش لە بەغدا، بەزۆری، هەر لەخزمەتی شێوەزاری سلێمانیدا بووە. یەکەم ئێسگەی رادیۆش بەزمانی کوردی، رادیۆی بەغدا بەکوردی، ئەویش (لە بەشە سۆرانییەکەی) هەر بەزاراوەی سلێمانی رایدەگەیاند. ئەو ڕادیۆیەی ئینگلیزەکان لە ساڵانی دووەم جەنگی جیهان لە شاری (یافا)ی فەلەستین بەناوی (اذاعة الشرق الادنی) دایانمەزراندبوو بە زمانی کوردیش پەخش دەکرا هەر بە زاراوای سلێمانی بوو زمانیش هەر بەنووسین و ڕاگەیاندن

پێش دەکەوێ. دکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملو لە کتێبی lranian kurdistan دا دەنووسێ ((زۆرترایەتی کوردی ئێراق و ئێران بە سۆرانی قسە دەکەن... ئەوەی کە ئاڵوگۆڕی چاپەمەنیی کوردی لەنێوان ئەو دوو پارچەیەی کوردستاندا ئاسان دەکات، لە مشەیی کتێب و رۆژنامەی کوردییە کە لەئێراقدا چاپ دەکرێن)).

هەڵبەتا تاکە شێوەزاری نووسینیش لە ناوچە سۆرانییەکانی کوردستانی ئێراق، هەر شێوەزاری سلێمانی بوو.

راستی، ئەو دەرفەتەی کە بۆ شێوەزاری سلێمانی هەڵکەوتووە، بۆ هیچ شێوەزارێکی دیکە لەمێژووی زمانی کوردیدا هەڵنەکەوتووە، بۆیە، زۆر لۆژیکە، زۆر مەنتیقییە، کە ئەم شێوەزارە ئاوا بۆتە پەتی و پاراو و جۆرە elegancy واتا کیباری و ناسکییەکی بورژوازییانەی پێوە دیارە و وەك زمانی چینی رۆشنبیر و پەروەردەکراوان ئاوا خۆی دەنوێنێ. میهرداد ئیزەدی دەربارەی شێوەزاری سلێمانی دەڵێ ((شێوەزاری سلێمانی لەچاو شێوەزارەکانی دی باش رسکاوە و بەردەوامیش گەشەی پێ دەدرێ، کە ئەمەش بەپێچەوانەی زۆرترایەتی شێوەزارەکانی دیکەی کوردییە کە بە سستی ماونەتەوە چونکە ئەم شێوەزارە زمانی فەرمانڕەوا کۆنەکانی میرنشین و شاری شارەزووری ستراتیژیی بووە — کە دواترێ شاری سلێمانی شوێنەکەی گرتەوە و کەوتبووە سەر سنووری نێوان ئیمپراتۆراتی عوسمانی و فارسی— بۆیە ئەمیش، وەکو (شێوەزاری گۆرانی)، لە رووی وشە و موستەلەحاتی بیرۆکراتی و بەڕێوەبەرایەتی، زۆر دەوڵەمەندە)) بڕوانە (میهرداد ئیزەدی لە

Kurdish Times. VoL.2No.2 Summer 1988 New York)

بۆ پتر پشتگرتنی ئەم قسانەم، پەنا دەبەمە بەر بیرو بینینی دوو نووسەری بەبڕشتی کوردستانی باکووریش. سولەیمان چەڤیك لە ژمارە 8ی ساڵی یەکی مانگی گوڵانی 1993ی کۆڤاری Nu Behar کە بە پیتی لاتینی لە ئەستەمبۆڵ دەردەچێ (یان دەردەچوو) دەڵێ:

((ئەم نها کۆڤارەکە یان رۆژنامەکە ترکی بنڤیسینن، خوەندەڤانێن وێ پرن، ئەڤ کۆڤار، یان رۆژنامە ب ترکا هەموویان رە ئو ب پرێ کوردارە ژی خیطاب دکە، لەورا زمانێ ترکی زمانێ دەوڵەتێ یە، رەسمی یە ئۆ هەرکەس ب ترکی دزانە

قسەبکە ئو بخوینن، لیٚ کۆڤارەکە کوردی ل ترکا تەو خیطاب ناکە، ژ کوردارە ژی ئانجاخ دەھ ژ صەدێ رە دکارە خیطاب بکە، یان ژی ئەو قـاس ژی نینـە. وەخـتێ زمانەك دنفیسانندنێ دە، د تەعلیمێ دە ئۆ تەلەفیزیۆن و رادیـۆییێ دە بکـار نـەییێ، ئەو زمان پێشدەناچە، نەپێشدەچووین، سەردە بێ گوومان شووندەژی دمینە. پـڕ کەلیمە ژبیر دبن و ژ زمان دەردکەڤن. ئیرۆ هەنەك کەس دبێژن کۆڤـاراوە ئوزمـانێ وەشانێن کوردی پڕ فام نابن. ئەم هەتا نۆقتەکی ڤان گۆتنێن وان کەسـان نۆرمـال دبیـنن. لـەورا ژبۆنـا کـو کـوردی ژمێژڤـە ب تـەڤایی نەبوویـە زمـانێ نڤیسـاندنێ، دەڤۆکەك (شێوە) هەڤپشکی نەهاتیە مەیدانێ. ئەوقاس سالە کـورد ژزمـانێ خـوە دوور مانە........))

فەرات جـەوەری لـەژمارەی 63ی سـاڵی 2ی (8 - 2)ی مـانگی گـوڵانی 1993ی رۆژنامەی (وەلات)دا دەربارەی زمان و ئەدەبیات لە کوردستانی ئێراقدا دەنووسێ: ((.... کۆڤارێن ئەدەبی ب دەھ هەزاران دفرۆشـن، پرتـوکێن کـوردی ب هـەزاران و دیسان ب صەدان و ب هەزاران بەشدارییا سەمینار و پانەلێن ئەدەبی تێنەکرن. لێ ئەڤ ژبۆمە کوردێن ترکیێ هێ نوویە. هەرچقاس کۆڤار و رۆژنامەیێن مە زێدە نەیێن فرۆتن ژی، پرتـووکێن مـە زێـدە نـەیێن خوەنـدن ژی، سـەمینار و پانـەلێن مـەیێن ئەدەبی نە ئەوچەند بالکێش بن ژی، دیسان ژبۆمە دەمەکە نـوو دەسـت پێکرییـە، ئەم ددەمەکە رۆنێسانسەکێ دەنە.))

دەوجا بابزانین نووسەری گـەورەی کـوردی تورکیـا یاشـار کـەمال لـەم رووەوە دەڵێ چی: ((ئەگەر زمانەك نەخوەدی ئەدەبیاتەکـە نڤیسـکی بـە، نکـارە ب پـێش کەڤە، وێ دجهێ خوەدە بهەژمێرە. لە هەمبەر ڤێ ژی وێ (وێژە) یان (ئەدەبیاتا) دەڤکـی ب پێشـڤە هـەرە.)) (رۆژنامـا وەلاتـێ مـە، هـەژمار 5 سـالێ –1 (24–94/12/18) هەڤپەیڤینەك ب یاشار کەمال ی رە.)

جا وەك دەبینین نەك هەر کوردی ئێراق، بەڵکو وادیارە بیرو دیتنی رۆشنبیرانی کـوردی ئێـران و تورکیـاش هـەر ئەوەیـە کـە زمـان و ئـەدەبیاتی سـۆرانی لـە کوردسـتانی ئێـراق، کـە بەشـێوەزاری سـلێمانی دەنووسـرێتەوە زۆر بـەپێش زاراوەکانی دیکەی کوردی کەوتووە چ لە ئێران چ لە تورکیا و چ لەناو خودی ئێراق خۆیشی. لە هەموو دەور و زەمانێکیشدا، هـەروەك کـە پێشـترێ باسـم کـرد، هـەر

شتی وا لەگەڵ ڕەوتی ڕۆژگاردا بەرەبەرە دەبێتە زمانی ستاندارد. ئەمەش دەبێ هیوای هەر کوردێکی دڵسۆز بێ کە پەرۆشی زمانەکەی بێ.

تۆ ئەگەر تێبینیت کردبێ دەبینی کە هەم جەنابی مەلا مستەفای رەحمەتی، هەم سەرۆکی هەرێمی کوردستان جەنابی کاک مەسعود بارزانی و هەم سەرۆکی حکومەتی کوردستان جەنابی کاک نێچیرڤان بارزانی، کە شێوەزاری هەر سێکیان کرمانجی باکوورە، بەڵام لە هەموو نامە و گوتار و قسەکردنیاندا شێوەزاری سۆرانی بەکاردێنن چونکە دەزانن کە ئەم شێوەزارە ئەوە هەیامێکی دوورە خۆی فەرز کردووە و لە ئێراق و ئێران بۆتە زمانی ستاندارد. هەر خۆم نامەیەکی خوالێخۆشبوو مەلا مستەفای بارزانیم هەڵگرتووە، کە بە دەستخەتی خۆی و بە ئیمزای خۆی لە ناوەڕاستی حەفتاکانی سەدەی رابردوو لە ئەمریکا بۆی ناردوومەتە لەندەن. نامەکە بەشێوەزاری سۆرانی سلێمانییە. خۆ نە مەلا مستەفا سلێمانی بوو و نە منیش، بەڵام ئەو دەیزانی سلێمانی زمانی نووسینی رەسمیاتە.

من کە لێرەدا دەڵێم شێوەزاری سلێمانی زۆر بەپێش زاراوەکانی دیکەی کوردی کەوتووە مەبەستم هەر ئەوەیە کە ئەو شێوەزارە بە درێژایی مێژوو زیاتر خزمەتی کراوە ئەگینا هیچ شێوەزارێك لە زمانێکدا لەوەی دیکەی ئەو زمانە رەسەنتر نییە. شێوەزاری سلێمانی لەوەی موکریان، ئەردەڵان، سۆران (مەبەستم لە سۆرانستانی هەولێرە)، گۆران، هەکاری، بادینان، بۆتان، کەڵهوڕ و لەك و فەیلی و ...هتد کوردیتر نییە.

ئەمن شێوەزارەکانی زمانێك بە زارۆڵانی باوانێك دەچوێنم. هیچ یەکێك لەو زارۆڵانە لەوانی دیکە پتر منداڵی دایك و باوکی خۆی نییە، هەموویان وەك یەك، بە یەکسانی، منداڵی ئەو باوانەن، بەڵام کوڕ یان کچ هەیە خزمەتی خۆی کردووە، خۆی پێ گەیاندووە و ئیتر هەڵکەوتووە و ناو و دەنگێکی ئەوتۆی دەرکردووە کە خوشك و براکانی لە ئاستیا بزر بووین و بەم جۆرە رێبەرایەتی بنەماڵەکەی وەرگرتووە. مەرجیش نییە ئەو کوڕە یان کچە نۆبەرەی باوانی بێ، نەخێر! زۆر جاری وا بووە کە منداڵی بچووك، زیاتر لە برا گەورەکەی، ناوی دەرکردووە. بەم پێوەرە، هەموو شێوەزارەکانی زمانی کوردی هەمووی وەك یەك کوردین.

لە کوردیی باکووردا، شێوەزاری بۆتان، ئەو زمانەی کە برایانی بەدرخان میر جەلادەت و میر کامەران کۆڤاری (هاوار)یان لە سەرایی سییەکانی سەدەی بیست پێ دەنووسییەوە، ئەورۆکەش بۆتە بناغەیەك بۆ زمانی ئەدەبیات و نووسین لای کوردەکانی باکوور، بۆیەکا ئەو شێوەزارە (واتا بۆتانی) بەموتربەکردن لەگەڵ زاراوای بادینان و هەکاری، پێموایە باشترین و گونجاوترین شێوەزارە کە دەکرێ ببێ بەزاراوای ستاندارد بۆ کوردی باکوور و کوردی سوریا. من لەخۆم رادەبینم ئەوەشی بخەمەسەر کە لەئەنجامی بەراوردکردنی هەردوو زاراوا سەرەکییەکەی کوردی (کرمانجی و سۆرانی) لەگەڵ زمانە پێشکەوتووەکانی ئەوروپاییدا، بۆم دەرکەوتووە کە رێزمانی کرمانجی، دۆخی (ergative)ی لێ بترازێ، ئەگینا لە رووی سینتاکس و فۆنۆلۆژی و تاراددەیەك لە رووی رزگاربوونی لە inflection واتا (ئاوسانی وشە)، ئەمڕۆ پتر تا سۆرانی لە زمانە ئەوروپاییەکانەوە نزیکە. جا لام وایە بەو هەموو رۆشنبیرە کرمانج زارەی کە لە هوندرو هەندەری تورکیادا دەژین و بەپەرۆشەوە سەرگەرمی زمان و کولتووری کوردین، زاراوای کرمانجی تێی رادەبینرێ لە پاشەڕۆژدا پێش هەموو زاراواکانی دیکەی کوردی بکەوێت و خۆی دابسەپێنێ. کە ئەمەیش هەر دەبێ هیوای هەموو کوردێکی دڵسۆز بێ ئەگەر ئەو خۆ داسەپاندنە بە رێگای پرۆسەی دوورودرێژی مێژووییەوە روو بدات وەك کە شێوەزاری سلێمانی بەو پرۆسە مێژووییە تا ئێستا خۆی داسەپاندووە. فەرات جەوەری چاکی بۆ چووە کە دەڵێ ((کرمانجی ژووروو ئێستاکە وا لە رێنصانصی دایە)). بریا بەبریای خوایێ یەك تاکە شێوەزار بەپرۆسەیەکی مێژوویی، خۆی بەسەر تەواوی شێوەکانی دیکەی کوردیدا لە هەموو پارچەکانی کوردستاندا بسەپاندایە، کورد گوتەنی ((کوێرە چیت دەوێ دوو چاوی ساغ)).

**٦– موتربەکردنی شێوەزاری زاڵ بە وشەی زاراواکانی دیکە**

پێشتر ئاماژەم بە خواستنەوەی وشە و داڕشتنی وشەی نوێ کرد و گوتم با جارێ بەردێك لەسەر ئەمە دابنێین تا کژی دێ. ئێستاکێ وا ئەو کژە هاتووە و با بەردەکەی لەسەر هەڵدەینەوە.

تا ئێستا گوتوومە پرۆسەی لەدایكبوونی زمانی ستانداردی كوردی بەرێگای بەخشكەیی زاڵبوونی زاراوایەك بەسەر هەموو زاراواكانی دیكەدا دەبێ، بەڵام ئەوەندە بەس نییە. لێرەدا پرسیارێك سەری قوت دەكاتەوە ئایا دەشێ شێوەزاری زاڵ رووی خۆی لەخەزێنەی وشەمەنی شێوەزارەكانی دیكە وەرگێرێت و پشتی تێ بكات؟

بۆ وەرامی ئەم پرسیارە دیسان با ئەزموونی سلێمانی بكەین بەنموونە. شێوەزاری سلێمانی سەرەرای هەموو جوانییەكەی تارادەیەك ئەم كەموكوڕی و خەوشەی هەیە.

پێموایە زۆرترایەتی نووسەر و رۆشنبیرانی شاری سلێمانی بە وجاخ وردە بورژوازی و زادەی چینی ناوەندین. ئەمانە شارستانن و خۆیان لە وشەی ((سادە)) و ((رەق))ی لادێی كورد لادەدەن و بەلایانەوە وشەیەك بۆخۆیان دابرێژن، یان وشەیەكی بێگانە بەكاربێنن باشترە لەوەی كە خۆیان بۆ ریزی جووتیاری سادە ((دابەزێنن))، بەتایبەتی ئەگەر جووتیاری ناوچەی خۆیان نەبوو. بە بەرەواژی ئەوەش، تۆ ئەگەر سەرنجێ بدەیتە نووسینەكانی هەندێ لەو نووسەرانەی سلێمانی كە لە هەرەتی لاوییاندا لە دێهاتدا ژیاون، یان بەفەقێیاتی و مەلایەتی و دەربەدەریی سیاسی بەناو زۆر ناوچەی جۆراوجۆری كوردستاندا گەراون، دەبینی بەرهەمەكانیان كوردییەكی پەتی بێ گرێ، سووك و ئاسانە و لە گوێچكەدا خۆشتر دەزرینگێتەوە ئەگەر بەراوردی بكەیت لەگەڵ بەرهەمی ئەوانەی كە هەموو ژیانیان لە شار بەسەر بردووە. ئەمانەی دواییان هەركە بۆ وشەیەك تەنگاو دەبن، یەكسەر پەنا دەبەنەبەر وشەی دروستكراو، نەك دروستكراوی باویش، بەڵكو هەر نووسەرێك ئازادی دەداتە خۆی بەئارەزووی خۆی وشەی نوێ دابتاشێ. من كە پێشتر گوتم شێوەزاری سلێمانی جۆرە elegancy واتا كیباری و ناسكییەكی بۆرژوازییانەی لێ دەتكێتەوە، ئێستا مەبەستم لە جوانیی– كەمكردنەوەی ئەو شێوەزارە نییە، مەبەستم ئەوەیە كە ئەو جوانییەش بێ كەموكوڕی و خەوش نییە و پێموایە زۆر جوانتر و شیرین و پاراوتر دەبوو، ئەگەر ئەو شێوەزمانە بە وشەمەنی لادێ و ناوچەكانی دیكەی كوردەواریشەوە موتربە بكرایە و بنەخشێنرایە. خۆ زۆر لە گوینە ئەگەر من وشەیەكم پێویست بوو و لەبارەكەی

خۆمم نەدۆزییەوە، لـە بارەکـەی موکریانـدا بیدۆزمـەوە، ئەگـەر تـۆ وشـەیەکت لـە توورەگەدا نەبوو رەنگە لە هەگبەی من، هەمبانەی بادینان، یان لەناو تێڕ و توور و خورجی بۆتان، گەرمیان، هەورامان، سۆران، ئەردەڵان، زازا و فـەیلی و کرماشـاندا دەستت کەوێ.

ئەڵبەت لێرەدا مەبەستم شتی تازە بابەت واتا وشەی ژیانی مۆدێرن نییە، چون رەنگـە وشـەی وا نـە لـە لای مـن، نـەلای تـۆ و نـە لای هـیچ ئێـلێ و ناوچـەیەکی کوردەواریدا دەست نەکەوێ.

خۆی راستە کە لەسەردەمی زمانی (هۆف)ی ئاڵمانی شۆڕەسوارە خانەدانەکان خۆیان لە وشە و چۆنییەتی ئاخاوتنی لادێیان لادەدا، چونکە بە نزم و دواکەوتوو و رەق و سادەیان دادەنا و لەباتییان، هانایان وەبەر وشەی فرانسەیی دەبرد کـە لـە هی خۆیان پێشـکەوتووتر و ناسـکتر بـوو و سـەرباری ئـەوەش، راسـتەوخۆ زادەی لاتـین بـوو. بـەڵام ئەمـە تـا سـەر نـەبوو. لەگـەڵ کۆتـایی سـەردەمی سوارچـاکی Ritterschaft ئەم رێبازەش باوی نەما. بەڵام بۆچـی ئەوەنـدە دوور بـڕۆین. ئـەدی مەلای کوردی پێشانیش هەر وا نەبوون! مەلای کورد چون هەر خۆی خوێندەواری گوندەکەی بـوو، هـەوڵی دەدا بـەڕێگای بـەکارهێنانی وشـەی عـەرەبی و جیـاوازی شـێوەی قسـەکردنی ئاسـتی رۆشـنبیریی خـۆی دەرخـات و لـە هـی لادێییـەکانی جیاکاتەوە. مەسەلێکی زۆر بـاوە لـە کوردسـتان کـە مەلایـەك تووشـی کابرایـەکی لادێیـی دەبـێ بـارە دارێکـی لـە گوێدرێـژێکی رەش بـار کردبـوو دەیـبرد بـۆ شـار بیفرۆشێ. مەلا لێی پرسی ((ئەی بائیعی حطب، ئەم حەملی حـەطـــەبی حیمـاری ئەسـوەدەت بەچـەند بـەیع و شـیراء دەکـەیت؟)) لادێیـی دامـاویش کـە فـڕی لـە قسەکانی مەلا نەگەیشت گوتی ((وەی مامۆستا گیان قسەکانت چـەند خۆشـن!... توخوا ئەگەر ئایەتێکی دیکەشم بۆ نەڵێیت..!!))

جا نووسەرانی شێوەزاری زاڵی کوردیش نـابێ لـووت بـەرز و لـەخۆبایی بـن کـە وشەیەکی ناوچەیەکی دیکەی کوردستان دەبینن بڵێن:

((...جا ئەمە کەی کوردییە؟ ... من قـەت شـتی وام نەبیسـتووە... کـێ لەمـە ئەگا!!...هتد))

((..ئەمە کەی کوردییە؟)) لەسەر بناغەیەکی پـووچ و رزیـودا بنیـاد نـراوە کـە تەنیا زیانی پێوەیە و هیچی تر. من پێشتر باسی رەسەناتی هەموو شێوەزارەکانی کوردیم کرد و بە زارۆڵانی باوانێکم چواندن کە هەموویان وەك یـەك بـە یەکسـانی منداڵی دایك و باوکی خۆیانن. خۆ ئەگەر نووسەرێك یان شاعیرێکی شـێوەزاری زاڵ بڵێ ((.... من قەت شتی وام نەبیستووە)) راست دەکات. بارودۆخی جیۆپۆلیتیکی کوردستان وای لە هەموومان کردووە پەیوەندی و ئامۆشۆی ناوخۆییمان یـان هـەر نەبێ، یان زۆر کز و سست بێ. راستە ئەو شەڕوشۆڕەی چڵ پەنجا ساڵی دوایی لـە سێ پارچەی کوردستاندا ئەم بارەی تا ڕادەیەك گۆڕیوە و پـتر هاتوچـۆ و تێکـەڵی ئـەنجام داوە، بـەڵام نووسـەرانی ئەمڕۆکـە هێشـتا هـەقی رەوای خۆیـان نەداوەتـە وشەی ئەو ناوچە جیاجیایانە.

ئێمە نەك تەنیا دەبێت سـوود لـە وشـەمەنی ناوچـەکانی کوردسـتان وەرگـرین، بەڵکو پێویستە وشـەی هـەر ئێـڵ و خێڵاتێکـی کـورد بـەکار بێـنین ئەگـەر خۆمـان نەمانبوو و زانیمان بۆ مەبەستەکەی ئێمە پڕ بەپێسـتی خۆیـەتی، تەنانـەت ئەگـەر هـەشمانبوو زیـانی بـۆ پـەز نـابێ، ئەگـەر جاروبـار، هـەر نـەبێ بـۆ رازاندنـەوەی نووسـینەکانمان وشـەی ناوچـەیەکی دیکـەی کوردسـتان بـەکار بێـنین. بـەدووری مەزانن ئەگەر بارودۆخی کوردستانی ئێراق تا ماوەیەك بـەم جـۆرە بمێنێتـەوە کـە ئەمڕۆ تیایەتی، واتا سەنگی سیاسی و ناوەندی پەیوەندیی بازرگـانی کەوتوونەتـە سەر هێڵی هـەولێر– سـەربەن –شـەقڵاوە – بادینـان – کوردسـتانی بـاکوور و لـە هێڵی حاجی ئۆمەرانیش تا دەگاتە موکریان کە خەڵکی زۆرترایەتی ئـەو ناوچـانەی کوردسـتان (ئێـراق و ئێـران و تورکیـا و سـوریا) هـەموو روو دەکەنـە هـەولێر و بەمێتروپۆلی خۆیانی دادەنێن، دەڵێم بەدووری مەزانن شێوەی سلێمانی کە ئـەمڕۆ بناغـەی زمـانی سـتانداردی سـۆرانی زارەکانـە لـە پاشـەڕۆژێکی زۆر دوورنـا، بەئەندازەیـەکی زۆر بگـۆڕێ و تێکـەڵ بـە هـی ئـەو ناوچـانە ببێـت و لەئـەنجام، شـێوەیەکی نـوێ سـەر هەڵبـدات و بـبێ بـەزمانی سـتانداردی compromise بـۆ هـەموویان وەك کـە پێشـتر ئـەزموونی بـەردەوامی شـێوەی لەنـدەن و ئـەزموونی

کورتخایەنی شێوەی Mitteleniederdeutschم وەك نموونە بۆ هێنانەوە. ئەمەیان لەلایەك.. لەلایەکی تریشەوە لەپاش وێرانکردنی دێهاتی کوردستانی ئێراق و بارکردنی جووتیاری کورد بۆ شارەکان کە ئەگەر شرووپڕ و بوزگوڕیشیان پێ رزگار نەکرابێ، خۆ زمانەکەیان (زمانی جووتیارانیان) لەگەڵ خۆدا بردووە و ئەم پرۆسەیەش بێگومان کاریگەری دەبێ لەسەر شێوەزاری زاڵ کە ئەمڕۆ شێوەزاری سلێمانییە.

رەنگبێ هەندێ لە نووسەر و شاعیرەکانمان وا بیربکەنەوە کە ئەگەر وشەیەکی ناوچەیەکی دیکەی کوردستان بەکاربێنن کە ناوچەی خۆیان نییە و ئەو وشەیە لای ئەواندا بەکار نایەت، ئەوا نووسینەکانیان ئەو تام و چێژەی نامێنێ وەك خۆیان دەیانویست و لێیان لەنگ دەبێ. وەك بڵێی ئەو وشەیە شایەستەی چوونە ناو زمانی ئەدەبی کوردییەوە نەبێ، وەك بڵێی نووسین و شیعرەکانیان تەنها بۆ ناوچەیەکی دیاریکراوی کوردستان نووسیبێ، لەبەرئەوە هەڵدەستن وشەیەك یان دەقاودەق لە عەرەبییەوە وەردەگێڕنە سەر کوردی، یان هەر خۆیان بەبێ لەبەرچاوگرتنی رێ و سیستەمی زانستی زمان وشەیەك دادەڕێژن و دەیپەستنە ناو نووسینەکانیان بۆیە ئەو نووسینانە بۆ خوێنەری کورد، بەزۆری پڕن لە گرێ و نە لەسەر زمان و نە بۆ گوێچکەش خۆشن.

بەڵام ئەمڕۆ سەردەم سەردەمی (هۆف)ی ئاڵمانی نییە کە وشەی لادێیی بەچاوێکی نزم سەیر بکرێ، ئەمڕۆ بەکارهێنانی وشەی جووتیاران کەمی نییە، سووکی نییە و نزمی نییە، بەپێچەوانەوە، شێوەزاری موکریان کە ناوەندەکەی مەهابادە و لە رووی وشەمەنی رەسەنەوە یەکێکە لە دەوڵەمەندترین شێوەزارەکانی زمانی کوردی، هەر سەبارەت بەهەندێ دەوڵەمەندە چونکە نووسەر و شاعیرانی ئەو هەرێمە بەڕادەیەکی زۆر سوود لە خەزێنەی وشەمەنی لادێی موکریان وەردەگرن، رەنگە بەشێکی هۆی ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە زۆرترایەتی هەرە زۆری نووسەر و شاعیرانی موکریان بەڕەچەڵەك لادێیین و لە لادێ ژیاون، یان بە فەقێیاتی و مەلایەتی بەناو دێهاتدا گەڕاون.

هەر خۆی ناوچەی موکریان خۆیشی تا ئەم چەند ساڵانەی دوایی شاری وا گەورەی هەر لێ نەبووە. تەواوی کۆمەڵگای ناوچەکە مەیلەو لادێییانە دەژیان و گەورەترین شاری موکریان کە مەهابادە ژمارەی دانیشتووانی لە ساڵی 1976 تەنیا 42 هەزار کەس بووە و سەرجەمی دانیشتووانی هەموو لادێی موکریانیش لە ساڵی 1975 لە سەدا 75 بووە کەچی ژمارەی شارنشینەکان تەنیا لە سەدا 25 بووە (بڕوانە: عەبدولڕەحمان قاسملو Iranian Kurdistan ل–4).

ئەڵبەت ئەمە بەپێچەوانەی شارە سۆرانە سەرەکییەکانی کوردستانی ئێراقە (سلێمانی و کەرکووک و هەولێر) کە دانیشتوانی هەر یەکێك لەمانە ئەوڕۆکە خۆی لە ملیۆنێك دەدات و زیاتریش.

### دەرەنجام

لە کورتی بیبڕمەوە، لە قۆناغی یەکەمی پرۆسەی یەکگرتنی زمانی کوردی و دانانی زمانێکی ستاندارد من هەر وای دەبینم کە لە ئێران و لە ئێراق هەموو شێوەزارەکان و بن شێوەزارەکانی dialects and sub - dialects کوردی لە نووسیندا خۆیان بخەنە ژێر چەتری شێوەزاری سلێمانی یان ئەگەر دەتەوێت دەتوانین بڵێین (سلێمانی –موکریانی)، بەمەرجێك کە ئەو زاراوایە چەترە خۆی بە وشەمەنی و ئیستیلاحاتی هەموو شێوەزار و بن شێوەزارەکانی دیکە موتربە بکات. هەروەها لە تورکیا و سوریاش هەموو زاراوا و بن زاراواکانی کرمانجی و زازاش خۆیان بخەنە ژێر چەتری زاراوای بۆتانی، چونکە پێموایە زاراوای بۆتانیش کە زمانی دواترین میرنشینی کورد، جزیرا بۆتان بووە و میرەکانی بۆتان لەپاش نەمانی فەرمانڕەواییشیان، هەر لە میقداد میدحەت بەدرخانەوە بگرە بۆ عەبدولڕەزاق بەدرخان، تا دەگاتە میر جەلادەت و میر کامەران عالی بەدرخان، ئەمانە هەموویان هەر خەریکی خزمەتکردنی زمان و ئەدەبیاتی کوردی بوون و نووسینەکانی ئەم دووانەی دواییان هەر لە سەرایی سییەکانی سەدەی رابردوو هەموو بەشێوەزاری کرمانجی بۆتانی بووە کە بەڕاستی کوردییەکی زۆر هاوچەرخی پەتی و پاراوە. هەر چۆنێکی بێت شێوەزاری بۆتانیش دەبێت خۆی بە وشە و ئیستیلاحاتی کانیاوی زوڵاڵی هەکاری و بادینان و شکاك و شێوەزارەکانی دیکەی کرمانجی موتربە بکات و جۆرە تێکەڵەیەك بێتە گۆڕێ و ببێ بەشێوەی ستانداردی کرمانجی زارەکان.

هەرچی شێوەزاری گۆرانی–زازایە، ئەمەیان وێ ناچێ پاشەڕۆژێکی رووناکی وەك سۆرانی و کرمانجی هەبێ. شێوەزاری گۆرانی کە هەورامی و زۆر ناوچە و ئێڵی کوردستان دەگرێتەوە لە سەردەمێکدا تا نەمانی میرایەتی ئەردەڵان هەر خۆی تاکە سواری مەیدانی ئەدەبی بووە لای گۆرانەکان و سۆرانەکانیش، بەڵام هەروەکو گوتمان زۆر هۆکار هەن کە پاشەکشە بە شێوەزارێك وەك شێوەزاری ستاندارد ئەنجام دەدەن و لەگەڵ رەوتی رۆژگار شێوەزارێکی دیکە شوێنەکەی دەگرێتەوە. بەم جۆرەش لەپاش نەمانی میرنشینی ئەردەڵان و دامەزراندنی میرنشینی بابان شێوەزاری سلێمانی بەرەبەرە پەرەی سەند و، وەك کە باسم کرد

بـوو بـە شـێوەزاری نووسـین بـۆ هـەموو سـۆران زارەکـان. ئەوڕۆکـە زۆرترایـەتی هەرەزۆری گۆرانەکان سۆرانی دەزانن و بەشێوەزاری گۆرانی دەستیان لە نووسـین هـەڵگرتووە، بـەڵام ئەڵبـەت قسـەی هـەر پـێ دەکـەن و فۆلکلۆرەکەشـی زۆر دەوڵەمەندە هەروەك کە یاشار کەمالیش ئاماژەی بۆ ئـەم دیاردەیـە داوە. (بڕوانـە سەرچاوەکەی پێشوو لەسەر یاشار کەمال).

میهـرداد ئیـزەدی لـەو باوەڕەدایـە کـە شـێوەزاری گـۆرانی وردەوردە لـەناو شـێوەزاری سـۆرانیدا دەتوێتـەوە (بڕوانـە سەرچـاوەی پێشـوو لەسـەر میهـرداد ئیـزەدی و هـەروەها گفتوگۆیـەکی ڕادیـۆی دەنگـی ئەمـەریکا لەگـەڵ میهـرداد ئیزەدی).

شێوەزاری زازا، کە وێ دەچێ لە دەمێکی زووتری مێژوودا شـێوەزاری گـۆرانی بووبێت و هەر لـە هـەرێمی گۆرانـەکانیش بـووبێ، بـەڵام ئـەو زازایانـەی ئـەمڕۆ لـە کوردستانی تورکیا کە خۆیان بەخۆیان دەڵێن (دیملی) ڕەنگە هەر لە هەورامانـەوە دەرچووبن و کەوتووبنەتە باکوور و لەوێ کرمانجەکان ئەم ناوی زازایەیان بەسەردا بڕیـون و ئـەوانیش بـەدەردی گـۆرانی بـاپیرە گـەورەیان چـووبن و هـەموو خوێنـدەوارەکانیان کرمـانجی دەزانـن و بـەکرمانجی دەنووسـن و زازاییەکـەش ڕاستییەکەی بۆتە تێکەڵەیـەکی زازایـی و کرمـانجی، بۆیـە باوەڕناکـەم پاشـەڕۆژی ئـەمیش لـەوەی گـۆران ڕۆشـنتربێ و دوور نییـە، لەدواییـدا هـەر لـەناو شـێوەزاری کرمانجیدا بتوێتەوە هەرچەندە کە ماوەیەکە زازا زارەکان وەخۆ کەوتوون، ڕۆژنامە و فەرهەنگ و کاسێتی گـۆرانی بـە زازایـی لەچـاپ دەدەن و تۆمـار دەکـەن، بـەڵام هەروەك کە لە مێژووی زمانەکانی دیکەی دنیا کە چـەند نموونەیـەکم بـۆ هێنانـەوە دەردەکـەوێ، لـەوە ناچـێت شـێوەزاری سـێیەم کـە بـە شـێوەزاری گـۆرانی—زازا ناسێنراوە، بتـوانێ خـۆی لەبـەر کـارتێکردنی سـۆرانی و کرمـانجی ڕاگرێـت و وەك شـێوەزارێکی نووسـین بـبێ بەسـتانداردی سـێیەم. نـەك هـەر زازا و گـۆرانی بگـرە هەموو بن شێوەزارەکانی دیکەی ئەم دوو زاراوایە و هەروەها زاراوای لـوڕ و لـەك و کـەڵهوڕ و ئیـدی کـەش ئەوانـەش باوەڕناکـەم پاشـەڕۆژێکی وایـان ببـێ بـبن بـە ستانداردێکی چوارەم بۆ زمانی کوردی.

جا بۆ ئەوەی سەر لەخۆمان نەشێوێنین و دەستەوئەژنۆ و داماو دانەنیشین و سەری خۆمان هەڵنەکڕێنین، واچاکە جارێ (دیسان هەڵوەستەیەك لەسەر وشەی جارێ دەکەم) دەسبەرداری خەیاڵی (یەك کوردستانی یەکگرتووی گەورە و یەك زمانی ستاندارد بۆ ئەو کوردستانە یەك پارچەیە) ببین. دوو (کوردستانی زمانیی) یان (دوو زۆنی زمانیی) و دوو ستاندارد هەریەکە بۆ زۆنێك باشترین و گونجاوترین ڕێگاچارەیە بۆ ئەمڕۆ، دەڵێم بۆ ئەمڕۆ، خوا دەزانێ لەپاشەڕۆژدا شت چۆن دەڕوات.

سۆرانی وا (بەپرۆسەیەکی مێژوویی نەك بەبڕیاری سیاسی) بۆتە ستانداردی کوردی ئێراق بە هەورامی و بادینانی و فەیلی و خانەقینیشیەوە هەروەها بووەتە ستانداردی کوردی ئێرانیش بە موکریانی و کەڵهوڕی و لەکی و لوڕی و شکاکیشەوە. کرمانجی بۆتانیش (بە پرۆسەیەکی مێژوویی نەك بەبڕیاری سیاسی) ئەویش وا بۆتە ستانداردی کوردی تورکیا و سوریا بە زازایی و زاراوایەکانی دیکەشەوە.

لێرەدا بادینییەکانی کوردستانی ئێراق و کرمانجی زارەکانی کوردستانی ئێران (شکاکی) کە پەراوێز دەکرێن هیچ زیانێك بە دیالێکتەکەیان ناگات چونکە هەم سۆرانییەکە فێر دەبن هەم کرمانجی خۆشیان بۆ دەمێنێتەوە کە لە سوریا و تورکیا قسەی پێ دەکرێت واتا لە دوولاوە قازانج دەکەن و بە دوو ستاندارد کێشەیان نابێ. ڕەنگە ئەوان ئەم قسانەیان بەدڵ نەبێ، بەڵام توخوا وەرن وەرامی ئەم پرسیارەم بدەنەوە: ئەگەر سبەینێ حکومەتی عیراق لە بەغدا داوای لە کورد کرد پارەو پاسپۆرتی ئێراقی بە عەرەبی و بە کوردی لەسەریدا بنووسرێ، ئێمە دەبێ چی بکەین، دوو لەهجەیان بۆ بنێرین؟ سۆرانی و بادینانی؟ ئەمە ئابڕوو بردنی زمانەکەی خۆمان نابێ؟ هەروەها ئەوانەی کە بەرهەڵستی ئەم پرۆسە مێژووییە دەکەن دەبێ ڕووبەڕووی پرسیارێکی دیکەش ببنەوە: بۆچی عەرەبی فێردەبن و لەوانەیە زۆر لە عەرەبیش باشتری فێربن، بەڵام لەهجەیەکی دیکەی زمانی خۆیان نەخوێنن کە زۆر بەئاسانی ڕەوانی دەکەن؟

ڕەنگە ئەم قسانەم بەدڵی کوردێکی ناسیۆنالیستی بەعاتیفە ناسیۆنالیستیش نەبێ کە چۆن وا ((بە بێ شەرم)) دەڵێم دەبێ دەست لە کوردستانێکی

یەکگرتووی گەورە بەردەین. کاکە من خۆیشم ناسیۆنالیستم، بەلاّم ئەمڕۆ بە تێگەیشتنی خۆم ناسیۆنالیستێکی زیاتر ڕێئالیست (واقیعی)م نەك عاتیفی. منیش لە بەرایی خەباتی کوردایەتیمدا بەقۆناغی ناسیۆنالیزمی ڕۆمانتیکیدا ڕەت بوویم کە نەخشەیەکی گەورەی کوردستانەکەی بەدرخانەکانم لەسەر دیواری ناو ماڵەکەم هەڵواسیبوو، نەخشەیەك کە سەرێکی دەریای ناوەڕاستی دەگرتەوە و سەرێکیشی کەنداوی فارس (ئای کە خەیاڵێکی خۆش بوو ئەوساکە ! !) وەك خەیاڵی عەرەبەکان کە دەیانگوت (دولة عربية واحدة من المحيط الهادر الى الخليج الثائر). بەلاّم ئەدی نابێ پیاو لەگەڵ ڕەوتی ژیانیدا شتی نوێ فێرببێت و سوود لە ئەزموونی سەرکەوتوو و شکست خواردووی گەلانی دنیا وەرگرێت؟

مخابن ئەو ناسیۆنالیستە عاتفییانە بێ ئەوەی خۆیان هەستی پێ بکەن، گورزێکی گەورە لە خودی ئەو ناسیۆنالیزمە دەدەن کە خۆیان باوەڕیان پێیەتی، چونکە نکۆڵی لە ئەنجامی ئەو پرۆسە مێژووییە دەکەن کە هەموو کوردێك بەپەرۆشەوە چاوەڕوانیەتی. لەوانەیە ئەگەر واقیعبین بین بگەین بە شتێك، بەلاّم بێگومان بە عاتیفە ناگەین بە هیچ. کوردی کرمانجیش وەك کە فەرات جەوەری دەڵێ تازە لە (ڕێنێسانس)یەتی ڕێنێسانسیش بە فرەنسەیی واتا سەرلەنوێ لەدایکبوونەوەوە و لە خەو هەڵسان. باوەڕناکەم یەکێك تازە لەدایك بووبێ یان تازە لە خەو هەڵسابێ بتوانێت وا بەزوویی بگات بە کاروانێکی لەمێژە بەڕێوە. شێوەزاری سۆرانی بە پرۆسەیەکی مێژوویی خۆی فەرز کردووە و پێویستە دەسەلاّتی سیاسیش بڕیاری لەسەر بدات و مۆری بکات و کۆتایی بەو مشتومڕە بێنێ.

## سەرچاوە

بۆ نووسینی ئەم وتارە سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرتووە:

1- Adrian Akmajian
Richard A. Demers Linguistics
Robert M. Harnish
Publisher: Cambridge, Mass. MIT Press 1987 U.S.A.
2- William Bennett H. An Introduction of the Gothic Language.
New York: Modern language Association of America 1980.
3- Oskar Mann, Die Mundart der Mukri Kurden, Berlin, G. Reimer 1906.
4- C. M. Millward, A biography of English language.
Harcourt Press 1996. 2nd edition U.S.A.
5- Hugo Moser, Annalen der deustschen Sprache.
J.B. Metzlersche, Stuttgart 1968.
6- Ludwig Erich Schmitt, Kurzer Grundriss der germanischen Philologie bis 1500.
Walter de Gruyter Inc. Berlin 1970.
7- Peter von Polenz, Geschichte der deutschen Sprache.
Walter de Gruyter Inc. Berlin 1978.

8- John T. Waterman, A History of German language.
University of Washington Press, Seatle, WA., U.S.A 1976.
9- Izadi Mehrdad, A Kurdish Lingua Franca (in, Kurdish Times Vol. 2, No. 2, Summer 1988).
10- Abdul Rahman Kassemlou, Iranian Kurdistan.

(ساڵ و شوێنی چاپم لەبەر دەست نییە)

11- Kurdish Magazines “Nu bihar” (No. 8, year 1, May 1993).

12- Kurdish News Papers “Welat” (No. 57, 63, year 2, 1993).

١٣- مسعود محمد: لسان الكرد، مطبعة الحوادث بغداد ١٩٨٧.
١٤- رۆژنامەی (ولاتێ مە) ئەستەمبۆڵ ژمارە (٥) ١٨ – ١٩٩٤/١٢/٢٤. (هەڤ پەیڤینەك دگەل یاشار کەمال).
١٥- رۆژنامەی (بارزان) هەولێر، ژمارەکانی مانگی ٨ی ٢٠٠٨ .
١٦- زۆر گوتار و بیر و رای دیکەش لەسەر زمانی کوردی.

## ملخص البحث

**ولادة اللغة الفصحى الكردية**

من الآثار المترتبة على تجزأة ارض كردستان بين عدد من دول منطقة الشرق الأوسط، تشعب اللغة الكردية وظهور لهجات عديدة فيها. وبسبب طبيعة الجغرافيا في كردستان الجبلية في معظم أجزائها، لم ينشأ ترابط وتلاحم بين أجزائها، خاصة بين تلك التي تقع ضمن الحدود السياسية لتلك الدول. لذلك لم تظهر لغة كردية فصحى معتمدة في الكتابة في الدوائر الرسمية وفي التعليم والإعلام في جميع أجزاء كردستان.

وحاول عدد من المختصين في اللغة الكردية خلق لغة كردية موحدة تكون مفهومة في جميع أجزاء كردستان وتصبح لغة رسمية في الأقطار التي تسمح باستعمال اللغة الكردية فيها. إن هذه المحاولة ثبت علميا عدم جدواها بسبب بسيط، هو عدم وجود وحدة سياسية بين اجزاء كردستان، بل أن استعمال وتداول اللغة الكردية كان من الممنوعات في معظم الدول التي تتقاسم ارض كردستان. توجد بين اللهجات الكردية لهجتان رئيسيتان هما، لهجة كرمانجي الشمالي ولهجة كرمانجي الجنوبي، والمعروفة أيضا (بسوراني) والتي أصبحت منذ زمن بعيد وعبر عملية تاريخية طويلة الأمد، لغة الكتابة الرسمية والأدب والقلم في كل من كردستان العراق وكردستان إيران. ونتيجة عدم استعمال اللهجات الأخرى على نطاق واسع في هاتين المنطقتين من كردستان، ترتب على ذلك عدم انتشارها إلا على نطاق محدود. إن اللهجة الأخرى الثانية الأكثر انتشارا، أي لهجة كرمانجى الشمالي، التي اصبحت هي ايضا عبر عملية تاريخية طويلة الأمد لغة الكتابة والأدب في المناطق التي يقطنها الكرد في كل من تركيا وسوريا. ونقترح اعتراف الكرد الذين لديهم لهجة اقل استعمالا في تلك المناطق عدم استعمالها الا في المجالات الضرورية، مع المحافظة عليها في أدبياتهم الشعبية وتراثهم.

إن هذا البحث يقترح عدم ربط فكرة توحيد اللغة الكردية بمسألة إقامة دولة (كردستان الكبرى)، أو ايجاد لغة واحدة لوحدة سياسية لا وجود لها على ارض الواقع، ولا يمكن التكهن بتحقيقها في المستقبل القريب على اقل تقدير. إن الواقعية تستوجب الاعتراف بوجود لهجتين رئيسيتين، تصبح إحداهما لغة فصحى في منطقة (كردستان سوراني)، والأخرى تصبح لغة فصحى في (كردستان كرمانجي)، لانهما فرضتا تواجدهما عبر عملية تاريخية طويلة الأمد، ويتوجب على الجميع الإقرار بهذا الواقع ولو كان مريرا بالنسبة للبعض.

# Abstract

## The Process of the Birth of a standard Language
## The Sorani Case

As Kurdistan is divided among several nations in the Middle East, the language of the Kurds is accordingly divided on several dialects and sub-dialects. Today, the Kurdish language lacks a unified, solid standard that can be used officially in education, administration and media in all four parts of the "greater Kurdistan." Many attempts have been made in vain by Kurdish linguists to create such a standard.

This paper deals with the issue from a different perspective. It highlights the misguided approach which insists on creating a standard Kurdish language for a political entity "greater Kurdistan". This entity does not exist on any political map of the world. It exists only in the minds and dreams of Kurdish romantic nationalists.

This essay suggests that two linguistic zones should be recognized. The Sorani dialect has become the standard Kurdish in both Iraq and Iran through a long historical process therefore it should be officially recognized as the standard dialect for Iraqi and Iranian Kurds. All other Kurdish vernacular spoken in Iraq and Iran should submit to and recognize this standard Kurdish, the Sorani, while maintaining and promoting their literature and folklore in their own vernacular.

Likewise, the Kurmanji dialect has become the standard Kurdish in Turkey and Syria, also through a long historical process. Thus this dialect should be officially recognized as the standard Kurdish for Turkey and Syrian Kurds. All other Kurdish vernacular spoken in these two countries should recognize the Kurmanji as the official standard while maintaining and promoting their literature and folklore in their own vernacular.

In conclusion, this paper suggests that the Kurds should not base such a serious issue on dreams, a dream of a greater Kurdistan with one single, unified standard. It is more realistic, to distance science from the emotions of nationalism and accept the two principal dialects for a "Sorani Kurdistan" and a "Kurmanji Kurdistan". This approach should not be dismissed just because it does not please the nationalists and/or provincialists who refuse to recognize an already existing standard. Disregarding these dialects is detrimental to the very nationalism they believe in.

# زمانی ڕاگەیاندن
# لەدوای پڕۆسەی ئازادکردنی عیراق

## توێژینەوەیەکی وەسفییە بۆ زمانی دەقی نووسراو و پەخشکراوی ئامرازەکانی ڕاگەیاندن لە هەرێمی کوردستان (٢٠٠٥- ٢٠٠٧)، خەبات، ktv. بە نموونە

د. ئاریانا ئیبراهیم محەمەد
زانکۆی سەلاحەدین/کۆلێژی ئەدەبیات/بەشی ڕاگەیاندن

**پێشەکی :**

زمان جێگەی بایەخپێدانی گشت بوارەکانی هزری مرۆڤایەتییە، بەوەی وەک سیستەمێکی گشتی لەلایەن تاکەکانی کۆمەڵگا پەیڕەو دەکرێت بۆ دەربڕین لە ناخ و بیر و هزر و ئارەزووەکانیان، بەلام سەبارەت بە رۆڵی کارایەیی لە بوارە مەبەستدارەکاندا بیروڕای جیاوازی لەبارەیەوە هەیە، جارێک وەک ئامرازێکی دەربڕین بۆ ئەنجامدانی کاریگەری بەسەر وەرگرەوە بەکاردێت و جارێک وەک ئامرازێکی گەیاندن بۆ گواستنەوەی بیروڕا و زانیارییەکان و جارێکیش وەک مەترپیالێك بۆ ئەنجامدانی پەیوەندیکردن لەنێو تاکەکاندا بەکاردێت، ئەمانەش بەگشتی کرۆکی ئامانجی زمانی ڕاگەیاندنە. زمان بەرهەمی کۆمەڵگایە و لە ئەنجامی ژیانێکی کۆمەڵی دێتەوە دی کە تاکەکانی کۆمەڵگە لە ڕێگای فێربوون وەریدەگرن، زمانی ڕاگەیاندنیش لەو سیستەمە ڕێکخراوەییە بەدەر نییە و پەیوەستە بە کۆمەڵگاکەیەوە، چونکە گەر ڕێڕەوێکی جیاوازی لە پێڕەوە گشتییەکەیدا گرتەبەر دەبێتە هۆی ڕەتکردنەوەی لەلایەن گشتی خەڵکەوە، کەواتە زمانی ڕاگەیاندن و زانستی زمان پەیوەستن بە یەکترەوە و پەیوەندییەکی

کاریگـەری و کاریگـەربوون (ئاڵوگۆڕیـان) هەیـە و بەیەکـەوە دەبەسـترێنەوە، کـە پەیوەندییـەکی (پەرەپێدان و نەشـونمابوون)ی زمانـە، چـونکە زمـانی ڕاگەیانـدن کاتێك کـە زاراوەکـانی پەسـەندتر و فـراوانتر دەکـات و دانـە زمانییـەکانی ڕەوانـتر دەکـات بـۆ هێنانـەدی زاراوە و وشـەی نـوێ و پشـتگیری لـە تایبەتمەندییـەکانی زمانەکـەی بکـات لـە ئاسـانی و ئاشـکرایی و نزیکبوونـەوەی لـە زمـانی واقیعـی و زیندووییەکەی بێئەوەی لە ئاستی زمانەکەی نـزم بکاتـەوە وەك ئـەوەی لـە زمانـە ئاسـاییەکەی خـەڵکی سـادەدا دەردەکـەوێت بـەهۆی سـوود وەرگرتنـی لەزانسـتی زماندا دێتەوە دی. هەروەها بەکارهێنانی زمانی پراکتێکی ڕۆژانە کە گوزارشـت لـە زیندوویی ژیان و جووڵانەوە و کارکردن و داهێناندا دەکات کاریگەری ڕاسـتەقینەی زمانی ڕاگەیانـدن دەردەخـات. لـە هەمانکاتـدا زانسـتی زمـانیش سـوود لـە زمـانی ڕاگەیاندن وەردەگرێت، بەوەی هۆکارەکانی ڕاگەیانـدن بەشـداری لـە گەشـەپێدانی زۆر لە وشە و زاراوەکاندا دەکەن کە پێشتر لەنێو زمانەکەدا نەبوون یـان وازهێنـان لە هەندێ وشە کە ئێستا بـەکارنایێن، چـونکە ئامرازەکـانی ڕاگەیانـدن یەکێکـە لـە فاکترە گرنگەکانی پەرەپێدانی وشە لەنێو زماندا، وەك پێویستییەکی سەردەم بـۆ ناونانی داهێنانێکی کۆمەڵیی نوێ، چ پێڕەوێکی کۆمەڵایەتی بێت یان ئابووری بێت یان تیۆرێکی زانستی نوێ یان فەلسەفی یان بەرهەمهێنانی بابـەتێکی نـوێی بێـت، بەم شێوەیە گرنگی زمانی ڕاگەیانـدن لـە پەیوەنـدی بـە زانسـتی زمانـەوە لـەوەدا دەردەکەوێت کە هۆکاری سەرەکی بۆ ئاڵوگۆڕکردن و گەشەسەندنی زمانە لەلایـەك و کاریگەری بەسەر بیروڕای خەڵکی بۆ دروسـتکردنی ڕای گشـتی لەلایـەکی تـرەوە بۆیە بەپێویسـتمان زانـی ئـەم توێژینەوەیـە (زمـانی ڕاگەیانـدن لـە دوای پرۆسـەی ئازادیکردنی عێراق، بۆ دەقی نووسـراو و پەخشـکراوی ئامرازەکـانی ڕاگەیانـدن لـە هەرێمی کوردستان (٢٠٠٥–٢٠٠٧) خەبات، .ktv بەنموونە) بەپێی ڕێبـازی وەسـفی ئامادەبکەین و بخەینە بەردەستی خوێنەران بەئامانجی سوود لێوەرگرتنی.

بەگشـتی ئـەم لێکۆڵینەوەیـە بریتییـە لـە پێشـەکی و سـێ تـەوەر و لیسـتی سەرچاوەکان، لە تەوەری یەکەمدا کـە بەناونیشـانی (چـەمکی زمـانی ڕاگەیانـدن و تایبەتمەندییەکانی)، ئەم باشانەی لەخۆگرتووە: (أ– چەمك و پێناسـەی زاراوەیـی زمـان، ب– تایبەتمەندییـەکانی زمـانی ڕاگەیانـدن، پ– سیسـتەمی گەیانـدن و

ئەركــەكانى زمــان، ت– ئەركــەكانى زمــانى ڕاگەيانــدن، ج– ئاســتەكانى زمــانى ڕاگەياندن (دانە واتاييەكان)، كە بەشێوەيەكى گشتى تيشك خراوەتەوە سەر زمان و گرنگترين تايبەتمەند و ئـەرك و ئاسـتەكانى. لەتـەوەرى دووەمـدا بـە ناونيشـانى (شێوازى نووسينى بابەتـە پەخشـكراوەكان و شـيانى نووسـەرەكە)، بريتييـە لـەم باسانە: (يەكەم: شێوازى دەقى پەخشكراو (أ– تايبەتمەندييەكانى شێوازى دەقـى پەخشـكراو، ب– مەرجـەكانى نووسـينى دەقـى پەخشـكراو)، دووەم: نووسـەرى بابەتـــە پەخشـــكراوەكان، (أ– نـــاوى نووســـەرى بابەتـــە پەخشـــكراوەكان، ب– مەرجەكانى سەركەوتنى نووسەرى بابەتە پەخشكراوەكان)، سێيەم: پێكهاتـەكانى زمـانى ڕاديـۆ و تەلـەفزيۆن، (أ– وشـەى گـوتراو، ب– مۆسـيقا، پ– كاريگەرييـە دەنگييــەكان، ت– لەقــەتات –گرتــەكان)، چــوارەم: زمــانى هــەواڵ لــە ڕاديــۆ و تەلەفزيۆنــدا، (أ– بنــەماكانى نووســينى هــەواڵى پەخشــكراو، ب– بەشــەكانى نووسينى هەواڵى پەخشـكراو، پ– پێشكەشـكردنى هەواڵـەكان (دەنگوباسـەكان)، ت– هــەواڵ لــە تەلەفزيۆنــدا)، تيايــدا بــاس لــە زمــانى ڕاگەيانــدن و گــرنگترين پێكهاتەكانى دەكات هەروەها باسى زمانى هەواڵ لە ڕاديـۆ و تەلـەفزيۆن دەكـات. لەتــەوەرى ســێيەمدا بــە ناونيشــانى (زمــانى ڕۆژنامەگــەرى و شــێوازەكانى)، ئــەم باشانەى لە خـۆ گرتـووە: (أ– نووسـينى ڕۆژنامەگـەرى (ئيدێتـەر– التحريـر) وەك لايەنێكى زمانەوانى، ب– ئامانجى (ئيديت) نووسينى ڕۆژنامەگەرى (التحريـر)، پ– شـــێوازى ڕۆژنامەگەرى(الاســـلوب الصـــحفى)، ت– هـــەنگاوەكانى نووســـين و ئامــادەكردنى دەقــى ڕۆژنامەگــەرى ئيــديت، ج– زمــانى ڕاگەيانــدن و شــێوازى نووسينەوە لە كوردستان) بەتێروتەسەلى باس لە زمانى ڕۆژنامەگەريدا دەكات.

## تەوەری یەکەم: چەمکی زمانی ڕاگەیاندن و تایبەتمەندییەکانی

**أ- چەمك و پێناسەی زاراوەیی زمان:** سەرەتا ئەگەر سەرنج بدەینە دەستەواژەی (زمانی راگەیاندن) تێبینی دەکەین کە لە دوو زاراوە پێکهاتووە (زمان + راگەیاندن)، زاراوەی یەکەم (زمان) لەلایەن زمانەوانان و شارەزایانی بواری زمانەوانی لێکۆڵینەوەی زۆری لەسەر کراوە و بەزۆر زمانی جیاواز وەك (کوردی، عەرەبی و ئینگلیزی)ی ناوبراوە، وەك: (زمان، زمانی، زمانەوانی، لغة، لغوي، لسان، language، linguistic) کە تا ئێستاش چەندین واتا و ئاماژە و مەبەستی جۆراوجۆری لەخۆ گرتووە. واتا زاراوەیی و زمانەوانییەکەی زۆر دوورودرێژە پەیوەستە بە بواری زمانییەوە، بەڵام لێرەدا دەتوانین بەکورتی بڵێین (زمان) ئەو ئامرازە یان کەرستە یان هۆکارەیە کە لەڕێگەیەوە زانیاری و بیروڕاکان دەگوازرێتەوە، جا بەشێوەی (هێما، یان وێنە، یان دەنگ، یان پیت یان هەر شێوەیەکی تر بێت)، لە ڕووی واتاییشەوە چەمکەکە واتای زیاتر هەڵدەگرێت و مانای جۆراوجۆر دەبەخشێت چونکە زمان و ئاخاوتن (اللغة والكلام) بەپێی ڕا و بۆچوونی زانای زمانەوانی ناسراو (فردیناند دیسۆسێر ١٨٥٧-١٩١٣) لەکتێبەکەی (زانستی گشتی زمان)دا کە بنەما زمانەوانییەکانی خستۆتە ڕوو، بەلای سۆسێرەوە لە هەموو زمانێکدا وێنەیەکی (دووانەیی-مزدوج) بەرچاو دەکەوێت: ((زمان لە هەموو حاڵەتەکانیدا دوو لایەنی سەرەکی تێدا دەردەکەوێت، هەر یەکە بایەخ و گرنگیی خۆی هەیە))[1]. واتە زمان دوو شێوازی جیاواز لەخۆ دەگرێت یەکێکیان واقعییە و ئەویتر هزرییە، ئەوەی یەکەم بە ئاخاوتن ناونراوە و ئەوی دووەمیش بە زمانی ناوبردووە، واتە لە ڕووی زمانەوانییەوە (زمان و ئاخاوتن-اللغة والكلام) دوولایەنی سەرەکی بوونی زمانن و لەم ڕووەوە کۆمەڵە (دووالیزم - ثنائیات)ی لێ دەبێتەوەو لەنێو زانستی زمان لە نێوان (زمان و ئاخاوتن)دا جیادەکرێنەوە. بەمشێوەیە سۆسێر ئاخاوتن بەو کۆمەڵە دەنگانە کە لەلایەن مرۆڤەوە دەردەبڕێن دادەنێت، بەڵام زمان بریتییە لەو کۆمەڵە وێنە فیکریانەی کە لە مێشکی کۆمەڵە کەسانێکدا چەسپاون و بەشێوەی ئاخاوتن دێنە دەرەوە، دووالیزمەکانیش بەم شێوەیە دەبن :

**دەنگەكان** .............................. **ئامێری قسەكردن**

**لایەنی فسیۆلۆژی** ....................... **لایەنی سایكۆلۆژی**

**لایەنی تاك** ............................... **لایەنی كۆمەڵایەتی**

**سیستەمی چەسپاو** ....................... **پرۆسەی گەشەكردن**

**سیستەمی رابردوو** ....................... **سیستەمی رانەبردوو**

**دال (ئاماژەگەر)** ............................ **مدلول (ئاماژەپێكراو)**

هەروەها وێنەی بیریش دوو شێوازی هەیە: وێنەی زاراوەیی، واتە چۆنیەتی گوتن (زاراوە) و وێنەی ئاماژەپێكراو واتە تێگەیشتن لە واتای گوتنەكە (الدلالة)، كۆی ئەم دوو وێنەیەش بەهێمای زمانی ناودەبرێت، وەك لەم وێنەیەی خوارەوە دەردەكەوێت:




دەكرێ لێرەدا چەند جیاوازییەك لەنێوان ئاخاوتن و زمان لەم خاڵانەی خوارەوەدا دەستنیشان بكەین [٢]:

١- ئاخاوتن پەیوەستە بەزمانەوە و لەئەنجامی بەكارهێنانی زمانەكەوە دێتە دی، دەكرێ ئاخاوتن بەجۆرێك لە شێواز یان رۆنانی زمانێكی دیاركراودا بێت.

٢- زمان واقعێكی كۆمەڵایەتییە، بەڵام ئاخاوتن كارێكی تاكە كەسییە و گۆڕاوە.

٣- زمان بەرهەمێكی مرۆڤایەتییە مرۆڤ وەریدەگرێت، بەڵام ئاخاوتن كارێكی خۆییە پەیوەستە بەتاكە كەسەكەوە.

٤- زمان لەكاری ئاخاوتندا بەشێكی كۆمەڵایەتیە، چونكە لەدەرەوەی دەسەڵاتی مرۆڤدایە و لەتوانایدا نییە بگۆڕێت، كە دواتر توانرا بەشێوەیەكی سەربەخۆ لێبكۆڵرێتەوە.

٥- لەبەرئەوەی زمان دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە و ئاخاوتن تاکە کەسییە، بۆیە ئالییەتی پێویست بۆ شیکردنەوەی پێکهاتەکانی زمان لەلای هەموو تاکەکانی کۆمەڵگا یەکە.

ئەگەر سەیری هەردوو شێوازی زمان (زمانی گوتراو زمانی نووسراو (اللغة المنطوقة واللغة المكتوبة) )، کە زانای زمانەوانی سویسری دیسۆسێر سەبارەت بەزمانی ئاخاوتن و زمانی نووسین، پەیوەندیکردنی گوتەیی (واژەیی) (الاتصال اللفظي) لەدوو شێوەی جیاوازدا دەخاتەڕوو، یەکێکیان شێوەی گوتراو یان زمانی قسەکردن و ئەویتریان شێوەی نووسراو، یان زمانی نووسین. لەوانەیە بۆ پرۆسەی پەیوەندیکردن زمانی گوتراو لە ڕووی گرنگی لە زمانی نووسیندا لەپێشتر بێت هەروا فراوانترە، چونکە لەلای مرۆڤی ئاسایی قسەکردن لە بەرهەمی نووسین زۆرترە، هەرچەند زمانی نووسین خۆی شێوەیەکە لەنواندنی زمانی قسەکردن، بەلاّم نووسین سنووردارە و قسەکردن فراوانە، بۆیە زانایانی زمانەوانی لەسەرەتاوە زیاتر بایەخیان بەزمانی قسەکردن داوە، بەبێ ئەوەی زمانی نووسین فەرامۆش بکەن. لەلایەکی تر زمانی قسەکردن لەپێش نووسیندا بەهەزارەها ساڵە، بۆیە زمانەوانان سەرەتا ئاوڕیان لەزمانی قسەکردن دایەوە، هەروەها جێگەی بایەخپێدانیان بووە کەچی بایەخدان بە زمانی نووسین دەگەڕێتەوە بۆ دوو خاڵ[٣]:

١-توانای گواستنەوەی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر لەنێو سنوورێکی زۆر فراواندا.

٢-ئەم زمانە تاڕادەیەك نەگۆڕە و ڕووبەڕووی گۆڕان نابێت، وەك ئەوەی لە زمانی قسەکردندا دەبینرێت .

هەرچەندە شارەزایانی بواری زمانەوانی نووسینیان بە هەوڵێك لە نواندنی زمانی قسەکردندا داناوە، بەلاّم لەگەڵ باری پێشکەوتنی زمانی نووسین کاریگەریی بەسەر زمانی قسەکردنیشدا هەبووە. شیکردنەوەی پەیوەندیی نێوان قسەکردن و نووسین کارێکی ئاسان نییە چونکە لەزۆر شتدا هاوبەش نین و لە شتی دیکەدا هاوبەشن، بەلاّم بەگشتی دەتوانین بڵێین زمان دوو شێوەی جیاوازی هەیە، گوتراو و نووسراو، لەزۆر شتیشدا لێکچوونیان هەیە بەلاّم هەر یەکە و جیاوازە لەوەیتر و

تایبەتمەندی خۆی هەیە، هەروەها هەرچەند پەیوەندییە کۆمەلأیەتییەکان فراوانتر و ئالۆزتر بێت، زمانیش بەهەمان شێوە فراوانی و ئالۆزی بەخۆیەوە دەبینێت و چەندین لقوپۆپی لێ دەبێتەوە.

دووەم زاراوە (ڕاگەیاندن)ە کە بۆ ئاماژەکردن بەواتای ڕاگەیاندن دێت و بەچەند زمانێکی جیاواز ناونراوە کە تا ئێستا واتایەکی ورد و دیارکراوی بۆ دانەنراوە، بەلأم هەولدەدەین واتا زاراوەیی و زمانەوانییەکەی بەدەست بخەین. لە زمانی کوردیدا لە ڕووی زمانەوانییەوە وشەی (ڕاگەیاندن) لەدوو بەش پێکدێت، ئەویش مۆرفیمی بەندی (ڕا) و چاوگی (گەیاندن) بەمەبەستی (گەیاندنی ڕا و بۆچوون) دێت، بەیەکەوەش واتای پێڕاگەیاندنی زانیاری یان هەوالأ دەگەیەنن، لە کەسێك یان لایەنێك بۆ کەسێك یان لایەنێکی دیکەدا، بەپێی ئەمە ڕاگەیاندن لە ڕووی زمانەوانییەوە وەکو زاراوەیەکی جیهانی واتای (پێ ڕاگەیاندنی زانیارییەکان) دەگەیەنێت، ئەمەش زیاتر لە عەرەبییەوە وەرگیراوە، کە لە وشەی (اعلام)ەوە هاتووە[٤]. لە زمانی ئینگلیزیشدا کە بە زاراوەی (Media) ناودەبەن، لە بنەڕەتدا لە وشەی (Median)ەوە هاتووە و بە واتای پێناو (الوسیط) یان ناوبەند دێت، کە مەبەستی ناوەڕاست یان ناوەند دەگەیێنێت و لەنێوان دوو شت یان دوو لایەن دەبێت، لێرەدا چەمکی ڕاگەیاندن دوو پرۆسە دیار دەکات کە هەردووکیان تەواوکەری یەکترن لە ڕووی زاراوەییەوە شێوەیەکە لە شێوەکانی پرۆسەی پەیوەندیکردن یان بەیەکگەیشتن (Communication) لەلایەکی تریش پرۆسەی گەیشتن بەزانیاری (Information)، و گەیاندنی ئەو زانیارییانە بەجەماوەر، کە ئەم زانیاریانە تەنیا بەهۆی ڕاگەیاندن یاخود کەرەستەکان یان ئامرازەکانی ڕاگەیاندن (Mass-Media)ەوە دێنەدی، ئەوانەش کۆمەلە ئامێر و ئامرازن، وەك: (ڕۆژنامە و گۆڤار– ڕادیۆ و تەلەفزیۆن – هۆکارە ئەلیکترۆنییەکان دیکە)، هەروەها ئەو زانیارییانەی لەماوەیەکی کورتدا و بەخێراییەکی زۆر لە ڕێگەی ئەم کەنالأنە بە جەماوەر دەگەیەنرێن[٥]. ئەگەر سەرنج بدەین بۆ گشت زاراوە ئاماژەپێکراوەکان بۆ مەبەستی (گەیاندن)، تێبینی دەکەین کە وشەی میدیا لە وشەی (ڕاگەیاندن)دا ڕاستترە چونکە ئەمە مەبەستی ئامرازەکە دەگەیێنێت کە تەنها پێناوە واتە (وسیط)ە لەنێوان دوو شت بۆ گەیاندنی زانیارییەکان نەك

زانیارییـەکان خـۆی، کەچـی ڕاگەیانـدن کـە لـە وشـەی (اعـلام)ی عەرەبییـەوە وەرگیراوە مەبەستی پێی ڕاگەیاندنی زانیارییەك، ئەمەش ئاماژە بەئامرازەکە خۆی ناکات وەك (ڕۆژنامە و گۆڤار و ڕادیۆ و تەلەفزیۆن)، بۆیـە زاراوەی یەکـەم بـۆ ئـەم چەمکە لە زمانی کوردیدا ڕاستترە.

ڕاگەیاندن چـەمکێکی زۆر ئـاڵۆزە هـەروەك لـەناو زاناکانـدا مشـتومڕێکی زۆری لەسەرە، لە بارەی دیارکردنی چـەمکی ڕاگەیانـدن و پڕۆسـەی ڕاگەیانـدن، چـونکە ڕاگەیاندن کۆمەڵە واتای جۆراوجۆر خراوەتـە پـاڵ چـەمکەکەوە کـە لەگـەڵ ئـەقڵی جـەماوەر و هەسـت و سـۆزە بـەرزەکانیان دەدوێـت و لەسـەر بنـەمای گفتوگـۆ و وتووێژ و بڕواپێهێنانیان دامەزراوە، بۆیە دەبێ پڕۆسەی ڕاگەیاندن هەردوو توخمی ئەمانەت و بابەتیبون لەخۆ بگرێت کە دوو سیفەتی سەرەکی بێت، بەڵام دەتـوانین بەچەندین شێوەی جیاواز چەمکی ڕاگەیاندن دەستنیشان بکـەین، کـە لـەدیارترین چەمك و پێناسەکانی لەمانەی خوارەوە دەردەکەوێت(٦):

١- ڕاگەیاندن گواستنەوەی زانیاری و هەواڵ بەشێوەیەکی بابەتییانە.

٢- ڕاگەیانـدن ئـەو پەیوەندییـەی نێـوان تـاك و جـەماوەر دەبەسـتێتەوە بـۆ مەبەستێکی تایبەت.

٣- ڕاگەیاندن دەربڕینێکی بابەتییانەیە بۆ ئەقڵ و ڕۆح و مەیل و ئاڕاسـتەکانی جەماوەر لەیەك کاتدا.

٤- ڕاگەیاندن زانسـتێکە هـەوڵی دروسـتکردنی کاریگـەری لـە بـیروڕای کەسـی بەرامبەر دەدات و ڕای گشتی دەگۆڕێت.

٥- ڕاگەیانـدن پێـدانی هـەواڵی ڕاسـت و زانیـاری دروسـت و بـیرو بۆچـوونی جیاواز، بەهۆی شێوازە جیاجیاکانییەوە وەك: (ڕۆژنامەکان، رادیۆ و تەلـەفزیۆن و هۆکارەکانی تری ڕاگەیاندن)، تا یارمەتییان بدات بۆ دروستکردنی ڕایەکی دروست لەبارەی یەکێك لە ڕووداوەکان یاخود گرفتێك لە گرفتەکاندا، یاخود بڵاوکردنەوەی ڕاسـتی یـان هەنـدێجار لـە ڕێگایـەکی دیکـەوە وەك (سـینەما، موحـازەرە، کـۆڕ، پێشانگا، ئاهەنگ) ئەنجامدەدرێت.

٦- ڕاگەیاندن پرۆسەی بڵاوکردنەوە و پێشکەشکردنی زانیاری ڕاست و دروست، بەسەرهاتی ڕاست و ڕوون، هەواڵی ڕاستەقینە، بابەتی ورد، ڕووداوی دیارکراو، بیرو بۆچوونی پەسند بۆ جەماوەر.

٧- ڕاگەیاندن بە دیدی دەروونزانان هۆکارێکی وروووژێنەرە بەرامبەر بە کۆمەڵ بۆ خستنەرووی ڕاستییەکان و دەرخستنی دیاردە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان لەپێناو هۆشیارکردنەوەی خەڵك لەکاتی ئاشتیدا، و لەکاتی شەڕدا، سەرەڕای ئەو ئەرکانەی پێشوو، دەرخستنی ڕووداوەکانی سەر گۆڕەپانی شەڕ و بەرزکردنەوەی ئاستی ورەی جەماوەر و بزاوندنی هەستی نیشتمانی.

٨- ڕاگەیاندن لەلایەن کۆمەڵناسانەوە پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتییە، بوارێکی بەرفراوانی گۆڕینەوەی هەڵسوکەوت و بیروڕایە واتە جەخت لەسەر بەکۆمەڵایەتیبوونی ڕاگەیاندن دەکات و گۆڕینەوەی ڕووداو و بیروڕاکان لەنێوان تاکەکاندا.

٩- ڕاگەیاندن بریتییە لەچالاکییەکی کۆمەڵایەتی و ئەرکی گەیاندن و گواستنەوەی هەواڵ و دەنگوباس و زانیاری و تاقیکردنەوەی نێوان مرۆڤەکان دەگرێتەخۆ، لەهەموو قۆناغە جیاکانی پێشکەوتن ولاگۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکاندا ڕۆڵی سەرەکیی خۆی دەبینی.

بەگشتی دەستەواژەی (زمانی ڕاگەیاندن) واتای ئەو زمانەی (کەرەستە، ئامرازە، هۆکارە)ی دەگەیێنێت کە بۆ گەیاندنی زانیارییە جۆراوجۆرەکانی ژیان بەهۆی ئامرازێکی گەیاندن (بڵاوکراوە، ڕۆژنامە و گۆڤار، ڕادیۆ، تەلەفزیۆن، ئامرازە ئەلیکترۆنییەکان) بەکاردێت، لە بەرجەستەیەکەوە بۆ بەرجەستەیەکی ترەوە.

**ب- تایبەتمەندییەکانی زمانی ڕاگەیاندن :**

زمانی ڕاگەیاندن لەنێو ئامرازەکانی ڕاگەیاندندا وەك: (ڕۆژنامە و گۆڤار، ڕادیۆ و تەلەفزیۆن)، جیاوازە و هەریەك لەم ئامرازانە جۆرە شێوازێکی تایبەتی پەیڕەو دەکات، بەڵام ئەمانە کۆمەڵە تایبەتمەندی گشتی هاوبەشیان کۆدەکاتەوە، دەکرێ لەمخاڵانەی خوارەوە دەستنیشانیان بکەین(٧):

١- ئاشکرایی (الوضوح) : بەرزترین سیماکانی زمانی راگەیاندن و نیشانەیەکی هەرە گەورە و دیاری زمانەکەیە، بۆ سروشتی ئامرازەکە و تایبەتمەندی جەماوەرەکەی دەگەڕێتەوە کە لەچین و توێژێکی جیاوازدا هەڵدەکەون لە چەندین ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری جۆراوجۆر و جیاوازدان کات و حەزەکانیان تیایدا دەردەکەوێت کە زیاتر جەخت لەسەر قسە گۆتراوەکان دەکەن، پێویستە وشە و ڕستە و واتای بەکارهاتووی لە دەوروبەری قسەکردندا ڕوون و ئاشکرا بێت.

٢- هاوچەرخبوون (المعاصرة): مەبەستی وشە و ڕستە و پێکهاتە و دەربڕینە زمانییەکان لەگەڵ سەردەمەکەی گونجاو بێت، هاودەمی بێت، لەگەڵ ڕیتم و ئاوازەکانی ڕێك بێت، چونکە رستەی درێژ یان وشەی فەرهەنگی قورس و بیانی و رستەی لێکدراو لەگەڵ سەردەمی خێرا و تەکنەلۆژیای نوێ ناگونجێت.

٣- گونجاوبوون (الملائمة): مەبەست لەوە ئەوەیە دەبێت زمانی ڕاگەیاندن لەگەڵ ئەو ئامرازەی کە تیایدا بەکاردێت گونجاو بێت و لەگەڵ جەماوەرەکەشی بگونجێت، چونکە زمان ئامانجی کۆمەڵە کەسانی کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی وئابووری تایبەتییە و ئاراستەی چاو دەکرێت، بۆیە دەبێ لەگەڵیدا گونجاو بێت.

٤- سەرنجڕاکێش (الجاذبية): مەبەست لەمەش وشەکان توانای گێڕانەوە و شیکردنەوە و باسکردنەوەی بابەتەکانیان هەبێت، کە بە شێوەیەکی زیندوو و خۆش و حەزپێکردنەوە بگێڕدرێتەوە، چونکە جەماوەری خەڵك هەردەم بە تاسە و شەوقەوە دەڕوانێتە بابەتە سەرنجڕاکێشراوەکان نەك بابەتێکی وشك و بێ تام بێ هیچ جۆرێك لە سەرنجڕاکێشی و حەزپێکردن (تشويق).

٥- کورتبڕی (الاختصار): بەهۆی سنوورداری ئامرازە بەکارهاتووەکەی ڕۆژنامەگەری و سروشتی جەماوەرەکەی کە توانای بەدواداچوونی بابەتە درێژخایەنەکانیان نییە، پەیوەستە بەکورتبڕی، واتە چەند قەبارە و پانتایی ڕۆژنامەکە گەورەتر بێت، پێویستە نووسینەکانیش بەپێی قەبارەکەی بێت (نەزیاد و نەکەم)، وەك تێبینیش دەکرێت ڕۆژنامەکان لاپەڕەکانیان سنووردارە، بۆیە پێویستە لەگەڵ قەوارەی لاپەڕەکە بگونجێت، لە هەمانکاتدا کورتکردنەوەکە کاریگەری لەسەر ناوەرۆکەکەی نەکات.

٦- نەرمی (مرونة): مەبەستی ئەوەیە کە زمانەکە توانای دەربڕینی جۆراوجۆری هەبێت، لە هەموو بابەتە پێشکەشکراوەکاندا، کە بەشێوەیەکی ڕێکوپێك بێ جەختکردن بڵاو بکرێتەوە، واتە ئاستەکانی دواندن و گفتوگۆ جۆراوجۆر بێت، بۆئەوەی لەبابەتی هەمەچەشندا بدوێ.

٧- فراوانی (الاتساع): واتە دانە زمانەوانییەکان فراوان و جۆراوجۆر بن، لە ڕووی بەکارهێنانی زۆرترین پێکهاتە و دەربڕینی واتایی هەمەچەشن، تاوەکو بتوانێت پێداویستییە جۆراوجۆرەکانی ڕۆژنامەگەریی دابین بکات زمانی ڕۆژنامەگەریش فراوانە و هەموو ڕۆژێ زیاتر دەبێت بەهاتنە ناوەوەی وشە و زاراوەی نوێ بەهۆی تێکەڵاوبوونی ڕۆشنبیریی میللەتانی جیهان بەیەکەوە.

٨- توانای پێشکەوتن (القابلیة للتطور): ئەمەش نیشانەیەکی هەمیشەی زمانی ڕۆژنامەگەرییە، کە توانایەکی بەهێزی دەربڕین و توانای زۆرتر لەسەر سەرنجڕاکێشانی جەماوەری هەیە، ئاشکراشە زمانی ڕۆژنامەگەری لە سییەکان و چلەکانی سەدەی رابردوودا جیاوازە لەگەڵ زمانی پەنجاکان و شەستەکانی هەمان سەدە، بە هاتنەناوی چەندین زاراوەی نوێ و سەردەم کە پێشتر نەبووە و بەکارنەهاتووە، و لەبەر پێویستیی سەردەم کە وا دەخوازێت ئەم زاراوانە بێنە ئاراوە، ئەمەش هۆکاری پێشکەوتن و پەرەسەندنی زمانەکە دەسەلمێنێت.

**پ- سیستەمی گەیاندن و جۆرەکانی پەیوەندیکردن:**

سیستەمی گەیاندن بەشێوەیەکی گشتی بریتییە لە ڕەگەزەکانی پەیوەندیکردن : ( نێرەر - وەرگر - (هێما) - (پەیام-بابەت) - هۆکار (ئامرازەکانی راگەیاندن)- ئامانج) پێکدێت. واتە سیستەمی گەیاندن کە بەچەند ڕێگایەوە ئەنجامدەدرێت بەهۆی کەرەستەکانەوە وەك: (وشە - ڕستە - دەق - ئاخاوتن-هێما- وێنە)، پەیامەکەشیان لە ڕێی ئامرازەکانی راگەیاندن (ڕۆژنامە، گۆڤار، رادیۆ، تەلەفزیۆن، و ئینتەرنێت)، دەگەیێنرێت[٨]. کاریگەرییەکەشی لەنێوان دوو کەس یاخود نێوان کۆمەڵە کەسانێکی جیاوازدا ڕوودەدات.

**سیستەمی گەیاندن :**

نێرەر ←—— پەیام ←—— هۆکار ←—— وەرگر ←—— ئامانج – (کاریگەری)

وەکو پێشتر ئاماژەمان پێکرد کە پرۆسەی پەیوەندیکردن پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتییە، نەك تەنیا لەڕێگای زمانەوە چ گوتراو و نووسراو بێت، بەڵکو لە ڕێگای جوولە و ئاماژەکارییەکان ئەنجامدەدرێت. هەروەها پەیوەندیکردن بەیەکەوە بۆ چەند جۆرێك دابەش دەکرێت، بەڵام بەپێی توخمە هاوبەشەکان بۆ ئەم بەشانە دابەش دەکرێت: (پەیوەندی خۆیی– پەیوەندی کەسی– پەیوەندی گشتی یان کۆمەڵی و پەیوەندی جەماوەری). بەشێوەیەکی گشتی دەکرێ چاوێك بەم شێوە پەیوەندییانە بخشێنینەوە، چونکە ئەم جۆرە پەیوەندییانە ئاستی جیاوازی نیوان هەموو جۆرەکانی پەیوەندیکردن دەستنیشان دەکات، هەروەها یارمەتی لە ناسین و تێگەیشتن لە پرۆسەی پەیوەندیکردن بە گشتی و کاری پەیوەندکردن لەگەڵ جەماوەردا بەتایبەتی، کە بریتین لەمانەی خوارەوە[٩]:

١- **پەیوەندی خودی** (Individual communication): ئەم جۆرە پەیوەندییە نێوان مرۆڤ و خودی خۆی ئەنجامدەدرێت، کە خۆی دەبێتە کەسی نێرەر و لە هەمانکاتدا کەسی وەرگر. چۆن بیر دەکاتەوە و چۆن هەست دەکات، چۆن هێما و زانیارییەکان لە ڕێگەی پێنج هەستەکانەوە وەردەگرێت و لێکیان دەدات و شییان دەکاتەوە و چۆن واتاکان لە مێشکی خۆیدا وەردەگێڕێتەوە. واتە بۆ تێگەیشتن لەکاری پەیوەندیکردن لەم جۆرەدا، ئەوە دەگەیێنێت کە خودی مرۆڤ بەخۆی دەناسێنێت لەکاتی بیر کردنەوە و کەسایەتیەکی پەیوەندکار و بەشداربوو دەنوێنێ.

٢- **پەیوەندی کەسی** (Dual communication): ئەم جۆرە پەیوەندییە کە لەنێوان کەسێك و کەسێکی دیکە ڕوودەدات یان زیاتر، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ و ڕووبەڕوو ئەنجامدەدرێت، هەروەها بەئالوگۆڕکردنی هێما و زانیارییەکان دەرفەتی وەرگرتنی واتاکە یان مەبەستەکە بۆ کەسی بەرامبەر دەڕەخسێنێ و کاردانەوەی هەردووکیان بەسەر یەکەوە ئاشکرا دەکات، بەشێوەیەك کە تێگەیشتنێکی تەواو لەنێوانیان بێتەدی. هەروەها بەشێوەیەکی تەلقائی (ناڕەسمی) بێ ئەوەی ئامادەیی خۆیان پێشتر وەرگرتبێ، ئەنجامدەدرێت. ئەملاجۆرە پەیوەندیکردنە

وەك پێویستیەكی مرۆڤایەتی بۆ كارلەیەككردن و تێكەڵاوبوونی كەسەكاندا دێتەوە ئەنجام، و دروستكردنی پەیوەندی لەنێوانیان، بۆ دەرخستنی توانای كاریگەری و سەپاندنی دەسەڵاتیان بەسەر یەكترەوە، هەروەها پێویستییەكی دیكەی پەیوەندیكردن ئەویش بۆ دەربڕینی خۆشەویستی و برادەرایەتییە.

**٣- پەیوەندی گشتی یاخود (كۆمەڵی)** (mass communication): ئەمجۆرە پەیوەندییە كە لەنێوان كەسێك و كۆمەڵە كەسانێكی دیاركراودا ئەنجامدەدرێت، وەرگر لەگەڵ نێرەرەوە یەك شوێنیان كۆدەكاتەوە، كە لە نزیكەوە دەتوانن یەكتری ببینن و گوێ لەیەكتر بگرن، دەشتوانرێ كاردانەوەی وەرگر بۆ ئامانج و مەبەستی پەیامەكە دەستنیشان بكرێت، وەك ئەوەی لە: (وانەكانی زانكۆیی، گوتاری ئایینی ڕۆژانی هەینی، كۆنگرە و كۆنفرانسەكان، كۆبوونەوە و ئاهەنگەكان). ئەم كەسانەش لەسەر چەند پێوەر و بەرژەوەندی هاوبەش ڕێكدەكەون و پەیوەندییەكە ئەنجامدەدەن، هەرچەندە هەریەكەو ئامانجی تایبەتی خۆی هەیە، بەڵام لەهەندێ پرسی جیاوازدا یەك هەڵویست وەردەگرن.

**٤- پەیوەندیی جەماوەری** (mass-communication-media): ئەم جۆرە پەیوەندییە تایبەتە بەدەزگاكانی ڕاگەیاندن لەنێوان ئامرازە جیاجیاكانی ڕاگەیاندندا ئەنجامدەدرێت، ئەویش پەیوەندییەكی ڕێكخراو و لێكۆڵراوە، لەسەر بنەمای ناردنی پەیامێكی بەئاشكرا و بەگشتی لەدەزگایەكی پەیوەندیكار بۆ گشت جەماوەری خەڵك دامەزراوە، ئەو پەیامەش لەڕێگای ئامرازێكی ڕاگەیاندن بڵاودەكرێتەوە ئاراستەی هەموو جۆرە خەڵكانێك دەكرێت كە لەچەند ئاستێكی جیاوازدا دەردەكەون. ئەم جۆرە پەیوەندیكردنە توانای دەركردنی چەندین ژمارەی كۆپی لێكراو لەدانە (نوسخە)ی ئەسلییەكەیدا و دووبارە بەسەر هەموو جەماوەرەوە دابەش دەكرێتەوە، كە چەندین ئامانجی كۆمەڵایەتی دەگەیێنێت وەك: (هەواڵدان، پەروەردەكردن، هۆشیاركردن، ڕۆشنبیركردن، ڕێكلام و كات بەسەربردن). هەروەها لەبەر زۆری ژمارەی كەسی وەرگر (وەرگرانی پەیامەكە)، پەیامە ئاراستەكراوەكە كاریگەرییەكی گەورە دەخاتە سەر دەروون و كەسایەتی ئەو خەڵكە، كە دوابەدوایدا كاریگەری بەسەر بیرو لێكدانەوەشیان دەكات، بەڵام لە خاڵە نیگەتیفانەی ئەم جۆرە پەیوەندیكردنە نەبوونی گەڕانەوەیی–(كاردانەوە–

ردفعل)، واتە کارەکە یەکلایەنانەوە ئاراستە دەکرێت، کـە دەبێتـە پـەیوەندییـەکی یەکتاکی، جەماوەر تیایدا تەنیا ڕۆڵی وەرگر دەبینێت و ناتوانێت راسـتەوخۆ لـەم پەیوەندیکردنە بەشداری بکات، بـەڵام دەتوانێت بەشـێوەیەکی تـر (ناڕاسـتەوخۆ) ئەم کاردانەوەیە بەدەست بهێنێت ئـەویش لـە ڕێگـای ئەنجامـدانی چـەند کـارێکی بەکۆمەڵی وەك: (فۆرمی ڕاپرسی، لێکۆڵینەوەکانی مەیدانی و پراکتیکی).

**ت- ئەرکەکانی زمانی ڕاگەیاندن :**

دەکـرێ لـە خـوارەوە ئامـاژە بـە گـرنگترین ئەرکـە سـەرەکییەکانی زمـانی ڕاگەیاندن بکەین [١٠]:

١- ئـەرکی گواسـتنەوە (گەیانـدن-نقـل)): زمـان هۆکارێکـە بـۆ دەربـڕین و گواستنەوەی (زانیاری، زانست، ڕا و بۆچوون، بیر، هەست و سۆز، حەز و ویست و ئـارەزوو)، بـەکاردێ و لـە پرۆسـەی گواسـتنەوە پێویسـتە پەیوەندییـەك لـەنێوان کەسەکان هەبێت، بۆ گەیاندنی مەبەستی پەیامـە گواسـتراوەکە لـە نێـرەرەوە بـۆ وەرگرەوە، بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەی.

٢- ئەرکی پەیوەندیکردن (الاتصال): چـەمکی (communicaton) لـە وشـەی (commune) هـاتووە، کـە بـەواتای (گشـتی) دێـت یـان بـەواتای هاوبەشـی و پەیوەنـدیکردن هـاتووە و لەهـەر پەیوەندییـەکیش بەلایـەنی کەمـەوە دەبێـت دوو کەس هەبێت (کەسی نێرەر) و (کەسی وەرگر) و دەبێ پەیامێك هـەبێت کـە کـاری پەیوەندی لە پێناویدا ئەنجامدەدرێت، ئەمەش لە پرۆسەی پەیوەندیکردندا گرنگـە چـونکە گواسـتنەوەی پـەیام لـە نێـرەرەوە بـۆ وەرگـر، بـۆ گەیشـتن بەمەبەسـتی گەیاندنەکە، هۆکاری پەیوەندیکردنەکە دەستنیشان دەکـات، ئـەویش ئەنجامـدانی کاریگەرییەکە.

٣- ئەرکی لێك تێگەیشـتن و بـەردەوامبوون (الفهـم والتواصـل): بـۆ مانـەوە و بەردەوامبوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، لە یەکگەیشتن یان لێك تێگەیشـتنی کەسەکاندا، پەیوەندیی نێوان کەسـەکان بـەردەوام دەکـات، ئەگـەر تێگەیشـتنەکە ڕوونەدات ئەوا پەیوەندییەکەش ڕوونادات و بەردەوام نابێت، چونکە بۆ ئەنجامدانی پەیوەندییەك پێویستە تێگەیشتن بێتە دی، ئەگەرنا پەیوەندییەکە دروست نابێت.

دەكرێ ئەركەكانی زمانی ڕاگەیاندنیش بە شێوازێكی تر بەم شێوەیەی خوارەوە كورتی كەینەوە: (ئەركی (هەست دەربڕین، ئەركی وورووژاندن، ئەركی ئەوپەرزمانی، ئەركی گەڕانەوەیی، ئەركی ئەدەبی)، كە لەنێوان ئەم سێ ئاستە نووسینەوە (زمانی نووسراو: زمانی ڕۆژنامە و گۆڤارەكان، زمانی بیستراو: زمانی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن، زمانی بینراو : زمانی تەلەفزیۆن و ئامرازە ئەلیكترۆنییەكانی تر) دەردەكەوێت.

**ج- ئاستەكانی زمانی ڕاگەیاندن (دانە واتاییەكان):**

ئاستەكانی زمان تا ئێستا لەلایەن شارەزایانی بواری زمانەوانی مشتومڕێكی زۆری لەسەرە زانایانی زمان و زمانەوانان لەسەر ئاستەكانی زمان تا ئێستا ڕێك نەكەوتوون، بەڵام لەسەر ئەوە ڕێككەوتوون كە پێویستە ئاستەكان بەپێی پلەیان ریز بكرێن، بەگشتی دەتوانین سێ ئاستی سەرەكی بۆ زمان دەستنیشان بكەین ئەویش[11]:

- ئاستی دەنگسازی (فۆنۆلۆژی – علم الصوت) Phonology
- ئاستی وشەسازی (مۆرفۆلۆژی – علم الصرف) Morphology
- ئاستی رستەسازی (سینتاكس – علم النحو) Syntax

هەروەها بۆ ئاستی واتاسازیش لەلایەن زمانەوانان هەمان مشتومڕی لەسەرە، ئایا ئەمە بە ئاستێكی سەرەكی زمان دادەنرێت یاخود نا ؟ بەڵام لێرەدا ئەوەی گرنگە، ئەو دانە واتاییانەی كە پێكهاتەی زمانی ڕاگەیاندن دروست دەكەن، ئەویش بۆ چەند بەشێكیان دابەش كردووە، كە هەر یەكێك لەم دانە واتاییانە مەبەست و ئەركی تایبەتی خۆی هەیە، بەگشتی ئەمانەن (١٢):

١- مۆرفیم (مۆرفیمی سەربەخۆ- مۆرفیمی بەند) : بچووكترین دانەی واتاداری زمانە، دەكرێت بە دوو جۆری سەرەكی (مۆرفیمی سەربەخۆ-و مۆرفیمی بەند)، مۆرفیمی بەندیش كە بەتەنها نایەت بەڵكو لەگەڵ وشەیەكی تردا دێت و واتایەكی تری پێی دەبەخشێت.

٢- وشە (وشەی سادە- وشەی لێكدراو - وشەی داڕێژراو) : گرنكترین یەكەی واتاداری زمانە، كە واتایەكی تایبەتی خۆی هەیە، و بەسەر سێ جۆری

سەرەکی دابەش دەکرێت، ئەوانەش: (وشەی سادە–وشەی لێکدراو–وشەی داڕێژراو).

٣– ڕستە (ڕستەی سادە، ڕستەی لێکدراو، ڕستەی ئاوێتە) : بریتییە لەو ڕێکخستنە ڕێزمانییەی بۆ دانە واتاییەکانی زمان (وشە، مۆرفیم) بۆ دروستکردنی ڕستە، واتایەکی دیارکراو پێی دەبەخشێت.

٤– گوتن (ڕستەیەکی بەکارهاتوو لەگەڵ دەوروبەردا): بریتییە لەواتای ئەو ڕستانەی کە لەگەڵ دەوروبەردا تێکەڵ دەبێت، و واتایەکی جیاواز پێی دەبەخشێت، وەك: بەهار وەرزێکی خۆشە، ئەم ڕستەیە ئەگەر بخرێتە دەوروبەری گوتنەوە ئەوا واتای جیا بەدەستەوە دەدات وەك: (با بڕۆین بۆ سەیران، دەست بە کارەکانمان بکەین).

٥– دەق–پەرەگراف (واتای پەیوەندی ڕستەکان بەیەکەوە دیاردەکات تا کۆتایی پەرەگرافەکە): لێرەدا پەیوەندی وشەکان بەیەکەوە بۆ دروستکردنی واتای ڕستەکە و پاشان واتای ڕستەکان تا کۆتایی یەکتری تەواو دەکەن.

٦– ئاخاوتن دەقێکی دەربڕاو لەگەڵ دەوروبەرەکەیدا (پەیوەندی نێوان زمان و دەوروبەردا) : واتە قسەیەکی لەنێوان دووکەسدا یان زیاتر ئەنجامدەدرێت، کە بەئازادی لەنێوانیاندا بەڕێوەدەچی، بەمەش دەبێتە واتای دەق لەگەڵ واتای دەوروبەردا، کە بە یەکەیەکی تەواو و سەرەکی پەیوەندیکردن دادەنرێت. لەمیانەی ئەو کارلەیەککردن و ئاڵوگۆڕانەی نێوان نێرەر بۆ وەرگرەوە ئەنجامدەدرێت.

### تەوەری دووەم:
### شێوازی نووسینی بابەتەکان و شیانی نووسەرەکە (مؤهلات الكاتب)

ئەگەر زمانی ڕاگەیاندن بەشێوەیەکی گشتی بۆ بەدەستخستنی ئامانجە گەیاندنەکانی خۆی پەیوەست بێت بەئاشکرایی و ئاسانی و سەرنجڕاکێشی و (حەزکردن– تشویق)، ئەوە لەشێوازی ڕادیۆ و تەلەفزیۆندا ئەم تایبەتمەندییانەی سەرەوە پێویستر دەبێت، بەتایبەتی لەبەر هۆی جیاوازی جەوهەری لە نێوان ڕادیۆ و تەلەفزیۆندا لەلایەك و گشت ئامرازەکانی دیکەی گەیاندن لەلایەکی ترەوە، بەتایبەتی ڕۆژنامەگەری، جا چ لە ڕووی خودی پێکهاتەی ئامرازەکە یان سروشتی جەماوەرەکە، کە ئامانجی پەیامە ئاڕاستەکراوەکەیە(١٣). بەهۆی ئەوەی ڕۆژنامە یاخود گۆڤار دەتوانرێ دووجار و سێجار یاخود چەندین جار بگەڕێتەوە سەری و پێدابچێتەوە، بەڵام سەبارەت بەبابەتی پێشکەشکراوی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن پەیوەستە بە کۆمەڵە کەسانێك کە لەئاستی خوێندن و پایەی کۆمەڵایەتی و لایەنی ئابووری جیاوازن، واتە لەچین و توێژێکی جیاوازدان، بەزۆریش دەکەوێتە ئاستی خوارەوەی کۆمەڵ. لێرەدا پێویستە ئەو بابەتانەی کە لە ئامرازەکانی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن دەنووسرێن بەزمانێك بنووسرێن لەگەڵ ئاستی گشتی جەماوەر هاوسەنگ بن و بتوانن ئەو کۆمەڵە ئاستە جیاوازانەی کۆبکەنەوە و لەگەڵ ئاستی مامناوەندی خەڵکدا بگونجێنن، لە هەمانکاتدا دەقی پەخشکراو بتوانێت سەرنجی زۆرترین کەس بۆخۆی ڕابکێشێت. لێرەدا دەکرێ گرنگترین سیماو تایبەتمەندییەکانی دەقی پەخشکراو و شیانەکانی پێویست بۆ نووسەرەکەی بەم شێوەیەی خوارەوە دەستنیشان بکرێن:

**یەکەم: شێوازی دەقی پەخشکراو**

**أ- تایبەتمەندییەکانی شێوازی دەقی پەخشکراو:**

لە قۆناغی یەکەمی نووسینی بابەتی پەخشکراودا ئامانجی سەرەکی گواستنەوەی بیرو بۆچوون و زانیارییەکان بەگشتی و گەیاندنیان بە وەرگرەوە بە ئاسانترین ڕێگە و زووترین کات، هەروەها هەوڵی سەرنجڕاکێشی و حەزپێکردن و بڕواپێهێنانی خەڵکی بدات، بۆیە پێویستە لە دەقی نووسراودا تایبەتمەندی ئاشکرایی و زیندوویی و هەمەچەشنی و کورتی تیایدا بەدی بکرێت بۆ ئەوەی

زۆرترین جەماوەر بۆ خۆی ڕابکێشێت کە بە زۆرترین ڕێژە لە توانای کارلێکردن و بەکورترین کات ئەو کاریگەرییەی پێویست ئەنجامبدات[١٤]. ئەم شێوەیە پێویستە لەگەڵ سروشتی بابەتی پەخشکراو و جەماوەرەکەی بگونجێت، شارەزایانی ئەم بوارە تایبەتمەندییەکانی شێوازی بابەتە پەخشکراوەکان، بەچەند وشەیەکی کورت پێناسەی دەکەن، دەڵێن: (ئەو شێوازەیەی کە لەگەڵ پیرەژنێکی گوێگران لەتەمەنی نەوەدساڵیدا دەدوێت، لەکاتی خوێندنەوەی دەقەکەدا پێویستی بە ڕوونی و خێرایی دەبێت، هەروەها ئەو شێوازەیەی لەگەڵ منداڵێکی لەتەمەن چوارده ساڵیدا دەدوێت، کە پێویستی بەهەڵبژاردنی زاراوەی تایبەت و لەگەڵ تەمەنی منداڵەکەدا بگونجێت. هەروەها ئەو شێوازەیەی لەگەڵ پیاوی گەورە و پێگەیشتوو دەدوێت کە پێویستی بەلایەنی بیرییەوە هەیە)[١٥]. لێرەدا شێوازی دەقی پەخشکراو ڕوونتر دەبێت، بەوەی پێویستی بەشێوازێکی تایبەت و دیارکراو بۆ نووسین هەیە ئەویش کورتی و ڕوونی و پاراویی زمان، تایبەتمەندیی جۆری چوارەمیش لەکاتی خوێندنەوە یاخود ئەنجامدانی بەشێوەی گوتن (خوێندنەوە بەدەنگ)، پەیوەستە بەشێوازی تایبەتی کەسی، چونکە کاریگەرییەکانی دەنگی مرۆڤ لەسەر وشەکان کاتی خوێندنەوە بەشێوەیەکی دیارکراو، ڕاستەوخۆ ڕادەی ڕاستی و کارلێکردنەکە دەردەخات[١٦]. سەبارەت بە کورتبڕی مەبەست بەکارهێنانی کورتترین ڕستە و لەهەمانکاتدا ئامانجی خۆی بۆ وەرگرەکە بەجێ بگەیێنێت، بۆ تێگەیشتن لەواتای دەقی گوتراو (واتای مەبەست) بەئاسانی و سادەیی، هەروەها دوورکەوتنەوە لە دووبارەکردنەوە و بەکارهێنانی ڕستەی درێژ و واتای ئاڵۆزدا کە بیری وەرگران بۆ چەندین واتای جیاواز و جۆراوجۆر دەبات و دووردەخاتەوە لەواتای مەبەست. لەلایەکی دیکەوە چەندین توێژینەوەی هەمەچەشن لەم بارەیەوە کراون، گرنگیی داڕشتنی رستەی گوتراو کە لەسنووری چەند وشەیەکی دیارکراودا دەرنەچێت و ماوەی گوتنەکەشی یان سازدانی ماوەیەکی دیارکراو بێت، چونکە ڕستەی درێژ و ئاڵۆز بەرەو تەرکیزنەکردنەوە دەبات و لادان و دوورخستنەوەی بیری کەسەکان لە بابەتەکەدا، کە لەئەنجامدا دەبێتە هۆی تێنەگەیشتن و کەم یان زەحمەت وەرگرتنی (استیعاب) بابەتەکان[١٧]. بێگومان فاکتەری (ڕوون)یش بەفاکتەری ئاسانی گرێدراوە لە ڕووی

بەكارهێنانی وشە و ڕستە و دەستەواژەی ڕوون و ئاسان، بەڵام لایەنێكی دووەمی هەیە لەكاتی خوێندنەوەی بەدەنگەوە، واتە لەكاتی گوتنەوەدا پێویستە نووسەر دووركەوێتەوە لە هەموو زاراوەیەكی ئەدەبی و زانستی بەرز كە تەنها ئەو كەسانەی لەئاستی ڕۆشنبیریی بەرزدان لێ تێدەگەن، لەبەرئەوەی ئەم بابەتە ئاراستەی هەموو جەماوەرەوە دەكرێت نەك تەنیا بۆ كەسانێكی تایبەتمەند. سروشتی دەقی پەخشكراو و متمانەكردنی لەسەر ئەو وشە و ڕستانەی كە لە ڕێگەی گوتنەوە یان خوێندنەوەدا پێشكەش دەكرێن، وای كرد نووسەر یاخود ئامادەكەری دەقەكە لەكاتی نووسینی بابەتەكەدا پەیوەست بێت بەشێوازێكی تایبەتی، ئەویش شێوازی (گوتنەوە یان قسەكردن) نەك شێوازی نووسین كە لەئامرازەكانی چاپكراودا بەكاردێت[١٨]. واتە پێویستە لەسەر نووسەر لەزاراوەی قورس و ئاڵۆز یاخود زاراوەو شێوازی ئەدەبی دووركەوێت، هەروەها نووسەر لەكاتی نووسینی بابەتەكەیدا پێویستە لەگەڵ خۆی بیلێتەوە پێش ئەوەی بینووسێتەوە، پاشان لەپاش تەواوبوونی لەنووسینی بابەتەكەیدا دووبارە دەستەواژە نووسراوەكە یان لاپەڕەكە بخوێنێتەوە، چونكە دووبارە خوێندنی ڕستەكە لەپاش نووسینەوەیدا یارمەتی نووسەر دەدات لەدووبارە پێداچوونەوەو ڕاستكردنەوەی داڕشتنی دەقەكە بەشێوەیەكی دروست. هەروەها خوێندنەوەی ڕستەكان بەدەنگێكی بەرز وادەكات نووسەر بەردەوام بێت لەسەر نووسینەكەی بەگوێرەی بابەتی دەقەكە، نەك تەنها جەخت لەسەر ئەو وشە و ڕستە نووسراوانەدا بێت. ئەگەر ئەم ڕێگایەش بۆ بەكارهێنانی زمانی گوتراو یارمەتی نووسەرەكە نادات، دەكرێ كەسێكی تریش هەبێت یارمەتی نووسەرەكە بدات و لەكاتی خوێندنەوەی دەقەكە لەگەڵی بەشدار بێت، بەوەی دووبارە دەقەكەی بۆ بخوێنێت و بەنووسینەكەیدا بچێتەوە. ڕێگایەكی تریش هەیە بۆ نووسینی دەقی پەخشكراو ئەویش كاتێك نووسەر هەموو شتێكی لەبارەی ڕادیۆ ومایكرۆفۆن و جەماوەرەوە لەبیركاتەوە—لەكاتی نووسین— تەنیا ئەوەی بەبیربێتەوە كە لەگەڵ برادەرێك قسە دەكات یاخود لەگەڵ كەسێكی نزیكی خۆی قسە دەكات. هەروەها بەكارهێنانی ئەو وشە و ڕستانەی كە لە كاتی گفتوگۆدا لەگەڵ كەسێكی بەرامبەر و سیمای ئاسانی و ڕوونی و ئاسایی تیایدا بەدیار دەكەوێت، چونكە شێوازی

پەخشکراو وێنەی (کەسایەتی پەخشکار) بەرجەستە دەکات، کە بەرامبەر بە ڕەوانی و زمان پاراوی لەشێوازی رۆژنامەنووسیدا دێت، چونکە هەڵبژاردنی زاراوە و پێکهێنانی ڕستەکان لەگەڵ ئاوازی دەنگی کەسی پەخشکار و شێوەی ئەنجامدانی، شێوازی دەقی پەخشکراو دیاردەکات[١٩]. بەلاَم لێرەدا یەك پرسیار دێتە ئاراوە ئەویش ئایا بۆ دەقی پەخشکراو پێویست دەکات کە زمانێکی پاراو و هەموو یاسا و ڕێساکانی ڕێزمانی تێدا پەیڕەو بکرێت یاخود نا؟ لێرەدا ئەگەر ئێمە بەراوردی جەماوەری ڕۆژنامەگەری لەگەڵ جەماوەی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن بکەین، ئەوە بۆمان دەردەکەوێت کەوا جەماوەری رۆژنامەگەری بەگشتی پێویستە خوێندەوار بن، چونکە لە ڕێگای خوێندنەوە زانیارییەکان وەردەگرن، بەلاَم جەماوەری بابەتی پەخشکراو لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆن هەموویان خوێندەوار نین یاخود پێویستیان بەخوێندنەوە نییە بەڵکو تەنیا پێویستییان بەبیستن یان بینین هەیە، بۆیە جەماوەرەکە لە هەردوو ئاستەکەی خوێندەوار و نەخوێندەواری دەگرێتەوە و دەقی پەخشکراو بۆ جەماوەرێکی گشتی ئاراستە دەکرێت. لێرەدا تێبینی دەکرێ کە دەقی پەخشکراو ئەگەر بەشێوەیەك بنووسرێت بە لای گوێگری ئاسایی و نەخوێندەوار زەحمەت بێ، ببێتە هۆی تێنەگەیشتنی، بیسەران یاخود بینەرانی ئەم ئاستە لێ دوور دەکەونەوە، بەلاَم لە هەمانکاتدا ئەگەر بەجۆرێك بنووسرێت کە زۆر سادە و ساکار بێت ئەوا چینی ڕۆشنبیر و ئاستی بەرز ڕازی ناکات، بۆیە سەرەتا وا مەزەندە کرا کە جۆری نووسینەکە بەشێوەیەکی ڕوون و ئاسان و زمانێکی پاراو بەکاربهێنێت بۆ پێشکەشکردنی دەقی پەخشکراو کە لەگەڵ بابەتە پێشکەشکراوەکە گونجاوبێت.

**ب- مەرجەکانی نووسینی دەقی پەخشکراو:**

شێوەکانی دەقی پەخشکراو جیاواز و جۆراوجۆرن بەپێی جۆر و سروشتی دەقە پێشکەشکراوەکە و ئەو شێوە و قاڵبەی کە لە ڕێگەیەوە پێشکەش دەکرێت، چونکە لەوانەیە بابەتە پێشکەشکراوەکە لە ڕێگەی گێڕانەوە بێت یاخود ڕای کەسی خۆی بێت یان گفتوگۆی نێوان دوو کەس یان زیاتر بێت، یاخود بەشێوەیەکی درامی وەك کارێکی هونەری لەسەر نواندنی ڕووداو و بەسەرهاتەکان لەشێوەی نواندندا پێشکەش بکرێت، یان لەوانەیە دەقەکە لەسەر شێوەی پرسیار

و وەلأم بێت یان پێشبڕکێ بێت، یان وەك ڕێپۆرتاژ و ڕاپـۆرت بێـت، یـان لەوانەیـە یەك بەرنامە لەنێوان ئەو هەموو جۆر و شێوە و هونـەرەکانی بابـەتی پەخشـکراوی لەخۆ بگرێت کە یەك قالّب کۆیان دەکاتەوە. هەندێ کەسـانیش دەقـی پەخشـکراو بۆ دوو بەشی سەرەکی دابەش دەکەن ئەویش[٢٠]: دەقـی تـەواو و دەقـی ناتـەواو، دەقی تەواو ئەو دەقەیە کە بەشێوەیەکی تەواو پشت بەنووسەرەکەی دەبەستێت، ماوە بەبێژەر و دەرهێنەر و ئەکتـەر یـان ئامادەکـاری بەرنامەکـە نـادات بۆئـەوەی هەندێ گۆڕانکاری بە وشە و دەستەواژە و دەربڕینەکان بکـات، وەك لادان و دانـان و گۆڕینی هەندێ وشە و ڕستە لەنێو دەقەکەدا، بۆنموونە وەك لـەدەقی (نوانـدن و گوتن و وتە و قسە)ی ڕۆژنامەوانیدا هەیە، بەلأم دەقـی ناتـەواو ئـەو دەقانـەی کـە بەشێوەی (بەش بەش) ئامادە دەکرێت، دەقەکەش بەکراوەیی دەمێنێتەوە لـەژێر دەسـەلأتی بێـژەر یـان ئامادەکـاری بەرنامەکـە وەك دەستنیشـانکردنی خالّـە سەرەکییەکانی بابەتە ئامادەکراوەکە و پێشکەشکەری بەرنامەکە خۆی بەرپرسـی یەکەم دەبێـت لـە بـەرێوەبردنی بەرنامەکـە، بـەلأم بەگشـتی هەنـدێ تایبەتمەنـدی دەقـی پەخشـکراو دەکـرێ دەستنیشـان بکرێـت، کـە بریتییـە لەکۆمەلّـە یاسـا و ڕێسایەکی گشتی، واتە هەندێ مەرجی سەرەکی و گرنگ لەنێو دەقەکەدا پێویستە هەبێت، بەم شێوەیەی خوارەوە [٢١]:

**١- دەستنیشانکردنی ئامانجی بابەتەکە و دیارکردنی جەماوەرەکەی :**

ئامانجی دەقی ئامادەکراو خالّی دەستپێکردنی یەکەمە بـۆ دەستنیشـانکردنی ئـەو مەبەسـتەی کـە نووسـەر دەیـەوێت جەماوەرەکـە پـێ کاریگـەر بێـت، بۆیـە پێویستە جەماوەرەکەش دیاربکرێت کە دەقی ئامادەکراوەکەی ئاڕاستە دەکرێت و بزانرێت چی دەوێت ؟ و مەبەستی چییە لە نووسینی ئەم دەقە ؟ چونکە لەوانەیـە ئەو جەماوەرەی کە دەقـە پەخشـکراوەکەی ئاراسـتە دەکرێـت ئـافرەت بێـت یـان منالّ بێت یان گەنج یان هەر توێژێکی کۆمـەلّگا بێـت، بـەلأم سـەبارەت بـەئامانجی نووسەرەکە چەندین ئامانجی جیاوازی هەیە، لەوانەیە مەبەستی کـات بەسـەربردن بێت یان سەرنجڕاکێشانی جەماوەر بێت یان ئیغراکردنیـان بـۆ کڕینـی شـتێك، یـان لەوانەیە مەبەستی پەروەردەیی بێت یان ڕێنماییکردن بێت. بەم شـێوەیە نووسـەر ئەگەر ئامانجی نووسینی بابەتەکـەی دەستنیشـان کـرد، دەتوانێـت لـە ڕێگەیـەوە

زانیاری پێویست ئامادە بکات، هەروەها چەندین لێکۆڵینەوە ئامادەکراوە بۆ ناسینی جەماوەری ڕادیۆ و تەلەفزیون کە لە کۆتاییدا گەیشتنە کۆمەڵە سیفاتی تایبەت بەجەماوەری ئەم جۆرە ئامرازە گەیاندنانە، وەك [٢٢]:

١- لە ڕووی ئاستی ڕۆشنبیرییەوە کەسێکی مامناوەندییە.

٢- لەوانەیە نەخوێندەوار بێت، لەوانەیشە زانا بێت.

٣- کەسێکی نەناسراوە، لەلای کەسی راگەیێنەر.

٤- تێکەڵ نییە لەگەڵ کەسانی تر.

٥- ئامادە نییە بۆ گوێبیستنی یان تەماشاکردنی بەرنامەکە کە پێویستی بەجۆرێك لە زیرەکایەتی هەیە بۆ سەرنجڕاکێشانی ئەم جۆرە کەسانە.

٦- هەندێ بایەخ و گرنگی تایبەتی خۆی هەیە، و هەندێ بایەخی هاوبەشی هەیە لەگەڵ کەسانی تر.

٧- کەسێکە دەیەوێت شتێکی باش و بەسوود پێشکەشی بکرێت.

٨- بۆ هەموو بابەتێك گوێ ناگرێت، تەنیا ئەگەر بابەتە پەخشکراوەکە لە ئاستی تێگەیشتنی خۆی بێت.

٩- لەئاستێکی ڕۆشنبیریی تایبەتدایە کە هەر کەمکردنەوەیەك لەو ئاستەیە رەت دەکاتەوە.

١٠- خۆی بڕیاری باشی یان خراپی بابەتەکەی دەدات، ڕای خەڵکی تر وەرناگرێت.

١١- بەرنامەکان بەشێوەیەکی هێمن وەردەگیرێت، کە شێوازی خێزانی بەسەرەوە دیارە بەلام لەدەرەوەی خێزان، یان لەدەرەوەی ماڵ بینەر لە هۆڵی سینەما پێویستی بەهەندێ یاسا و ڕێسای ئەوشوێنە دەبێت کە پێی پابەند بێ.

١٢- جەماوەرەکە هەمەجۆرن لە هەموو ئاست و ڕەگەزەکانن وەك (پیاو و منداڵ، ئافرەت، گەنج)، واتە ئاستی ڕۆشنبیرییان جیاوازە.

١٣- شێوەی ئاڕاستەکردنی بابەتە ئامادەکراوەکان لەئامرازەکانی ڕاگەیاندن جیاوازن و شێوەی وەرگرتنەوەشیان، بۆنموونە بابەتە ئاراستەکراوەکان لە ڕادیۆ جیاوازە لەوەی لە تەلەفزیۆن و سینەمادا هەیە.

**٢- (حەزپێکردن – تشویق) و سەرنجڕاکێشانی جەماوەر :**

یاسای سەرەکی بۆ بابەتی پێشکەشکراو، پێویستە سەرنجڕاکێش بێت، کە لە هەموو حاڵەتەکان وشەی گوتراو سەبارەت بە ڕادیۆ یاخود وێنە سەبارەت بە تەلەفزیۆن، وابکات سەرنجی خەڵك بۆ بابەتە پێشکەشکراوەکە رابکێشێت بەشێوەیەکی زیندوو و خۆش، چونکە بەبێ ئەمشتانە بەرنامەکە ناگاتە ئامانجی سەرەکی خۆی.

**٣- پابەندبوون بە کات :**

بەگشتی هەموو بەرنامە پەخشکراوەکان پێویستە بەکاتەوە پابەند بن، نەك لەبەرئەوەی بەرنامەکان دەبێت لە کاتێکی دیارکراودا دەستپێ بکەن و تەواو بن، بەڵکو لەبەر سروشت و جۆری بەرنامەکە خۆی کە پێویست دەکات پابەند بێت بەم کاتەوە، واتە پێشکەشکردنی بابەتەکە پەیوەستە بە کاتێکی دیارکراوی خۆیەوە، ئەگەر بەرنامەکە رۆژانە یاخود هەفتانە یاخود مانگانە بێت. هەندێ بەرنامەش تەنیا پێویستی بە کاتێکی پێنج دەقەیی هەیە، بەپێی سروشتی بەرنامەکان و جۆرو ئامانج و بەپێی سیاسەتی ئەو دەزگایەی کە پەخشی دەکات.

بەم شێوەیە ئەو دەقەی کە بۆ ئەم جۆرە بابەتە پەخشکراوانە یاخود بەرنامە پەخشکراوانە دەنووسرێت، پێویستی بەکاتێکی دیارکراو هەیە و بەو کاتەوە پابەندبێت کە بەهۆیەوە دەست پێ دەکات و تەواو دەبێت و نابێت لەوەوە زیاتر بێت، چونکە هەر بەرنامەیەك کاتێکی دیارکراوی خۆی هەیە و پێویستە پێی پابەندبێت، بێ زیاد یان کەم، بۆئەوەی بە ڕێکخستن و جێگیربوونی کاتی پێشکەشکردنی بەرنامەکان کاریگەری نەخاتە سەر بەرنامەکانی دیکەی ئەم کەناڵە، کە پەیوەندی نێوان گوێگر یاخود بینەری بەرنامەکە لەگەڵ بەرنامە تایبەتییەکەی خۆی دەبەستێت و جۆرە تێکەڵاوییەك دروست نەکات.

**٤- پابەندبوون بە چێژ و ئادابی گشتی :**

ئەم خاسیەتە پەیوەستە بە سروشتی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکە، وەك دوو ئامرازی سەرەکی راگەیاندن ئاراستەی (خێزان) دەکرێت و لەناو هەموو ماڵێکدا هەیە، وای

کرد لە زۆربەی کەناڵە ئاسمانییەکاندا پەیوەست بن بە هەندێ یاسا و ڕێسای تایبەت بۆ هەموو بابەتە پێشکەشکراوەکان، وەك (دابونەریتی کۆمەڵایەتی ئەو کۆمەڵگایە و سیاسیەتی ئەو کەناڵە و ڕێبازەکەی). لەکۆمەڵگا ڕۆژهەلاٌتییەکاندا بەگشتی هەندێ بابەت قەدەغە کراون وەك: ( بابەتی سێکس، و تاوان و قومار و خۆڕووتکردن و خواردنەوە)، یان ئەو بابەتانەی لەدژی ئایینەکاندا ئامادە دەکرێت، ئەمەش بەشێوەیەکی گشتی لەولاٌتێك بۆ ولاتێکی تر دەگۆڕێت.

**دووەم : نووسەری بابەتە پەخشکراوەکان**

دەکرێ لێرە نووسەری بابەتی پەخشکراو لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی دەستنیشان بکەین، هەروەها پێناسەیەکی کورت بۆ نووسەری بابەتە پەخشکراوەکان بکەین، ئەویش ئەو کەسەیە کە تایبەتمەندە بە نووسینی ئەو بابەتەی کە دەشێ لە ڕادیۆ پێشکەش بکرێت، یان لە تەلەفزیۆن پەخش بکرێت.

**أ- ناوی نووسەری بابەتە پەخشکراوەکان :**

لەبەرئەوەی ئەو کەسە بە یەك بوار لە بوارەکانی نووسین تایبەتمەند دەبێت، وەك نووسین و ئامادەکردنی (ئێدیت)ی هەواڵەکان یان نووسینی کۆمینتار یان دەقی درامی و ئامادەکردنی بەرنامەی جۆراوجۆر و بەرنامەی گفتوگۆ، هەروەها ئەم نووسەرە چەندین ناوی بۆ دانراوە، وەك دانەر و نووسەری سیناریۆ و نووسەری گفتوگۆ و ئیدیتۆر و ئامادەکار و کۆمینتار. لێرەدا لەسەر هەندێ لەم کارانەدا ڕادەوەستین و سروشتی ئەم جۆرە کارانە دەستنیشان دەکەین[٢٣]:

**١- نووسەر یا دانەر (مؤلف) :**

ئەو ناوە بەئەدیب و هونەرمەند و ڕۆژنامەنووسان دەدرێت کە بابەتێکی داهێنەرانە دەنووسن، و دەبنە داهێنەری بابەت و دەقی باش، ئەم جۆرە نووسەرانەش نووسەرانی چیرۆك و ڕۆمان و لە ڕاگەیاندن نووسەرانی وتە یان (وتار)ی جیاواز دەگرێتەوە.

٢- نووسەری سيناريۆ (سيناريست) :

ئەو کەسەی کە دەقێکی سینەمایی یان تەلەفزیۆنی دەنووسێت و بەناوی سیناریۆ یان دەقی بینراو ناودەبرێت، هەروەها پڕۆسەی بەرنامە یان فلیمێك کە بۆ نمایشکردن ئامادە دەکات، دەقەکەی بە شێوەیەکی تایبەت دەنووسرێت، بەهۆی کامیراش بە شێوەی (لقطات – گرتە) دەگیرێت و وەك دیمەنێکی چیرۆکی لە تەلەفزیۆن پێشکەش دەکرێت، یان بۆ گێڕانەوە دەست دەدات و لە ڕادیۆ پەخش دەکرێت. زۆر جار بابەتی چیرۆکی کە بۆ بلاوکردنەوە دەشێت، کەسی (سیناریست) ئەم جۆرە بابەتانە وەردەگرێت و بەشێوەیەکی تر ئامادەی دەکات بۆئەوەی ببێتە وێنە و دیمەن لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکان پەخش بکرێت، ئەمە بەگشتی ئەرکی سیناریستە.

٣- نووسەری (گفتوگۆ- حوار) :

ئەو کەسەی کە چیرۆکێك یان بابەتێك ئامادە دەکات، دەشێت ببێت بە بابەتێکی بیستراو و لە ئامرازی ڕادیۆدا پێشکەش بکرێت و وەك دیمەنی بینراو لە تەلەفزیۆندا پەخش بکرێت. لە ئامرازی ڕادیۆدا بریتییە لەو دەنگە بیستراوانەی درامای پەخشکراو، گوزارشت لە هەڵویست و ڕووداو و سروشتی کەسایەتییەکان و ڕەهەندە دەروونییەکان دەکات.

٤- ئامادەکار (معد) :

ئەو کەسەی کارێکی هونەری ئەنجامدەدات، واتە لایەنە هونەرییەکەی دەقی پێشکەشکراو، بۆئەوەی بە شێوەیەکی جوان و ڕێکوپێك پێشکەشی جەماوەر بکرێت و لەگەڵ سروشتی ئامرازەکانی رادیۆ و تەلەفزیۆن بگونجێت، ئەمە لایەنی (گفتوگۆ و سیناریۆ)یش دەگرێتەوە، چونکە ئەم جۆرە هونەرانە وەك ئامادەکردنی (ئینتەرڤیو و کۆڕ و سیمینار) دەگرێتەخۆ.

٥- ئێدیتور (محرر) :

سیفەتی (ئێدیتور) لە ئامرازەکانی رادیۆ و تەلەفزیۆندا بەو کەسە دەگوترێت کە کاری نووسین و ئامادەکردنی (ئێدیت)ی هەواڵەکان ئەنجامدەدات، چ لە ڕێگەی بەشداربوونی لە کۆکردنەوەی زانیارییەکان، یاخود وەك بێژەرێك هەواڵەکان دەنووسرێتەوە و پێشکەش دەکات، واتە ئێدیتۆر لێرە واتای دارشتنی هەواڵەکان

دەگەینێت، ئەویش کارێکە جیاوازە لە کاری دانەر (تالیف)دا، چونکە هیچ شتێك داناهێنێت تەنیا ئەوەی لەبەردەستدایە ڕێکی دەخات و بەپێی یاسا و ڕێسای نووسینی ئەم جۆرە بابەتانە سەرلەنوێ دایدەڕێژێتەوە.

**ب- مەرجەکانی سەرکەوتنی نووسەری بابەتە پەخشکراوەکان :**

نووسەری دەقی پەخشکراو بۆ بە سەرکەوتوویی کارەکەی ئەنجامبدات پێویستە ئەم مەرجانەی هەبێت(٢٤):

١- **بەهرەی خودی و ئامادەبوونی کەسایەتی :** واتە نووسەری دەقی پەخشکراو وەك هەر کەسێك لەبواری داهێنانی هونەری کار دەکات، پێویستە بەهرەی تایبەتی خۆی هەبێت و بەجیا لەگەڵ کەسانی تر بتوانێت ئەم کارەی خۆی بەسەرکەوتوویی ئەنجامبدات.

٢- **تێگەیشتن لە سروشتی ئامرازی بەکارهاتوو و تایبەتمەندییەکانیدا:** پێویستە لەسەر نووسەری دەقی پەخشکراو ئەمەی لەبەرچاو بێت، کە شارەزایی هەبێت لە خاسیەت و سروشتی ئەو هۆکارەی یان ئامرازەی کە لە ڕێگەیەوە دەقەکەی پەخش دەکات. چونکە ئەم نووسەرە نووسەری بابەتێکی ئەدەبی نییە یاخود مامۆستای قوتابخانە نییە تاکو بابەتێك بنووسێت یان وانەیەك بڵێتەوە و ڕاستەوخۆ ئاراستەی جەماوەری بکات، بەڵکو پێویستە لەکاتی نووسینەوەدا بۆ بیستن یان بینین بشێت، لەبەرئەوەی جەماوەرەکە لە ڕێگای گوێ یان چاو زانیارییەکە وەردەگرێت و بەهۆی ئامرازێکی تایبەت وەك ڕادیۆ یان تەلەفزیۆن پێیان دەگات.

٣- **تێگەیشتن لە سروشت و خاسیەتی جەماوەرەکە:** پێویستە نووسەری دەقی پەخشکراو لە سروشت و خاسیەتی ئەو جەماوەرە بگات کە دەقە پەخشکراوەکەیان ئاراستە دەکات، بۆئەوەی ئامانجی خۆی یان مەبەستی نووسینی دەقەکەیان پێی ڕابگەیێنێت وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد.

٤- **نووسەر خاوەن ڕۆشنبیرییەك بێت پەیوەستە بەکاری پەخشکراوی :** واتە نووسەر خاوەن ئەو زانیاری و زانست و هونەر و مەعریفانە بێت کە پەیوەندی بەکاری پەخشکراوی هەیە.

**٥- خاوەن ڕۆشنبیری گشتی بێت :** واتە باگراوەندێکی ڕۆشنبیریی گشتی هەبێت لە هەموو بوارەکاندا، خاوەن کۆمەڵە زانیـاری و بابـەتی گـرنگ و جۆراوجـۆر بێـت، وەك ئـــەو بابەتانـــەی کـــە پەیوەنـــدی بـــە سیاســـەت و مێـــژوو و ئـــابووری و کۆمەلأیەتییەوە هەیە، بۆ ئەوەی لەکاتی پێویستدا یارمەتی نووسـەرەکە بـدات لـە ئەنجامدانی کارەکەیدا.

**٦- هاوژینی واقیعی بێت (التعایش في الواقع) :** واتە پێویستە لەسەر نووسـەر بەشێك لەو کۆمەڵگایە بێت و یەکێك لەوانە بێت و لەناویان بژێت، بۆ ئەوەی نزیکـی کێشە و گرفتەکانیان و هاوخەمیان بێت، چونکە ئەم جۆرە پرسانە بـیری نووسـەر فـراوانتر دەکـات و بـەرەو واقیعیـەتتر دەبـات و کەسـایەتییەکی بـێ سـنووری پێیدەبەخشێت.

**٧- نەرمی و توانای ڕووبەڕووبوونەوەی بەسەرهاتە لەناکاوەکاندا (المفاجئـات) :** لەبەرئەوەی سروشتی ئەم جۆرە بابەتە پەخشکراوانە کـە هـەردەم لـەژێر ڕەوشـی گۆڕاندایـە و هـەموو بوارەکـان دەگرێتـەخۆ، بۆیـە پێویسـتە نووسـەر لـەکاتی ئەنجامدانی کارەکەیدا توانای کۆنترۆڵکردنی هەموو کێشە و گرفتەکانی هەبێت کـە لەنێو بەرنامەکەدا دروستدەبێت، بۆنموونـە هەنـدێ جـار لـەکاتی پێشکەشـکردنی بەرنامەیەکدا، لەوانەیە هەندێ لە میوانەکان ئامـادە نـەبن یـان گۆڕانیـان بەسـەردا بێت و نەتوانن ئامادە بن.

بەگشـتی نووسـەری ئـەم بابەتانـە (دەقـە پەخشـکراوەکان) زۆر سـەرکەوتوو دەبێت، ئەگەر لەکاتی ئامادەکردنی ئەم جـۆرە بابەتانـەدا ڕەچـاوی ئـەم خالأنـەی سەرەوە بکات، چونکە هەر یـەك لـەو مەرجانـەی سـەرەوە بایـەخ و گرنگـی خـۆی هەیە، و ناکرێ تەنها خاوەن یەك مەرج بێت، واتە تـەنیا بـەهرەی خۆیـان هـەبێت، بـەڵکو پێویسـتە لـەکاتی دیـارکراوی خۆیـدا بابەتەکـەی پـەخش بکـات و لەگـەڵ سروشـتی کـاری پەخشـەکە بگونجێـت، وا دەکـات نووسـەرەکە هەنـدێ جـار بابەتەکەی کورتکاتەوە یاخود زانیارییەکی نوێ زێدەباری بکات، لەگەڵ هەموو ئەو مەرجانەی کە لەسەرەوەمان ئاماژە پێدا پێویستە تیایاندا هەبێت.

**سێیەم : پێکهاتەکانی زمانی رادیۆ و تەلەفزیۆن:**

ئەگەر زمانی ڕاگەیاندن بەگشتی پەیوەستە بە هەندێ تایبەتمەندی دیارکراوی خۆیەتی، بەجیا لەگەڵ زمانەکانی تر، ئەوە زمانی رادیۆ و تەلەفزیۆن پەیوەست بە هەندێ تایبەتمەندی خۆی دەبێت کە جیایە لەگەڵ زمانی ئامرازەکانی تری ڕاگەیاندن، وەك (زمانی ڕۆژنامە – زمانی رێکلام – زمانی بلاۆکراوە و پەیوەندییە گشتییەکان). ئەویش لە رێگای ئەو دانە زمانییە بەکارهاتووانەی لەبابەتی پەخشکراودا دەردەکەوێت. چونکە دانە زمانییە تایبەتییەکانی تەلەفزیۆن زیاتر بریتییە لە (لەقتە–گرتە) بە هەموو شێوە و جۆرەکانی، کەچی دانە زمانییەکانی تایبەت بە رادیۆ بریتییە لە (دەنگەکان) بە هەموو پێکهێنەکانەوە، وەك: (قسەکردن – مۆسیقا – کاریگەرییە دەنگییەکان – بێ دەنگی). لێرەدا پێویستە لەسەر هەندێ فاکتەر و دانە زمانییەکانی پێکهاتەی زمانی رادیۆو تەلەفزیۆن رابوەستین و یەکە یەکە ڕوونیان بکەینەوە کە بریتین لەمانەی خوارەوە [٢٥]:

أ- وشەی گۆکراو: وشەی گۆکراو بریتییە لەو وشانەی کە لە ڕێگەیەوە دەقی پەخشکراو لەلایەن بێژەرەوە یان پێشکەشکاری بەرنامە دەخوێندرێتەوە و لەسەر کەسایەتی ئەو پێشکەشکارە ڕادەوەستێت بۆ سەرنجڕاکێشانی زۆرترین ڕێژەیەکی جەماوەری بۆ بەرنامەکەی، ئەویش بە پابەندبوون بەم خاڵانەی خوارەوە[٢٦]:

١– بەکارهێنانی وشە و زاراوەی باو کە لەلایەن گشت خەڵکەوە ناسراوبێت، ئەگەر پێویستە زاراوەیەکی نەناسراو یاخود نوێ بەکاربهێنرێت، دەکرێ وشەکە بە ڕستەیەکی کورت ڕوون بکرێتەوە.

٢– دوورکەوتنەوە لە شێوازی ناڕاستەوخۆ: پێویستە لەسەر نووسەر بۆ نووسینی دەقی پەخشکراو و پێشکەشکردنی زانیارییەکان شێوازێکی راستەوخۆ بەکاربهێنێت بەتایبەتی لە ڕادیۆدا واتە ڕاستەوخۆ گوزارشت لە مەبەستەکەی بکات.

٣– بەکارهێنانی وشەی وەسفی : واتە لەکاتی نووسینی دەقی پەخشکراودا زیاتر وشەی وەسفکردن بەکاربهێنرێت، چونکە بیسەران، پەڕەگرافەکانی بەرنامەکە نابینن، بەڵکو لە ڕێگەی بیستنەوە خەیاڵیان بۆ دەچێت، بۆیە پێویستە لە ڕێگەی بەکارهێنانی چەند وشەیەکی وەسفییەوە یارمەتی بیسەر بدات بە

خەياڵی خۆی دیمەنەکەی بێتە بەرچاو واتە لە ڕێگەی دەنگەکانەوە وێنەکان دروستدەکرێت بۆ ئەوەی لە چەمکەکە بگەن.

٤- ڕێزگرتن لە وشەی گوتراو (خۆش گوتن) : لە ڕێگای خوێندنەوەی دەقی پەخشکراودا دەردەکەوێت، واتە دەقەکە بە شێوەیەك بخوێنرێتەوە وەکو ئەوەی چیرۆکێك بۆ بیسەران دەگێڕدرێتەوە ئەویش لە ڕێگای بەکارهێنانی دەنگی جۆراوجۆر و دەستەواژەی جیاواز و لە ڕێگای خوێندنەوە ئاوازی هەمەجۆر و لە هەموو پەرەگرافەکانی تر بەکاربهێنرێت.

**ب- مۆسیقا** : مۆسیقا یەکێکە لە فاکتەرە سەرەکییەکانی پێکهاتەی بەرنامەی پەخشکراودا کە بۆ چەندین مەبەست بەکاردێت، بۆنموونە [٢٧]:

١- مۆسیقا وەك بەرنامەی سەربەخۆ بەکاردێت: لەم شێوە مۆسیقایە، جۆری مۆسیقای زیندوو و تۆمارکراو پێشکەش دەکرێت، هەروەها مۆسیقا تۆمارکراوەکە لەسەر کاسێت و سیدی دەبێت.

٢- مۆسیقا وەك ئاوازێکی تایبەت بۆ بەرنامە بەکاردێت: هەموو بەرنامە پەخشکراوەکان بەشێکی تایبەتییان هەیە بۆ مۆسیقا (بەشی مۆسیقا)، بەرنامەکەش چ هەواڵی بێت یان گفتوگۆ یان ڕیپۆرتاژ یان دراما بێت، بەشێکی بۆ مۆسیقا تەرخاندەکرێت، جا چ وەك سەرەتا یان بەش بەش یان کۆتایی دێت.

٣- مۆسیقای لێکدەر (بۆ گرێدان یان بەستنی بەشەکانی بەرنامە بەیەکەوە): لەم حاڵەتەدا مۆسیقا لەنێوان پەرەگرافەکانی بەرنامەکە بەکاردێن، وەك جیاکەرەوە لەنێوان بەشەکانی بەرنامە بەکار دەهێنرێت.

٤- مۆسیقا وەك ئاماژەدانێك بۆ شتی تایبەت: مۆسیقا وەك ئاماژەیەك بەکاردێت بۆ گۆڕانی کات یاخود شوێن، ئەویش لەسەر درێژی و کورتی ماوەی مۆسیقاکە ڕادەوەستێت.

٥- بەکارهێنانی مۆسیقا وەك باگراوەندێك: دەکرێ هەندێ جار مۆسیقا وەك باگراوەندی بەرنامەیەك بەکاربێت لە ڕێگەی تێکەڵکردنی دوو دەنگ بەیەکەوە، بۆنموونە بەکارهێنانی وشەی گوتراو لەگەڵ مۆسیقا لە هەمانکاتدا بەیەکەوە.

٦- بەکارهێنانی مۆسیقا وەك هۆکارێکی دەنگی کاریگەر: هەندێ جار مۆسیقا لـەکاتی پێشکەشـکردنی درامـادا لـەنێو ڕووداوەکـانی ئەڵقـە درامییەکـەدا، وەك ئاماژەکارێك بەکاردێت.

٧- مۆسـیقای پێشـەکی: لـە هەنـدێ بەرنامـەی تایبەتـدا وەك بەرنامـەکانی تایبـەت بـە گـەنج و لاوان ئـەو مۆسـیقایە پێشـەکییە بـەکاردێت، ئـەوەیش پـێش دەستپێکردنی بەرنامەکە لێدەدرێت.

بەگشــتی بایــەخی پێکهاتــەی مۆســیقا لــەکاتی پێشکەشــکردنی بابەتــە پەخشـکراوەکاندا دەردەکـەوێت، بۆیـە بـۆ بەرهـەمهێنانی ئـەم جـۆرە بەرنامانـە پێویستە ئەرشیفێکی تایبەت بەمۆسیقا دابنرێت.

**پ- کاریگەرییە دەنگییەکان** : ئەو دەنگانەن کە تۆمار دەکرێن [٢٨]، دوو جـۆر لەکاریگەرییە دەنگییەکان هەیە:

١- کاریگەرییە دەنگییە زیندوو و سروشتییەکان : ئەمەش بریتییە لەو جـۆرە دەنگانە کە لەناو ستۆدیۆکان تۆمار دەکرێن وەك دەنگی هەنگاوەکان (پێ لـەکاتی ڕۆیشتن و ڕاوەستان) یان دەنگی دەرگا (لەکاتی کردنەوە و داخستنی).

٢- کاریگەرییە دەنگییە تۆمارکراوەکان : ئەمەش ئەو دەنگانە دەگرێتەوە کـە پێشتر لەدەرەوەی ستۆدیۆ تۆمارکراون، وەك دەنگی شەپۆڵەکانی دەریـا، دەنگـی باو هەوا، دەنگی برووسك و بارانی توند.

لێرەدا دەکرێ ئاماژە بـە مەبەسـتە سـەرەکییەکانی بـەکارهێنانی کاریگەرییـە دەنگییەکان بکەین کە بەم شێوەیەی خوارەوە دەردەکەوێت :

١- **بۆ ئامـاژەدان بـە شـوێنێك** : بۆنموونـە وەك دەنگـی سـەیارە، قەڵـەباڵغی جادە.

٢- **بۆ ئاماژەدان بە کاتێکی دیارکراو** : بۆنموونە دەنگی بولبول بۆ ئامـاژەدان بەکاتی بەیانییان.

٣- **ئامــاژەدان بــە هەڵویســتێکی نوانــدن** : بۆنموونـە دەنگـی جەسـتەیەك بەزەوییەوە بکەوێت.

**٤-ئاماژەدان بە حاڵەتێکی دەروونی :** بۆ نموونە وەك دەنگی ترس - چاوەڕوانی.

**٥-ئاماژەدان بەسەرەتا و کۆتایی :** وەك هەندێ مۆسیقای تایبەت بەسەرەتا و کۆتایی بەرنامەیەك یاخود ئەڵقەیەکی درامی (وەك دەنگی چەپڵە و لابردنی پەردە بۆ سەرەتا و هاواری بینەران بۆ کۆتایی بەرنامەکە یان ئەڵقەکە).

هەروەها شێوازی سازدانی دەنگە پێکهێنەرەکانی بەرنامەیەکی پەخشکراودا بەم شێوەیە ئەنجامدەدرێت:

١- (بڕین - قطع - Cutting ) : وەك بڕینی دەنگێك و بۆ دەنگێکی تر بگۆڕێت.

٢- (تێکەڵکردن - المزج - Mixing ): واتە دوو دەنگ لەیەك کات تێکەڵ بکرێت، وەك دەنگی بێژەر لەگەڵ مۆسیقایەکی باگراوەند بۆ قسەکانی.

٣- دەرکەوتن و لاچوونی سەبر (تەدریجی) (Fade In - Out ): وەك دەرکەوتنی دەنگێك و سەبر سەبر لادەچێت.

٤- دەرکەوتن و لاچوونی ناوەوە (Cross Fade): لەم حاڵەتە دەرکەوتنی دەنگێك کاتی دەنگێکی تر لادەچێت دێتەوە.

٥- نەمانی دەنگەکە بەشێوەیەکی بەش بەش (Partial Fade): واتە نزمبوونەوەی ئاستی دەنگێك تا ڕێگە بدات بۆ بەرزبوونەوەی دەنگێکی تر.

٦- دەرکەوتن و لاچوونی یەکجارەکی (Board Fade In - Out): واتە ماوەیەك دەخایێنێت لەنێوان دوو دەنگدا تاکو دەنگێك بۆ دەنگێکی تر بگۆڕێت یان لاچوونی دەنگێك و دەسپێکردن و دەرچوونی دەنگێکی تر، وەك ئەوەی لە درامادا دەردەکەوێت کاتێ دیمەنێك کۆتایی دێت بۆ دەستپێکردنی دیمەنێکی دیکە.

**ت- لەقەتات - گرتەکان:** لەقتە - گرتە بریتییە لەو وێنەیەی کە لەگەڵ پەنجە دانان لەسەر دوگمەی تۆمارکردن و لابردنی پەنجەکە تەواو دەبێت، بەڵام دیمەن بریتییە لە کۆمەڵە لەقەتاتی - گرتەی بەدوایەکترهاتوو، کە لەکات و شوێنێکی دیارکراودا ئەنجامدەدرێت[٢٩]. لەقتەکان-گرتەکان لە تەلەفزیۆن زیاترە و بەلەقەتاتی-گرتەکانی ناویەکە ناسراوە، وەك گرتەی کورت و گرتەی درێژ،

هەروەها چەندین قەبارەی جیاوازمان هەیە کە بەپێی کورتی و درێژی گرتەکان دەگۆڕێت و لەسەر چەند بنەمایەکی تایبەتی دامەزراون، بۆ نموونە ئەم جۆرە لەقەتاتانە– گرتانە هەیە:

١- **لەقتە- گرتەی نزیك** (close up shot) : بۆ (دەربڕینی نزیکی دەموچاو (پۆرترێت). دووپاتکردنەوەی هەندێ بەشی تایبەت و گرنگ. ڕوونکردنەوەی هەندێ وردەکاری. ئاڕاستەکردنی تەرکیز بۆ هەندێ بابەت).

٢- **لەقتە – گرتەی دوور** (Far shot) : بۆ (شوێنی ڕووداو و ڕەوشی گشتی نیشان دەدات. بەدواداچوونی هەموو جوولە و هەڵوێستەکان. پەیوەندی نێوان شتەکان نیشان دەدات).

٣- **لەقتە – گرتەی مامناوەند** (Medium shot) : لەنێوان لەقتەی – گرتەی نزیك و دوور ڕادەوەستێت.

٤- **لەقتە – گرتەی درێژ (دووردرێژ)** (Long shot) : بۆ (شارەزایی پەیداکردن لەبارەی شوێنی گەورە وەك لە فلیمە مێژووییەکان، ناسینی ڕەوشی گشتی شوێنەکە، پەیوەندی نێوان کۆمەڵەکان ئاشکرا دەکات).

**چوارەم : زمانی هەواڵ لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆندا**

بۆ ئەوەی هەواڵ ئامانجی خۆی بەجێ بگەیێنێت، پێویستە ئەم چوار فاکتەرەی تێدا هەبێت : (وردی–الدقة، خێرایی–السرعة، ئاشکرایی–الوضوح، بابەتی–الموضوعية)، ئەمەش پەیوەستە بەکۆمەڵە فاکتەری سەرەکی بۆ نووسینەوە کە بەم شێوەیەی خوارەوە دەردەکەوێت:

**أ- بنەماکانی نووسینی هەواڵی پەخشکراو:**

لەپاش کۆکردنەوەی هەواڵە پێویستەکان و دەگاتە دەزگای پەخشکراودا چ (ڕادیۆ یان تەلەفزیۆن) بێت، یان ئەو هەواڵانەی کە بۆ بڵاوکردنەوە دەشێت، دەدرێتە بەرپرسی دەزگاکە و هەواڵەکان لەلایەن سەرنووسەرەکە پێدادەچێتەوە و کورت دەکرێنەوە، کە پێشتر ئەم هەواڵانە لەلایەن هەندێ لەو نووسەرانەی کە لەوێ کار دەکەن، بەشێوەیەك دەنووسرێن لەگەڵ ئەو ئامرازە پەخشکراوەیە (ڕادیۆ یان تەلەفزیۆن) بگونجێت، و هەریەکە لەو کەسانە (ئێدیتۆر)انە تایبەتمەندن

بەکاروبارێکی تایبەت وەك: ئێدیتەری (کاروباری سیاسی – کاروباری ئابووری – کاروباری وەرزشی – کاروباری کۆمەلأیەتی) و بابەتەکانیان دابەش دەکرێن، بەلأم لەگەلٚ ئەوەشدا هەندێ مەرجی تایبەتی لەکاتی نووسینی هەواڵی پەخشکراودا پێویستە ڕەچاو بکرێت[٣٠]: (یەکەم : پێویستی کورتی و چڕی، دووەم: پێویستی ئاسانی و ئاشکرایی، سێیەم: پێویستی خێرایی و زوو فریاکەوتن، چوارەم : پێویستی ڕەچاوکردنی ناوەکان، پێنجەم : پێویستی زانینی سەرچاوەی هەواڵەکان).

ب- بەشەکانی نووسینی هەواڵی پەخشکراو :

زۆرجار پرسیارێك دێتەئاراوە چۆن هەواڵی پەخشکراو دەنووسرێت؟ بۆ وەلأمدانەوەی ئەم پرسیارە پێویستە بزانین دەقی هەواڵ لە چی پێکدێت، ئەویش لەچەند بەشێکدا پێکدێت[٣١]: (پێشەکی (افتتاح)، جەستەی هەواڵ (ناوەڕۆك )، کۆتایی (الختام).

١- **پێشەکی (افتتاح – Lead)** : لەکاتی دارشتنی هەواڵەکاندا بەشێوازی (پەرەمێدی سەراوژێرکراو–هەرەمی هەلگەڕاو) کە شێوازی هەرە باوی ڕۆژنامەگەرییە، بەگرنگترین بەشەکانی هەواڵ (ڕووداو) دەست پێ دەکات و بەکەمتر گرنگنیان کۆتایی دێت.

٢- **جەستەی هەواڵ (The body) (ناوەڕۆك)**: واتە مەبەست لە چیرۆکەکەیەتی کە دەبێ بەهەموو وردەکارییەکانەوە باس بکرێت و پێداپچێتەوە.

٣- **کۆتایی (الختام) (Closes)**: لە ڕێگای نووسەری هەواڵەکە بە ڕستەیەکی کورت کۆتایی پێ دێنێت.

پ- پێشکەشکردنی هەواڵەکان (دەنگوباس) :

لە دارشتنی هەواڵ و میکانیزمی پێشکەشکردنی هەواڵ پێك دێت، لێرەدا پێویستە میکانیزمی پێشکەشکردنی هەواڵەکان ڕەچاوبکرێن بۆ ئەوەی هەواڵەکان بەڕێکوپێکی بگاتە وەرگر ئەویش لەم خالأنە دەردەکەوێت[٣٢]: (١– دەربڕینی دەنگی باش، ٢– ئاسانی و ئاشکرایی، ٣– گونجان لەگەڵ چیرۆکی هەواڵی، ٤– تێگەیشتن لە سروشتی کارکردن لەگەلٚ مایکرۆفۆن، ٥– ڕەزامەندی جەماوەر).

**ت- هەواڵ لە تەلەفزیۆندا :**

ئەو بنەمایە سەرەکییانەی کە لەسەر هەواڵی پەخشکراوی رادیۆ دەچەسپێت، بەهەمان شێوە لەسەر هەواڵی پەخشکراوی تەلەفزیۆنی پراکتیزە دەکرێت، بەلاّم ئەوە مانای ئەوە ناگەیێنی کە هیچ جیاوازی لە نێوانیاندا نییە، واتە لەنێوان (ڕادیۆ و تەلەفزیۆن) چونکە تەلەفزیۆن زیاتر متمانە لەسەر (لەقتەکان – گرتەکان) دەکات و ڕادیۆش متمانە لەسەر (دەنگەکان) دەکات، کەچی هەندێ جیاوازی تەلەفزیۆن بەم شێوەیە دەردەکەوێت[٣٣] :

**هەڵبژاردنی گرتەکان - لەقتەکان:** بەپێی ئەم فاکتەرانە دەستنیشان دەکرێن: (١–جوولە Action، ٢– گرتەی تەواوکەرەکان cover shots، ٣– گرتەی کاردانەوە (رد فعل) Reaction shots، ٤– زنجیرە بەدوایەکداهاتنی گرتەکان Sequence). هەروەها جۆری گرتەکانیش دەگۆڕێت، بەم شێوەیە: (١–گرتەکانی دەنگی بینراو: Sound Bites، ٢– گرتەکانی ناوەند : Cut Aways لەم دوو بەشە پێکدێت: (گرتەی پێچەوانە: Reverse، گرتەی بێدەنگی: Video – Only). ٣–گرتەی راپۆرتی: Stand up لەم سێ بەشە پێکدێت: (گرتەی ئیفتیتاحی: Openers، گرتەی لێکدەر: Bridges، گرتەی کۆتایی: Closes).

## تەوەری سێیەم: زمانی ڕۆژنامەگەری و شێوازەکانی:

هەر وەکو زانراوە پێشتر ڕەخنەگران و شارەزایانی ئەدەب، بەشێوەیەکی سادە و ساکار پێناسەی پەخشانیان کردووە، ئەو نووسینانە دەگرێتەوە کە بێ کێش وسەروان و بۆ سێ جۆری پەخشانیان دەستنیشان کردووە(٣٤):

١- پەخشانی سادە: ئەو شێوەیەی کە لەلایەن گشتی خەڵکەوە بەکاردێت بۆ ئاخاوتنی ئاسایی خۆیان بێ ئەوەی شتێکی هونەری یاخود فیکری تیایدا دابڕێژرێت، بەڵکو شێوەیەکی سادە بەکاردێنن بۆ دەربرین لە پێداویستییەکانی خۆیان کە دەبێتە زمانی ئاخاوتنی ڕۆژانەیان.

٢- پەخشانی زانستی: ئەو جۆرە نووسینانە دەگرێتەوە کە لە ڕێگایەوە ڕاستییە زانستییەکان دەخرێتەڕوو و بەشێوەیەکی زانستییەوە بابەتەکان دادەڕێژرێتەوە بێ ئەوەی کاری هونەری تێدا ئەنجام بدرێت، بەڵکو زیاتر زاراوە زانستییەکان تیایدا بەکاردێت.

٣- پەخشانی هونەری: ئەم شێوازە زمانەیە یاخود ئەو جۆرە نووسینانە دەگرێتەوە کە لە ڕێگایەوە کاری هونەری تێدا ئەنجامدەدرێت و لە زمانانی دیکەدا جیاوازە، لە ڕێگای بەکارهێنانی دەربرینی هەمەچەشن و زاراوە جۆراوجۆرەکان دەخرێتە ڕوو و دەبێتە هۆی بەخشینی واتای هەمەجۆر.

نووسینی ڕۆژنامەگەری وەك هونەرێکی تایبەت بەنووسین بۆ جۆرێکی پەخشانی چوارەم پۆلێن دەکرێت، ئەویش بە پەخشانی پراکتیکی یان ڕۆژنامەوانی ناودەبرێت ئەمە زیاتر لەدوای سەرهەڵدانی دیاردەی ڕۆژنامەگەری گەشەی کرد، پەرەسەندنی ئەم جۆرە نووسینانەش کە بەنێو نووسینەکانی دیکە بڵاوتر بووە جەختیان لەسەر ئەوە کرد کە ئەم جۆرە شێوازەیە لە ناوەندی نووسینەکانی دیکە ڕادەوەستێت، نێوان پەخشانی هونەری واتە زمانی ئەدەب و پەخشانی سادە واتە زمانی ئاخاوتنی ڕۆژانەی خەڵك. کەواتە نووسینی ڕۆژنامەگەری وەك کارێکی تەکنیکی لەبواری نووسیندا پەیڕەو دەکرێت، پەیوەستە بە هەڵبژاردنی شێوازێکی تایبەت و پڕۆفیشنال هەیە، بتوانێت لەنێوان ئەو جۆرە نووسینە جیاوازانە ڕابوەستێت و بوونی خۆی بسەلمێنێت و تایبەتمەندی خۆی لەوانی دیکەوە جیاکاتەوە، بەڵام لە هەمانکاتدا هەندێ لە تایبەتمەندییەکانی جۆرەکانی

تر وەربگرێت و بەشێوەیەك بەکاربێت کە سوودی هەبێت بۆ جۆر و تەکنیکی نووسینی خۆی، نووسینی ڕۆژنامەگەری واتە لە پەخشانی سادە سیفەتی سادەیی و ئاسانی و ڕاستەوخۆیی و میللییەکەی وەربگرێت و لە پەخشانی هونەریش لە شێوەی دەربڕین و هونەرییەکەی وەربگرێت و لەپەخشانی زانستی لەشێوەی فیکری و بابەتییەکەی وەربگرێت، هەندێ لە زانایان بەم جۆرە نووسینانە دەڵێن (ئەدەبی خێرایی). بەشێوەیەکی گشتی بۆ زمانی ڕاگەیاندن کۆمەڵە تایبەتمەندی بۆ تەرخان کراوە بەڵام لەهەر یەك لە ئامرازەکانی یاخود هۆکارەکانی ڕاگەیاندن یاخود کەناڵەکانی گەیاندن وەك (ڕۆژنامە و ڕادیۆ و تەلەفزیۆن) تایبەتمەندی جیاوازی خۆی لەنووسین و ئامادەکردنی بابەتەکان بۆ دانراوە، جا بۆ زمانی ڕۆژنامەگەری ئەم تایبەتمەندییانە دەستنیشان کراوە [٣٥]:

١- ساکاری (البساطة): ساکاری لە زمانی ڕۆژنامەگەریدا پێویستە چونکە شێوازی نووسینی ڕۆژنامەگەری پێویستە بۆخوێنەران ڕوون بێت، ئەمەش لە ڕێگای بەکارهێنانی زمانێکی ئاسان ئەنجامدەدرێت، بۆ گەیشتن بەئامانجی خۆی بێئەوەی پەنا بباتە بەر هەندێ وشەی قورس و نامۆ کە خوێنەر لەکاتی خوێندنەوەی بابەتەکەدا زەحمەتییەك بێتە پێش، بەڵام لە هەمانکاتیشدا ئەوە ناگەیێنێ کەوا زمانێکی زۆر ئاسان بەکاربێت بۆ نووسینی رۆژنامەگەریی وەك زمانی ڕۆژانەی خەڵك.

٢- وردی و بەرجەستەبوون (الدقة والتجسيد): لەوانەیە شێوازەی نووسینی ئاسان بەرەو ڕوون و ئاشکراییمان ببات، بەڵام وردی و چڕی زۆر پێویستە بۆ نووسینی ڕۆژنامەگەری چونکە بابەتەکە لە مەسەلەکانی درێژدادڕی و بزربوونی لەناو وشەی نامۆ و نادیار دووردەکەوێت، ئەم شێوازە نووسینەیە لەم گرفتانەی ڕزگار دەکات. هەروەها وردی لە هەڵبژاردنی وشەکاندا کە گوزارشت لە ڕەوش و حاڵەتی ڕووداوەکە یاخود باری دەروونی ڕاستەقینەی کەسەکاندا دەکات، دەربڕینێکی ڕاستەوخۆیە، بێئەوەی هیچ جۆرە دڵەڕاوکێ بۆ تێگەیشتن لەواتای مەبەستەکەدا بۆ خوێنەران دروست بکات.

٣- شارەزابوون لە زماندا: لەبەرئەوەی ئەم جۆرە نووسینە رۆژنامەگەرییە لە ڕێگای نووسینەوە بلاْودەکرێتەوە، بۆیە پێویستە لەسەر ڕۆژنامەنووس

شارەزاییەکی تەواوی هەبێت لەو زمانەی کە پێی دەنووسێت، بەوەی ئاگای لەهەموو ئەو یاسا و ڕێسانەی تایبەت بەو زمانە و پابەندبوونی بە ڕێنووسەکەی و زاڵبوونی بەسەر (ڕێزمان)ەکەی و تەواوی زمانەکەدا بێت، بۆئەوەی توانای پەیڕەوکردنی ڕاست و دروستی لە زمانەکەدا هەبێت و بەکارهێنانی (دانە واتاییەکان)ی زمان وەك (مۆرفیم و وشە و ڕستە لەگەڵ هەموو نیشانەکانی خاڵبەندی) بەشێوەیەکی تەواو، چونکە شێوازی نووسینی ڕۆژنامەگەری پێویستە بەم یاسایانەی سەرەوە پابەند بێت.

٤- پابەندبوون بەهەندێ یاسا و ڕێسای ڕێزمانی تایبەت بەزمان : شێوازی ڕۆژنامەگەریی بەکارهێنانی ئەو کارانەی کەوا بکەریان دیارە لەجیاتی بکەری نادیار، بەکارهێنانی ڕستەی کورت لەجیاتی ڕستەی درێژ، ڕستەی سادە لەجیاتی ڕستەی ئاوێتە و لێکدراو، دوورکەوتنەوە لەو ڕستانەی کە چەند زاراوەیەکی نادیار و نامۆ تیایدا بەکارهاتووە و خوێنەر دەشێوێنێ، و لەجیاتی ئەوە ڕستەی دیار و ئاشکراو ڕوون بەکار بهێنرێت.

پابەندبوونی ڕۆژنامەنووسان بەشێوازەی نووسینەوە بۆ دوو هۆ دەگەڕێتەوە:

١- هۆی خێرایی: چونکە خێرایی ژیانی ڕۆژانە وای کردووە زۆر زەحمەت بێت ڕۆژنامەنووس بتوانێت کاتێکی پێویست بۆنووسینی بابەتێك یاخود نووسینێکی ڕۆژنامەگەری تەرخان بکات، بە شێوەیەکی ئەدەبی دابڕێژێت و کاری هونەری تیایدا ئەنجامبدات، بەتایبەتی لە کاتی ئامادەکردنی هەواڵی ڕۆژانەدا کە پێویستە بە زووترین کات ئامادەبکرێت و بڵاوبکرێتەوە یاخود پێشکەش بکرێت، چونکە ئامادەکردنی بابەتێکی ڕۆژنامەگەری لە کاتێکی زۆر کەموتەسکدا ناکرێت و زەحمەتە بێتە ئەنجام، ڕۆژنامەنووسان ئەو کاتەیان نییە بۆ نووسینی بابەتێکی ڕۆژنامەگەری بە دەربڕینێکی ئەدەبیی بەرز و قورس.

٢- هۆی دووەم بەندە بە جەماوەرەکە: ئەمەش پەیوەستە بە مەسەلەی خێرایی چونکە وەرگر ئەو کات و هێزەی یاخود (هەناسەدرێژە)ی نییە کە بەدوورودرێژی لەسەر بابەتێکی ڕۆژنامەگەری ڕابوەستێت و بخوێنێتەوە، زۆربەی خوێنەرانیش حەزدەکەن هەواڵەکان بە شێوازێکی ئاسان پێشکەشیان بکرێت چونکە زۆربەی خوێنەران ئاستی ڕۆشنبیرییان لە ئاستی مامناوەندیدایە.

أ- نووسینی رۆژنامەگەریی (ئیدێتن- التحریر-Editing) وەك لایەنێكی زمانەوانی:

نووسینی ڕۆژنامەگەری یان کاری نووسینی هونەری ڕۆژنامەگەری (ڕۆژنامە بێت یان گۆڤار) بە بناغەی یان بنچینە و فاکتەری سەرەکی کاری داهێنانی ڕۆژنامەگەری دەژمێردرێت، شانبەشانی فۆتۆی ڕۆژنامەگەری (فۆتۆجورنالیزم) و ڕێکلام و دەرهێنانی ڕۆژنامەگەری، چونکە بێ (نووسین-تحریر) ئامرازی پێشکەشکردنی ناوەڕۆکی ڕۆژنامەگەری بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش و ئاسان و سادە نابێت، کە لە ڕێگەیەوە خوێنەر بتوانێت بە ڕێکوپێکی بابەتەکان بخوینێت[٣٦]. نووسین - التحریر (Edit) : کارێکی هونەریی نووسینە یان هونەری نووسینی ڕۆژنامەگەرییە، یەکێکە لە هونەرەکانی نووسینی واقیعی، هەموو ئەو ڕووداو و بەسەرهات و بیر و بۆچوونانەی بەگشتی لەسنوورە هزرییەکەیەوە بۆ زمانێکی نووسراوی ڕوون و ئاشکرا دەگوازێتەوە، هەروەها پشت بە شێوازی زانستی ئەدەبی (مامناوەندی) دەبەستێت، کە لە ڕێگایەوە ناوەڕۆکی بابەتەکەوە بۆ سەر لاپەڕەکانی دەگوازێتەوە[٣٧]. بەوپێیەش هونەری نووسینی ڕۆژنامەگەری وەك هەنگاوێك لە هەنگاوەکانی دەرکردنی ڕۆژنامە، کارێکی ڕۆژانەیە یاخود هەفتانەیە بەپێی دەرچوونی ڕۆژنامەکە یاخود گۆڤارەکە هەڵدەستێت بە داڕشتنی هونەری یان نووسینی ناوەرۆکی بابەتەکە و پێداچوونەوە و چاکردنەوەی ناوەڕۆکی بابەتەکە بەپێی پێویست، وەك قالبێكی هونەری دیارکراوی ڕۆژنامەگەری یان بەپێی سیاسەتی ڕۆژنامەکە کە لەسەری دەڕوات دەینووسێتەوە، چونکە ڕۆژنامەنووس بەپێی ئەو قالبەی کە خۆی هەڵیبژاردووە بابەتەکەی ئامادە دەکات، پاشان نووسەری بەرپرس دیسان پێیدەچێتەوە و چاکی دەکاتەوە، واتە کاری نووسین (writing) ئەنجامدەدرێت پاشان کاری ئیدیت (التحریر-Editing) دەکرێت کە بەمانای ئامادەکردنی نووسینەکانی کەسانی دیکە دێت، هەر لەمەشەوە ناوی نووسەر و سەرنووسەر هاتووە، نووسەری باشیش (ئیدیتۆر- المحرر) ئەو کەسەیە کە بابەتێك یاخود هەواڵێك ئامادە دەکات بێئەوەی پێویستی بە کاری (ئیدیتۆر-تحریر) هەبێت، واتە بێئەوەی بابەتەکەی دووبارە پێدابچێتەوە و سەرلەنوێ دایبڕێژتەوە، وەك لابردنی

هەندێ وشە یان زیادکردنی چەند وشەیەکی تر یان گۆڕینی شێواز یان سەرلەنوێ دارشتنی ناوەڕۆکەکەی یان دووبارە دروستکردنی پێکهاتەی هونەری بابەتەکە.

**ب- ئامانجی نووسینی ڕۆژنامەگەری (ئیدیت - تحریر):**

ئامانجی نووسینی ڕۆژنامەگەری وەك کارێکی هونەری ڕۆژنامەگەری، هەنگاوێك لە هەنگاوەکانی دەرکردنی ڕۆژنامە بۆ بەدەستهێنانی ئەم خاڵانەی خوارەوە ئەنجامدەدرێت [٣٨]:

١- ئامادەکردنی دەقی ڕۆژنامەگەریی چ هەواڵ یان بابەتی تر بێت، کە لەگەڵ سیاسەتی ڕۆژنامەکە بگونجێت.

٢- ئاگاداربوون لە هەموو هەڵەیەکی نووسین کە لەوانەیە لەناو دەقەکەدا بەدی بکرێت وەك (ژمارەکان-ناوەکان- پایتەختی ولاتەکان- کەسایەتییەکان - هتد).

٣- پێویستە دەقەکە لەو ڕووپەڕەی کە بۆی تەرخان کراوە زیاتر نەبێت.

٤- ئاسانکردن و چاککردنەوەی زمانی دەقەکە.

٥- ڕوونکردنەوەی واتای دەقی ڕۆژنامەگەرییەکە و زیندووکردنەوەی.

٦- پێداچوونەوەی دەقی ڕۆژنامەگەریی لەپێناو گەیاندنی بە شێوەیەکی بابەتی و لۆژیکی.

٧- چاککردنی شێوەزاری دەقی ڕۆژنامەگەری لەکاتی پێویست.

٨- ئامادەکردنی دەقی ڕۆژنامەگەری بەشێوەیەك سەرنجی خوێنەر ڕابکیشێت.

٩- داهێنانی جۆرێك لە هارمۆنییەت و تێکەڵکردنی شێوازەیی لە نێوان دەقە ڕۆژنامەگەرییە ئامادەکراوەکان چ (بابەت- هەواڵ- مادە) بێت.

١٠- ئاسانکاری لەکاری دەرهێنانی ڕۆژنامەگەری.

بۆ گەیشتن بەم ئامانجانە پێویستە ڕۆژنامەنووس-ئیدیتۆر ئەم کارانەی خوارەوە ئەنجام بدات [٣٩]:

١- دڵنیابوون (جەختکردنەوە-التأکد) لە ڕاستی بەڵگە و بەیاناتە بەکارهاتووەکانی دەقی ڕۆژنامەگەری، ئەویش لەچەند ڕێگەیەکەوە دەستدەکەوێت، بە گفتوگۆ لەگەڵ نووسەر یان سەرنووسەری ڕۆژنامەکە یان

لە ڕێگەی پرسیارکردن لە پسپۆڕێکی تایبەت بە دەزگای زانیاری یان بەدەزگای ڕۆژنامەگەری، یان لە بانکی زانیاری لەدەرەوەی کاری ڕۆژنامەگەری.

٢- کورتکردنەوەی وشە و ڕستە و پەڕەگرافی زیاد، کە پێویستی پێ نییە.

٣- دووبارەکردنەوەی داڕشتنی دەق بەگشتی لەپێناو باشکردنی دەقەکە لە ڕووی زمانەوانی و زمان پاراوی.

٤- دووبارەکردنەوەی داڕشتنی دەقی ڕۆژنامەگەری بەئامانجی داهێنانی جۆرێك لە گونجان و هەماهەنگی (تنسیق) شێوازەیی.

٥- سڕینەوەی ئەو وشە و ڕستە و زاراوە قورسانەی کە خوێندنەوەیان زۆر زەحمەتە.

٦- لابردنی هەندێ وشە و ڕستە و زاراوەی نابەجێ کە لە ڕووی یاسای چاپەمەنی و بلاوکردنەوە قەدەغەن، یان لەگەڵ چێژی گشتی خەڵك ناگونجێن.

٧- کورتکردنەوەی دەقی ڕۆژنامەگەری کە لەگەڵ ئەو پانتاییەی بۆی دانراوە بگونجێ.

٨- تەواوکردنی دەقی ڕۆژنامەگەری بەهەندێ زانیاری لە ڕووی ناوەڕۆکەوە بۆ ئەوەی هەموو لایەنەکانی بیرۆکەی گەیاندنی (هەواڵ و ڕیپۆرتاژەکان)ی ڕۆژنامەگەری بگرێتەوە.

٩- دووبارە داڕشتنی ناونیشانەکانی تایبەت بە دەقی ڕۆژنامەگەری، ناونیشانی سەرەکی و لاوەکی، چونکە ناونیشانی دەق فاکتەرێکی بەهێز و گرنگە بۆ هێورکردنی خوێنەر لە ڕووی بینین ولە ڕووی فیکرییەوە، هەروا دانانی ناونیشانی پێویست لەکاتی نەبوونی.

١٠- تێکەڵکردنی دوو دەقی ڕۆژنامەگەری (بەتایبەتی هەواڵەکان) لەکاتی پێویست، یان دانانی نیشانەیەك لەکۆتایی هەر دەقێکی دیکەی ڕۆژنامەگەری.

**پ- شێوازی ڕۆژنامەگەری (الاسلوب الصحفی):**

لە ڕوانگەی سروشتی ڕۆژنامەگەری چ ڕۆژنامە بێت یان گۆڤار (بۆ نموونە ڕۆژنامەی خەبات) وەك ئامرازێکی ڕاگەیاندن هەندێ خەسڵەت و تایبەتمەندی خۆی هەیە وەك فۆرمێکی چاپکراو بۆ بلاوکردنەوە بەپێی خولێکی دیارکراو دەردەچێت

جا رۆژانە بێت یاخود هەفتانە بەپێی ئەو ماوەیەی بۆی تەرخان کراوە، ئاراستەی جەماوەری جۆراوجۆر دەکرێت، کە لە ڕووی ئاستی ڕۆشنبیری و کۆمەلأیەتی و پیشەییدا جیاوازن، بۆیە بابەتەکانی ڕۆژنامەگەری پێویستی بە شێوازێکی نووسین یان زمانێکی تایبەت هەیە کە لەنێو ئامرازەکانی ڕۆژنامەگەری بەکاربهێنرێت، هەروەها خاوەن سیما و تایبەتمەندیی دیارکراو بێت. ئەم شێوازە لە نووسینی ڕۆژنامەگەری لە ڕێگای هەندێ تایبەتمەندیی پەیوەست بە سروشتی ڕۆژنامەکە خۆیەوە پەیڕەو دەکرێت، وەك ئامرازێکی گەیاندن لە ڕووی قەبارە و ڕووپەڕ و لایەنی تەکنیکی و جۆری دەرچوونی یان کاتی دەرچوونی کە پێویستی بەخێرایی هەیە، هەروەها کورتی و چڕی بابەتەکان کە جەخت لەسەر (هەواڵ) بکات وەك پیشەیەکی سەرەکی کاری ڕۆژنامەگەری، ئەویش پەیوەستە بەهۆکاری خێرایی و گەیاندنی هەواڵەکان بۆ هەموو چین و توێژێکی کۆمەڵ[٤٠]. لەلایەکی ترەوە لەبەر ڕەوشی گۆڕانی بەردەوامی سەردەم و پێشبڕکێی ئامرازەکانی ڕاگەیاندن و ئاوێتەبوونی ڕووداو و بەسەرهاتەکانی ژیان، هەندێ شێوازی دیکەی ڕۆژنامەگەری پەیدابوون کە پێشتر لە ڕۆژنامەکاندا پەیڕەو نەدەکران و تایبەت بوون بە گۆڤارەکان، ئەویش شێوازی ڕاڤەکردن و شیکردنەوە و لێکۆڵینەوە، بۆیە پێویست بوو شێوازی ڕۆژنامەگەری ڕێڕەوێك بۆ خۆی پەیدا بکات کە لەگەڵ ئەو هەموو گۆڕانانەی سەردەم بگونجێ و بەکارهێنانی شێوازێکی ئاسان و ئاشکرا نزیکی شێوازە ئاساییەکەی بێت و لە ڕێگایەوە بتوانێت ئەو ڕووداوانە بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا و واقعی پێشکەش بکرێت، دوور لەهەموو ئاڵۆزییەك.

پیشەی دووەمی ڕۆژنامەگەری پاش هەواڵەکان پیشەی ڕاڤەکردنە، بۆ ڕووداو و بەسەرهات و بیرو بۆچوون و ئەزموونە سیاسی و ئابووری و وەرزشی و یاسایی و زانستی و هونەرییەکان، کە لە ڕێگەی شێوازی ڕۆژنامەگەرییەوە بەشێوەیەکی ڕوون و ئاسان وورد و دیار دەخرێنەڕوو، هەردوو کەسی پسپۆڕ و خوێنەری ئاسایی لێ تێدەگەن[٤١]. لێرەدا لە کاتی بەکارهێنانی ئەم پیشەیە زەحمەتییەك دێتە پێش ڕۆژنامەنووسان واتە کاری (ئاسانکردن و بەرجەستەکردن و ڕاڤەکردن و خستنەڕووی ڕووداوەکان بەشێوەیەکی دیار و ڕوون) کارێکی قورسی شێوازەییە، پەیوەستن بە سروشت و ناوەڕۆکی بابەتی ڕۆژنامەگەری هەمەجۆرەوە، ئەویش لە

ڕێگەی بەکارهێنانی زمانێکی تایبەت بۆ ئەو جۆرە بابەتە ڕۆژنامەگەرییانە (زانستی و وەرزشی و هونەر و مۆسیقا و داد و کارگێڕی). پێویستە لەسەر ڕۆژنامەنووس لە هەموو ئەو زمانانە زمانێك دابهێنێت یەك زمانی ئاسان کە لە لایەنی گشتی خەڵکەوە ڕوون و ئاشکرابێت. بەم شێوەیە ڕۆژنامەگەری ڕۆڵی نێوەند (وسيط) دەبینێت و لە نێوان ئەو کۆمەڵ و جەماوەرە ڕۆڵی خۆی دەگێڕێت. کەواتە ڕۆژنامەگەری دوو زمانی تایبەتی خۆی هەیە : یەکەم زمانێکی بابەتی بۆ (تحرير) نووسینی هەواڵ و ڕیپۆرتاژ و گفتوگۆکان واتە (شێوازەیەکی گشتی)، دووەم زمانێکی تایبەت یان (خودی) بۆ نووسینی وتاری ڕۆژنامەگەری بەهەموو جۆرەکانی، واتە (شێوازەی تایبەتی) ئەویش بەندە بە ئاستی ڕۆشنبیری کەسەکەوە و سیاسەتی دەزگا ڕاگەیێنەرەکەوە. لێرەدا دەتوانین هەندێ پێکهاتەی شێوازی ڕۆژنامەگەریی بەگشتی لە ڕێگەی چوار تەوەرەوە بخەینەڕوو[٤٢]:

پێکهاتەی یەکەم پەیوەستە بە شارەزابوون لە ڕێزمانی زمانەکەی (وشەسازی و ڕستەسازی): وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد پێویستە لەسەر کەسی ڕۆژنامەگەر شارەزاییەکی تەواوی هەبێت لە دەستوور و یاسای زمانەکەی خۆی، واتا (ڕێزمانەکەی). پێکهاتەی دووەم پەیوەستە بە لۆژیکی: ئەمەش بەندە بە بنەما فیکرییەکەی دەقی ڕۆژنامەگەریی، کە ئەنجام و دەستکەوتەکانی لە کۆتاییدا لەگەڵ پێشەکییەکەی ڕێك بکەوێت، واتە بیرۆکەی بابەتەکە لەناو یەك ناوەڕۆکدا خۆی بگرێتەوە و ڕووی ڕاستەقینەی خۆی فەرامۆش نەکات چ لە لایەنی زانستی یا مێژوویی یان لایەنی ژیان و سروشتەکەی. پێکهاتەی سێیەم پەیوەستە بە ڕەوانی زمان و چاکی شێوازەیی گشتی یان ڕەوانبێژی: واتە پێویستە لەسەر ڕۆژنامەنووس کاری شێوازی ڕۆژنامەگەریی گشتی پەیڕەو بکات و لەسەری بڕوات، کەهەموو ئەو یاسا و ڕێسانەی کاری ڕۆژنامەگەری دەگرێتەوە و بابەتەکانی تیایدا داڕێژراو بێت. پێکهاتەی چوارەم پەیوەستە بە پەیڕەوکردنی شێوازەی ڕۆژنامەگەری تایبەت بەخۆی: ئەمەش بەندە بە سروشتی ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارەیە، چونکە پیشە و کار و سیاسەتی تایبەتی خۆی هەیە (ستراتیجییەتی تایبەت)ی کە لەسەری دەڕوات، هەروەها پێویستە لەسەر ئەو ڕۆژنامەنووسانەی کە لە

ڕۆژنامەکەدا کاردەکەن پەیڕەوی بکەن. بەم شێوەیە دەکرێ خاڵە سەرەکییەکانی باشترین ڕێگا بۆ پەیڕەوکردنی شێوازەی ڕۆژنامەگەری دەستنیشان بکەین، لەکاتی نووسینی بابەتە ڕۆژنامەگەرییەکە لە چوارچێوەی دەقە جۆراوجۆرەکانی هەواڵگری و ناهەواڵگری، بەپێی ئەو تەوەر و باسانەی کە لەسەرەوە خراونەتە ڕوو بەم شێوەیەی خوارەوە دەستنیشان دەکرێن[٤٣]:

١- وازهێنان لە هەندێ وشە و مۆرفیمی زیاد و هەندێ ئاوڵفرمانی شوێن و کات و ئامرازی لێکدەر و پەیوەندیکردن کە پێویست ناکات لە ڕستەکەدا هەبێت، هەروەها هەمانەشت لە ڕستەی درێژ و ڕستە دووبارەکراوەکان.

٢- بەکارهێنانی زاراوەی ئاسان و ڕوون و دیار وەك بەکارهێنانی وشەی کورت و ناسراو.

٣- پێویستە لەسەر ڕۆژنامەنووس پیرۆزیی هەواڵ ڕابگرێت، بە شێوەیەك دابڕێژێتەوە بێئەوەی ڕای خۆی تێکەڵ بکات و بەبابەتی دەقەکە پابەندبێت، ئەمەش لە ڕێگای بەکارهێنانی دەربڕین و زاراوەی ورد و ڕوون و بەجێ.

٤- پێویستە وشەکانی یەك پەڕەگراف لە (٥٠-٧٥) وشە زیاتر نەبێت و لەهەر پەڕەگرافێکدا (٤-٥) ڕستە زیاتر نەبێت، و هەر دێڕێك لە (٤٠-٥٠) پیت زیاتر لەخۆ نەگرێت.

٥- پێویستە لەسەر هەموو هەواڵێکی ئامادەکراو سەرچاوەی خۆی لە ناوەڕۆکی هەواڵەکەدا هەبێت، کە زانیارییە هەواڵییەکەی لێ وەرگیراوە یان خواستراوە، چونکە ڕۆژنامەنووس پێویستە سەرچاوەی هەواڵەکانی خۆی دەستنیشان بکات، دەکرێ سەرچاوەکە لەناو هەواڵەکەدا شاراوە بێت، هەندێ جاریش وا دەخوازێت کە سەرچاوەکەی دیار نەبێت بۆ ئەوەی کەسێکی تایبەت بپارێزێت، هەندێ جار پێویستە شێوازی خستنەڕووی بیر و بۆچوون و ڕاکانی کەسەکان لەناو هەواڵەکەدا بگۆڕێت، لە ڕێگای بەکارهێنانی هەندێ زاراوە : (گوتی، ڕاگەیاند، خستەڕوو).

٦- ڕێکخستنی هەواڵەکە بەشێوەیەکی لۆژیکی و بابەتی، ڕۆژنامەنووس پێویستە ڕووداوەکان شیان بکاتەوە و بەشێوەی چیرۆکێك بیانخاتە ڕوو و لە چوارچیوەی یەك تەوەردا بخولێنەوە.

٧- دەکرێ هەندێ زاراوەی بێگانە بەکاربێت ئەگەر لە ڕووی واتاکەوە نزیکتر بێت بۆ دەربڕین لە حاڵەتی ڕووداوەکە کە ڕاستەوخۆ واتاکەی بەدەستەوە بدات.

٨- بەکارهێنانی وشەی نوێ تەنانەت ئەگەر بەلای خوێنەریشەوە نوێ بێت بەلأم لە هەمانکاتدا واتایەکی ڕاستەوخۆ دەبەخشێت.

٩- بەکارهێنانی خاڵبەندی وەك ئاسانکارییەك بۆ خوێندنەوە و زیاتر شارەزابوون لە شێوازەی نووسینی ڕۆژنامەگەری وەك: (خاڵ، کۆما، شارحە (-)، کەوانە)، کە هەریەك لەم نیشانانە ئەرکی تایبەتیی خۆی هەیە.

١٠- ناوهێنانی ناوی تەواوی کەسایەتییەکان لە سەرەتای هەواڵەکەدا، هەروەها ئاگاداری نازناوی زانستی و مەدەنییەکان یان هەر ناوێکی تر، هەروەها ئاماژەدان بە پۆست و نازناوی بەرپرسان و سەرۆکەکان بۆ ئەوەی جۆرێك لە تێکەڵی ناوەکان دروست نەبێت لە نێوان کەسەکاندا.

١١- ئاگاداری ڕیزبەندی (زنجیرەی) ژمارەکان بکرێت بۆ ئاسانی خوێندنەوە، باشتروایە لە ژمارە یەکەوە بۆ ژمارە نۆوە بە نووسین بنووسرێت، و لە ژمارە دەو بەرەو سەرەوە بە ژمارە بنووسرێت. هەروەها ژمارەکانی تەقریبی بە نووسین بنووسرێت وەك لە سەدان یەك، بەلأم ئەو ژمارانەی کەوا زیاتر پێویستە بۆ بڕی پارە و ئەنجامی گەمەکان و ڕێکەوتی مێژووییەکان بە ژمارە بنووسرێت، یان هەندێ ژمارەی گەورە بە نووسین بنووسرێت وەك (٢) ملیۆن و (١٢) هەزار.

لێرە پرسیارێك دێتەئاراوە، ئایا شێوازەی ڕۆژنامەگەریی لە هەموو کات و حاڵەتەکاندا یەك ئاستی دەربڕینی هەیە بۆ گشت هەواڵ و بابەت و دەربڕینی دەقەکانی ڕۆژنامەگەریی بەکاردێت؟ وەلأمەکە نەخێر واتە ئەم شێوازەیە دەگۆڕێت بەپێی جیاوازی هونەرەکان و شێوە و جۆرەکانی کاری ڕۆژنامەگەریی، چونکە هەندێ جار نزیکی ئاستی ئەدەبی دەبێت و هەندێ جاریش نزیکی ئاستی زانستی دەبێت، لە کۆتاییدا ئەو جۆر و ئاستی نووسینانەی بەپێی تایبەتمەندی و بنەما هونەرییەکان و تەکنیکی ڕۆژنامەکان بۆ ئەو جۆرانەی خوارەوە دەستنیشان دەکرێن [٤٤]:

١- ئاستی ڕۆژنامەگەریی هەواڵگەری (الاخباري): ئەو شێوازەیە بە زۆری بۆ نووسینی هەواڵی کورت و مامناوەند و درێژ بەکاردێت پێش هەموو بابەت و هونەرەکانی دیکەی ڕۆژنامەگەری.

٢- ئاستی ڕۆژنامەگەری تۆماری (التسجيلي): هەندێ جاریش بە (ڕاپۆرتی - التقريری) ناودەبرێت ئەمەش سەرەتا تایبەتە بەشێوازەی نووسینی چیرۆك و بابەت و ڕاپۆرتە هەواڵەکانی ڕۆژنامەگەری، کە بۆ ئەم جۆرە نووسینانە تەرخان کراوە، هەندێ جاریش بۆ چەند گفتوگۆیەکی ڕۆژنامەگەریی (الاحاديث الصحفية-ئینتەرڤیو) بەکاردێت.

٣- ئاستی ڕۆژنامەگەریی ڕاڤەیی- شرۆڤەکردن (التفسيري): ئەم شێوازەیە تایبەتە بەهەندێ وتەی ڕۆژنامەگەریی دیکە، هەندێ جۆری ڕاپۆرتی تازە کە بەرەو ئاراستەیەکی نوێ هەنگاو دەنێت و لە ڕێگەی نووسینەوە ئەنجامدەدرێت، خوێنەریش تەنیا بە شێوازی تۆمارکردن (تسجيلي) قەناعەت ناهێنی و پێویستە هەندێ ڕاڤەکردنیشی تێدا هەبێت، هەروەها ئەم جۆرە شێوازەیە لە هەندێ ڕیپۆرتاژی ڕۆژنامەگەریش بەکاردێت، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی ئەم شێوازەیە بۆ نووسینی وتاری تایبەت وەك وتارەکانی (سەرنووسەر (سەروتار) - (کۆمینت-تەعليق) - لێدوان- سەرۆك - شوێن - گۆشە) بەکاردێت.

٤- ئاستی ڕۆژنامەگەریی وەسفکردن پەسەنکردن (وصفي) : ئەمەش تێکەڵ دەبێت لەگەڵ چەند ئاستی باسکراوی پێشوو لە نووسینی بابەتەکانی ڕۆژنامەگەری وەك (وتارەکان- ڕاپۆرتەکان- ڕیپۆرتاژەکان)، لەگەڵ هەندێ وتاری (ستوونی و ڕۆژانەکان)ی ڕۆژنامەکە بەتایبەتی ئەو وتارانەی کە لەرووی ناوەرۆکەوە بریتییە لەم بابەتانە (گەشت- (خواطر وتاملات) بیرکرنەوە- بۆنە تایبەتییەکان - دانپێنانەکان (الاعترافات).

٥- ئاستی ڕۆژنامەگەریی ئەدەبی: نووسەر لێرەدا هەندێ سیما و خەسڵەتی تایبەتی ئەدەب و چێژی ئەدەبی لە نووسینی بابەتەکاندا پەیڕەو دەکات، بەڵام بەپێی پێویست کە لە سنووری خۆی باز نەدات، وەك لە هەندێ جۆری ناونیشان و پێشەکی و کۆتایی وتەکان و ڕاپۆرتی وێنەکراو و ڕیپۆرتاژ

بەگشتی، بەتایبەتی لەنێو گۆڤارەکان بەدی دەکرێت. هەروەها لەهەندێ وتاری ستوونیش بەدی دەکرێت بەتایبەتی ئەو وتارانەی کە پەیوەستە بەلایەنی خودی نووسەرەکە (الذاتية).

٦- ئاستی ڕۆژنامەگەریی زانستی: ئەمشێوازەیە لەلایەن نووسەرانی بەندن بەنووسینی ئەمجۆرە بابەتانە پەیڕەو دەکرێت وەك: زانستی، سەربازی یان ئابووری وکشتوکاڵ و گشت بابەتە پسپۆرییەکانیتر دەگرێتەوە.

٧- ئاستی ڕۆژنامەگەریی گشتی: نووسەری ئەم شێوازەیە دەتوانێت بە کۆکردنەوەی ئاستە باسکراوەکانی پێشوو لەسەر هونەر و جۆرەکانی ڕۆژنامەگەریی تایبەت و بەرچاو (متمیز) پەیڕەو بکات، ئەم جۆرە ئاستەش لە ڕێگای بەکارهێنانی ئەم بابەتانە دەبێت: (ڕیپۆرتاژی ڕۆژنامەگەریی بەرچاو بەتایبەتی : (ڕیپۆرتاژی کێشە و گرفتەکان- ڕیپۆرتاژی هەواڵی- ڕیپۆرتاژی پۆرترێت - ڕیپۆرتاژی (تایبەت بەکەسایەتی)- ڕیپۆرتاژی گەشت و گوزار) و هەڵمەتی (ڕیپۆرتاژی ڕۆژنامەگەریی). وتارەکانی (leader) سەروتاری واژووکراو. وتاری ڕۆژانەی ڕۆژنامەگەریی (وتاری گۆشە و ستوونەکان). وتارە شیکراوەکان).

ئەم جۆرە ئاستی نووسینە بە مەرجێك پەیڕەو دەکرێت بیرۆکەی ڕیپۆرتاژەکە شایستەی ئەوە بێت بخرێتە ڕوو و توانای کاری ئیدیتۆری تیایدا بەرجەستە بێت، یان ئەو کۆمەڵە کەسانەی وەك تیمێك کاردەکەن پەیڕەوی بکەن، چونکە زەحمەتە یەکێك بتوانێت ئەو هەموو ئاستە نووسینانەی سەرەوە بەیەکەوە کۆبکاتەوە و لەیەك شێوازەدا بخاتەڕوو.

**ت- هەنگاوەکانی نووسین و ئامادەکردنی دەقی ڕۆژنامەگەری (ئیدیتین):**

نووسین و ئامادەکردنی دەقی ڕۆژنامەگەری (ئیدیت) بەشێکە لە سیستەمی گشتی دەرکردنی هەموو ڕۆژنامەیەك هەروەها هەنگاو و پلانە پێشەکییەکەی (ستراتیجییەتی) خۆی هەیە پێش دەرکردنی ڕۆژنامەکە، کە بریتییە لە سیستەمێکی لاوەکی لەناو سیستەمێکی گشتی بۆ دەرکردنی ڕۆژنامەکە. هەروەها

هـەنگاوەكانی ئێـدیتی دەقـی ڕۆژنامەگـەریی بـەپێی بابەتـە ڕۆژنامەگەرییـەكان دەگۆڕێت، ئایا ئەمە دەقێكی هەواڵییە یان ناهەواڵییە.

**یەكەم: هەنگاوەكانی نووسینی (ئیدیت)ی دەقی هەواڵی [٤٥]:**

١- سەرەتا پلاندانان بۆ ئامادەكردنی هـەواڵی (پێشبینیكراو و بەدواچووەكان) ئەمـەش لـە ڕێگـای دەستنیشـان كردنـی تـەوەرەكانی هـەواڵ و خاڵـە سـەرەكییەكانی و كۆكردنـەوەی هـەموو ئـەو زانیارییانـەی پەیوەسـتن بەبابەتەكەوە لە بەشی هەواڵ و زانیاری یـان لـە ئەرشـیفی تایبـەتی نووسـەری ڕۆژنامەنووس.

٢- كۆكردنـەوەی زانیـاری تایبـەت بـە هـەواڵی ئامـادەكراو لـە سەرچـاوە جۆراوجۆرەكانی خەڵك و بەڵگەنامەكان.

٣- وێنەگرتنی فۆتۆگرافی پەیوەست بە هەواڵەكە لە لایەن نووسەر یان وێنـەگری ڕۆژنامەكەوە.

٤- پێداچـوونەوەی بابەتـە ڕۆژنامەگەرییـە نووسـراو و وێنەكیشـراوەكە و تەواوكردنی تەوەرەكانی.

٥- هەڵسـەنگاندنی بابـەتی ڕۆژنامەگـەریی ئامـادەكراو و وێنەكێشـراوەكە و دەستنیشانكردنی شیانی بڵاوكردنەوەی لـە لایـەن كەسـی بـەرپرس، سـەرۆكی بەش یان بەڕێوەبەری نووسـین یـان جێگـری سەرنووسـەر یـاخود سەرنووسـەر بـەخۆی یـان هـەموویان بـەپێی پلـەی بـەڕێوەبردنی كـارگێڕی لـەدەزگا ڕۆژنامەگەرییەكەدا.

٦- ئامادەكردنی وێنەی دروستكراو و دەربڕاو و ڕوونكراوی بابەتەكە و بڵاوكردنی لەگەڵ بابەتەكە یان بەجیا.

٧- هەڵبژاردنی ستراكتۆر یان پێكهاتـەی (البنـاء) هونـەری دەقـی ڕۆژنامەگـەری، واتە دەستنیشان كردنی شێوە (فۆرمی دیاركراو) قـاڵبی دەقەكـە، یـان بابەتـە هەواڵگەرییەكە كە بۆ بڵاوكردنەوە ئامادەكراوە.

٨- ئێدیتی كۆتایی دەقی ڕۆژنامەگەری.

٩- پێداچوونەوەی كۆتایی بۆ دەقی ڕۆژنامەگەری (ئامادەكراو).

١٠- هەڵسەنگاندنی كۆتایی و دەستنیشانكردنی پێشینەی بڵاوكردنەوەی.

**دووەم: هەنگاوەکانی نووسین (ئیدیت)ی دەقی ناهەواڵی (گفتوگۆ و ڕیپۆرتاژ)** [٤٦]:

١- هەڵبژاردنی بیرۆکەی دەقی ڕۆژنامەگەری (بابەتی ڕۆژنامەگەری).

٢- پێداچوونەوەی بیرۆکەی بابەتەکە و دەستنیشانکردن و بڕیارلەسەردانی لە لایەن کەسی نووسەری ئیدیتۆر.

٣- کۆکردنەوەی زانیاری و وردەکارییەکانی تایبەت بە بیرۆکەی دەقی ڕۆژنامەگەریی لە هەندێ زانیاری نووسراو و وێنەگیراو و وێنەکێشراو لە بەشی زانیاری ڕۆژنامەگەری یان ئەرشیفی تایبەتی کەسی ئیدیتۆر.

٤- کۆکردنەوەی زانیاری پێویست بۆ دەقی ڕۆژنامەگەریی بە هۆی نووسەر یان تیمی کارکردن.

٥- وێنەگرتنی فۆتۆگراف و ئامادەکردنی وێنەی پەیوەست بە دەقی ڕۆژنامەگەری.

٦- پێداچوون و تەواوکردنی زانیارییە کۆکراوەکان.

٧- هەڵسەنگاندنی بابەتەکە و دەستنیشانکردنی ئاستی شیاوی بۆ بلاوکردنەوەی لە لایەن ئیدیتۆری بەرپرس.

٨- هەڵبژاردنی پێکهاتە (ستراکتۆری) هونەری بۆ دەقی ڕۆژنامەگەری، واتە هەڵبژاردنی فۆرمی هونەری تایبەت بە دەقی ڕۆژنامەگەری و قاڵبە شیاوەکەی کە بابەتەکە تیایدا دادەڕیژرێت، پاشان هەڵبژاردنی شێوەی وتووێژی ڕۆژنامەگەری، دواتر وتووێژەکە کە لە پرسیار و وەلام پێکهاتووە لە شێوە تەقلیدییەکەی دادەنرێت.

٩- ئێدیتی دەقی ڕۆژنامەگەری .

١٠- پێداچوونەوەی گشتی بۆ دەقی ڕۆژنامەگەری لە ڕووی زمانەوانی و زانیاری و شێوازەیی وهەندێ جاریش لە ڕووی یاسایی و تەواوکردنی یان هەمووارکردنی دەقەکە.

١١- هەڵسەنگاندنی کۆتایی و دەستنیشانکردنی پێشینەی بلاوکردنەوەی.

**سێیەم: هەنگاوەکانی (ئیدیت)ی دەقی نا هەواڵی (وتار)** [٤٧]:

١- دەستنيشانكردنى بيرۆكەى دەقى ڕۆژنامەگەرى (بابەتى وتارەكە).
٢- كۆكردنەوەى زانيارى پێويست وەك باگراوەندێك بۆ دەقى نووسراو وێنەگيراو و وێنەكێشراو.
٣- كۆكردنەوەى زانيارى هەنووكەيى ياخود بەردەست.
٤- هەڵبژاردنى (ستراكتۆرى) هونەرى دەقى ڕۆژنامەگەرى، و دەستنيشانكردنى جۆرى وتار و شێوە هونەرييەكەى واتە (سەروتار يان وتارى ڕۆژانە).
٥- ئێديتى (نووسينى) وتارەكە.
٦- پێداچوونەوەى زمانەوانى و زانيارى و شێوازەيى و ياساييش.
٧- تەواوكردن و دووبارەداڕشتنى وتارەكە، بەلآم ئەمە بۆ نووسەرە ناسراوەكان نييە.
٨- هەڵسەنگاندنى كۆتايى و دەستنيشانكردنى پێشينەى بلآوكردنەوە.

ج- زمانى ڕاگەياندن و شێوازى نوسينەوە لەكوردستان:

لەگەڵ هاتنى سەدەى بيستەم دياردەى ڕۆژنامەگەرى بە شێوەيەكى زۆر فراوان بوژايەوە، بابەتەكانيشى بەپێى تەكنيك و ڕێكخستنى شێوازە تايبەتييەكەى پەيامەكەى خۆى دەگەيێنێت، چونكە رۆژنامە وەكو داهێنراوێكى نوێى ناو زانستە مرۆڤايەتييەكان و ڕايەڵێك لە پرۆسەى گەياندندا تايبەتمەندى خۆى هەبووە، هەروەها ڕەچاوى لايەنى هونەريشى كردووە كە چەندين تايبەتمەندى لەخۆگرتووە، كوردستان بەهۆى ڕەوشى نالەبار و سەختى بارى سياسى و نەبوونى ئازادييە ديموكراتييەكان و ڕادەربڕين دووچارى گرفتبوو هەروەها نەبوونى زمانێكى يەكگرتووى نووسينى كوردى ئەمەش گرفتێكى تر بووە، بەلآم دواتر كار لەسەر ئەوە كرا كە ديالێكتى شێوەزارى (كرمانجى ناوەڕاست) ببێت بە زمانى نووسينى يەكگرتووى كوردى لە زۆربەى ناوچەكانى كوردستانى عيراقدا، تەنيا لە ناوچەكانى باكووردا نەبێت كە بەكارنايەت، بەڵكو شێوەزارى (كرمانجى سەروو) تيايدا بەكاردەهێنرێت. ئەم ديالێكتە (كرمانجى ناوەڕاست) بوو بە زمانى فەرمى كوردى لە هەموو دامودەزگاكانى حكومەتى

هەرێمی کوردستان پەیڕەوکرا و لەنێو دەزگا و ئامرازە ڕاگەیاندنەکانیش بەکارهێنرا، ئەو زمانەی کە بابەتە بلاوکراوەکانی ڕۆژنامە و گۆڤار و بابەتە پەخشکراوەکانی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن تیایدا دادەڕێژرا و پێشکەشی خەڵك دەکرا، ئەگەر بە وردی سەیری زمانە بەکارهاتووەکەی هەواڵ و گشت بابەتە بلاوکراوەکانی ڕۆژنامەگەری و دەزگاکانی تری ڕاگەیاندن بکەین ئەوا کۆمەڵە سیما و خەسڵەتی تایبەتی تێدا بەدیاردەکەوێت، چونکە زمانی هەواڵ پەیوەستە بە هەندێ تایبەتمەندیی دیارکراوی خۆیەتی جیایە لەگەڵ زمانی بابەتەکانی تری ڕاگەیاندن، کە لە ڕێگای ئەو دانە زمانییە بەکارهاتووانەی لەنێو بابەتە بلاوکراوەکاندا دەردەکەوێت، چونکە پێکهاتەی زمان لە ڕۆژنامەگەرییدا بەگشتی بریتییە لە وشە و گشت شێوازە تایپۆگرافییەکانی، وشەی نووسراویش بریتییە لەو وشانەی کە لە ڕێگەیەوە دەقی ڕۆژنامەگەری لەلایەن کەسی نووسەر پێشکەش دەکرێت، واتە لەسەر کەسایەتی نووسەرەکە ڕادەوەستێت لە کاتی نووسینی بابەتەکەیدا تا چەند توانای سەرنجڕاکێشانی زۆرترین ڕێژەی جەماوەر بۆ هەواڵەکانی دەبێت، وێنە واقیعەکەی خۆی لەسەر زانیاری و شارەزایی خۆیدا بونیات بنێت بۆیە کۆمەڵە وشە و زاراوەی زمانی پێویستە بەکاربێت بۆئەوەی یەکەیەکی ڕێزمانی ڕاگەیینەر پێکبهێنێت لە ڕێگەیەوە ڕستەکان کردەکانی تیایدا بنوێنرێن، واتە زمان پەیوەستە بە واقعەکە خۆی.

بەهێزترین تێگەیشتن لە واقیعی ڕووداوەکەش ئەوەیە کە (کردە، بەشدارەکان و بارەکەی) هاوکاری لە دروستکردنی زانیاری و شارەزایی دروست بۆ دەوروبەرەکەی بکات واتە لە زمانی کوردیدا ئەو پێکهاتە ڕێزمانییە کە ئەو تێگەیشتنانەمان بۆ بەدەستدەخات لە چوارچێوەی ڕستەدا بریتییە لە (کار و بکەر و بەرکار) ئەوەیە کە هەر ڕستەیەکی هەواڵی پەیوەستە بەکار و کەسی بەشداربووی لە بەئەنجامگەیاندنی کارەکە و ئەو بارە کردەیەی تێدا ڕوویداوە، لە هەواڵسازیدا چەند تازەیی و گرنگی لەخۆ بگرێتەوە ڕۆڵی سەرەکی لە سەرنجڕاکێشانی خەڵکدا دەبینێت، بۆیە نووسەری بابەتەکان پێویستە بەهەندێ خاڵی گرنگ پابەند بێت، وەك: (بەکارهێنانی وشە و زاراوەی باو کە لەلایەنی گشتی خەڵکەوە ناسراوبێت، ئەگەریش پێویست بوو زاراوەیەکی نەناسراو یاخود

نویٚ بەکاربێت، ئەوە دەکرێ ئەم وشەیە بەڕستەیەکی کورت ڕوون بکرێتەوە. دوورکەوتنەوە لە شێوازی ناڕاستەوخۆ، واتە پێویستە لەسەر نووسەر شێوازێکی ڕاستەوخۆ بەکاربهێنێت بۆ نووسینی دەقی پەخشکراو کە ڕاستەوخۆ گوزارشت لە مەبەستەکەی بکات. هەروەها لە کاتی نووسینی دەقی پەخشکراودا زیاتر وشەی وەسفکردن بەکاردەهێنرێت، جگە لە دووبارە پێداچوونەوە بە وشەی گوتراو ئەویش لە ڕێگای خوێندنەوەی دەقی نووسراو دەبێت، دەقەکە بە شێوەیەك دەخوێندرێتەوە وەك ئەوەی چیرۆکێك بۆ خۆێنەران دەگێڕدرێتەوە، لە ڕێگای بەکارهێنانی دەربڕینی جۆراوجۆر و دەستەواژەی جیاواز کە شێوازی هەمەجۆر و لەهەموو پەرەگرافەکانی تردا بەکاردەهێنرێت)[٤٨]. لە لایەکی تر زمانی هەواڵ پێویستە (وردی، خێرایی، ئاشکرایی و بابەتی) لەخۆبگرێت، هەروەها پێویستییەکانی کورتی و چڕی، ئاسانی و ئاشکرایی، خێرایی و زوو فریاکەوتن، ڕەچاوکردنی ناوەکان و زانینی سەرچاوەی هەواڵەکان، لەخۆ بگرێت.

دەقی هەواڵیش وەکو پێشتر ئاماژەمان پێکرد لەچەند بەشێك پێکدێت، ئەویش: (پێشەکی (لید)، جەستەی هەواڵ و ڕستەی کۆتایی)، لەکاتی ئەنجامدانی کاری نووسین پێویستە بنەماکانی زمانی بەکارهاتوو تێدا ڕەچاو بکرێت کە لەسنووری (ئاستەکانی زمان و پێشکەوتنەکانی زمان و راست و هەڵەکانی زمانی و هەماهەنگی لەگەڵ وەرگر کە لەنێوان شێوەی سادە و شێوەی بەرزی زماندا هاوسەنگ بێت). کەواتە نووسین هەر یەکێك و بەپێی ئامراز و جۆری گەیاندنەکەی دەستنیشان دەکرێت، شێوازی هەواڵیش پەیوەندی بە جۆری داڕشتنی هەواڵەکە هەیە کە پەیوەستە بەزمانێکی تایبەتی لە بەکارهێنان و هەڵبژاردنی وشەدا، پێویستە نووسەری هەواڵ رووداوەکە زۆر بەوردی و ڕاشکاوی بگەیەنێتە خوێنەر، پەیوەستە بەکار و سیاسەتی دەزگاکەوە کە هەردەم ڕووداوە نوێیەکانی ڕۆژانە دێنە کایەوە، بۆیە زمانەکە پاراوتر دەبێت، پابەندە بە یاساکانی داڕشتنەوە وەك (بەکارهێنانی ئامرازەکانی لێکدان و خاڵبەندی بۆ فەراهەمکردنی تێگەیشتنی زیاتر، دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی کاری (بکەری نادیار) چونکە هەندێ جار لە سەرەتای ڕوودانی ڕووداوەکەدا بکەری ڕووداوەکە ئاشکرا نابێت، هەروەها بەکارهێنانی زیاتر یەکێك لەو شەش ڕەگەزەی کە پێوستە وەڵام بدرێنەوە لە

هەواڵەکەدا کە ڕەگەزی (کێ)یە. بەکارهێنانی ئەو ڕاناو و وشـە و دەربڕینانـەی کـە خوێنەر لەگەڵیدا هەست بەبوونی خۆی دەکات وەك (تـۆ و ئێـوە)، جەختکردنـەوە لەسەر بەکارهێنان و دروستکردنی ئەو وشـانەی کـە بـە لای خوێنـەرەوە نـامۆنین، هاوکـات بـەکارهێنانی ڕسـتەی کـورت و بڕگـەی کـورت لەگـەڵ پابەنـدبوون بـە دەستەواژەیەك کە خوێنەری لێ تێبگات[٤٩]. دوورکەوتنەوە لە زێدەڕۆیی، چـونکە هەر ڕووداوێك بـەپێی گرنگیـی دەربـڕێت بێئـەوەی قەبارەکـەی گـەورەتر بکرێـت، چـونکە دەبێتـە هـۆی شـێواندنی ڕاسـتی ڕوداوەکـە و سـەرەنجام هەڵخەڵەتانـدنی خوێنەر، لەبەرئەوە پێویستە لەسـەر نووسـەر لەبـەکارهێنانی ئـەو وشـە و بڕگـە و ڕستانەی کـە دەبێتــە هـۆی دروسـتکردنی ئـەم دۆخـە دووربکەوێتـەوە. هـەروەها گـرنگترین بنـەماکانی نووسـینی هـەواڵیش پەیوەسـتن بـە چـەند بنەمایـەك وەك: نووسەر پێویستە ڕاستی ڕووداوەکە وەك خۆی بۆ خەڵك بگوازێتەوە، ئەو وشـانەی نووسەر پێویستی پێیەتی ئەو وشانەن کە یەك واتا دەبەخشن و نابنە جیاوازی لـە تێگەیشتندا. هەروەها داڕشتنی هەواڵەکان بە کورتی بۆئەوەی هەر هەواڵێك بەپێی پێویست لەجێگای تایبەتیی خۆی دابنرێت، جگە لـەوەش کـاتی خوێنـەر خـاڵێکی گرنگە کە کاتی پێویسـتی نـەبێت ئەگـەر داڕشـتنەکە بەشـێوەی دووردرێـژ بێـت، لەوانەیە ئەم کورتبڕییە ببێتە هۆی شێواندنی هەواڵەکە، باشتر وایە هاوسـەنگییەك لە نێوان کورتبڕی و گواستنەوەی هەواڵ و پاراستنی ڕاستی ڕووداوەکە هەبێت.

کەواتە پرۆسەی نووسین وداڕشتنی دەقە ڕۆژنامەگەرییەکان وەك هەنگاوێك لە هــەنگاوەکانی پێشکەشــکردنی بابەتــەکان کــە لەگــەڵ سیاســەتی دەزگاکــە گونجاوبێت، بریتییـە لـە پشـکنینی هەڵـەکان و ڕاسـتکردنەوەیان سـادەکردنەوە و ڕوونکردنەوە و ڕاستکردنەوەی زمانی هەواڵەکە، نووسەرانی هەواڵ دەبێت بەئاگابن لە نەریت و میتۆدی هەواڵسازی کە دەبێت شایستە و گونجاو بێت بۆ بلاْوکردنەوە، بۆیە دەکرێ کۆمەڵێك لەو نەریت و ڕێگایانەی کـە دەبێـت نووسـەران لـە داڕشـتنی هەواڵدا ڕەچاوی بکەن، بەم شێوەیەی خوارەوە بخەینەڕوو:

١- بەکارهێنانی ئـامرازی لێکدەر (پەیوەنـدی): بریتییـە لـە کۆمـەڵێك وشـەی سادە بەشێوەی ستراکتۆری هاوکاری یەکێتی نووسـین دەدات، لـە هەنـدێ بەشـدا دەبنـە ئـامراز، وەك (و ، بـەلاْم، یـاخود، هـەروەك، لەهەمانکاتـدا). ئـەو وشـە و

دەستەواژانەی لە دەقێکدا دووبارە دەبنەوە بۆ ئەوەی هەستی یەکێتی بابەت بە وەرگر بگەیێنێت.

٢- بەکارهێنانی ڕاناو: لەبەرئەوەی نووسین هونەرێکە پشت بەسەلیقە و ئارەزوو و چێژی تەندروست و داهێنەرانە دەبەستێت، بۆیە لەنووسینی هەواڵدا هەرچەندە لەکەناڵێکەوە بۆ کەناڵێکی تر دەگۆڕێت و بەپێی ئامرازە جیاوازەکانی جیاوازە، بەڵام هەندێ جار پێویستە ئەم جۆرە ڕاناوانە بەکاربهێنرێت.

٣- نووسەر قەوارە سروشتییەکەی خۆی بە ڕووداوەکە بدات بەبێ کەمکردنەوە و دوورکەوتنەوە لە گێڕانەوەی دوور و درێژ، بەڵکو بابەتییانە مامەڵەی لەگەڵ ڕووداوەکە بکرێت بەگوێرەی قاڵبەکانی داڕشتنی هەواڵ و هەڵبژاردنی وشە گونجاوەکان بەکەمترین وشە دەربڕین لە مەبەستەکەی بکات کە مانا و ئاماژەکانی بەئاسانی بەخوێنەر بگەینێت.

بەهۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیایی گەیاندن و هاتنەئارای شێوازی جۆراوجۆری نووسین کە بەسەردەمی زانیارییە خێراکان دەناسرێت، لەهەرێمی کوردستان بەتایبەتی لەدوای پرۆسەی ئازادیکردنی عیراق ٢٠٠٣ دەرفەتی زیاتری ڕەخساند بۆ پەرەپێدانی ئاست و شێوازەکانی داڕشتنی بابەتە ڕۆژنامەگەرییەکان لە کاتی ئەنجامدانی کاری نووسیندا، ئەویش بەتێکڕا ڕستەکان کورت بن بەو شێوەیەی قسەی پێدەکرێت بنووسرێت، زاراوەکان بەشێوەیەك بەکاربهێنرێت کە خوێنەر بتوانێ بەئاسانی لێ تێبگات، هەروەها سادەیی پەسندە نەك ئاڵۆزی، هەڵبەت ڕستەی کۆتایی بەڕێژەی دەستپێکردن گرنگ نییە، بەڵام تاڕادەیەك لە پێکهاتەی هەواڵدا گرنگە، دەقی دووردرێژ و زۆر دەبێتە هۆی ئەوەی وەرگر بەئەنجام نەگات. بەکارهێنانی زاراوەگەلێك وەك: (وترا، دەڵێن ، وادەڵێن، یان ڕاگەیەنرا) لەهەواڵدا دروست نییە، وەرگر مافی خۆیەتی بپرسێ کێ وتوویەتی، یان کێ ڕایگەیاند؟ هونەری بەکارهێنانی سەردێڕ و مانشێت لەتەواوی میدیاکانی جیهاندا وەك یەك نین، ئەمەش بەندە بەئاستی گەشەکردنی ئامێرەکانی تەکنەلۆژیای سەردەم لەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر، لەلایەکی تر ئەو کەسەی کار لەدانانی مانشێتدا دەکات دەبێت بەتوانا و خاوەن ئەزموون بێت، چونکە مانشێت نووسین پێویستی بەتەرکیزکردن هەیە لەبەکارهێنانی زمانەکەی، هەروەها داڕشتنی

ناونیشان بەشێوازێکی ڕوون و بەڕێساکانی نووسینەوەی مانشێت کە پەیوەستە بەدوورکەوتنەوە لەناوە نەناسراوەکان و وشە نامۆکان و نەئاخەنینی بەژمارە و وردەکارییەکاندا، کەمکردنەوەی ژمارەی دێڕەکان بەشێوەیەك کە خوێنەر بەئاسانی وەربگرێت، هەروەها هەموو دێڕێك لە مانایەکی سەربەخۆدا پێکبێت و دێڕی یەکەم تەوەری هەواڵەکە لەخۆبگرێت. لێرەدا بۆ هەردوو شێوازی نووسینی دەقی پەخشکراو و نووسراو چەند نموونەیەك وەردەگرین و دەخەینەڕوو، بۆ دەقی پەخشکراو نموونە لەهەواڵەکانی کەناڵی ئاسمانی (.k.tv –٢٠٠٧) و بۆ دەقی نووسراو نموونە لە بابەتەکانی ڕۆژنامەی (خەبات، ٢٠٠٥–٢٠٠٦) وەردەگرین و بەشێوەیەکی گشتی وەسفیان دەکەین، بەم شێوەیە:

١– لەبابەتێکی ڕۆژنامەی خەبات بەناونیشانی: (چاوەڕوانی تورکیا لەبەر دەرگای ئەورووپا)[٥٠]. ڕستەیەکی ناتەواو و نادیار بەکارهاتووە کە لە وشەی (دەرگا) دەردەکەوێت، مەبەستی لەکام دەرگایە.

٢– هەواڵێکی تر بەناونیشانی: (بەپێی پلانێکی وەزارەتی پیشەسازی و کارەبا ئەمساڵ زیاتر لە ٦٠٠ کارگە و پرۆژەی پیشەسازی کەرتی تایبەت لە هەولێر و دهۆك دادەمەزرێن)[٥١]. تیایدا ناونیشانێکی دوورودرێژ بەکارهاتووە، کە لەگەڵ شێوازی نووسینی ڕۆژنامەگەری ناگونجێت، چونکە ناونیشان پێویستە کورتەی ناوەڕۆکی هەواڵەکە بێت.

٣– لە ڕیپۆرتاژێك بەناونیشانی: (دوابەدوای سەردانێك بۆ ئیتالیا، گەورەترین دارستان لەدەوروبەری هەولێر دروستدەکرێت)[٥٢]. ڕستەیەکی ئاڵۆز بەکارهاتووە و ماناکەی دیارنییە، کە لەگەڵ شێوازی نووسینی ڕۆژنامەگەری ناگونجێ، چونکە ڕستەکە چەند سادە و ساکار بێت و واتاکەی ڕوون و ئاشکرا بێت ئاسانتر دەبێت بۆ تێگەیشتن.

٤– لە ڕیپۆرتاژێکی تر: (ئایا کێشەی قوتابیانی بەشە ناوخۆییەکان لە سەروبەندی چارەسەرکردندایە...؟)[٥٣]. هەواڵێك بەشێوەی پرسیار خراوەتەڕوو ئەمەش بۆ شێوازی نووسینی ناونیشان گونجاو نییە. هەروەك لەناونیشانێکی تر: (پێشیلکردنی یاسا، پەتای گەندەڵی و ئەنفلەوەنزای باڵندە..کامیان کاریگەرترن؟!)[٥٤]، بەهەمانشێوە بەشێوازی پرسیار نووسراوە. یاخود بەشێوەی سەرسوڕمان وەك لەم ناونیشانە دیارە: (کەرویشکێك لەشێوەی مریشکدا!)[٥٥].

٥–لە هەواڵێك بەناونیشانی: (کەس ناتوانێ دەربارەی تەحداکردن و شەڕی بەعس موزایەدەمان بەسەرەوە بکات)[٥٦]، تیایدا چەند وشەیەك لەزمانی تر بەکارهاتووە، هەروەها (پرسی کەرکووك هەڵواسراو نییە، لەسەر ڕێگەچارەی ڕێککەوتن کراوەو سەقفی زەمەنیش دیاریکراوە)، بەهەمانشێوە وشەی عەرەبی تیایدا بەکارهاتووە. یان بەکارهێنانی وشەی ئینگلیزی وەك لەم ناونیشانە دیارە: (کۆمسیۆنی ئەورووپا ڕەزامەندی لەسەر دەستپێکردنی گفتوگۆ لەگەڵ تورکیا دەربڕی)[٥٧].

٦– لە وتارێك بەناونیشانی: (با ئاستی زانستی زیاتر نەبێتە قوربانی دامەزراندن و مووچە)[٥٨]، بەکارهێنانی خاڵبەندی تیایدا ڕەچاو نەکراوە، کە ئەمەش بایەخی خۆی هەیە و پێویستییەکی سەرەکییە بۆ شێوازی نووسین.

٧– لە وتارێکی تر بەناونیشانی: (هەولێر ... هەردوو یازدەی ئادار و پرۆژەی شایەن بەدێرینی و پێگەی سیاسی ئێستات پیرۆز)[٥٩]. هەڵەیەك لەشێوەی نووسینی ژمارەکان دەردەکەوێت، چونکە ژمارە (١–٩) پێویستە بەنووسین بنووسرێتەوە بەڵام لە (١٠ بەرەو سەرەوە) پێویستە بەژمارە بنووسرێتەوە وەك (١١) بەڵام لەدەقی پەخشکراو بەنووسین دەنووسرێتەوە.

٨– لە بابەتێك: (لە کەرکووك ... خوێندنەوە و بازاڕی کتێب و ڕۆژنامە لەچیدایە؟)[٦٠]. تیایدا بەکارهێنانی مۆرفیم و ئامراز و ڕاناوی زیاد هاتووە، وەك لەسەرەتای وشەی (لە کەرکووك) دەردەکەوێت کە ئامرازی (لە) لەسەرەتای وشەکە زیادە و پێویست ناکات بنووسرێت چونکە وشەی کەرکووك ئاماژە بەشوێنی بابەتەکە دەکات. یاخود بەپێچەوانەوە کورتکردنەوەی هەندێ ڕستە ئەکرێت، کە واتایەکی ناتەواو دەبەخشێت و ماناکەی لەدەست دەدات وەك لەم ناونیشانە دیارە: (پێشنیارکردنی ئەنجومەنێکی ڕاوێژکاریی بۆ تەوافوقی نیشتمانی)[٦١]. مەبەستی لەکام تەوافوقی نیشتمانییە ئاماژە پێی نەکراوە.

٩– لەلایەکی تر کۆمەڵە شێوازی نووسینی جۆراوجۆر لەدەقە نووسراوەکاندا پەیڕەوکراوە، بۆ نموونە لەم بابەتە ڕۆژنامەگەرییە شێوازی ئەدەبی بەکارهاتووە:

مرۆڤێکی عاشق بەخاك و نیشتمان، مرۆڤێك دڵسۆز تا سەر ئێسقان، دوێنێ بوو... لاپەڕەکانی یاد و شۆڕشی نەتەوایەتی بەهەست و ئیحساس و عەشقێکی یەقینەوە وشە و شیعر و جوانی تەمەنی دەنووسیەوە، هەر دوێنێ بوو، باخچەو گوڵ و پەپوولە سڵاوی خۆشەویستی و ئەڤینداریان بۆ دڵە ڕۆمانسییەکەی

(هەردی) دەناردو لەوێوەش لەژوورێکی پڕ لەعەشق و خۆشەویستی، وشە و پەیڤە ئەسرینەکانی دونیای غوربەت و تەنیایی لەئامێزی دیوانێکی نەمر خۆیان دۆزیـەوە و بوونە (رازی تـەنیایی) بـەڵێ لـەرازی تەنیاییـدا هـەردی رازە شـاراوەکانی نـاخی پێشکەش بە دەوروبەر کردو پێی گوتن کە لەپاڵ ئەوەی عەشـق گـەورەو پـیرۆزە، بەلاَم لەم نێوەندەشدا رازە تەنیاییەکان ماندوومان دەکەن ... ماندوو! !.

هـــەروەها هەواڵـــەکانی (k.tv) لـــەنێوان (٣/١/ ٢٠٠٧ – ٢٠٠٧/٥/١) لەهـــەر مانگێکدا سیٚ نموونـە وەردەگـرین، لـەرووی شـێوازەیی بـەم شـێوەیەی خـوارەوە دەرکەوتووە:

١– نموونەی یەکەم: سەرنووچە: (برۆکسـل/ کۆنفرانسـی دیموکراسـی دەسـتی پێکرد/ لە کۆنفرانسەکەدا سەرۆك بارزانی وتارێکی پێشکەش کرد)[٦٢]. لەم هەواڵـە زۆربەی ئـەو زاراوانـەی لەدەقـە پەخشـکراوەکەدا بـەکارهاتووە زاراوەی سیاسـین، وەك: (کۆنفرانسی دیموکراسی، سـەرۆکی پەرلـەمان، وەزیـری دەرەوە، سـەرۆکیی هـەرێمی کوردسـتان، پرۆسـەی دەیموکراسـی) بەمـەش هەواڵەکـە دەچـێتە قـاڵبی هەواڵی سیاسی و بەشێوازی هەواڵگەری نووسراوە.

٢– نموونەی دووەم: سەرنووچە: (هەولێر/ رووداو/ لەقـەزای شـێخان گـەنجێك تەقـەی لـە خانەوادەکـەی دەکـات و دایـك و بـاوك و دوو بـرا و خوشـکێکی خـۆی دەکوژێت)[٦٣]. تیایـدا وردەکارییـەکانی بەشـێوازی وەسـفی خراوەتـەڕوو، چـونکە بـەوردی وەسـفی ڕووداوەکـە و حاڵـەتی روودانـی رووداوەکـە دەکـات. (لەناوچـەی شـێخان نیزیـك شـاری موسـل گـەنجێك بـەهۆی گرفتێکـی کۆمەلاَیـەتی تەقـە لـە خانەوادەکـەی دەکـات و دایـك و بـاوك و دوو بـرا و خوشـکێکی خـۆی دەکوژێـت و برایەکی دیکەیشی بریندار دەکات، ئەو گەنجە دەرچووی زانکۆیە و تەمەنی بیسـت و پێنج ساڵە، ئێستاش هاتووەتە دەستگیرکردن لەلایەن ئاسایش).

٣– نموونەی سێیەم: سەرنووچە: (کوردستان/ کۆچی دوایی هونەرمەنـد خالـد تـاج/ هونەرمەنـدی بـەناوبانگی رۆژئـاوا بەنەخۆشـییەکی کتـوپڕ کۆچـی دوایـی کـرد)[٦٤]. ئـەم هەواڵـە دەچـێتە قـاڵبی هـەواڵێکی مـەجازی ئـەدەبی و واتایـەکی ئـەدەبی دەبەخشـێت، لەبەرئـەوەی ئـەم زاراوانـە وەك: (دڵەگەورەکـەی لەلێـدان کەوت، ماڵئاوایی، چرپییەوە، کەسوکار و دۆسـت و هونـەر، هونەرمەنـدان، گـەرمی، خوالێخوشبوو)، شێوازێکی ئەدەبییان لەخۆگرتووە.

٤- نموونەی چوارەم: سەرنووچە: (کوردستان/ تەقینەوەکەی شاری بەغدا/ سەرۆکایەتی هەرێم کردەوەکەی ئیدانە دەکات)[٦٥]. بەهەمان شێوە زاراوەکانی سیاسین و شێوازێکی هەواڵگەری لەخۆگۆتووە.

٥- نموونەی پێنجەم: سەرنووچە: (هەولێر/ دانیشتنی پەرلەمان/ لە دانیشتنەکەدا پێنج خاڵی جیاجیا بۆ گفتوگۆکردن خرانەڕوو)[٦٦]. بەهەمان شێوازی هەواڵگەری نووسراوە.

٦- نموونەی شەشەم: سەرنووچە: (سعودیە/ پرسی پێکهێنانی حکوومەتی عێراق/ دەستخۆشی لە دەست پێشخەرییەکەی سەرۆکی هەرێمی کوردستان دەکات)[٦٧]. ئەم هەواڵە دەچێتە قاڵبی شێوازی نووسینی گشتییەوە، چونکە کۆمەڵە شێوازی نووسینی جیاوازەوە لەخۆگرتووە، کە ئەمەش پەیوەستە بەکەسایەتییەکی زیرەك و لێهاتووەوە، بتوانی ئەو هەموو شێوازە نووسینە جیاوازەیە لەیەك بابەت کۆبکاتەوە و هەواڵەکەی دابڕێژێتەوە.

٧- نموونەی حەفتەم: سەرنووچە: (عیراق/ ئەنجوومەنی نیشتمانی سیاسەتی ستراتیژییەکان/ عیراقییە ڕەشنووسی یاسای ئەنجوومەنەکەی ئامادە کردووە)[٦٨]. بابەتەکە بەشێوازێکی شرۆڤەیی خراوەتەڕوو تیایدا ڕووداوەکانی بەوردی باس کراوە و وردەکارییەکانی یاساکە بەوردی شیکراوەتەوە.

٨- نموونەی هەشتەم: سەرنووچە: (هەولێر/ خوێندنی باڵا/ بۆخوێندنی ئەم ساڵ ٣٧٩ قوتابی ماستەر و دکتۆرا لەخوێندنی باڵا وەرگیراون)[٦٩]. وردەکاریی: ((دکتۆر محمد صدیق خۆشناو سەرۆکی زانکۆی سەلاحەددین لەکۆنگرەیەکی رۆژنامەوانیدا رایگەیاند: ئەم ساڵ حەفتا قوتابی بۆخوێندنی دکتۆرا و سەد و نەود و نۆ قوتابی دیکە بۆ خوێندنی ماستەر لەزانکۆی سەلاحەددین وەرگیراون، ئەمەش لەدوای ئەو پێشبڕکێ و تاقیکرنەوانە هات کەپێشتر لەنێو قوتابیاندا ئەنجامدرا)). ئەم بابەتە شێوازێکی راپۆرتی لەخۆگرتووە هەروەها وردەکارییەکانی چۆنییەتی وەرگرتنی ئەم قوتابیانە تیایدا خراوەتەڕوو.

٩- نموونەی نۆیەم: سەرنووچە: (جیهان/ ڕۆژی جیهانی بەرەنگاربوونەوەی ئایدز/ بەپێی دوا ئامارەکان ٣١ ملیۆن ٥٠٠ هەزار کەس لەجیهاندا تووشی ئایدز بوون + لەهەرێمی کوردستان لەساڵی (١٩٨٦)ەوە تا ٢٠٠٥/١١/٣٠ تەنها ٧ کەس تووش بوون)[٧٠]. هەواڵەکە شێوازێکی زانستی لەخۆگرتووە زاراوە زانستییەکان بە ڕوونی تیایدا دەرکەوتووە.

لەپاش وردبوونەوە و پێداچوونەوە بۆ شێوازە زمانیـەکانی ڕاگەیانـدن (٢٠٠٥–٢٠٠٧) لە ڕووی نووسینی هەردوو جۆری دەقی پەخشکراو و نووسراوی بابەتەکانی (k.tv. و خەبات) وەك لەم خشتەیەی ژمارە (١) دیارکراوە دەکرێ بـەم شـێوەیەی خوارەوە دەستنیشان بکەین:

خشتە ژمارە (١):

| بـەکارهێناني وشـــەی نـــامۆ و بیانی | بـەکارهێنانی ڕستەی ئاڵۆز و نادیار | بـەکارهێنانی وشـــــە و مـــــۆرفیم وئـــامراز و ڕاناوی زیاد | ڕێکنەخستنی هـــــەواڵ بەشێوەیەکی لۆژیکی | ئامازەنـەدان بەسەرچـاوە ی هەواڵەکان | دووورودرێـــژی ناونیشـــان و پەرەگرافەکانی دەق | بەکارنـەهێنانی خاڵبەنـدی بـۆ نووسین |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ٪٢١ | ٪١٩ | ٪٩ | ٪٥ | ٪٧ | ٪٢٦ | ٪١٣ |

هەروەها لەپاش وردبوونەوە و پێداچوونەوەی بەشـێوازەکانی نووسـین بـەپێی نموونـــە باســـکراوەکانی ســـەرەوە دەکـــرێ لێـــرەدا گـــرنگترین شـــێوازە بـەکارهاتووەکانی نووسـین دەقـی پەخشـکراو و نووسـراوی بابەتـەکانی (k.tv.) و (خـــەبات) لـــەنێوان (٢٠٠٥–٢٠٠٧) وەك لـــەم خشـــتەیەی ژمـــارە (٢) دیـــارکراوە دەستنیشان بکەین:

خشتە ژمارە (٢):

| شێوازی هەواڵگری | شێوازی تۆماری | شێوازی ڕاڤەیی | شێوازی وەسفی | شێوازی ئەدەبی | شێوازی زانستی | شێوازی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ٪١٩ | ٪١٥ | ٪١١ | ٪١٨ | ٪٢٥ | ٪٩ | ٪٣ |

## ئەنجامەکان :

١- زمانی ڕاگەیاندن ئەو زمانەی کە لەئاستی ناوەندی زمانەکانی تری نووسین دێت، کە بە زمانی پراکتیکی دەناسرێت چونکە ڕۆژانە لەنێو دەزگاکانی ڕاگەیاندن بۆ ئامادەکردن و پێشکەشکردنی بابەتەکان بەکاردێت، زمانێکە بۆ گشتی خەڵك ئاراستە دەکرێت کە ئاستی ڕۆشنبیرییان جیاوازە، هەندێ جار نزیکی ئاستی نووسینی ئەدەبی دەبێت و هەندێجار نزیکی ئاستی زانستی دەبێت واتە زمانێکی مامناوەندە، لەهەردوو ئاستەکە پێکدێت.

٢- پرۆسەی نووسین و داڕشتنی دەقە ڕۆژنامەوانییەکان یاخود (ئیدیت- تحریر) وەك هەنگاوێك لە هەنگاوەکانی پێشکەشکردنی بابەتەکان کە لەگەڵ سیاسەتی دەزگاکە بگونجێت کارێکی گرنگ و ئامانجی کاری نووسینە. ئەمەش لە ڕێگای پشکنین و ڕاستکردنەوەی هەڵەکان لەگەڵ ڕوونکردنەوە و ڕاستکردنەوەی زمانی دەقەکە.

٣- بەکارهێنانی وشەی نامۆ و بیانی لەنێو دەقە ڕۆژنامەوانییەکان هۆکاری بەزەحمەت تێگەیشتن لەواتای ئەم وشانە و نەگەیشتنی مانای بابەتەکە بەدروستی بۆ وەرگر کە بەڕێژەی (٢١٪) دەرکەوتووە.

٤- بەکارهێنانی ڕستەی ئاڵۆز و نادیار دەبێتە هۆی شێواندنی خوێنەر و گەیاندنی واتاکەی بەشێوەیەکی نادروست، ئەمەش بە ڕێژەی (١٩٪) لەنێو دەقە ڕۆژنامەوانییەکان دەرکەوتووە.

٥- بەکارهێنانی وشە و مۆرفیم و ئامراز و ڕاناوی زیاد لەنێو بابەتەکانی ڕۆژنامەوانی بەڕێژەی (٩٪) دەرکەوتووە، کە ئەمەش زیادەیە و پێویست ناکات بەکاربهێنرێت، چونکە دەقەکە چەند کورت و پوخت بێت دوور بێت لەم ئامرازە زیادانە واتاکەی ڕوونتر و باشتر دەگاتە وەرگر.

٦- پەیڕەکردنی شێوازی نووسینی درێژدادەڕی بۆ گشت بەشەکانی دەقی ڕۆژنامەوانی وەك دووروودرێژی ناونیشان و پەرەگرافەکانی لەپێشەکی و ناوەڕۆکی بابەتەکە کە بەڕێژەی (٢٦٪) دەرکەوتووە، هۆکاری بێزاربوونی خوێنەر لە بەردەوامی خویندنی بابەتەکە، دەخاتەڕوو.

٧- ئاماژەنەدان بەسەرچاوەی هەواڵەکان و ناوی کەسایەتییەکان و شوێن و ژمارەکان لەنێو بابەتە رۆژنامەوانییەکان بەرێژەی (٧٪) دەرکەوتووە، رێکنەخستنی بەشەکانی بەشێوەیەکی لۆژیکی بەرێژەی (٥٪) دەرکەوتووە.

٨- بەکارنەهێنانی خاڵبەندی بۆ نووسینی بابەتە رۆژنامەوانییەکان لاوازییەکی بەنێو زمانەکەیدا خستۆتە ڕوو کە بە ڕێژەی (١٣٪) دەرکەوتووە.

٩- شێوازە بەکارهاتووەکانی نووسینی بابەتە رۆژنامەگەرییەکان جۆراوجۆرن (شێوازی ئەدەبی، شێوازی هەواڵگەری، شێوازی وەسفی، شێوازی تۆماری، شێوازی راڤەیی، شێوازی زانستی و شێوازی گشتی) کە لەدوای ٢٠٠٣ زیاتر شێوازی ئەدەبی تیایدا بەکارهاتووە و بەرێژەی (٢٥٪) دەرکەوتووە، پاشان شێوازی هەواڵگری و وەسفی بەرێژەی (١٩٪ - ١٨٪) دەرکەوتووە، دواتر کەمتر شێوازی تۆماری و ڕاڤەیی و زانستی بەرێژەی (١٥٪-١١٪-٩٪) دەرکەوتووە، و زۆر بەکەمی شێوازی گشتی تیایدا پەیرەو کراوە کە بەرێژەی (٣٪) دەرکەوتووە.

## پەراوێزەکان :

١- الاسلوبية وتحليل الخطاب، د. منذر عياش، سوريا-٢٠٠٢، ص٢٠.
٢- مدخل الى علم الاسلوب، د. شكرى عياد، ص٨٨.
٣- الكتابة الاعلامية – المبادئ والاصول، د. نسيم الخوري، بيروت-٢٠٠٩، ص٢٢-٢٦.
٤- چەند هەنگاوێك بەرەو راگەیاندن، رۆژنامەنووسی، پروپاگەندە رای گشتی، هەڤاڵ ئەبوبەكر، چ:١، چخ: هەواڵ، سلێمانی-١٩٩٦، ل٤.
٥- the encyclopedia britanica CD, 2001
٦- سەرچاوەی پێشوو.
٧- اللغة الاعلامية (المفاهيم-الاسس-التطبيقات)، أ.د.سامى الشريف – د.ايمن منصور ندا، القاهرة-٢٠٠٤، ص٣٨-٣٩.
٨- الكتابة الاعلامية – المبادئ والاصول، د. نسيم الخوري، بيروت-٢٠٠٩، ص٢٧-٢٨.
٩- الكفايات التواصلية والاتصالية، د. هادي نهر، الاردن-٢٠٠٣، ص١٦٤-١٦٥.
١٠- مدخل الى لغة الاعلام، د. جان جبران كرم، ص١٢-١٣.
١١- زمانەوانی، محمد معروف فتاح، چ: زانكۆی سەلاحەدین، هەولێر-١٩٩٠، ل٥٠-٥٢.
١٢- سەرچاوەی پێشوو.
١٣- الكتابة الاعلامية – المبادئ والاصول، د. نسيم الخوري، ص٧٧.
١٤- لغة الصحافة المعاصرة، د. محمد حسن عبدالعزيز، بيروت-١٩٨٠، ص١٣.
١٥- اللغة الاعلامية (المفاهيم-الاسس-التطبيقات)، أ.د.سامي الشريف – د.ايمن منصور ندا، القاهرة-٢٠٠٤، ص٤٦.
١٦- سەرچاوەی پێشوو، ص٤٦.
١٧- فن الخبر الصحفي، د. عبد الجواد سعيد ربيع، القاهرة-٢٠٠٥، ص١٥٠.
١٨- بنەماكانی دارشتن لە میدیاكاندا، ئۆمید مەسعودی، ل٧٣.
١٩- الاتصال الجماهيري المنظور الجديد، د. هادي نعمان الهيتي، بغداد-١٩٩٨، ص٢٧.
٢٠- اللغة الاعلامية (المفاهيم-الاسس-التطبيقات)، أ.د.سامي الشريف – د.ايمن منصور ندا، القاهرة-٢٠٠٤، ص٤٩.
٢١- اللغة الاعلامية الجديدة ومنظومة التطوير، ديانا ام لويس، ت: د.راغب احمد مهران، دار جرير، عمان-٢٠٠٩، ص١٣٢-١٣٩.
٢٢- اللغة الاعلامية (المفاهيم-الاسس-التطبيقات)، أ.د.سامي الشريف – د.ايمن منصور ندا، القاهرة-٢٠٠٤، ص.
٢٣- قضايا ودراسات أعلامية، د. تيسير أبو عرجة، دار جرير للنشر والتوزيع، عمان-٢٠٠٦، ص١٢٤-١٢٥.
٢٤- هونەری رۆژنامەنووسی، شێرزاد عبدالرحمان، چ:١، بەغداد – ١٩٨٧، ل٢٣-٢٤.

٢٥- اللغة الاعلامية (المفاهيم-الاسس-التطبيقات)، أ.د.سامي الشريف - د.ايمن منصور ندا، القاهرة-٢٠٠٤، ص٦٩-٧٨.
٢٦- قضايا ودراسات أعلامية، د. تيسير أبو عرجة، دار جرير للنشر والتوزيع، عمان-٢٠٠٦، ص١٢٦-١٢٧.
٢٧- اللغة الاعلامية (المفاهيم-الاسس-التطبيقات)، أ.د.سامي الشريف - د.ايمن منصور ندا، القاهرة-٢٠٠٤، ص٧١-٧٢.
٢٨- سەرچاوەی پێشوو، ٧٣-٧٦.
٢٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ٧٦-٧٨.
٣٠- بنەماکامی هەواڵنووسین، پرۆفیسۆر کورتیس ماکدۆگاڵ، وەرگێڕان: هەندرێن شێرزاد سلێمان، چاپی یەکەم، سلێمانی- ٢٠٠٥، ل٢٦.
٣١- فن التحرير الاعلامي، د. عبدالعزيز شرف الدين، ص١٥٨.
٣٢- سەرچاوەی پێشوو.
٣٣- ڕێبەری کامێرامان و پەیامنێری تەلەفزیۆنی بۆ ئامادەکردنی ڕاپۆرتە هەواڵ، بۆل ستانیلی، وەرگێڕانی: محمد عبدالكريم، چاپی یەکەم، سلێمانی- ٢٠٠٧، ل٢٨.
٣٤- اللغة الاعلامية (دراسة في النصوص الاعلامية و تحليلها)، د. عبدالستار جواد، ط:١، دار الهلال، الاردن-١٩٩٨، ص٩.
٣٥- صناعة الاخبار في العالم المعاصر، د.سليمان صالح، دار النشر للجامعات، مصر- ب.ت، ص١٢٢.
٣٦- اللغة الاعلامية (المفاهيم-الاسس-التطبيقات)، أ.د.سامي الشريف - د.ايمن منصور ندا، القاهرة-٢٠٠٤، ص١٢٤.
٣٧- سەرچاوەی پێشوو، ص١٢٥.
٣٨- مشروع اصدار جريدة او مجلة، أ.د. اشرف صالح - أ.د. محمود علم الدين، مط: جامعة القاهرة، القاهرة-٢٠٠٣، ص٩٠.
٣٩- سەرچاوەی پێشوو، ص٩١-٩٢.
٤٠- بنەما زمانەوانییەکانی داڕشتنی هەواڵ لە ڕۆژنامە کوردییەکاندا، د.ئازاد ڕەمەزان، ل٢٦.
٤١- فن الخبر الصحفي، د. فاروق ابو زيد، ط: ٤، دار الشروق، القاهرة- ٢٠٠٠، ص١٨٣.
٤٢- فن التحرير الاعلامي المعاصر، د. عبد الرزاق محمد الدليمي، عمان-٢٠١٠، ص١١٣-١١٤.
٤٣- صناعة الاخبار في العالم المعاصر، د.سليمان صالح، ص١٢٥.
٤٤- فن كتابة الخبر والمقال الصحفي-نظريا وعمليا، ابراهيم احمد ابراهيم، القاهرة-٢٠٠٨، ص٩٢.

٤٥- اللغة الاعلامية (المفاهيم-الاسس-التطبيقات)، أ.د.سامي الشريف - د.ايمن منصور ندا، القاهرة-٢٠٠٤، ص١٣٦-١٣٧.
٤٦- سەرچاوەی پێشوو، ص١٣٧-١٣٨.
٤٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ١٣٨-١٣٩.
٤٨- صناعة الخبر الصحفي، د. يوسف الشماسي، جامعة الشارقة، الشارقة - ٢٠٠٢، ص٨١.
٤٩- فن الخبر الصحفي، د. فاروق ابو زيد، ص١٨٣.
٥٠- ر: خەبات، ژ(١٧٢٤)، چوارشەممە (٢٠٠٥/٣/٢)، ل٩.
٥١- ر: خەبات، ژ(٢٠٤٦)، هەینی (٢٠٠٦/٢/٣)، ل٥.
٥٢- ر: خەبات، ژ(١٦٧٠)، ڕێکەوتی (٢٠٠٥/١/٤)، ل٥.
٥٣- ر: خەبات، ژ(١٧٦٨)، سێ شەممە (٢٠٠٥/٤/١٩)، ل٥.
٥٤- ر: خەبات، ژ(٢٢٢٦)، شەممە (٢٠٠٦/٨/٥)، ل١١.
٥٥- ر: خەبات، ژ(٢٢٤٧)، شەممە (٢٠٠٦/٨/٢٦)، ل١٢.
٥٦- ر: خەبات، ژ(٢٠٦٧)، هەینی (٢٠٠٦/٢/٢٤)، ل٢.
٥٧- ر: خەبات، ژ(١٥٨٥)، شەممە (٢٠٠٦/١٠/٩)، ل١.
٥٨- ر: خەبات، ژ(١٧٢٦)، هەینی (٢٠٠٥/٣/٤)، ل٨.
٥٩- ر: خەبات، ژ(١٧٣٣)، هەینی (٢٠٠٥/٣/١١)، ل٣.
٦٠- ر: خەبات، ژ(١٧٣٠)، سێ شەممە (٢٠٠٥/٣/٨)، ل٥.
٦١- ر: خەبات، ژ(٢٠٤٩)، دووشەممە (٢٠٠٦/٢/٦)، ل١.
٦٢- دەنگوباس K.TV کاتژمێر (٦:٣٠)ی ئێوارە، ڕێکەوتی ٢٠٠٧/٣/١.
٦٣- دەنگوباس K.TV کاتژمێر (٦:٣٠)ی ئێوارە، ڕێکەوتی ٢٠٠٧/٣/١.
٦٤- دەنگوباس K.TV کاتژمێر (٦:٣٠)ی ئێوارە، ڕێکەوتی ٢٠٠٧/٣/١.
٦٥- دەنگوباس K.TV کاتژمێر (٦:٣٠)ی ئێوارە، ڕێکەوتی ٢٠٠٧/٤/١.
٦٦- دەنگوباس K.TV کاتژمێر (٦:٣٠)ی ئێوارە، ڕێکەوتی ٢٠٠٧/٤/١.
٦٧- دەنگوباس K.TV کاتژمێر (٦:٣٠)ی ئێوارە، ڕێکەوتی ٢٠٠٧/٤/١.
٦٨- دەنگوباس K.TV کاتژمێر (٦:٣٠)ی ئێوارە، ڕێکەوتی ٢٠٠٧/٥/١.
٦٩- دەنگوباس K.TV کاتژمێر (٦:٣٠)ی ئێوارە، ڕێکەوتی ٢٠٠٧/٥/١.
٧٠- دەنگوباس K.TV کاتژمێر (٦:٣٠)ی ئێوارە، ڕێکەوتی ٢٠٠٧/٥/١.

## سەرچاوەکان :

**أ- بە زمانی کوردی :**

١- ئـازاد ڕەمـەزان (دکتـور)، بنـەما زمانەوانییـەکانی داڕشـتنی هـەواڵ لـە ڕۆژنامـە کوردییەکاندا (١٩٩١-٢٠٠٠)، دەز: ئاراس، هەولێر - ٢٠٠٩.

٢- ئۆمیـد مەسـعودی، بنـەماکانی داڕشـتن لەمیدیاکانـدا، و: مەجیـد صـالح، خانـەی وەرگێڕان، سلێمانی- ٢٠٠٢.

٣- بۆل ستانیلی، ڕێبەری کامێرامان و پەیامنێری تەلەفزیۆنی بۆ ئامادەکردنی ڕاپۆرتـە هەواڵ، و: محمد عبدالکریم، چ:١، سلێمانی-٢٠٠٧.

٤- شێرزاد عبدالرحمان، هونەری ڕۆژنامەنوسی، چ:١، بەغدا - ١٩٨٧.

٥- کـورتیس ماکـدۆگاڵ (پرۆفیسـور)، بنـەماکامی هەواڵنووسـین، وەرگێـڕان: هەنـدرێن شێرزاد سلێمان، چ:١، سلێمانی- ٢٠٠٥.

٦- محمد معروف فتاح، زمانەوانی، چ: زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر-١٩٩٠.

٧- هەڤال ئەبو بەکر، چەند هەنگاوێك بەرەو ڕاگەیانـدن، ڕۆژنامەنووسـی، پڕوپاگەنـدە، ڕای گشتی، چ:١، چخ: هەواڵ، سلێمانی-١٩٩٦.

**ب- بە زمانی عەرەبی :**

٨- ابراهیم احمد ابراهیم (دکتور)، فن کتابة الخبر والمقال الصحفي-نظریا وعملیا، مرکـز العربی للنشر والتوزیع، القاهرة-٢٠٠٨.

٩- اشرف صالح (دکتور)- محمود علم الدین (دکتـور)، مشـروع اصـدار جریـدة او مجلـة، مط: جامعة القاهرة، القاهرة-٢٠٠٣.

١٠- تیسـیر أبـو عرجـة (دکتـور)، قضـایا ودراسـات أعلامیـة، ط:١، دار جریـر للنشـر والتوزیع، عمان-٢٠٠٦.

١١- جان جبران کرم (دکتور)، مدخل الی لغة الاعلام، ط:٢، دار الجیل، بیروت - ١٩٩٢.

١٢- دیانا ام لویس، اللغة الاعلامیة الجدیدة ومنظومة التطویر، ت: د.راغب احمـد مهـران، دار جریر للنشر والتوزیع، عمان-٢٠٠٩.

١٣- سـامي الشـریف (دکتـور)- ایمـن منصـور نـدا(دکتور)، اللغـة الاعلامیـة (المفـاهیم-الاسس-التطبیقات)، القاهرة-٢٠٠٤.

١٤- سـلیمان صـالح (دکتـور)، صـناعة الاخبـار في العـالم المعاصـر، ط:٢، دار النشـر للجامعات، القاهرة-١٩٩٨.

١٥- شکري عیاد (دکتور)، مدخل الی علم الاسلوب، ط:١، الریاض-١٩٨٢.

١٦- عبدالجواد سعيد ربيع (دكتور)، فن الخبر الصحفي، دار الفجر للنشر والتوزيع، القاهرة-٢٠٠٥.

١٧- عبدالرزاق محمد الدليمى (دكتور)، فن التحرير الاعلامي المعاصر، ط:١، دار جرير للنشر والتوزيع، عمان-٢٠١٠.

١٨- عبدالستار جواد (دكتور)، اللغة الاعلامية (دراسة في النصوص الاعلامية وتحليلها)، ط:١، دار الهلال، الاردن-١٩٩٨.

١٩- عبدالعزيز شرف الدين (دكتور)، فن التحرير الاعلامي، الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة - ١٩٨٧ .

٢٠- فاروق ابو زيد (دكتور)، فن الخبر الصحفي، ط: ٤، دار الشروق، القاهرة- ٢٠٠٠ .

٢١- محمد حسن عبدالعزيز (دكتور)، لغة الصحافة المعاصرة، ط:٢، المركز العربي للثقافة والعلوم، بيروت-١٩٨٠.

٢٢- منذر عياش (دكتور)، الاسلوبية وتحليل الخطاب، ط:١، مر: الانماء الحضاري، سوريا-٢٠٠٢.

٢٣- نسيم الخوري (دكتور)، الكتابة الاعلامية - المبادئ والاصول، ط:١، دار المنهل اللبناني، بيروت-٢٠٠٩ .

٢٤- هادي نعمان الهيتي (دكتور)، الاتصال الجماهيري المنظور الجديد، ط:٢، بغداد- ١٩٩٨ .

٢٥- هادي نهر (دكتور)، الكفايات التواصلية والاتصالية، ط:١، الاردن-٢٠٠٣.

٢٦- يوسف الشماسي (دكتور)، صناعة الخبر الصحفي، جامعة الشارقة، الشارقة - ٢٠٠٢.

**پ- بە زمانی ئینگلیزی :**

27- the encyclopedia britanica CD, 2001

**ت- بابەتی رۆژنامە و تەلەفزیۆن**

٢٨- ر: خەبات، ژ(١٦٧٠)، رێکەوتی (٢٠٠٥/١/٤).

٢٩- ر: خەبات، ژ(١٧٢٤)، چوارشەممە (٢٠٠٥/٣/٢).

٣٠- ر: خەبات، ژ(١٧٢٦)، هەینی (٢٠٠٥/٣/٤).

٣١- ر: خەبات، ژ(١٧٣٠)، سێ شەممە (٢٠٠٥/٣/٨).

٣٢- ر: خەبات، ژ(١٧٣٣)، هەینی (٢٠٠٥/٣/١١).

٣٣- ر: خەبات، ژ(١٧٦٨)، سێ شەممە (٢٠٠٥/٤/١٩).

٣٤- ر: خەبات، ژ(٢٠٤٦)، هەینی (٢٠٠٦/٢/٣).

٣٥- ر: خەبات، ژ(٢٠٤٩)، دووشەممە (٢٠٠٦/٢/٦).
٣٦- ر: خەبات، ژ(٢٠٦٧)، هەینی (٢٠٠٦/٢/٢٤).
٣٧- ر: خەبات، ژ(٢٢٢٦)، شەممە (٢٠٠٦/٨/٥).
٣٨- ر: خەبات، ژ(٢٢٤٧)، شەممە (٢٠٠٦/٨/٢٦).
٣٩- ر: خەبات، ژ(١٥٨٥)، شەممە (٢٠٠٦/١٠/٩).
٤٠- دەنگوباس K.TV ، ڕێکەوتی ٢٠٠٧/٣/١.
٤١- دەنگوباس K.TV ، ڕێکەوتی ٢٠٠٧/٤/١.
٤٢- دەنگوباس K.TV ، ڕێکەوتی ٢٠٠٧/٥/١.

## ملخص البحث

اللغة وسيلة تستعمل للتعبير ونقل المعلومات يقوم افراد المجتمع بتعلمها، لغة الاعلام وعلم اللغة مرتبطين ببعض، لديهما علاقة (التنمية والتطور) لان لغة الاعلام تستفيد من علم اللغة عندما تكون الفاظها مقبولة اكثر ومتوسعة وتوضيح المفردات اللغوية اكثر لتحقيق كلمات حديثة ودعم لخصائص لغتها من حيث السهولة والوضوح وتقربها من لغتها الواقعية الحية، بدون ان تقلل من مستوى لغتها كما يظهر في اللغة البسيطة للناس العاديين، كذلك استعمال اللغة العملية اليومية للتعبير عن طبيعة الحياة وحركتها وعملها والخلق، يظهر التأثير الحقيقي للغة الاعلام، وفي نفس الوقت علم اللغة يستفيد من لغة الاعلام لان الوسائل الاعلامية تساعد في تطور كثير من الكلمات والالفاظ المتعددة والتي سابقا لم تكن موجودة في اللغة، فهو منفعة متبادلة، او حتى عندما يتخلى عن بعض الكلمات الغير مفيدة والتي هي لاتستعمل اليوم، لان وسائل الاعلام هي اهم العوامل التي تساعد على تطوير الكلمة في منظومة اللغة، كحاجة عصرية يومية بسبب التقدم الحاصل للمجتمعات في عصر المعلومات السريعة، وذلك عند القيام بأختراع معين سواء كانت نظام اجتماعي جديد او نظام اقتصادي او نظرية علمية حديثة او نظرية فلسفية او ان يكون انتاج موضوع جديد، بذلك تظهر اهمية لغة الاعلام في حال تأثيره على أراء الناس لتكوين الرأي العام. لذلك ارتأينا ان نقوم بهذا البحث تحت عنوان (لغة الاعلام بعد عملية تحرير العراق) اتبعنا فيها المنهج الوصفي لاعدادها ووضعها بين ايدي القراء في سبيل تحقيق الفائدة المرجوة منها. يتكون البحث من المقدمة وثلاث محاور يعرض فيها الباحث المفاهيم اللغوية واهم المبادئ المتبعة للغة والكتابة الصحفية، ينتهي باهم النتائج التي توصل اليها الباحث مع قائمة المصادر.

# Abstract

Language of media after Operation Iraqi Freedom
(Research and descriptive language to Broadcast and written text in media organizations for the Kurdistan Region period (2005-2007) Khabat, K.tv. as a model)

Language is a means of expression and communication that members of a community try to learn. The science of language and language of media are interrelated through progress and development since language of media benefits from linguistics when its utterances are more acceptable and linguistic expressions are clearer. This will bring about more modern lexicon and will support the language in terms of ease and clarity; it will also bring it to a more realistic state without affecting the language.

However, linguistics will benefit from the language of media in that media channels help bring about the introduction of numerous words and expressions that never existed before. Even when it will lead to discarding words and expressions that are no longer beneficial, it is an advantage offered by language of media. Thus, media channels are among the most important factors behind lexical development which is a contemporary need to cope with the progress witnessed by societies in this age of communications revolution. This is especially salient when a new invention is introduced whether a new social or economic order, or propounding a new scientific or philosophical theory.

Hence our study is intended to deal with this vital issue, which is divided into an introduction and three sections wherein the researcher displays the most common linguistic concepts and conventional principles of language and journalistic writing.

# تێگەیشتنی دەربڕینە زمانییەکان لە ڕوانگەی زمانەوانی دەروونییەوە

م. ی. رزگار واحد حەمەدەمین
زانکۆی سەلاحەددین / کۆلێژی پەروەردەی بنیات ـ بەشی زمانی کوردی

م. ی. بابارەسوول نوری رەسوول
زانکۆی ڕاپەڕین / کۆلێژی پەروەردەی قەلادزێ / بەشی زمانی کوردی

**پێشەکی:**

ئەم توێژینەوەی ئێمە بە ناونیشانی (تێگەیشتنی دەربڕینە زمانییەکانە لە ڕوانگەی زمانەوانی دەروونییەوە)یە، بواری توێژینەوەکەش لە چوارچێوەی زمانەوانی دەروونییە.

نالێین ئەم بابەتە لە پێشتر باس نەکراوە، بەڵکو باس کراوە، بەلام ئێمە هەوڵمان داوە بە شێوازێکی تر و بە سیما و ڕووکارێکی ترەوە دەوڵەمەندی بکەین و هەندێ لایەنی تری ڕوون بکەینەوە و تیشکی زیاتری بخەینەسەر، هۆکاری هەڵبژاردنی بابەتەکەش هەر بۆ ئەم مەبەستە بووە.

گرنگیی لێکۆڵینەوەکە لەوەدایە، کە بە شێوەیەکی زانستی هەوڵی شیکردنەوەی لایەنێکی تازەی زمانەوانیی کوردی دەدات، بۆیە ساغکردنەوە و ڕۆشنکردنەوەی زۆرینەی لایەنەکانی ئەم بابەتە ئامانجی لێکۆڵینەوەکەیە.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵدراوە گرفتی (تێگەیشتن) بە شێوەی ئەرێنی و نەرێنی چارەسەر بکا و کاریگەری جۆری دەربڕینەکانیش لێکبدرێتەوە.

ئەم لێکۆڵینەوە لە چوارچێوەی - زاری کرمانجی ناوەڕاست (شێوە فەرمییەکەی) دایە و کەرستەی خاوی لێکۆڵینەوەکەش ئاخاوتنی ڕۆژانەی خەڵك و پەندی پێشینانە، لە شوێنی پێویستیش نموونەی هۆنراوە بەکارهاتووە.

شیکردنەوەی ئەم بابەتە لەژێر پەیڕەوی (وەسفی - شیکاری) دایە.

ناوەڕۆکی لێکۆڵینەوەکە، لە پاڵ پێشەکی و ئەنجام و لیستی سەرچاوەکان و کورتەیەك بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزی، لە دوو بەش پێکدێت:

لە بەشی یەکەمدا لەم سەرە بابەتانەی خوارەوە دواوین:

چەمك و زاراوەی زمانەوانی دەروونی، سەرهەڵدانی زمانەوانی دەروونی، بوارەکانی زمانەوانی دەروونی، زمانەوانی دەروونی و واتای دەروونی، کاریگەری هەندێ لە دەربڕینە باوەکان لەسەر دەروونی (وەرگر).

لە بەشی دووەمیشدا لەم بابەتانەی خوارەوە کۆڵدراوەتەوە:

تێگەیشتن چییە، خێرایی تێگەیشتن، هەنگاوەکانی تێگەیشتن، چۆنیەتی هەڵگرتنی واتای ڕستە و زانیاری لە یادگەدا، پلانی داڕشتنی ڕستە، ئەو هۆکارانەی کار لە تێگەیشتنی واتای ڕستە دەکەن، پێشبینی تەواوکردنی واتای وشە و ڕستە.

## بەشی یەکەم

## هەندێ لایەنی تیۆری زمانەوانی دەروونی

### ١ . ١: چەمك و پێناسەی زاراوەی زمانەوانی دەروونی:

زاراوەی (زمانەوانی دەروونی) بەرامبەر زاراوەی (psycholinguistics) دەوەستێ، کە لە دوو وشە پێکدێت، وشەی یەکەم گریکییە (psyche) بە واتای (هۆش) یان (بیر) دێت، وشەی دووەمیش لاتینییە (Lingua) بە واتای (زمان) دێت.

زمانەوانی دەروونی ناوی لقێکی زانستی نوێیە، کە دوو زانستی زمانەوانی و دەروونناسی بە یەکەوە گرێ دەدات، کەواتە زمانەوانی دەروونی لقێك یان جۆرێکی زمانەوانییە و لێکۆڵینەوە لە پەیوەندی نێوان ڕەفتاری زمانی و چالاکی هۆشەکیدا دەکات.

هەروەها لێکۆڵینەوە لە چۆنییەتی کارکردنی پرۆسەی زمان دەکات، واتە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە بزانێت چۆن پەیوەندی لەنێوان قسەکەر و گوێگر، هەروەها لە نێوان خوێنەر و نووسەردا دروست دەبێت.

چ کاردانەوەیەکی هۆشەکی لەناو هۆشی قسەکەردا دەبنە هۆی ئەوەی واتا ببێتە دەنگ و گوێگر بە کام کاردانەوەی هۆشەکی ئەو دەنگانە دەکاتە واتا. هەروەها نووسەر چۆن واتاکان دەکاتە پیت و خوێنەریش بە کام پرۆسە ئەو پیتانە دەکاتە واتا. (شێرزاد سەبری عەلی، ٢٠١١: ٩٩).

زانستی زمانەوانی دەروونی هەروەکو هەموو زانستەکانی تر چەندین پێناسەی جۆراو جۆری بۆ کراوە. لەڕووی زاراوەوە بە لێکۆڵینەوە لە پەیوەندی نێوان زمان و بیر پێناسە دەکرێ، پەیوەندی نێوان واتا زمانەوانییەکە و زاراوەییەکە پەیوەندییەکی پتەوە. (محمد محمد یونس، ٢٠٠٤: ٢١).

واتا زمانەوانان بەجۆرێك سەیری دەکەن و پێناسەی دەکەن، دەروونناسانیش بەجۆرێکی تر و بە گۆشە نیگایەکی تر تێی دەڕوانن، بەڵام ئەوەی زیاتر پەیوەستە بە بابەتەکەی ئێمە زیاتر پێناسەی زمانەوانەکانە، بۆیە وا لە خوارەوە پێناسەی هەندێ لە زمانەوانان دەخەینەڕوو:

دیڤید کارۆل پێی وایە: (زمانەوانی دەروونی لێکۆڵینەوەی سایکۆلۆژییانەی زمانە، بەو واتایەی زمانەوانی دەروونی لێکۆڵینەوەیە لە چۆنیەتی وەرگرتن و بەرهەمهێنانی زمانە لای کەسەکان (محی الدین محسن، ٢٠٠٨: ١٢٤).

دیڤید کریستاڵ پێی وایە زمانەوانی دەروونی: (لقێکە لە لقەکانی زانستی زمان، لە پەیوەندی نێوان زمان و پرۆسە دەروونییەکان دەکۆڵێتەوە). .(Crystal, 2003: 380)

لە پاڵ (زمانەوانی دەروونی) دا زۆرجار گوێبیستی زاراوەی (دەروونناسی زمان) دەبین، ئەم دووانە زۆر لە یەك نزیکن، بگرە هەندێ لە پسپۆران دەیانکەن بە یەك و بۆ یەك مەبەست بەکاری دەهێنن. ئەگەر جیاوازی لە نێوان (زمانەوانی دەروونی) و (دەروونناسی زمان) بکرێت، دەکرێت بگوترێت (زمانەوانی دەروونی) لێکۆڵینەوەیە لە زمان لە ڕووی پەیوەندی بە دەروونناسییەوە. کەچی (دەروونناسی زمان) لێکۆڵینەوەیە لە دەروون لە ڕووی پەیوەندی بە زانستی زمانەوە، واتە ناوەڕۆکی بابەتەکە لە هەردوو زانستەکەدایە بەڵام ئامانجیان جیاوازە. (ئەڤین سامی عارف: ٢٠١١: ٣٢)، واتە لە (زمانی دەروونی)دا زیاتر گرنگی بە لایەنی زمان دەدرێت، بەڵام لە (دەروونناسی زمان) زیاتر گرنگی بە لایەنی (دەروونی) دەدرێت.

بەڕای چۆمسکیش (زمانەوانی دەروونی لێکۆڵینەوە لە پەیوەندی نێوان زمان و بیرو هۆشی مرۆڤ دەکات (محمد محمد یونس، ٢٠٠٤: ٢١).

**١ - ٢: سەرهەڵدانی زمانەوانی دەروونی:**

زمانەوانی دەروونی مێژوویەکی زۆر کۆنی نییە. لە کۆتایی سەدەی هەژدەمدا سەرەتاکانی بەدیارکەوتن. ئەویش لەو کاتەدا بوو کە فەیلەسووفی ئەلمانی (دیتریش تیدمان) بە هۆی ئامارێکی تۆمارکردنەوە، چۆنییەتی گەشەکردنی دەروونی و زمانی منداڵەکەی خۆی تۆمار کرد، بۆ ئەوەی تێبینی زمانەکەی بکات، بەڵام لە ڕووی ئەزموونییەوە زانای دەروونی بەریتانی

(فرانس گالتۆن) یەکەم کەس بوو، کە تاقیکردنەوەکانی زمانەوانیی دەروونی ئەنجام داوە. (ئەڤین سامی عارف، ٢٠١١: ٢٧).

لە سەدەی نۆزدە و بیستیشدا، بابەتە سەرەکییەکانی ئەم زانستە لە لایەن (فۆنت و شتاینتاڵ و بوهلەر و کارینز و ستینسال و جۆن واتسۆن و.... هتد) باس کرا و پەرەی پێدراوە. بەڵام ئەوەی کە زۆر جەختی لەسەر کراوە ئەوەیە کە (فۆنت)[١] یەکەم کەس بووە، کە مشتومڕی لەسەر باکگراوندی دەروونی لە زماندا کردووە، (فۆنت) ڕێگای تێبینی و هەڵێنجانی (استبطانی) پەیڕەو کرد، کە زمان دەبەستێتەوە بە باکگراوندی تاکەکانەوە.

وا لە خوارەوەش ئەم بۆچوونەی فۆنت بەم نموونەیە ڕوون دەکەینەوە:

ئەگەر هەندێك مەرەکەب بڕژێنینە سەر پارچە کاغەزێك، ئەوا وێنە و شێوەیەکی لێ دروست دەبێت، کەسەکانی دەوروپشتی کاغەزەکە بە پێی باکگراوندی دەروونیانەوە بۆچوونی جیاوازیان لەسەر وێنەی سەر کاغەزەکە دەبێت، بۆ نموونە یەکێك دەڵێت: ئەمە وێنەی سەگە، یەکێکی تریش دەڵێت ئەمە وێنەی پشیلەیە، ... هتد.

(فۆنت) پێی وابوو ڕستە، نەك وشە، یەکەی سەرەکی زمانە، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە بڵێت بەرهەمهێنانی ڕستە بریتییە لە گواستنەوەی هاوکاتی کردەی بیری.

ئەم گواستنەوەیەش لە ڕێگای دابەشکردنی ئەم کردە بیرییەوە بۆ بەشەکانی قسەکردن دەبێت، کەواتە لێرەدا فۆنت جەخت لەسەر هاوکاتی بیر و ڕستە لە بەرهەمهێنانی قسەدا دەکات (ئەڤین سامی عارف، ٢٠١١: ٢٧).

ڕێبازەکەی (فۆنت) لە ڕووی شیکردنەوەدا، لە بۆچوونەکانی بوهلەر Buhler، ستینسال steinthall و جۆن واتسۆن John watson) جیاوازە، چونکە بۆچوونی (فۆن)ی ئەڵمانی (ئیستبطانی)یە بەڵام بۆچوونی (واتسۆن)ی ئەمەریکی ماددی و ڕەوشتییە.

بۆچوونی ڕەوشتیش لەسەر تاقیکردنەوەی (بافلۆف) دامەزراوە: بافلۆف سەگێکی هێنا، سەرەتا برسی دەکرد ئینجا خواردنی دەخستە بەردەم، سەگەکە هەر کە خواردنەکەی دەبینی لیکی دەهاتە خوارەوە، دوای ئەمە

لەگەڵ خواردن هێنانەکە زەنگێکی لێدەدا... وای لێ هات دەنگی زەنگ و خواردنەکە لە مێشکیدا لێك بەستران، جا هەر کە دەنگی زەنگەکەی ببیستایە، بەبێ خواردنیش لیکی دەهاتە خوارەوە. (عزمی اسلام، ١٩٨٥: ٣٦).

بە باوەڕی (ڕیچاردس) ئەم کارە دەبێت لە دوو ڕوانگەوە سەیر بکرێت:

١ــ دەوروبەری فیزیکی: ئەو شتانەی مرۆڤ دەیانبینێت لە کاتی قسەکردندا، وەك: قەڵەم، دەرگا،...

٢ـ دەوروبەری دەروونی: ئەو شتانەی مرۆڤ هەستیان پێ دەکات و لە مێشکیدان، وەك: خەم، برسێتی،... (عەبدولواحید موشیر دزەیی، ٢٠٠٥: ٢٨).

لە هاوینی (١٩٥٣) لە بازنەیەکی گفتوگۆی زانستیدا لە پەیمانگای زمانەوانی لە زانکۆی (ئیندیانا) بە بەشداری زمانەوانەکان و زمانەوانە دەروونییە ئەمەریکییەکان، ناو و نەخشە و چەمك و پرۆگرامی ئەم زانستە دارێژرا. هەروەها هەر لەم گفتوگۆیەدا بڕیاریان لەوەش دا کە دەکرێ ئەو بونیادە زمانەوانییانەی کە زمانەوانەکان دۆزیبوویانەوە، بە بەکارهێنانی دەروونناسی و تیۆرەکانی، توێژینەوەیان لەسەر بکرێت (محمد محمد یونس، ٢٠٠٤: ٢٢).

لە ساڵی (١٩٦٠)یشدا، (چۆمسکی) بۆ خزمەتکردنی زمانەوانی دەروونی هاتە ناو بوارەکەوە، دەکرێ قۆناغی دووەم و سەرەکی پەرەسەندنی زمانەوانی دەروونی بە کارەکانی چۆمسکی ببەستینەوە. تیۆرەکانی چۆمسکی لە ڕێزمانی گوێزانەوەدا، کە بیرۆکەی سەرەکی ئەوەبوو چۆن مرۆڤ دەتوانی بەبێ کۆتایی ڕستە دروست بکات، زۆر کاری لە زانایانی دەروونی کرد. (ئەڤین سامی عارف، ٢٠١١: ٢٩).

مەسەلەی دەستنیشانکردنی لایەنە بۆماوەییەکانی زمان بۆچوونێکی تری چۆمسکییە، ئەو پێی وابوو هەموو بنیادێکی ڕێزمانی و چەمکەکانی، کە زانستی زمانەوانی لەلای پێگەیشتووان بەرجەستەی دەکەن، هەر لە منداڵییەوە لە مێشکی مرۆڤدا هەن. (محمد محد یونس،٢٠٠٤: ٢٢).

**١ . ٣: بوارەکانی زمانەوانی دەروونی:**

زمانەوانی دەروونی لقێکی سەرەکی زمانەوانی کارەکییە ئەویش بەشێکە لە زمانەوانی گشتی، بە شێوەیەکی گشتی زمانەوانی دەروونی بەدوای وەڵامی چەند پرسیارێك دەگەڕێ و لە چەند بوارێك دەکۆڵێتەوە[٢]: کە برتیین لە:

ــ تاك چۆن دەتوانێ زانیاری زمانی خۆی بۆ بەرهەمهێنانی گوتن و تێگەیشتنی زمان بەکاربێنێ.

ـ ئەو کردارە هۆشەکییانە چین کە خەڵك بۆ درککردن و تێگەیشتنی گوتن بەکاری دێنن ؟

ـ کەی و چۆن منداڵ فێری زمانی دایك دەبێ؟

ـ لێکۆڵینەوە لە وەرگرتنی زمانی دووەم و فێربوونی زمانی بیانی.

ـ لێکۆڵینەوە لە نەخۆشییەکانی زمان و ئەو ئاڵۆزییانەی تووشی گوتن دێن.

ـ لێکۆڵینەوە لە هەڵچوونی زمانی.

ـ لێکۆڵینەوە لە پەیوەندی نێوان زمان و بیر.

ـ لێکۆڵینەوە لە پەیوەندی نێوان زمانەوانی دەروونی و واتاسازی.

ـ کاریگەری دەربڕینە زمانییەکان لەسەر دەروونی تاك.

**١ . ٤: زمانەوانی دەروونی و واتای دەروونی:**

بێگومان کاتێك مرۆڤ بیرەکانی دەردەبڕێت لە بارودۆخێکی دەروونیی تایبەتدایە، جا ئەم بارە شێوەیەکی ئەرێنی یاخود نەرێنی لەسەر دەربڕینەکان بەجێ دێڵێ، کە زیاتر پەیوەستە بە هەست و نەستی قسەکەر.

هەستکردن بە کاریگەری دەربڕینەکان لە لایەن هەندێ (وەرگر) بەهێزترە، هەندێ پەندی کوردی هەن ئەم ڕاستییە پشتڕاست دەکەنەوە، بۆ نموونە دەگوترێ (گەر قسە بکات دەزانم چی لە دڵدایە) یاخود (ئەو قەسپەی تۆ دەیخۆی ناوکەکەی لە گیرفانی مندایە)...

بۆیە دەتوانرێ سوود لەم بارە وەربگیرێ لە ناسینەوەی تۆمـەتباران لـە دادگا و شوێنەکانی لێکۆڵینەوە بەهۆی شڵەژانی باری دەروونی و کاریگـەریی ئەم بارە لەسەر زمانی قسەکردنی تۆمەتبارەکە.

وشە لە زمانا جگە لە واتای سەرەکی یا فەرهەنگی، کە واتایەکی بابەتی و هاوبەشــە لــەنێوان بەکارهێنــەرانی زمانێــك، واتــای دەروونــیش لــەخۆی هەڵدەگرێ، کە دەشێ ئەم واتا دەروونییە گشتی بێ بۆ هەموو بەکارهێنەرانی زمانەکە یاخود تایبەت بێ بە ئـەزموونی ژیـانی تاکێـك، بـۆ نموونـە ئـەو واتـا دەروونییەی کە لە وشەی (دایك، نیشتمان...)دا هەیە تا ڕادەیەك هاوبەشە لە نێوان بەکارهێنەرانی، بەڵام کاتێك منداڵێك لە (سەگ) دەترسێ، هەرکات ئەم منداڵـە (سـەگ) ببینـێ دەترسـێ، واتـە ئـەم ئاژەڵـە مانایـەکی نـەرێنی لای منداڵەکە دەبـێ (محمـد علـي الخـولـي، ٢٠٠٠ : ٧٢) کەواتـە دەکـرێ بگـوترێ (واتای دەروونی لەسەر بنچینەی هەسـت و سـۆز بنیـات دەنرێـت، هەسـت و هەڵوێستی کەس دەردەخات بەرامبەر بە کەس، شت، ڕووداو... هتـد کـە بـە پێی کەس و کۆمەڵگا دەگۆڕێت) (عەبدولواحید موشیر، ٢٠٠٥ : ٧٢).

**١ . ٥: کاریگەریی هەندێ لە دەربڕینە باوەکان لەسەر دەروونی وەرگر:**

هـەموو کردەیـەکی گـوتن کاریگـەری دەروونـی هەیـە، بـەڵام کاریگـەری گوتنەکان لەڕووی دەروونییەوە یەکسان نین، هەندێ جار کـەلتووری میللـەت ئەم کاریگەرییە دروست دەکات، بۆیە لەوانەیە وشـەیەك کاریگـەری دەروونـی لەلای نەتەوەیەك بـەجۆرێك بێـت و لـەلای نەتەوەیـەکی دیکـە بـەجۆرێکی تـر بێت، یانیش هەر کاریگەری نەبێت، بۆ نموونە وشەی (کوندەپەپو) لای کـورد ترس و شوومی دەگەیەنێت، بەڵام لای نەتەوەیەکی تر ئەو کاریگەرییەی نییە و تـرس و شـوومی ناگەیـەنێت. یـان لەوانەیـە هەنـدێ جـار کارەسـاتێك یـا بەسەرهاتێك بە ناڕاستەوخۆ دەبێتە هـۆی دروسـتبوونی کاریگـەری دەروونـی لــەلای کەسـێك، بـۆ نموونــە کەسـێك لــەکاتی وتنــی گۆرانییەکـدا تووشــی کارەساتێك دەبێـت، ئـەوا لـەپاش کارەسـاتەکە هـەر کاتێـك گوێبیسـتی ئـەو گۆرانییــە ببێــت، یەکســەر ئــەو کارەســاتەی دێتــەوە بــیر و کاریگەرییــەکی

دەروونــی لا پەیـدا دەبێــت، بــەڵام ئــەو کاریگەرییــە لای کەســێکی تــر بــە گوێبیســتبوونی ئــەم گۆڕانییــە پەیـدا نابێــت. ئــەم دیاردەیــە لــە زانســتی دەروونزانیدا بە (التـداعي بـالاقتران) ناسـراوە، هەنـدێ دەربـڕین، کاریگـەری (ئەرێنی) یان هەیە لەسەر باری دەروونی (وەرگر) وەك: ئەو دەربڕینانەی بـە مەبەستی سوپاسکردن و ستایش و دەستخۆشی کردن.. بەکاردێن، بەڵام ئەو دەربڕینانەی کە بۆ سەرزەنشتکردن بەکاردێن کاریگەری (نەرێنییان) هەیە.

هەندێ دەربڕین هەن کە بەر ئـەو مەبەسـتانەی سـەرەوە ناکـەون بـەڵام کاریگەری دەروونیان هەیە، بۆ نموونە هـەموو ئـەو دەربڕینانـەی کـە (کـەم و کورتی) مرۆڤ دەردەخەن (وەك): (شەلە، کۆرە، کەڕە..) کاریگەری (نەرێنی) لەسەر باری دەروونی (وەرگر) بەجێ دێڵن.

زاراوەی (کەمئەنــدام) وەك زاراوەیــەکی گشــتگیر بــۆ ئــەو مرۆڤانــە بەکارهاتووە کەموکوڕی جەستەیی یان عەقڵییان هەیە، کاریگەری (نەرێنی)ی گشـتگیری هەیـە بۆیـە لـە ئێسـتادا هەوڵـدراوە زاراوەی (خـاوەن پێداویسـتی تایبەت) لەبری زاراوەکەی پێشتر بەکاربهێنرێ.

یان بەکارهێنانی زاراوەی (نابینـا) لـەجیاتی (کـوێر) ئـەم دیاردەیـە پـێ دەچێ پەیوەندی بە کەلتووری کۆمـەڵگاوە هـەبێ، بـۆ نموونـە زاراوەی (سـن اليأس) ـ (تەمەنی بێ ئومێدی) لە زمانی عەرەبیدا بۆ تەمەنی ئـەو ئافرەتانـە بەکاردێن کە لە ژوور (چل و پێنج) ساڵیدان، واتە بۆ ئەو تەمەنە بەکاردێت کە ئافرەت تێدا توانای منداڵبوونی نامێنێت، بۆیە ئەم زاراوەیە بارێکی دەروونـی نەرێنی لەلای ئافرەت پەیدا دەکات کە دەگاتە ئەو تەمەنە، بەڵام بەراورد بەم زاراوەیـە، زاراوەکـان (سـن الكمـال ـ سـن الرشـد ـ سـن العقـل) کاریگـەری (نــەرێنییان) نییــە، ڕەنگــە ئــافرەت شانازیشــی پێــوە بکــات، کــە ئــەم دەستەواژانەی بەرامبەر بەکاربێت، لە زمـانی کوردیشـدا زاراوەی (سەرسـپی) کاریگەرییـەکی کـەمترە لـە زاراوەی (تەمـەنی بـێ ئومێـدی)، بـەڵام زاراوەی (قــەیرە) کاریگەرییــەکی دەروونــی خراپــی هەیــە لــە لای ئــەو کچـانەی کــە تەمەنیان لە سەرووی (٣٥) سـاڵەوەیە یـا ئەگـەر سـەیری کۆمـەڵگای کـوردی بکـەین دەبیـنین کـە خـەڵکانێکی زۆر ناویـان (رەسـول، نـەبی، محەمـەد) ە،

کەچی کەسێ نییە یا دەگمەنە ناوی (پێغەمبەر) بێت، چونکە لەوانەیە پێیان وابێ ناونانی منداڵ بە (پێغەمبەر) گوناهێکی گەورە بێ، کەچی ناونانی منداڵ بە (ڕەسول، نەبی) بە باش و خێر دادەنێن، بەڵام لە ڕووی واتاوە هیچ جیاوازییەکیان نییە، تەنانەت لە ڕووی زاراوەشەوە (ڕەسول) لە وشەی (رسالە)وە هاتووە، بە هەمان شێوە (پێغەمبەر) لە (پەیغام بەر) هاتووە، کە ئەمڕۆ بووە بە (پەیام بەر) ئەم بیرکردنەوەی کوردیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی زاراوەی (پێغەمبەر) جگە لە واتا سەرەکییەکەی پلەی پیرۆزی و ڕێزگرتنی زیاتری تێدایە لە وشەی (ڕەسول) (قیس کاکل، ٢٠٠٠: ١٣ — ١٥).

دەکرێ بگوترێ هەڵبژاردنی وشەکان لە لای مرۆڤ لەژێر کاریگەری دەروونداییە و تێکەڵ بە هەست و سۆز دەبێ، زۆرجار بەکارهێنانی دەربڕینەکان بۆ رازیکردنی هەست و سۆزی بەرامبەرە، ئەم هەست و سۆزەش لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە دەگۆڕێ، هەر بۆیە هەمان دەربڕین لە دوو نێرەری جیاوازەوە هەمان کاریگەری و ئەنجامی نابێ، بۆ نموونە یەک جۆر قسە کاتی (وەرگر) لە یەکێك دەیبیستێ پێی تووڕە و دڵگران دەبێ، ڕەنگە هەمان قسە لە یەکێکی دیکە ببیستێ پێی دڵگران نەبێ.

یاخود وشە هەیە کاریگەرییە دەروونییەکەی لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەکی تر دەگۆڕێ، بۆ نموونە وشەی (ئەنفال ـ هەڵەبجە) ئەو کاریگەرییە دەروونییەی لەسەر کوردێك هەیانە لەسەر عەرەب، فارس، تورك،... نییانە. بڕوانە (عەبدولواحید موشیر، ٢٠٠٥: ٧٧).

دەشێ لەناو یەك کۆمەڵگاشدا کاریگەری وشە و دەستەواژەکان لەسەر وەرگر جیاوازییان هەبێت، بۆ نموونە وشەی ناوی ڕەنگەکان (سوور، سەوز، زەرد،... هتد) لەلای کورد بە ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتەوە بارگاوی کراون، بۆیە زۆر جار پارت و ڕێکخراوەکان وشە و دەستەواژەی تایبەت بەخۆیان هەیە. هەر بۆیە لە باشووری کوردستان وشەی ڕەنگەکان کاریگەری جیاوازیان لەسەر تاکی کورددا هەیە. ئەمڕۆ وشەی (سەوز) لای لایەنگرانی یەکێتی پیرۆزە و ڕەمزی زیندوویەتییە، بەڵام لەوانەیە لای کەسێکی دیکە وا نەبێت...

# بەشی دووەم
# پرۆسەی تێگەیشتن

**٢ . ١: تێگەیشتن چییە؟**

یەکێك لە ئامانجەکانی دەروونناسی (لێکدانەوە یان تێگەیشتن)ە، کە ئامانجی هەر زانستێکی تریشە، کە ئەمیش بە دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان دیاردە جۆربەجۆرەکان دەبێ، دۆزینەوەی ئەم پەیوەندییانە و لێکدانەوە و تێگەیشتن یەك کردەوەیە.

تێگەیشتنی دیاردەیەك واتای ئەوەیە ئێمە جۆرە پەیوەندییەکی ئەم دیاردەیە و دیاردەکانی دیکەمان دۆزیوەتەوە یان لێکیانداوەتەوە کەوابێت زانین و تێگەیشتن بە دۆزینەوەی پەیوەندییە جۆربەجۆرەکانی دیاردەکانەوە نەبێت، نابێت، (مستەفا پەژارە، ١٩٨٨ : ٨٤).

تێگەیشتن دوو واتای باوی هەیە، بە واتا تەسکەکەی ئاماژەیە بەکردارە عەقڵییەکان کە لە چوارچێوەیدا گوێگر دەتوانێ جیاوازی بکات لە نێوان ئەو دەنگانەی قسەکەر دەیدرکێنێ یا بەواتایەکی ئاسان تێگەیشتن بریتییە لە کرداری پێکهێنانی واتا لە دەنگەکانەوە.

بەڵام تێگەیشتن بە واتا فراوانەکەی بەوە لێکدەدرێتەوە، کە کاتێك گوێت لە ڕستەیەك دەبێ زانیاری نوێی لێ هەڵدەهێنجێ و لە یادگەدا ڕێکی دەخەی، کاتێك گوێت لە پرسیارێك دەبێ دەگەڕێی بەدوای ئەو زانیارییانەی کە پرسیاریان لە بارەوە کراوە.

بەشێوەیەکی گشتی تێگەیشتن بە مانای زانیاری پەیبردن بە شتێك یان هەڵوێستێك یان ڕاپۆرتێکی زمانی دێت (جمعە سید یوسف، ١٩٩٠ : ٦٨ – ٧٠).

تێگەیشتنی واتاییش چارەسەری واتای تاکە وشە و ڕستە و دەق دەکات (سەرچاوەی پێشوو: ٨٣).

**٢ ـ ٢: خێرایی تێگەیشتن:**

زمانی مرۆڤ بریتییە لەو پێڕەوەی کە مرۆڤ بۆ لەیەکتر گەیشتن بەکاری دەهێنێ، بەکارهێنانی ئەم پێڕەوەش بەندە بە توانای داهێنان و لێکدانەوەی بەکارهێنانی هێماوە. هێماش یا زمانییە یانیش نازمانییە. هێمای زمانی بریتییە لە ڕۆنانێك کە دوو دیوی هەیە، دیوێکی لە ڕیزە دەنگێك پێکهاتووە، کە بەرگوێ دەکەوێت و دیوەکەی تریشی بریتییە لە بیرێك، کە بەرامبەر بەو ڕیزە دەنگە دێت و لە مێشکی مرۆڤ هەڵگیراوە. پەیوەندی نێوان ئەم دوو دیوەش لەزۆربەی هێماکاندا لەخۆوەیە و زیاتر کۆمەڵ لەسەری ڕێککەوتووە. (محەمەد مەعرووف فەتاح، ٢٠١٠: ١١٦ ـ ١١٩).

یان گوتراوە زمان کۆدە (جفرەیە)، کۆدیش هێمای هاوبەشی نێوان قسەکەر و گوێگرە، کۆد بۆ گواستنەوەی زانیارییە. لە کردەی پەیوەندیکردن و لە یەکتر گەیشتندا، دەنگەکان بەهۆی کەناڵێکەوە لە قسەکەرەوە بۆ گوێگر دەنێردرێن و ئەو زانیارییانەش لەلایەن گوێگرەوە وەردەگیرێت و پاشان لێك دەدرێتەوە.

هەم لە تیۆری زانیاری و هەم لە تیۆری لە یەك گەیشتندا لایەنی قسەکەر و لایەنی گوێگر ڕۆڵیان لە جفرە لێکدانەوە (جفرە هەڵوەشاندنەوە decoding)دا هەیە (محەمەدی مەحوی، ٢٠٠٩: ١٣٩ ـ ١٤٠).

کردەی بەهێماکردن (encod) لە لایەن قسەکەر و کردەی هەڵوەشاندنەوە (decoding) لەلایەن گوێگرەوە کاریگەرییان لەسەر تێگەیشتن هەیە، بۆیە دەبێت قسەکەر هێمای گران و ئاڵۆز بەکارنەهێنێت و گوێگریش شارەزایی هەبێت لە هەڵوەشاندنەوەی هێماکان. بەواتایەکی تر گرانی هێماکان دەوەستێتە سەر مەبەستی نێرەرەکان خۆیان و هەڵوەشاندنەوەی هێماکانیش دەوەستێتە سەر شارەزایی وەرگر.

خێرایی تێگەیشتن و هەڵگرتنی زانیارییەکان بۆ ماوەیەکی درێژ تایبەتمەندییەکە، لە وەرگرێکەوە بۆ وەرگرێکی تر جیاوازە، ئەم تایبەتییە، پێوەرێکیشە بۆ دیاریکردنی ئاستی زیرەکیی مرۆڤ (وەرگریش ئەو کەسەیە کە وورووژێنەرەکە وەردەگرێت، لە ڕێگای (چاو) و (گوێ) و لە مێشکدا شییان

دەکاتـەوە، جـا ئەگـەر پەیامەکـە راسـتەوخۆ و ئاسـان بـوو ئـەوا خێـرا تێـی دەگـات، ئەگـەر ناڕاسـتەوخۆش بـوو، ئـەوا ئـەرکی مێشـك قورسـتر دەبێـت، پێویستی بە تێگەیشـتنی قـووڵ دەبێـت کـە زۆر گرانـە و لەوانەشـە ئەسـتەم بێت) (عەبدولواحید موشیر: ٢٠٠٥: ٥٥). خێرایی تێگەیشتن لە زمانێکەوە بـۆ زمانێکی تر و لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تـر دەگۆڕێـت، بـەڵام بەشـێوەیەکی گشتی گوێگر دەتوانێ بە ئاسانی لەو ئاخاوتنە تێ بگا کە بـە خێرایـی (٢٥٠) وشەیە لە دەقەیەکدا، کە دەکاتە (٤) وشە لە چرکەیەکدا، بەشێك لەم کاتەش بۆ پێکهێنانی واتای ڕستەیە لە واتای وشەکانەوە، ئامـادەکردنی واتـای وشـە لە زەیندا کەمتر لە چارەگە چرکەیەکی پێویستە) (داود عبده، ١٩٨٤ : ١٨).

ئەم خێراییەش دەوەستێتە سەر ئەو هۆکارانەی کە کاریگەرییان لەسـەر تێگەیشتن هەیە، بۆیە دەتـوانین بڵـێین، ئەگـەر قسـەکەر بـە خێراییـەکی زۆر وشـەکان بـدرکێنێ یـان خوێنـەر دەقێـك بـە خێرایـی بخوێنێتـەوە، مێشـکی (وەرگر) توانای شیکردنەوەی وشەکانی کەمتر دەبێ و لەوانەیە تێگەیشتن بە خراپـی ڕووبـدات، بـەڵام ئەمـە ئـەوە ناگەیـەنێ کـە هێواشـی لـە قسـەکردن یارمەتیـدەر بێـت بـۆ تێگەیشـتن، هێواشـییەکی زۆر لـە قسـەکردندا دەبێتـە کۆسپ بۆ تێگەیشتن چونکە بارگرانییەکی زۆر دەخاتە سەر یادگـەی گشـتیی گوێگر.

## ٢ . ٣: هەنگاوەکانی تێگەیشتن:

کردەی درکاندنی دەنگەکان لە لایەن قسـەکەرەوە و کـردەی بیسـتنیش لە لایەن وەرگرەوە کاریگەری خۆیان لەسەر پرۆسەی تێگەیشتندا هەیە. ئـەو لەرەلەرە دەنگییانەی بەرامبەر شەپۆلە دەنگییـەکان دەنـوێنرێن، کاریگـەری لە گوێی گوێگر دەکـات و بـە جۆرێـك کـە کاردەکاتـە سـەر میکـانیکی گـوێی ناوەوە و دەمارەکانی بیستن. ئەم کارتێکردنەش بـۆ ئەوەیـە تـاوەکو گـوێگر هەست بە دەنگەکان بکات. هەستکردنی گوێگریش بـەم دەنگانـە، قۆنـاغێکی دەروونـی بـێ خەوشـی بـواری ڕاسـتەقینەی دەروونناسـییە. (عـاطف عبـدالله فەرهادی، ٢٠١١: ٢٣).

تێگەیشتن کردارێکی هۆشەکییە و هەر لەخۆوە ڕوونادات، بۆ گەیشتن بە ئامانج (وەرگر) چەند هەنگاوێك، دەربڕێ و دەگاتە بنج و بنەوانی مەبەستەکە کە دەکرێ هەنگاوەکان بەم شێوەیەی خوارەوە کورت بکرێتەوە:

١ـ وەرگرتنی ئەو دەنگانەی کە وشەکەیان لێ پێکهاتووە لە لایەن (وەرگر)ەوە و پاراستنیان لە یادگەی گشتیدا بۆ ئەوەی شییان بکاتەوە بۆ پارچە پێکهێنەرەکانی ڕستە.

٢ـ شیکردنەوەی ئەو دەنگانەی لە یادگەی گشتیدا هەن، بۆ پارچە پێکهێنەرەکانی لە ڕستەدا و بەردەوامبوونی یادگە لە وەرگرتنی دەنگ و وشەی نوێ.

٣ـ گۆڕان و گواستنەوەی پێکهێنەرەکانی ڕستە بۆ ئەو بیرەی کە گوزارشت لە واتاکەی دەکات، لە هەمان کاتیش دوو هەنگاوەکەی پێشتر بەردەوامە.

٤ـ بەرە بەرە واتای کەرەسە پێکهێنەرەکانی رستە کۆدەبنەوە واتای ڕستەکە پێکدێنن کە (لووتکەی درەختەکەیە).

٥ـ ڕزگاربوون لە شێوەی گوتراوی پیتی ڕستە و گواستنەوەی واتاکەی بۆ یادگەی هەمیشەیی بڕوانە (داود عبده، ١٩٨٤ : ٢٤ — ٢٥).

**٢ . ٤: چۆنیەتی هەڵگرتنی واتای ڕستە و زانیاری لە یادگەدا:**

زۆربەی زانایان لەسەر سێ جۆر یادگە کۆکن ، کە بریتین لە: هەستە یادگە، یادگەی کورتخایەن، یادگەی هەمیشەیی، بڕوانە: (کەریم شەریف قەرەچەتانی: ٢٠٠٥، ٢٠٩) ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە ئەوەیە کە ئاخۆ واتای ڕستەکان لەم جۆرە یادگانەدا بەشێوەی پیتی هەڵدەگیرێن یانیش بەبێ شێوەی پیتی هەڵدەگیرێن؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە توێژەران چەندان ئەزموونیان ئەنجام داوە، لەوانە (کەمپن kempen ـ ١٩٧٦، ئامۆن Amon ـ ١٩٦٨، فۆدەر و بیڤر fodor and bever ـ ١٩٦٥) ئەمانە لە لێکۆڵینەوەکانیاندا گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەی کە ئەوەی گوێمان لێ دەبێ لە یادگەی کورتخایەن، لەسەر شێوەی پێکهاتەی ڕستەکان دەپارێزرێن) (موفق الحمداني : ١٩٨٢ ، ٢٠٨) واتە

مەبەست ئەوەیە (گوێگر دەستبەرداری شیکردنەوە و دەربڕاوی ڕستە نابێت، تەنها لە دوای شیکردنەوە و پێکهێنانی واتاکەی نەبێ لە واتای کەرستە پێکهێنەکانییەوە) (داود عبده: ١٩٨٤، ٢٥).

لێکۆڵینەوەکانی جارڤێلا Jarvella ١٩٧٠ ـ ١٩٧١ ئەوە ڕادەگەیەنن کە گوێگر رزگار دەبێ لە پێکهاتەی پیتی (حەرفی) دەق دوای بەزاندنی سنوورەکەی و هەڵگرتنی لە یادگەدا (موفق الحمداني: ١٩٨٢، ٢٠٨).

لێرەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی (وەرگر) دەستبەرداری شێوەی پیتی ڕستە نابێت، تا واتاکەی لە یادگەی هەمیشەییدا هەڵنەگرێت، بەڵام هەندێ وەرگر واز لە شێوەی پیتی ڕستە ناهێنن و بابەتەکان دەقاودەق ئەزبەر دەکەن، نموونەی ئەمە لای هەندێ لە قوتابیان دەبینرێ لە کاتی تاقیکردنەوەدا زانیارییەکان بەشێوەی پیتی دادەڕێژنەوە.

**٢ . ٥: پلانی داڕشتنی ڕستە:**

دانانی پلانی داڕشتنی ڕستە و گەیاندنی پەیام، ئەرکی (نێرەر)ە، بەڵام پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆشی بە (وەرگر)ەوە هەیە، چونکە داڕشتنی پلانی ڕستە بەچاترین شێواز کاریگەری ئەرێنی لەسەر هەڵوێستی (وەرگر) دەبێت دوای ئەوەی (نێرەر) بابەتەکە دیاری دەکا، بۆ گەیاندن و گواستنەوەی پەیامەکە ڕستە بۆ ئەم ئەرکە و دیاریکردنی (بکەر) و (بەرکار)ی ڕستەکە هەڵدەبژێرێ (جمعە سید یوسف، ١٩٩٠: ٩٦) هەنگاوی یەکەمیش بریتییە لەوەی ڕستەی ئاسان بەکاربێنێ لە ڕووی زمانەوانییەوە، تەنیا ئەگەر هۆیەك هەبوو بۆ پێچەوانەی ئەمە، پێویستە (نێرەر) بڕیار بدات کە دەیەوێ پەیامەکەی بە شێوەی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بگەیەنێ، (موفق الحمداني، ١٩٨٢: ٢١٢).

ئەمەش بە پێی کات و شوێن و پێگەی کەسەکە (نێرەر) دەگۆڕێت، بۆنموونە ئەگەر کەسەکە مامۆستایەك بێت، پێویستە ڕستە و دەربڕینەکانی لە کاتی وانە وتنەوە و تاقیکردنەوەدا لێکدانەوەی جیا جیا هەڵنەگرن، بەڵام بۆ کەسێکی سیاسەتمەدار ئاساییە ئەگەر قسەکانی لێکدانەوەی تر، جگە لە

واتا حەرفییەکە، هەڵبگرن. پێویستە لە داڕشتنی ڕستەی نێو دەقەکانی گرێبەست و ڕێککەوتنەکان بە گشتی و یاسا و دەستوورەکان بەتایبەتی، لێکدانەوەی جیاجیا هەڵنەگرن، بۆیە پێویستە ڕۆڵی زمانەوان لەم هەڵوێستانەدا لەبەرچاو بگیرێ، تاکو لایەنی بەرامبەر بە ئارەزووی خۆی لێکدانەوە بۆ دەقەکە نەکات.

بەڵام هەندێ جار لە گفتوگۆی ڕۆژانەدا ناردنی پەیام بەشێوەی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ ئاساییە، بۆ نموونە:

(ئاوی خواردنەوەم بدەیێ).

ـ ببوورە ئاوی خواردنەوەم نادەیتێ؟

ـ ئایا دەتوانی هەندێ ئاوی خواردنەوەم بدەیێ؟

ـ کەشەکە گەرمە بۆیە خەڵك زوو تێنوو دەبن.

لاکوف Lackoff ١٩٧٣ وای دەبینێ نموونەی ئەم هەڵبژاردنانە لە دوو بنەمای ئەدەبییەوە هاتوون ئەوانیش:

١ـ خودی خۆت لەسەر خەڵك فەرز نەکەی.

٢ـ چەند هەڵبژاردنێك دەدەیتە گوێگر بۆ ئەوەی یەکێکیان پەسند بکات (سەرچاوەی پێشوو، ٢١٢).

**٢ . ٦: ئەو هۆکارانەی کار لە تێگەیشتنی واتای ڕستە دەکەن:**

پێکهاتەی ڕستە لە رووی داڕشتن و ئەو وشانەی لێی پێکدێ و ئەو بیرۆکانەی دەیگەیەنێ رۆڵێکی گرنگ دەگێڕن لە تێگەیشتنی واتای ڕستە، جا هەندێ هۆکار هەن ڕۆڵی ئەرێنی دەگێڕن و هەندێکی تر ڕۆڵی نەرێنی، ئەمانەی خوارەوە کورتەیەکن لەو هۆکارانە:

١ـ ئەو ڕستانەی لە وشەی ڕوون و باو و زیاد بەکارهاتوو، پێکهاتوون تێگەیشتنیان خێرایە، لەبەر ئەوەی وشەی نامۆ و دەگمەن پێویستی بە کاتێکی زیاترە بۆ شیکردنەوەی (موفق الحمداني، ١٩٨٢ : ٢٠٩) وەك ئەم نموونانەی خوارەوە:

ـ ئارکیۆلۆجی لە وڵاتی ئێمەدا گرنگی پێ نادرێ.

لەم نموونەی سەرەوە زاراوەی (ئارکیۆلۆجی)، کە زاراوەیەکی بیانییە و بەواتای (شوێنەوارناسی) دێت، تێگەیشتنی ڕستەکەی گران کردووە.

- ئانارشیستەکان ڕێگاکانیان داخستووە.

ئەوەی وای لەم ڕستەیە کردووە، تێگەیشتنی گران بێت وشەی (ئەنارشیست) ە، کە بە واتای (ئاژاوەچی) دێت.

نموونەی لەوانەی سەرەوە زۆرن کە ئەمڕۆ لەلایەن هەندێ کەسانەوە بەکاردەهێنرێن، کە بارگرانی دەخەنە سەر یادگە و تێگەیشتن گران دەکەن.

٢- زۆری ئەو بیرانەی لە ڕستەیەکدا کۆدەبنەوە:

ئەگەر دوو ڕستە لە ژمارەی ئەو وشانەی کە ڕستەکانی لێ پێکدێ یەکسان بن، بەڵام لە ژمارەی ئەو بیرانەی ڕستەکەی لێ پێکدێ جیاوازبن، ئەوا ئەو ڕستەیەی ژمارەی دەربڕینی بیرەکانی زیاترە، تێگەیشتنی گرانترە لە ڕستەکەی تر (داود عبدە، ١٩٨٤: ٢٨) وەك:

أ - مامۆستا و قوتابییەکە سەعاتێك پێش ئێستا گەیشتنە فرۆکەخانە.

ب - مامۆستا نوێیەکە دوێنێ ئۆتۆمبێلێکی شایستەی بە قست کڕی.

ڕستەی یەکەم ئەم بیرانەی خوارەوەی تێدایە:

١- مامۆستا و قوتابییەکە پێکەوەن.

٢- مامۆستا و قوتابییەکە گەیشتن.

٣- گەیشتوونەتە فڕۆکەخانە.

٤- پێش سەعاتێك گەیشتن.

بەڵام ڕستەی دووەم ئەم بیرانەی خوارەوەی تێدایە:

١- مامۆستاکە ئۆتۆمبێلێکی کڕی.

٢- مامۆستاکە نوێیە.

٣- کڕینەکە دوێنی بووە.

٤- کڕینەکە بە قیست بووە.

٥- ئۆتۆمبێلەکە شایستەیە.

٦- ئۆتۆمبێلەکە بۆ مامۆستایەکە. (سەرچاوەی پێشوو: ٢٩).

٣ـ ریزبوونی کەرستەکانی ڕستە:

لە زمانی کوردیدا ڕستە بە شێوەیەکی ئاسایی بۆ کاری تێپەڕ لە (بکەر + بەکار + کار) پێکدێت، بۆ کاری تێنەپەڕیش لە (بکەر + کار) پێکدێت، ئەمە جگە لە چەند قالبێکی تر و بوونی کەرستە ناسەرەکییەکانی وەك: ئاوەڵکار و دیارخەرەکان و بەرکاری ناڕاستەوخۆ، بڕوانە: ( Fattah, 1997, 246).

هەر گۆڕانێك لەم ڕیزبوونە بنچینەییە ڕوویدات، تێگەیشتن درەنگتر دەکات، وەك لەم ڕستانەی خوارەوە دیارە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١ـ شێرکو | ماسییەکەی | دوێنێ | ڕاوکرد |
| بکەر | بەرکار | ئاوەڵکار | کار |
| ٢ـ ماسییەکە | شێرکۆ | دوێنێ | ڕاوی کرد |
| بەرکار | بکەر | ئاوەڵکار | کار |
| ٣ـ دوێنێ | شێرکۆ | ماسییەکەی | راوکرد |
| ئاوەڵکار | بکەر | بەرکار | کار |

تێگەیشتنی ڕستەی یەکەم و سێیەم ئاسانترە لە دووەم هەرچەندە لە ڕستەی یەکەم سێیەم شوێنی ئاوەڵکار گۆڕاوە بەڵام ئەمە تا ڕادەیەك کارێکی ئاساییە لە زمانی کوردیدا.

٤ـ ڕستەکە زیاتر لە واتایەکی هەبێ:

یەکێك لەو هۆکارانەی وا دەکات درەنگ مەبەستەکە تێبگەی، بوونی لە واتایەك زیاترە لە ڕستەیەکدا، ئەمەش بەهۆی بوونی وشەیەك کە زیاتر لە واتایەك هەڵبگرێ، یان بەهۆی پێکهاتەی ڕستەکەوە (داود عبده، ١٩٨٤: ٣٤) واتە (ڕستە لێڵە ئەگەر زیاتر لە مانایەکی هەبێ، ئەم لێڵییەش بەهۆی وشەی فرە واتا و جیای لە ئاوازی ڕستە و بوونی دوو پەیوەندی جیا لە نێوان بەشەکانی ڕستە لە پێکهاتەی ژێرەوەی ڕستە و دەرنەکەوتنی ئەم جیاوازییە لە پێکهاتەی سەرەوەی ڕستەدا، یاخود بەهۆی سەپاندنی هەندێ یاسایی گوێزانەوە دەبێت) بڕوانە: (وریا عومەر ئەمین، ٢٠٠٤: ٢٩٦ ـ ٣٠٠).

- ئازاد ئازار لە دڵ دەڕوێنێ.

تێگەیشتنی ئەم ڕستەیە تا ڕادەیەك گرانە و لەوانەیە (وەرگر) بە هەڵە لە مەبەست تێ بگات، چونکە ڕستەکە زیاتر لە لێکدانەوەیەك هەڵدەگرێ، کە بریتین لە:

أ - ئازاد ئازار لە دڵ لا دەبات.

ب - ئازاد ئازار دەخاتە دڵەوە.

جگە لەمانە لەوانەیە (وەرگر) وشەی (ئازار) بە مانای مانگی (سێ - ئادار) تێ بگات، ئەوکات ڕستەکە لێکدانەوەیەکی تریش هەڵدەگرێ.

٥- بوونی پەیوەندی لۆجیکی (مەنتقی) لە نێوان کەرستەکانی رستەکەدا تێگەیشتن ئاسان دەکات، بە پێچەوانەش راستە، ئەم دیاردەیە لە زمانی شیعردا زیاتر بەرچاو دەکەوێ، بۆیە تێگەیشتن هەندێ دەقی شیعری ئاڵۆزە و پێویستی بە قووڵبوونەوە لە واتا هەیە، (داود عبده، ١٩٨٤ : ٣٧)

هەندێ جۆر پەیوەندی واتایی لە ڕستەدا، یارمەتی ئاسان تێگەیشتن دەدەن، وەك گونجان کە بریتییە لەوەی دوو وشە لە قسەکردن بەیەکەوە دێن و هاوڕێیەتییێك دروست دەکەن، ئەگەرچی پەیوەندییەکە دژیش بێت.

- دار و بەردی ئەم وڵاتە پیرۆزن

پەیوەندی گونجان

- ئاسنگەرەکە هات

نیشانکراوە بۆ پیاو

بە پێچەوانەش تێگەیشتنی هەندێ ڕستەی رێزمانی، کە هیچ پەیوەندییەکی لۆجیکی لەنێوان وشەکانیدا نییە، گرانە، وەك:

- بیرە سەوزە بێ ڕەنگەکان بە تووڕەیی خەوتن.

ئەم ڕستەیە بە واتایی پیتی وەرناگیرێ، دەتوانرێ شیکردنەوەی جیاجیای بۆ بکرێ، بە مەرجێ ڕستەکە لە دەوروبەری پەسەند ڕوون بکرێتەوە، یان ئەگە واتای وشەیەك یان چەند وشەیەك لە پێکهاتەی ڕستەکەی فراوان بکرێ، لە دەرەوەی مانا بنچینەییەکەی یان ئاساییەکەی (جۆن لاینز، ١٩٨٥: ١٣٠).

زۆرجـار ڕاسـتییە لۆژیکییـەکان یارمەتیـدەرن لـە تێگەیشـتنی واتـای ڕستەکان بۆ نموونە کە یەکێك فێری زمانی کوردی دەبـێ، لـە سـەرەتادا لـە بـەکارهێنانی جێناوەکـان گرفتـی بـۆ دروسـت دەبـێ، ناتوانـێ بەشـێوەیەکی ڕێزمانی بەکاریان بهێنێ، ڕەنگـە ڕسـتەیەکی وەك ئەمـەی خـوارەوە دروسـت بکات:

- پۆلیسەکە دزەکە گرت*

ئێمە تێ دەگەین مەبەستی ئەوە بووە بڵێ:

- پۆلیسەکە دزەکەی گرت.

زانیاریمـان لـە بـارەی پـۆلیس و دز بـەرەو ئـەو لێکدانەوەیـەمان دەبـات. پێچەوانەی واتای پیتی ڕستەکەش دەشێ هەندێ جار ڕووبدات.

٦- درێژی ڕستە و ئاڵۆزییەکەی:

سادەترین ڕستە لە زمانی کوردیدا پێکدێت لـە (ب + ك) وەك (شـێرکۆ هات)، لە پێکهاتەی سەرەوەی ئەم ڕستەیە دەشێ (بکەر) لابـرێ و بگـوترێ (هات) (رستەی درێـژ تێگەیشـتنی گـرانترە لـە کـورت، چـونکە قورسـاییەکی زیاتر دەخاتە سەر یادگەی گشتی) (داود عبدە، ١٩٨٤: ٢٨).

پێکهاتەی ئاڵۆزیش کاریگەری سەربەخۆی لەسەر گران تێگەیشـتن هەیـە و پەیوەندی بە درێـژی ڕسـتەوە نییـە لەوانەیـە ڕسـتەیەك کـورت بـێ لەچـاو ڕسـتەیەکی تـر، بـەڵام تێگەیشـتن گـرانتر بـێ، بـۆ نموونـە ئـەم ڕسـتەیەی خوارەوە، کـە لـە زمـانی ئینگلیزییـەوە وەرگێـڕدراوە، پێکهاتەیـەکی ئـاڵۆزی هەیە:

- شێرەکە پڵێنگەکەی دەرکرد، ئەوەی مەیموونەکەی کوشـت کـە زیانبـەخش بوو. (سەرچاوەی پێشوو، ٣١).

تێگەیشـتنی ئـەم ڕسـتەیە ئـاڵۆزە، چـونکە کـاری (کوشـتن)ەکە دەشـێ (شێرەکە یان پڵێنگەکە) ئەنجامی دابێ، یان (زیانبەخش) دەشێ (شێر، یـان پڵێنگ یان مەیموون) بێ.

بەگشتی لە زمانی کوردیـدا ڕسـتەی ئاوێتـە (ئـاڵۆز) زیـاتر پێویسـتی بـە کاتە بۆ تێگەیشتن، بە بەراورد لەگەڵ ڕستەی سادە یان لێکدراو، نموونە:

ـ ئەو کوردانەی کە ژێردەستەن بۆ ئازادی تێدەکۆشن.

ـ کوردەکان بۆ ئازادی تێدەکۆشن.

هەروەها ئەو ڕستانەی باسی پەیوەندی خزمایەتی دەکەن، بەتایبەت ئەگەر پەیوەندییەکە بە چەند پلەیەك دووربێت، تێگەیشتنیان تا ڕادەیەك لە لایەن وەرگرەوە درەنگتر دەبێ، بۆ نموونە:

ـ کوڕی خەزووری ئامۆزاکەم لەو قوتابخانەیە مامۆستایە.

زانیاری لۆژیکی هەندێ جار یارمەتیدەرە لە تێگەیشتنی ڕستەیەکی ئالۆزی وەك ئەمەی خوارەوە:

ـ منداڵ لە دایك و باوکیان دەگەن، هەرچەندە زمانیشیان تەواو نییە.

لێرەدا (وەرگر) بەهۆی لۆژیکەوە لەوە دەگات کە (منداڵ زمانیان تەواو نییە) (داود عبدە، ١٩٨٤ : ١٤) سیاقی ڕستەش ڕۆڵ دەبینێ لە ڕوونکردنەوەی واتای ئەمجۆرە ڕستانە.

٧ـ دەربڕین و گەیاندنی واتا بە ڕێگایەکی جیاواز لە ڕێگای ئاسایی، بارگرانی دەخاتە سەر تێگەیشتن (سەرچاوەی پێشوو: ٣٤). وەك ئەم ڕستانەی خوارەوە:

أ ـ کتێبەکە لەسەر مێزەکەیە.

ب ـ مێزەکە لەژێر کتێبەکەیە.

أ ـ قەڵا لە ناوەڕاستی شاری هەولێرە.

ب ـ شاری هەولێر لە دەوری قەڵایە.

لە ڕستەکانی سەرەوە (أ) تێگەیشتنیان ئاسانترە لە (ب) چونکە بە ڕێگای ئاسایی خۆیان دەربڕاون.

جگە لە هۆکارەکانی سەرەوە، چەند هۆکارێکی تر هەن کە کاریگەرییان هەیە لەسەر تێگەیشتن لەوانە:

٨ــ دەق و پراگماتیك[٣]: دەق و پراگماتیك دوو هۆکاری یارمەتیدەری ترن لە پرۆسەی تێگەیشتن و ڕۆڵی گرنگ لەو مەیدانە دەبینن، زۆرجار گوێگر بەبێ گەڕانەوە بۆ دەق و پراگماتیك ناتوانێ لە دەربڕاوێك بگات، لە دەقدا لکانی ڕێزمانی و واتای بنچینەن لە بەستنەوەی پارچەکانیدا، چونکە دەبێت

پارچـــەکانی دەق پەیوەندییـــەکی پتـــەو بەیەکـــەوەیان ببەســـتێتەوە، ئـــەو پەیوەندییەش پەیوەندی واتایی و ڕێزمانییە.

دەق هەیە پارچە پێکهێنەکانی لەڕووی ڕێزمانی و واتاییەوە لەگـەڵ یـەك گونجاون و واتا بەخشن، وەك:

کاوە ژنی نەهێناوە، کەواتە ڕەبەنە. (پەسندە)

ئـــەم دەقـــەی ســـەرەوە لـــەڕووی واتـــا و ڕێزمانـــەوە پەســـندە و هـــیچ کەموکوڕییەکی نییە.

دەقیش هەیە پەیوەنـدی نێـوان پارچـەکانی زۆر گونجـاو نییـە و گـوێگر هەزمی ناکات و بە دەقی ناتەواوی دادەنێت، وەك:

- کاوە ژنی نەهێناوە، بۆیە سیدی زۆر دەکڕێت (کەمتر پەسندە).

- کاوە ژنی نەهێناوە، بۆیە ئەمستردام پایتەختی هۆڵەندایە (ناپەسندە).

کەچـی دەقـی واش هەیـە، لەوانەیـە لـە ڕووی ڕێزمانییـەوە ناتـەواوی تێدابێت، بەڵام لەبـەر ئـەوەی لـەڕووی واتاییـەوە گونجـاوە، بۆیـە گـوێگر بـە پەسندی دەزانی و لێی تێدەگات، وەك:

- ئەمستردام پایتەختی هۆڵەندایە، هەشت هەزار کەسی تیادا دەژی.

لەم دەقەی سەرەوە دوو ڕستەکە، بەبێ ئامرازی بەسـتنەوە، بەیەکـەوە لکاون، بەڵام چونکە لە ڕووی واتاییەوە لەگەڵ یەك گونجاون، بـە ڕسـتەیەکی پەسند دادەنرێت. (محمد خطابي، ١٩٩١: ٣١ ـ ٣٢).

لە دەقدا و ئاخاوتنیشدا، زانیاری دنیایی و دەوروبەر و کـەلتوور و نیشـانە کەسییەکان و نیشانەکانی کات و شوێن و زانیاری هاوبەشی نێوان قسـەکەر و گوێگر و... هتد لە کردەی تێگەیشتندا ڕۆڵ دەبینن، بۆ نموونە ئەگەر سەیری ئەم دەربڕینانەی خوارەوە بکەین، ئەوا دەبینن کەوا پراگماتیك چ ڕۆڵێکی لـە پرۆسەی تێگەیشتندا هەیە:

+ ئازاد لەکوێیە؟

- ئۆتۆمۆبیلێکی سپی لەبەر دەرگایماڵی کاروانە، ← زانیاری هاوبەشی نێوان قسەکەر و گوێگر

یان:

+ سەعات چەندە؟
- بانگی عەسری نەداوە → زانیاری کەلتووری

(محەمەد مەعرووف فەتتاح، ٢٠١١: ٢١٥)

٩- دەوروبەر: دەوروبەر بەهەموو جۆرەکانییەوە (دەروونی، کەلتووری، ڕۆشنبیری، ... هتد)، ڕۆڵێکی گرنگ لە پرۆسەی تێگەیشتندا دەبینن، ئەگەر ڕستە و دەق و دەربڕینەکان دووربخەینەوە لە دەوروبەر ئەوا هیچ واتایەکیان نابێت و گوێگر (وەرگر) تێیان ناگات، پێچەوانەکەشی ڕاستە.

لە ئاخاوتندا دەبێت بگەڕێینەوە بۆ ئەو کات و شوێنەی کە قسەکەی تیادا کراوە، چونکە ئەمانە کاریگەرییان لەسەر گوتنەکە دەبێت. زانیاری هاوبەشی نێوان قسەکەر و گوێگر و تەمەن و ڕەگەز و پلە و پایە و زانیاری دنیایش کاریگەری خۆیان لەسەر پرۆسەی تێگەیشتندا هەیە.

لە نووسینیشدا دەوروبەر ڕۆڵی کاریگەری خۆی لەسەر پرۆسەی تێگەیشتن هەیە، بەبێ پشتبەستن بە دەوروبەرەوە ناتوانین لە واتای وشە و ڕستە و دەق بگەین، چونکە وشە نرخ و واتای دیاری ناکرێت تا لە ڕستەدا بەکارنەهێنرێت (کلود جرمان و ریمون و روبلان، ١٩٩٤: ٤٤). ئەگەر وشەی (باش) بە نموونە وەربگرین، لە ڕستەدا بەپێی بەکارهێنان، واتای جیاواز دەبەخشێت:

- دکتۆری باش هاتوونەتە هەولێر. (شارەزایی و پسپۆری دەگەیەنێ)
- برنجەکە باش کوڵاوە. (واتای زۆری دەگەیەنێت)
- مامۆستایەکی باشم لەگەڵدایە (زیرەکی دەگەیەنێ).

هەروەها وشە لەڕستەدا بە پێی شوێنی ئەرك و واتای دەگۆڕێ، هەروەك لەم نموونەی خوارەوە ڕوون کراوەتەوە:

- جوان منداڵە جوانەکەی جوان پەروەردە دەکات.

ناوە ئاوەڵناوە ئاوەڵکارە

(بکەرە) (دیارخەری ناوە) (دیارخەری کارە)

١٠- نەخۆشییەکانی گوتن: لە ئاخاوتندا، هەموو نەخۆشییەکانی گوتن (خێرا قسەکردن، قسەکردنی پچڕ پچڕ، زمان گیران، تەواو دەرنەبڕینی

فۆنیمــەکان، دووبارەکردنــەوەی فــۆنیم و بڕگــە و وشــەکان، ... هتــد) کاریگـەرییان لەسـەر تێگەیشـتن هەیـە و دەبنـە هـۆی ئـاڵۆزبوونی پڕۆسـەی تێگەیشتن (بڕوانە: ئەڤین سامی عارف، ٢٠١١: ٦١ ـ ٧٥).

١١ـ خاڵبەندی: پەیڕەوکردنی سیستەمی خاڵبەندی و دانانی نیشـانەکانی خاڵبەندی لە نووسیندا، کاریگەری لەسەر پڕۆسەی تێگەیشتن دەبێت، چونکە دانـانی نیشـانەکانی خاڵبەنـدی کـردەی تێگەیشـتن لـەلای وەرگـر (خوێنـەر) ئاسان دەکات و بەپێچەوانەشەوە دانەنانی نیشانەکانی خاڵبەنـدی ئاڵۆزییـەك لەلای خوێنەر دروست دەکات وای لێ دەکات بە ئاسان لە بابەتەکە نەگات.

١٢ــ ئیدیـەم: بـوونی ئیدیەمـەکان لـە زمانـدا، لـە زۆر بارانـدا دەبێتـە بەربەست لە پڕۆسەی تێگەیشتندا.

ڕستە و دەربڕینەکان چەندی ئیدیەم و وشەی ئاڵۆزیان تێدابێت ئەوەندە تێگەیشتنیان گرانتر و ئاڵۆزتر دەبێت، چونکە واتای ئیدیەم یەکسان نییە بـە کـۆی واتـای کەرتـە پێکهێنـەکانی، بـەڵکو واتـای ئیدیـەم لـە کـۆی واتـای کەرتەکانەوە گەورەترە، بۆ نموونە کە دەڵێین: (ئافتاو سکی سـووتاوە) بـەو واتایە نایەت کە ئاگر پڕژابێتە ناو پشتێنەکەی ئافتاو سکی سووتابێت، بەڵکو بـە واتـای ئـەوە دێـت کـە ئافتـاو منـداڵێکی یـان کەسـێکی لەدەسـت داوە. (محەمەد مەعرووف فەتاح، ١٩٨٦: ٧٩).

١٣ـ پارازمانی: پارا زمـانی ئـەو دەنگانـەن لـەکاتی قسـەکردندا دروسـت دەبن، بەشێك نین لە فۆنیمەکان و تەنیا لـەزمانی قسـەکردندا بەدیاردەکـەون (شیلان عوسمان، ٢٠٠٩: ٨١).

کردەکانی پارا زمانی کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر پڕۆسـەی تێگەیشـتن هەیە، زۆرجار وەرگر بە هۆی ئەو کردانەوە لە بابەتێك دەگات.

پارا زمانی ئەمانە دەگرێتەوە: (سەرچاوەی پێشوو، ٨١ ـ ٨٢).

١– ڕەوت (pitch): بــە پێــی تــووڕەیی و شــەرم و ڕەگــەز و پێگــەی کۆمەڵایەتی و... دەگۆڕێ.

٢– خێرایی و هێواشی قسەکردن (rate): بەپێی باری دەروونی قسـەکەر و مەبەستی قسەکردنەکە و کات و باری قسەکردنەکە و ... دەگۆڕێ.

٣ـ گۆڕانی دەنگ (inflection): کە قسەکەر نەخۆش بێت یا سەرخۆش بێت، دەنگی ئاسایی نابێت و ئەندازەی دەنگی دەگۆڕێت، ئەندازەی دەنگیش کاریگەری زۆری لەسەر وروژاندنی هەستی وەرگر هەیە (عەبدولواحید موشیر دزەیی، ٢٠٠٥: ٧٧).

٤ـ زڕ وشەکان (دەنگە نا وشەییەکان): وەك: بڤە، کخە، ئحم، ئم، ... هتد.

٥ـ پێکەنین و گریان: هەندێ جار پێکەنین و گریان بۆ مەبەستی خۆیان کە خۆشی و ناخۆشییە بەکارنایەت، بەڵکو زۆرجار هەڵگری واتا و مەبەستی قووڵن و تێگەیشتن لێیان ئاسان نییە.

بێدەنگیش (silence) لە هەندێ کاتدا لە کردەی پەیوەندیکردندا بە واتای ڕازیبوون یان ڕازی نەبوون دێت، یان هەندێ جار بۆ مەبەستی فەرامۆشکردن بەکاردێت، دەبێت وەرگر ئاگاداری ئەمانە بێت بۆ ئەوەی لە مەبەستی قسەکەر بگات.

١٤ـ ئاماژەکان و زمانی جەستە: ئاماژەکان بە هۆکارێك لە هۆکارەکانی پەیوەندیکردن دەژمێردرێن و هەندێك جووڵەی لەش و حاڵەتەکانی ڕوخسار و دەم و چاو... هتد. بە زمان دادەنرێن، چونکە دەبنە مایەی تێگەیشتن (شنە ئەبوبەکر ئەحمەد، ٢٠٠٨: ٢٣).

لە ئاماژەی جووڵەیدا قسەکەر دەبێ دەست یان چاو یان سەر یان هەر ئەندامێکی تری لەش هاوبەشی ڕووداوی قسەکردن بکات بە مەبەستی لێکدانەوە و تێگەیشتن.

بۆ نمونە کاتێ دەڵێین: (تۆ و تۆ و تۆ وەرن، ئێوە بڕۆن) قسەکەر بەبێ بەکارهێنانی جووڵەی دەست ناتوانێت لە گوێگر بگەیەنێ کە کێ بێت و کێ بڕوات (محەمەد مەعرووف فەتاح، ٢٠١١: ١٩٧).

جووڵەکانیش واتای جیاواز دەگەیەنن.

١ـ سەر:

أ ـ جووڵەی سەر بۆ سەرەوە: (بە واتای نەخێر دێت).

ب ـ جووڵەی سەر بۆ خوارەوە: (بە واتای بەڵێ دێت).

پ ـ جووڵەی سەر بۆ تەنیشتەکان: (ئاماژەکردنە بۆ لاتەنیشتێك).

٢ـ چاو:

أ ـ چاو هەڵتەکاندن: (بۆ مەبەستی خۆشەویستی بەکاردێت یان بە مەبەستی جووڵە بۆ لای لایەك بەکاردێت).

ب ـ چاو نووقاندن: (بۆ دەربڕینی خۆشی، ڕەزامەندی، شاردنەوەی شتێك)، بەکاردێت.

٣ـ زمان: دەرخستنی زمان زۆرجار بۆ مەبەستی گاڵتەپێکردن بەکاردێت، هەندێ جاریش بۆ مەبەستی بەدرۆخستنەوە بەکاردێت.

١٥ـ هێز و ئاواز: هێز و ئاواز وەکو دوو کەرەستەی نا کەرتی بە نەبوونیان لێڵی واتایی دێننە ئاراوە، بۆ نموونە ئەگەر سەیری ڕستەیەکی وەکو (ئەو هەولێرییە) بکەین، دەبینین بەپێی ئاوازی ڕستەکە و کەوتکەی هێزی سەرەکی ڕستە چەند واتایەك لەخۆ دەگرێت، وەك:

ئەو هەولێرییە. (هەواڵ گەیاندن) ئەو هەولێرییە؟ (پرسیار) ئەو هەولێرییە! (سەرسوڕمان)

| | | |
|---|---|---|
| ئەو<sup>ˈ</sup> هەولێرییە. | ئەو<sup>ˈ</sup> هەولێرییە؟ | ئەو<sup>ˈ</sup> هەولێرییە! |
| ئەو هەولێرییە<sup>ˈ</sup>. | ئەو هەولێرییە<sup>ˈ</sup>؟ | ئەو هەولێرییە<sup>ˈ</sup>! |

لەڕستەکانی سەرەوەدا، بەهۆی ئاوازەوە دەتوانین جۆری ڕستەکە لەڕووی (هەواڵ گەیاندن، پرسیارکردن، سەرسوڕمان) دیاری بکەین، هەروەها لەهەر سێ جۆری ڕستەکانی سەرەوەدا بەلای کەمەوە دوو ئەگەر هەیە، یەکەمیان: جەخت لەسەر (ئەو) دەکاتەوە و دووەمیان: جەخت لەسەر شوێنەکە (هەولێر) دەکاتەوە، ئەم جەختکردنەوەیەش بەهۆی هێزەوەیە.

هێز و ئاوازە و ئەندازەی دەنگ هەڵگری واتای کاریگەرین، چونکە بوونی هێز و ئاواز بەجیاوازی لەسەر وشەکانی ڕستە کاریگەری جیاواز لای وەرگر دروست دەکەن و بۆچوونی وەرگر لەسەر (نێرەر) بەهۆی ئەمانەوە گۆڕانی بەسەر دادێت.

(ڕستەی کاری بکەر دیار، تێگەیشتنی ئاسانترە لە ڕستەی بکەر نادیار، ڕستەی ئەرێ تێگەیشتنی ئاسانترە لە ڕستەی نەرێ، بوونی جێناوە

لکاوەکان لە ڕستە یان دەق بە شێوەیەك کە بە تەواوی ڕوون نەبێت بەوەی کە ئاماژە بە چی دەکەن و ڕۆڵی چی دەگێڕن تێگەیشتن گران دەکەن، بوونی ئامرازەکانی نیشانە بە تایبەتی ئەوانەی ئامازە بە کەرەستە باس نەکراوەکان دەکەن تێگەیشتن گران دەکەن(٤)، هەروەها زۆر بەکارهێنانی دەربڕینی بەستنەوەی واتایی لە ڕستە و دەقدا کاریگەری نەرێنی لەسەر تێگەیشتن دروست دەکەن، لەوانەش بوونی دەستەواژەکانی وەك: (بەهەرحاڵ، بەلای کەمی، لە ئەنجامی ئەوەش، لەم کاتەدا، لە لایەکی ترەوە...) (السید عبدالحمید سلیمان، ٢٠٠٣: ٢٠٤ – ٢٠٧).

**٢ . ٧: پێشبینی تەواوکردنی واتایی وشە و ڕستە:**

زۆرجار لە وشەیەکدا دەنگێك دەکەوێت، کەوتنی ئەم دەنگە هەندێ جار واتا ناگۆڕێت وەك (بەغداد ـ بەغدا– بەغا) بەڵام هەندێ جار دەبێتە هۆی شێواندن یان گۆڕانی واتاکەی بەتایبەتی لێرەدا مەبەستمان دەرنەکەوتنی وێنەی دەنگەکانە لە کاتی چاپ یان بەهەر هۆیەك بێت، جا زۆرجار خوێنەری خودی زمانەکە دەتوانێ لە ناو دەقەکەدا واتای وشەکان بە تەواوی لێکبداتەوە گەر تووشی شێواندنی بووبێ، ئەمەش بەهۆی پەیوەندی وشەکە بە وشەکانی تر و زانیاری لۆژیکی خوێنەر بە بابەتی پەیوەندارەوە، بەڵام ڕەنگە هەموو جار ئەمە ڕوونەدات یان بۆ خوێنەرێکی بیانی کەم شارەزا لە زمانەکەدا تا ڕادەیەك ئەستەم بێت پێشبینی تەواوکردنی واتای وشەکە بکات.

ـ دوێنێ هاتم ← دوێنێ هاتم.
ـ ئەوان هات ← ئەوان هاتن
ـ دەست شکا بەئازارە← دەست شکان بە ئازارە

هەندێ جار (وەرگر) دەتوانێ پێشبینی تەواوکردنی واتای ئەو ڕستانە بکات، کە کەرستە سەرەکییەکانی وەك، (بکەر، بەرکار)یان تێدا کرتێنراوە، سەیری ئەم نموونانە بکە:

ـ کردەوە.

کاری کـردەوە پێویسـتی بـە (بەرکار)ێکـە کـە بتـوانرێ بکرێتـەوە وەك: (دەرگا، پەنجەرە، زەرف...).
- دەرگاکەی کردەوە.
- باری
(وەرگر) درك بەوە دەکات ئەو بکـەرە ڕێزمانییانـەی کـە دەشـێ لەگـەڵ ئەم کارە بێن بریتین لە (باران، بەفر، تەرزە، خۆڵ).
- باران باری
پێشبینی تەواوکردنی واتای ڕستە هەر لەخۆوە ڕوونادات و پێویستی بـە کارامەیی هەیە، بۆیە ڕسـتە و دەربڕینـە باوەکـان وەك پەنـدی پێشـینان کـە ڕێککەوتنی کۆمەڵیان لەسەرە، پێشبینیکردنی تەواوکردنیان ئاسانترە وەك:
أ - سوار هەتا نەگلێ...
ب - سوار هەتا نەگلێ نابێ بە سوار.
أ - لە هەموو هەورێك...
ب - لە هەموو هەورێك باران نابارێت.
(وەرگر لە هەموو بارێکدا ناتوانێ پێشبینی تەواوکردنی واتـای ڕسـتە بـە دروسـتی بکـات، بـۆ نموونـە تێگەیشـتن لـەم ڕسـتانەی خـوارەوە، بـەبێ تەواوکردنی بەشی دووەم بە تەواوی نایەتە جێ.
أ - ئێوە قوتابی نین.
ب - ئێوە قوتابی زیرەك نین.
پ - ئێوە بە تەنیا قوتابی زیرەك نین، بەڵکو ڕەوشت بەرزیشن.
وەرگـر تـا ڕسـتەی سـێیەم نەبیسـتێ واتـایی ڕسـتەکانی تـر بـە هەڵـە لێکدەداتەوە.
أ - ئۆتۆمبێلە تایبەتییەکەی نەکڕی.
ب - ئۆتۆمبێلە تایبەتییەکەی نەکڕی، تا دڵنیابوو لەوەی پێویستی پێیەتی.
وەرگـر پـاش ئـەوەی بەشـی دووەمـی ڕسـتەکە دەبیسـتێ بـەو واتایـەدا دەچێتەوە، کە لە دەربڕینی بەشی یەکەم لـەلای دروسـت بـوو. (داود عبـدە، ١٩٨٤: ١٦).

## ئەنجام

١ـ تێنەگەیشتن زیاتر لە نووسین دێتە ئاراوە، نەك لە قسەكردن.

٢ـ خێرا تێگەیشتن لە ڕستە و دەق و بابەتێك بەڵگەی ڕوونی بابەتەكە و زیرەكیی وەرگرە، بە پێچەوانەش ڕاستە.

٣ـ لە قسەكردندا، نەخۆشییەكانی گوتن كاریگەری نەرێنی زۆریان لەسەر پرۆسەی تێگەیشتن هەیە.

٤ـ لە زمانی كوردیدا هۆكارێكی زۆر هەن كار لە تێگەیشتن دەكەن لەوانە: بوونی وشەی باو و وشەی دەگمەن، زۆری و كەمی بڕەكانی ڕستە، ڕیزبوونی كەرستەكانی ڕستە، تەمومژی، درێژی و كورتی ڕستە، سادەیی و ئاڵۆزی ڕستە.

٥ـ پێشبینیكردنی تەواوكردنی واتای هەندێ دەربڕینی زمانی وەك پەندی پێشینیان ئاسانترە لەچاو هەندێ دەربڕینی تری وەك ڕستەی لێكدراوی ئاسایی.

٦ـ لە قسەكردندا جووڵەی جەستە و دیاردەی پارازمانی و بوونی كەرەستە ناكەرتییەكان هۆكاری یارمەتیدەری زۆر چالاكن لە پرۆسەی تێگەیشتندا و كردەی تێگەیشتن ئاسان دەكەن.

٧ـ لە نووسیندا، پەیڕەونەكردنی خاڵبەندی و دانەنانی نیشانەكانی خاڵبەندی، پرۆسەی تێگەیشتن ئاڵۆز دەكەن. بە پێچەوانەش ڕاستە.

٨ـ لەلای نەوەی نوێدا، كەلتوور و ئیدیەمەكان كاریگەریی نەرێنییان لەسەر پرۆسەی تێگەیشتن هەیە.

## پەراوێز

١– ئەم ناوە لە سەرچاوەکاندا بە (وندت) و (ڤۆن)یش هاتووە. بڕوانە: (محمد محمد یونس، ٢٠٠٤: ٢٢) و (ئەڤین سامی عارف، ٢٠١١: ٢٧).

٢– بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە ئەم سەرچاوانە: ١ـ ئەڤین سامی عارف، ٢٠١١: ٣٣.
٢–عزیز کعواش، ٢٠١٠ : ١٢ – ١٧.   ٣ـ خەسرۆ ئەحمەد، ٢٠٠٨ : ١١٧ – ١١٩.

٣– دەق: زنجیرە ڕۆنانێکی دەربڕینی زمانە کە یەکەیەکی تەواو پێکدێنێ
(willis Edmondson: 1977: 190)

پراگماتیک: بەکارهێنانی هێمایە بۆ مەبەستێك لە دەوروبەرێکدا، لایەنی کۆمەڵایەتی دەروونی و کەلتووری و زانیاری دنیایی و زانیاری هاوبەشی نێوان قسەکەر و گوێگریش ڕۆڵی خۆیان دەبێت لەسەر دەربڕینەکان. (عەبدولواحید موشیر دزەیی، ٢٠١١: ١٦).

٤– ئەم خاسیەتەی جێناوە لکاوەکان پێی دەگوترێ (ئەنافۆرا ـ Anaphora).

## سەرچاوەکان

**أ. بە زمانی کوردی:**

١ـ ئەڤین سامی عارف (٢٠١١)، کاریگەری باری دەروونی لەسەر زمانی قسەکردن، نامەی ماستەر، کۆلێژی زمان، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر.

٢ـ خەسرۆ ئەحمەد ڕەسول (٢٠٠٨)، هەندێك لایەنی زمانەوانی دەروونی، گۆڤاری ڕامان، ژمارە (١٣٩)، هەولێر.

٣ـ شنە ئەبوبەکر (٢٠٠٨)، زمانی جەستە، نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر.

٤ـ شێرزاد سەبری و عەبدولسەلام نەجمەدین عەبدوڵڵا (٢٠١١)، زمانڤانیا کارەکی، چاپا ئێکێ، چاپخانەیا خانی، دهۆك.

٥– شیلان عوسمان (٢٠٠٩)، کارابوونی زمان لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا، چاپی یەکەم، چاپخانەی هاوسەر، هەولێر.

٦ـ صباح رشید قادر (٢٠٠٠)، هاوبێژی و فرەواتایی لە گیرەکدا، نامەی ماستەر، کۆلێژی زمان، زانکۆی سلێمانی.

٧ـ قیس کاکل تۆفیق (٢٠٠٠) ژن و ئافرەت، هەولێر.

٨ـ کەریم شەریف قەرەچەتانی (٢٠٠٥)، سایکۆلۆژیای گشتی، چاپی یەکەم، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر.

٩ـ عەبدولوەهاب خالید موسا (٢٠٠٩)، هێز و ئاوازە لە دیالێکتی کوردی ژووروودا، بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، هەولێر.

١٠ـ عەبدولواحید موشیر دزەیی (٢٠٠٥)، ڕەهەندی دەروونی لە بواری ڕاگەیاندندا، چاپخانەی شەهاب، هەولێر.

١١ـ عەبدولواحید موشیر دزەیی (٢٠١١)، زانستی پراگماتیک، چاپی یەکەم، چاپخانەی پاک، هەولێر.

١٢ـ محەمەد مەعرووف فەتاح (١٩٨٦)، دیسان ئیدیەم، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد، بەرگی پازدەهەم، بەغداد.

١٣ـ محەمەد مەعرووف فەتاح (٢٠١٠)، لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکان، کۆکردنەوە و ئامادەکردنی: شێروان حسێن خۆشناو و شێروان میرزا قادر، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر.

١٤ـ محەمەد مەعرووف فەتاح (٢٠١١)، زمانەوانی، چاپی سێیەم، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر.

١٥ـ محەمەدی مەحوی (٢٠٠٩)، زانستی هێما ـ واتا و واتا لێکدانەوە، بەرگی یەکەم، زانکۆی سلێمانی.

١٦ـ مستەفا پەژار (١٩٨٨)، بواری دەروونناسی گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١١٨)، بەغدا.

١٧ـ وریا عومەر ئەمین (٢٠٠٤)، ئاسۆیەکی تری زمانەوانی، بەرگی یەکەم، دەزگای ئاراس، هەولێر.

**ب. بە زمانی عەرەبی:**

١٨ـ جون لاینز (١٩٨٥)، اللغة والمعنى والسياق، ترجمة: صادق الوهاب، دار الشؤون الثقافة العامة، بغداد.

١٩ـ جمعة سيد يوسف (١٩٩٠)، سيكولوجية اللغة والمرض العقلي، مطبعة السياسة، الكويت.

٢٠ـ داود عبدة (١٩٨٤)، دراسات في علم اللغة النفسي، طبعة اولى، كويت.

٢١ـ السيد عبدالحميد سليمان (٢٠٠٣)، سيكولوجية اللغة والطفل، طبعة اولى، دار الفكر العربى، القاهرة.
٢٢ـ كلود جرمان وريمون روبلان (١٩٩٤)، علم الدلالة، ترجمة: نور الهد لوشن، دار الفاضل، دمشق.
٢٣ـ موفق الحمداني (١٩٨٢)، اللغة وعلم النفس، دار الكتب للطباعة والنشر، جامعة الموصل، عراق.
٢٤ـ محمد خطابي (١٩٩٦)، لسانيات النص، المركز الثقافي العربي المغرب.
٢٥ـ محمد علي الخولي (٢٠٠٠)، مدخل الى علم اللغة، دار الفلاح للنشر، الاردن.
٢٦ـ محي الدين محسن (٢٠٠٨)، انفتاح النسق اللساني ـ دراسة في التداخل الاختصاصي، دار الكتاب الجديد المتحدة، ط١، بيروت ـ لبنان.
٢٧ـ محمد محمد يونس علي (٢٠٠٤)، مدخل الى اللسانيات، طبعة اولى، دار الكتاب الجديد المتحدة، بيروت، لبنان.
٢٨ـ عزيز كعواش (٢٠١٠)، علم اللغة النفسي بين الادبيات اللسانية والدراسات النفسية، جملة كلية الاداب والعلوم الانسانية والاجتماعية، العدد (٧)، جامعة محمد خيضر ـ بسكرة ـ الجزائر.

**پ. بە زمانی ئینگلیزی:**

29- Crystal, D. (2003) A dictionary of Linguistics and phonetics, 5th Edition, Black well, Oxford.
30- Crystal, D. (1992), A dictionary of Linguistics and Language, Black well: oxford.
31- Fattah, M, M, (1997) A Generative Grammar of Kurdish, Unpublished Doctoral Desperation University.
32- Lyons, J. (1969), Introduction to theoretical Linguistics, Cambridge University press: comb ridge.
33- Willis Edmondson (1977), spoken Discourse A model for Analysis, Legman, New York.

## الملخص البحث

يلعب علم اللغة النفسي دورا مهما وحيويا في المجال اللغوي، باعتبارها احدى اهم فروع علم اللغة وتساهم في عملية الفهم.

عنوان هذا البحث هو (فهم التعابير اللغوية من منطلق علم اللغة النفسية) وان هدف البحث هو في تحليل موضوع الفهم (الاستيعاب) باعتباره جانبا مهما من علم اللغة النفسية.

بالاضافة الى المقدمة والنتائج والمصادر فان هذا البحث يتكون من قسمين تم تناول عنوان واسباب اختيار هذا العنوان والحدود ومشاكل البحث في المقدمة، تم بحث: (مصطلحات ومفاهيم علم اللغة النفسية، ظهور علم اللغة النفسية ومجالاتها بالاضافة الى علاقتها بالمعنى النفسي وكذلك تأثير بعض التعابير الشائعة على نفسية المُستَقبِل "المخاطب") في القسم الاول بينما تم بحث: (ما هو الفهم؟ سرعة الفهم وخطواته وكذلك كيفية تناول معنى الجملة ومعرفته في الذاكرة بالاضافة الى خطة انشاء (تركيب) الجملة والعوامل التي تؤثر في الفهم واخيرا التنبأ بتكميل معنى الكلمة والجملة في (الجزء) القسم الثاني.

# Abstract

Psycholinguistics is one of the important branches of Linguistics. It plays an important role in the field of linguistics and particularly in comprehension process. This research, which is entitled "Understanding Linguistic Expressions from a Psycholinguistic Viewpoint", aims at analyzing comprehension which is an important aspect of psycholinguistics in Kurdish.

In addition to the introduction, results and references, this research consists of two main parts. The introduction is comprised of the title, and it points out why this topic is chosen.

Likewise, its limits and statement of the problem are highlighted. Part one, the following topics are discussed: the concept and the term of psycholinguistics, establishment of psycholinguistics, fields of psycholinguistics, psycholinguistics and meaning, and the impact of some common expressions on receiver's psychology

Part two deals with comprehension and questions like "what is comprehension?" It also examines the speed of comprehension and its stages. On the one hand, the meaning of the sentence and information in the memory are tackled. On the other hand, plans are made to formulate sentences, and factors affecting comprehension process and predicting in completing the word and sentence meanings are taken into consideration.

# زاراوەکانی گەشتیاری

**ئامادەکردنی: لیژنەی زاراوە لە ئەکادیمیای کوردی**

لەسەر داوای دەستەی گەشت و گوزاری سەر بە وەزارەتی شارەوانی و گەشت و گوزار بەنووسراوی ژمارە ٢٣٣٨، ڕێکەوتی ٢٠١٢/٧/١٧، کە تێیدا لیستی کۆمەڵێك زاراوەی گەشتیاریی بە زمانی ئینگلیزی و عەرەبی بۆ ئەکادیمیای کوردی ناردبوو، بە مەبەستی دۆزینەوەی هاوتا کوردیەکان و یەکخستنی زاراوەکان لە زمانی کوردیدا. لیژنەی زاراوە لە ئەکادیمیای کوردی هاوتای کوردیی زاراوەکانی کردە کوردی، بۆ بەرچاوخستنی ئەو زاراوانە، لەم ژمارەیەدا سەرجەمی ئەو وشە و زاراوانە بڵاودەکەینەوە.

| ئینگلیزی | عەرەبی | کوردی |
|---|---|---|
| Accommodation | السكن/ مكان المبيت | جێی مانەوە |
| Active holiday | عطلة نشطة | پشووی پڕ چالاکی، پشوویێکی کارا |
| Admission card | بطاقة دخول | کارتی چوونەژوور |
| Adventure | مغامرة | سەرکێشی، سەرەڕۆیی |
| Adventure Tourism | السياحة المغامراتية | گەشتیاریی سەرەڕۆیی |
| Advertising | الاعلان | جاڕدان |
| Advertising agency | وكالة إعلانات | ئاژانسی جاڕدان |
| leader | مرشد | ڕابەر |
| Agricultural Tourism | السياحة الزراعية | گەشتیاریی کشتوکاڵی |
| Apartment | شقة | ئەپارتمان، شوقە |
| suite | جناح | سویت، دەستە |
| Appetizer | مقبلات | بەرخۆر |
| Archaeological Tourism | السياحة الأثرية | گەشتیاریی شوێنەواری |

| | | |
|---|---|---|
| سەرنجکێش | جذب | Attraction |
| ئۆتوبان | طريق سريع | Autobahn |
| نووسینگەی پشتەکی | المكتب الخلفي | Back desk |
| خوانگه | محفلة | Banquet |
| بەلەم | زورق | Barge |
| سەکۆ | مصطبة | Bench, seat |
| پەنجەرۆکەی بلیت | شباك التذاكر | Box office |
| باڵاخانه | عمارة | Building |
| گەشتی بازرگانی | رحلة عمل | Business travel |
| کامپ، چادرگا | مخيم | Camp |
| پارە وەرگر | امين الصندوق | Cashier |
| پلەی گەشتیاری | درجة سياحة | Class tourism |
| پۆلاندن | تصنيف | Classification |
| کۆمیشن | عمولة | Commission |
| کۆمەڵگه | مجمّع | Complex |
| کۆمەڵگه | مجمّع | Compound |
| کەرتی پیشەسازیی فرەجۆر | قطاعات الصناعة المركبة | Compound industry |
| کۆنسولگه | قنصلية | Consulate |
| ڕێکەوتننامه | اتفاقية | Convention |
| تاریفەی گواستنەوه | تعرفة ركوب | Conveyance |
| ڕێکخەری گەشتیاری | منسق سياحي | Coordinated tourist |
| بەڕێوەبەری متمانەیی | مدير الائتمان | Credit manager |
| گەشتی دەریایی گشتی | سفرة بحرية شاملة | Cruise inclusive tour |
| کەشتیی گەشتیاری | سفينة سياحة | Cruise ship |
| شوێنی کولتووری سەرنجکێش | مغريات ثقافية/ جذب ثقافي | Cultural attraction |
| ئوتێلی دیلۆکس (نایاب) | فندق فاخر | Deluxe hotel |

| | | |
|---|---|---|
| گەشەپێکردن | تطوير | Development |
| ڕاگواستن | تهجير | Displacement |
| گەشتیاریی ژینگەیی | السياحة البيئية | Eco Tourism |
| ئەسانسۆر | مصعد | Elevator |
| کۆچکردن | هجرة | Emigration |
| کەیف و خۆشی | تسلية | Entertainment |
| گواستنەوەی خێرا | نقل سريع | Express carriage |
| پیشانگەی کتێب | معرض كتب | Fair of books |
| نرخی بلیت | ثمن التذكرة | Fare |
| شەمەندەفەری خێرا | قطار سريع | Fast train |
| ڕێی کراوە | طريق سالك | Free way |
| ناوچەی ئازاد | منطقة حرة | Free zone |
| پێشوازگە | مكتب الاستقبال | Front desk |
| سنوور | حدود | Frontier |
| ناوماڵ | أثاث | Furniture’s |
| موساتەحە | مساطحة | Giving lands for investment |
| ڕێبەر | دليل | Guide |
| ڕێبەری گەشتیاری | دليل سياحي | Guidebook |
| (کۆسپ، کۆسپە)، تاسە | عائق/ سلة كبيرة | Hamper |
| ڕێبەر | مرشد | handbook |
| دراوی پتەو | عملة صعبة | Hard currency |
| سەرپێشواز | رئيس الاستقبال | Head receptionist |
| بوژانگە | منتجع | Health resort |
| ڕێی گشتی | طريق عام | High road |
| ئۆتۆبان | طريق سريع | Highway |
| هێمای ئۆتۆبان | رمز الطريق السريع | Highway code |
| شوێنەواری مێژوویی | مغريات تاريخية/ | Historical attraction |

| | | |
|---|---|---|
| | الجذب التاريخي | |
| دراوی خۆیی | عملة محلية | Home currency |
| میوانداری | حسن الضيافة | Hospitality |
| خان، کاروانسەرا | خان، فندق صغير على الطريق العام | Hostel |
| مێوانخانە، ئوتێل | فندق | Hotel |
| گروپە ئۆتێل | سلسلة فنادق | Hotel chain |
| ئوتێلگەری | صناعة الفندقة | Hotel industry |
| کارسازی ئوتێل | تدبير فندقي | Hotel management |
| ئوتێلکار | الفندقي | Hotelier |
| کۆچبار | مهاجر | Immigrant |
| پەرەپێدان | تطوير | Improve |
| چاکبوون | تحسن | Improvement |
| ڕێنمایی گشتی سەفەر | تعليمات الرحلة الشاملة | Inclusive tour charter |
| بەرنامەی گشتی سەفەر | برنامج الرحلة الشاملة | Inclusive tour schedule |
| کۆمەڵەی نێودەوڵەتی | الجمعية الدولية | International association |
| ساڵی گەشتیاریی نێودەوڵەتی | سنة السياحة الدولية | International year of tourism |
| وەبەرهێنان | الاستثمار | Investment |
| فاتوورە | فاتورة | Invoice |
| مۆبەق، ناندین، ناندێن | مطبخ | Kitchen |
| سەیرانی زەمینی | نزهة برية | Land excursion |
| گواستنەوەی زەمینی | النقل البري | Land transport |
| کاتی دەست بەتاڵی | وقت الفراغ | Leisure |
| جانتای سەفەر | حقائب السفر | Luggage |
| ئینشوورەنسی کەلوپەل | تأمين على امتعة السفر | Luggage insurance |

| | | |
|---|---|---|
| ژینگەی دەستکرد | البيئة الاصطناعية | Man-made environment |
| خستنەبازار | تسويق | Marketing |
| بایەخ | الاستحقاقات | Merits |
| مینی باس | الحافلات الصغيرة | Minibuses |
| ترێنی بچووك | القطارات المصغرة | Mini-trains |
| خولەکە کرێ | رسومات بالدقائق | Minute-charge |
| گەڕۆکە ئوتێل | الفندق الجوال | Mobile hotel |
| مۆتێل (میوانخانەی سەرە ڕێ) | موتيل (فندق على الطريق العام) | Motel |
| داهاتی نەتەوەیی | الدخل القومي | National income |
| پارکی میللی | المنتزهات القومية | National park |
| ژینگەی سروشتی | البيئة الطبيعة | Natural environment |
| کەشتیوان | ملاح | Navigator |
| وڵاتی دراوسێ | بلد مجاور | Neighboring country |
| چاودێری شەوان | المراقب الليلي | Night auditor |
| شوێنی نیشتەجێی هەمیشەیی | محل الاقامة الدائم | Normal residence |
| کۆشك | قصر | Palace |
| سەیرانگە | منتزه | Park, recreation |
| جووڵەی ڕێبواران | حركة المسافرين | Passenger traffic |
| ترێنی ڕێبواران | عربة المسافرين | Passenger train |
| پاسپۆرت | جواز سفر | Passport |
| پانسیۆن | بانيسون | Pension |
| ماوەی مانەوە | مدة الاقامة | Period of stay |
| سەیران | نزهة | Picnic |
| گەشتیاریی سیاسی | السياحة السياسية | Political Tourism |
| بەندەری پەڕینەوە | ميناء العبور | Port of transit |

| | | |
|---|---|---|
| دامەزراندن، تۆمارکردن | توظيف/ تسجيل | Posting |
| سندوقی پۆستە | صندوق البريد | Post-office box |
| پتەوکردنی پڕوپاگەندە و ڕیکلام | التعزيز الدعائي والاعلاني | Promoting advertising and publicity |
| بانگەشە بۆ کردن، بڵاوکردنەوە | ترويج | Promotion |
| پڕوپاگەندە | الدعاية | Propaganda |
| برەودان | ترويج | Propagator |
| پەیوەندییە گشتییەکان | العلاقات العامة | Public relations |
| بانگەواز | اعلان | Publicity |
| تۆڕە هێڵی شەمەندەفەر | شبكة خطوط حديدية | Railway network |
| وێستگەی شەمەندەفەر | محطة القطار | Railway station |
| حەوانەوە، کات بەسەربردن | استجمام | Recreation |
| سەیرانگا/ شوێنی بووژاندنەوە | منتزه | Recreation ground |
| پەنابەر | لاجئ | Refugee |
| گەشتیاریی ئایینی | السياحة الدينية | Religious Tourism |
| گەشتیاریی چارەسەری | السياحة العلاجية | Remedy Tourism |
| گەڕانەوە بۆ وڵاتی دایك | عودة الى الوطن الام | Repatriation |
| گرتن | حجز | reservation |
| هەوار/ وار | منتجع | Resort |
| هەوارە ئوتێل | فنادق المنتجعات | Resort hotels |
| چێشتخانە، ڕێستۆرانت | مطعم | Restaurant |
| بەڕێوەبەری چێشتخانە | مدير مطعم | Restaurant manager |
| بارکردنەوە | اعادة الشحن | Return freight |
| داهاتی گەشتیاری | واردات السياحة | Revenue from touring |

| | | |
|---|---|---|
| دەریاوانی | ابحار | Sailing |
| پاشەکەوتەکان | مدخرات | Savings |
| گەشتی دەریایی | سفرة بحرية | Sea voyage |
| گەشتیاریی وەرزی | السياحة الموسمية | Seasonal tourism |
| فریودەر | مغريات | Seductive, luring |
| نۆرەکار | عمل بالمناوبة | Shift |
| کەنار/ رۆخ، لێوار | ساحل | Shore |
| گەڕانی گەشتیاری | جولات سياحة | Sightseeing tours |
| گەشتیاریی وەرزشی | السياحة الرياضية | Sport Tourism |
| پەیتوون | حناطیر | Stagecoaches |
| ئۆتێلی قەراغ شار، پەرگە ئوتێل | فندق الضواحي | Suburban hotel |
| هاوینەهەوار | منتج صيفي | Summer resort |
| گەشتیاریی هەمەکاتە | السياحة المستدامة | Sustainable tourism |
| سەکۆ | مساطبة | Terraces |
| شوێنمەبەستی گەشتیاری | الجهة السياحية، الاتجاه السياحي | The tourism destination |
| توێژینەوە تیۆری و پراکتیکی گەشتیاری | الدراسات السياحية نظريا وتطبيقيا | Theoretical and applied tourism |
| شەمەندەفەری خێرا | قطار سريع | Through train |
| نووسینگەی بلیتی سەفەر | مكتب بطاقات السفر | Ticket office |
| گەشتیاری | السياحة | Tourism |
| توێژینەوەی پراکتیکی گەشتیاری | الدراسات التطبيقية للسياحة | Tourism applied studies |
| ئۆتۆمبێلی گەشتیاری | سيارة سياحية | Tourism car |
| ناوەندی گەشتیاری | المركز السياحي | Tourism center |
| کۆمپانیای گەشتیاری | شركة سياحية | Tourism company |
| ئەو توێژینەوەی لە گەشتیاری | دراسات توصف | Tourism describe |

| | | |
|---|---|---|
| دەدوێن | السياحة | studies |
| سیستەمی گەشتیاری | النظام السياحي | Tourism system |
| تاکسیی گەشتیاری | سيارة اجرة سياحية | Tourism taxi |
| پسوولەی گەشتیاری | بطاقة سياحية | Tourism ticket |
| گەشتیار | سائح | Tourist |
| رێکخستنی گەشتیاری | نسق سياحي | Tourist arrangement |
| نەخشەی گەشتیاری | خريطة سياحية | Tourist map |
| بەرهەمی گەشتیاری | منتج سياحي | Tourist product |
| گوندی گەشتیاری | قرية سياحية | Tourist village |
| ناوچەی گەشتیاری | منطقة سياحية | Tourist zone |
| راهێنان/ مەشق کردن | تدريب | Training |
| رسوماتی ترانزیت | تأشيرات مرور | Transit duties |
| گەشتیارانی ترانزیت | مسافروا الترانزيت | Transit travelers |
| وەرگێر | مترجم | Translator |
| کەشتیی گواستنەوە | مركب نقل | Transport ship |
| ئاژانسی گەشتیاری | وكالة سياحية | Travel agency |
| بلیتی سەفەر | بطاقة السفر | Travel ticket |
| رێبوار | مسافر | Traveler |
| پشوو | عطلة | Vacancy |
| ڤیزە | تأشيرة | Visa |
| سەردەر | زائر | Visitor |
| گەشتیاریی ئاوی | السياحة المائية | Water Tourism |
| کۆفرۆش | بائع بالجملة | Wholesale seller |
| بازرگانی کۆفرۆش | تاجر الجملة | Wholesaler |
| گەشتیاریی زستانە | السياحة الشتوية | Winter Tourism |
| رێکخراوی گەشتیاریی جیهانی | المنظمة السياحية العالمية | World tourism organization |
| حەق بە دەستی، رەوابوون | استحقاق | Worthiness |
| گەشتیاری لاوی | السياحة الشبابية | Youth Tourism |

# ئایا.. حاجی قادری کۆیی نالی شارەزووری دیوە ؟!

## لێکۆڵینەوەیەکی شیکاریی بەڵگەیی – شیعر -ییە

دکتۆر مەولود ئیبراهیم حەسەن
کۆلێژی زمان - بەشی زمانی کوردی
زانکۆی سەلاحەدین

**پێشەکی:**

لە سەرەتادا دەبێ ئەوە بڵێین.. چ نێوەندی مێژووی ئەدەبی کوردیمان بە گشتی و چ مێژووی ژیانی شاعیر و نووسەرەکانمان هێشتا جێگای زۆر پرسیاری تریان تێدا دەبێتەوە و وەڵام نەدراونەتەوە، هەر پرسیارەش دەکرێ بەزۆر شێوە وەڵام بدرێتەوە، دیسان هەر پرسیارەش دەکرێ بەزۆر شێوە پرسیار بکرێ و بنووسرێ، وەك ئەم پرسیارەی کە کراوەتە ناونیشانی ئەم لێکۆڵینەوەیە (ئایا.. حاجی قادری کۆیی نالی شارەزووری دیوە؟!) کە دەکرا بەم شێوەش بنووسرێ! (ئایا.. نالی حاجی دیوە؟) یان (ئایا.. نالی و حاجی یەکترییان دیوە؟!) وە زۆر شێوەی تریش. بەڵام، ئێمە بۆیە پرسیارەکەمان بەم شێوەیە نووسی (ئایا.. حاجی قادری کۆیی نالی شارەزووری دیوە؟!) چونکە ئەوەندەی لەنێو دیوانی (حاجی قادری کۆیی)دا ناوهێنانی (نالی – مەلا خدری شارەزووری) دەخوێنینەوە و ئەو هەموو ڕێز و سەرسامییەی (حاجی) بۆ (نالی) هەیەتی لەنێو دیوانەکەیدا، بە پێچەوانە لە (دیوانی نالی) لای کەم ئەوەی کە تا ئێستا لەبەردەستە [*1] بەهیچ شێوەیەك ناکەوێتە بەرچاو کە (نالی) تاقە جارێك ناوی (حاجی) هێنابێ! هەر بۆیە دەبێ بەدوای ئەو هۆیانەدا بگەڕێین کە وای لە (حاجی) کردووە هێندە بە ڕێز و خۆشەویستی و داننان بە گەورەیی و شاعیریەتی (نالی) و ناوی خۆی وەکو (نالی – خدر) دەهێنێ و باسی بەرزیی شیعرەکانی دەکات. گەڕان بەدوای ئەم هۆیانە، گەڕانە بەدوای وەڵامی ئەو پرسیارەی کە (ئایا... حاجی نالی دیوە؟!) کە دواجار

ئـەم پرسـیارەش کـراوە بـە ناونیشـانی ئـەم لێکۆڵینەوەیـە، بەشـێکی زۆری لێکۆڵینەوەکانیش گەڕانە بەدوای وەڵامـی پرسـیارەکان، پرسـیارە زۆرەکـانی نێـو مێژووی ئەدەبیمان و مێژووی ژیانی شاعیران و نووسەرانمان، بەو هیوایەی ئێمەش لەم لێکۆڵینەوەیەدا بتوانین بگەینە وەڵامی ڕاستیی ئەم پرسیارە.

هەرچەندە ئەم پرسیارە لە بنەڕەتدا، ئەوەنـدەی پرسـیارێکی (کۆمەڵایـەتی) یـە، هێنـدە پرسـیارێکی (ئـەدەبی) نییـە! بـەڵام، هێنـدە هەیـە. ئـەم پرسـیارە، پرسـیارە لـە ژیـانی دوو شـاعیری گـەورە و نـاودار و مێـژوویی ئـەدەبیمان. بـۆ وەڵامەکەشـی ئەوەنـدەی لـەنێو دەقـە — شـیعر—ی و ئەدەبییەکانـدا — کـە لەبەردەسـتن— بـەدوای وەڵامـدا دەگـەڕێین، هێنـدە بەڵگـەی کۆمەڵایـەتیمان لەبەردەسـت نییـە! بەتایبـەت بەڵگەیـەك کـە لـە خـودی شـاعیرەکانەوە بۆمـان مابێتەوە، جگە لە شیعرەکانیان شتێکی تر نییە! لای کەم تا ئێستا.

هەر بۆیە دەبێ دان بەو ڕاستییە دابنێین کە ئەوەی تا ئێستا لەبارەی (حاجی قادری کۆیی) و (نـالی ـ مـەلا خـدری شـارەزووری)یەوە لەبەردەسـتە، نـە (تـەواوی شیعرەکان) یانە و، نە (تەواوی نووسین)ەکانیان، هەر بەم دواییە دەسنووسـێکی (نـالی)[٢*] دۆزرایـەوە، بەڵگـەی زۆری بەرهەمەکانیشـیان لـە سـێ خاڵـدا کـۆ دەکەینەوە.

یەکەم: هەریەك لە (نـالی) و (حـاجی) تەمـەنیان لـە سـەرەوەی حـەفتا سـاڵی بووە کـە کۆچـی دواییـان کـردووە، بـەم هـەموو توانایـە شـیعرییە و بـەم هـەموو زانایییـەی کـە ئـەم دووە هـەیانبوو، دەبـێ بەرهـەمیان، چ شـیعرو چ نووسـین و وەرگێڕان زۆر لەوە زۆرتر بێت کە تا ئێستا زانراوە.

دووەم: خۆیـان لـە شـیعرەکانیاندا هێمـا بـۆ ئـەوە دەکـەن کـە بەرهـەمی نووسـینیان زۆرە و داوا دەکـەن، میللـەتی کـورد و زانایـانی ڕێزیـان بگـرن و بیانپارێزن.

سێیەم: هەواڵە زارەکی و دەمییەکان و هەندێ جـار بـە نووسـینیش بـاس لـە شیعری زۆرتر و کتێبی نووسراوی ئەم دوو شاعیرە ناودارو بە توانایە دەکرێ.

هەربۆیە ئەوەی ئـەم لێکۆڵینەوەیـە دەیکات، پشـت بەسـتنە بـەوەی کـە تـا ئێسـتا لەبەردەسـتە، چ لـەبارەی ژیـان و مردنیـان، چ لـەبارەی شـیعرەکانیانەوە،

چونکە دڵنیاین لە داهاتوودا لێکۆڵینەوەکان دەری دەخەن کە بەرهەمی زۆرتر و هەواڵی زۆرتر بەڕێوەیە، لەبارەی نالی و حاجی بەتایبەت و هەموو ئەدەبی کوردی بە گشتی.

**نالی و حاجی ( لەدایکبوون ) و ( مردنیان ):**

زۆر جار لە نووسینی وتار و لێکۆڵینەوە و چاپکردنی دیوانە شیعری ئەم دوو شاعیرە و شاعیران و نووسەرانی تریش، بەتایبەت ئەوانەی ژیانیان دەکەوێتە سەدەی نۆزدەهەم و پێشتریش، دەبینین زۆر بە سادەیی بە ژمارەیەکی دیاریکراو ساڵی (بوون و مردن)یان لە ژێر ناوەکانیاندا نووسراوە! لێکۆڵینەوەکان دەری دەخەن ئەم کارە هەروا ئاسان نییە! ئەوەتا هەر بۆ ئەم دوو شاعیرە واتە (نالی و حاجی) مردنەکەی حاجی لێ دەرچێ، کە دڵسۆزی کورد (میقداد مەدحەت بەدرخان) لە ژمارە (٣) ی ڕۆژنامەی (کوردستان– قاهیرە) لە ساڵی ١٨٩٨ زاینی نووسی ساڵی پار – واتە ١٨٩٧) حاجی شاعیری کورد کۆچی دوایی کردووە! دەنا ساڵی لەدایکبوونی (حاجی قادر) و ساڵی لەدایکبوون و مردنی (نالی شارەزووری) بە گوێرەی لێکۆڵینەوەکان لە نێوان (١٥–٣٠) ساڵ و زیاتریش دێن و دەچن! هەر بۆیە لەنێو ئەم هەموو ڕایە جیاوازەدا، ئەرکی ئەم لێکۆڵینەوەیە نییە! بێ ئەم (بوون و مردن) [*٣] انە ساغ بکاتەوە.

ئەرکی سەرەکی ئەم لێکۆڵینەوەیە دۆزینەوەی (زەمەن) ێکە، کە (حاجی و نالی) پێکەوە لە (ئەستەنبۆڵ) کۆبکاتەوە، کە ئەوە دەرکەوتووە، هەردوو شاعیر ئاوارەی ئەم شارە بوون و هەر لەوێش مردوون و نێژراون.

ئێستاش بە خشتەیەك هەندێك لەو ساڵە بەرگومانانە بەراورد دەکەین، کە لێکۆڵەران بۆ لەدایکبوون و مردنی ئەو دوو شاعیرەیان تۆمار کردوون، کە هەندێك لەم لێکۆڵەرەوانەش زۆر بە دڵنیاییەوە ساڵەکان دەنووسن، جگە لەساڵی مردنی حاجی ساڵەکانی تر هەموویان گومان هەڵدەگرن! هەر لەبەر ئەمەشە هەندێ لە لێکۆڵەران، نەیانتوانیوە بە دڵنیایی ساڵەکان بنووسن و ئێمەش ساڵی زاینی و کۆچییەکانمان نەگۆڕی چونکە ئەمەش کێشەیەکی ترەو وردەکاری زۆری دەوێ و کاری ئەم لێکۆڵینەوە نییە.

| ز | لەدایکبوون | مردن | ساڵی تەمەن | سەرچاوە |
|---|---|---|---|---|
| | **نالی** | | | |
| ١ | ١٢١٥ | ١٢٧٣ | ٥٨ | محەمەد ئەمین زەکی (٣) |
| ٢ | ١٢١٧ | ١٢٧٥ | ٥٨ | عەلائەدین سجادی (٤) |
| ٣ | ١٢٢٠ | ١٢٧٦ | ٥٦ | دکتۆر مارف خەزنەدار (٨) |
| ٤ | ١٢١٢ | ١٢٩٥ | ٨٣ | سدیق بۆرەکەیی (٣) |
| ٥ | – | ١٢٩٠ | – | عثمانلري مؤلف – د. ع. ح. و. م. ل (٦) |
| ٦ | ١٨٠٠ | ١٨٥٦ | ٥٦ | نالی هەر لە لووتکەدایە (٩) |
| | حاجی | | | |
| ز | لەدایکبوون | مردن | ساڵی تەمەن | سەرچاوە |
| ١ | ١٨١٥ | ١٨٩٧ | ٨٢ | عەلائەدین سجادی (٣) |
| ٢ | ١٨١٦ | ١٨٩٧ | ٨١ | دکتۆر مارف خەزنەدار (٨) |
| ٣ | ١٢٤٥ | ١٣١٤ | ٦٩ | سدیق بۆرەکەیی (٣) |
| ٤ | ١٨١٥<br>١٨١٦<br>١٨١٧ | ١٨٩٧ | ٨٢<br>٨١<br>٨٠ | سەردار حەمید میران و کەریم شارەزا (٤) |
| ٥ | ١٨١٥<br>تا<br>١٨٢٥ | ١٨٩٧ | ٨٢<br>تا<br>٧٧ | دکتۆر عەبدوڵلا رەسول نەژاد (٩) |
| ٦ | ١٨١٥<br>١٨١٧ | ١٨٩٧ | ٨٢<br>٨٠ | هێرش بێتووشی (٢٠) |

وەکو لەم خشتەیەی سەرەوە دەردەکەوێ، هەر یەك لەتەمەنی نالی (٣٧) ساڵ و تەمەنی حاجی (١٣) ساڵ گومان هەڵدەگرن، ئەم دوو ژمارەیەش ژمارەیەکی کەم نین، لێرە چەند پرسیارێکی تر سەر هەڵدەدات، ئەویش ئەوەیە:

١- هەر یەك لەم دوو شاعیرە هەریەکەیان چەند ساڵ ئاوارە بوون ؟
٢- هەریەکەیان چەند ساڵ لە ئەستەنبۆڵ ژیاون؟
٣- هەردووکیان لە ئەستەنبۆڵ چەند ساڵ پێکەوە بوون؟

وەڵامی دروستی ئەم پرسیارانەش کێشەی زۆری تێدایە، کە لێکۆڵینەوەی تایبەتییان دەوێ، بۆیە ناچارین لەم لێکۆڵینەوەیەدا تەنیا بەدوای ئەوەدا بگەڕێین ئەرێ: (ئایا... حاجی نالی دیوە ؟!).

**پەیوەندی نێوان حاجی و نالی :**

ئێمە پەیوەندی نێوان (حاجی) و (نالی) لەوەوە دەزانین کە حاجی، لە شیعرەکانیدا زۆر باسی نالی کردووە، ئەوەی کە بۆ ئەم لێکۆڵینەوە بەردەستمان کەوت، حاجی (١٤)[٤*] جار باسی نالی کردووە، (١٢) جار ناوی هێناوە وەکو (نالی) (١) جاریش وەکو (خضر – خزر) و جارێکیش بە هێما، لەناوهێنان و باسکردنەکانیش، بەردەوام (حاجی) ڕێزی لە کەسایەتی نالی گرتووە و بە شاعیریەتی و شیعرەکانیدا هەڵگوتووە، ئێمە ئەم هەموو ڕێز و سەرسامییەی (حاجی) بۆ (نالی) هەر تەنیا لەوەدا نابینین کە (حاجی) پاش چوونی بۆ (ئەستەنبۆڵ) شیعری نالی دیبێ و خوێندبێتیەوە ! بەڵکو ئەوە بە دوور نازانین کە (حاجی) وەختێ لە کوردستان بووە و لە سەردەمی خوێندن و فەقێیاتی و دوای خوێندن و مەلایەتی ناوی (نالی) بیستبێ و شیعری خوێندبێتەوە و (نالی) دیبێ! ! چونکە (حاجی) لای کەم تا تەمەنی (٣٥-٤٠) ساڵ لە کوردستان بووە، تۆفیق وەهبی فەرموویەتی (ساڵی ١٨٣٥ بارگەی دەپێچێتەوە و دەچێ بۆ ئەستەنبۆڵ) (٦،ل٣٩) ئەگەرچی هەندێ سەرچاوەی تر چوونە دەرەوەی نالی لەم ساڵەدا واتە ١٨٣٥ بە چوونی بۆ حەج باس دەکەن وە ئەمەش پێش ڕووخانی میرنشینیی بابانەکانە، ڕاستی ئەم چوونە حەجەشی لەوەدا بەدەر دەکەوێ، پاش ئەوەی (نالی) حەج دەکا و ماوەیەك لە ماڵی خودا دەمێنێتەوە، وە دەچێتە شام، لەوێش نامە شیعرییە مێژووییەکەی بۆ (سالم) دەنێرێ، کە زۆربەی لێکۆڵەرانیش ساڵی ١٨٥٣ بە ساڵی نووسینی نامەکەی (نالی) دەزانن دەبێ پاشان لە (شام)ەوە چووبێتە (ئەستەنبۆڵ)، هەرچەندە هێڵی چوونی (نالی) بۆ (شام) و (سعودیە) و

(ئەستەنبۆڵ) زۆر بە ڕوونی دیار نییە ! کە کامیان پێشی ئەوی ترە و چوونی بۆ هەریەك لەم شارانە، لە چ ساڵێکدا بووە؟ بەلاّم ئەوە هەیە کە (نالی) لە جارێك زیاتر حەجی کردووە، لە چوونە حەجیش چ لە سلێمانییەوە چووبێ چ لە (ئەستەنبۆڵ)! ئەوا بێ شك لە ڕێگای شامەوە چووە.

دکتۆر عەبدوڵلاّ حەداد دەنووسێ : (دەبێ بڵێین لە ساڵی ١٢٨٥هـ) و (١٨٦٨ز) نالی بۆ دووەمین جار چووە بۆ مەککە و دوای سێ ساڵ مەلا عەبدوڵلاّی جەلی زادە لەوێ چاوی پێ کەوتووە، بەم پێیە دەبێ چوار پێنج ساڵ لە مەککەدا ژیانی بەسەربردبێ!) (٦،ل١٧)، ئەگەر ئێمە گومان لەوە نەکەین کە (نالی) لە ساڵی (١٨٧٣) دا وەفاتی کردووە، وەك بەڕێز (مەحمود لەوەندی) لە نووسینێکدا بەناوی (نالی مولا خزر د چاڤکانیەکا ترکی دا) نووسیویەتی (د ١٢٩٠ ێ دا پشتی دەمەکێ وەفات دەکاو ل گۆڕستانا کەرەجا ئەهمەت ڤە دشێرن) (٢٦،ل٥) کەواتە ئەگەر لە ساڵی ١٨٣٥؟ لە سلێمانی دەرچووبێ و لە ساڵی ١٨٧٣ دا وەفاتی کردبێ کەواتە (نالی) بەهەموو ئەگەران (٣٨) ساڵ ئاوارە بووە، وەك خۆی لە شیعری (قوربانی تۆزی ڕێگەتم...) دا، لە سەرەتای نیوە دێری دووەمدا، دەنووسێ : (دەرکراو و دەربەدەر) م، ئەم هەموو ساڵەشی بەدەرکراوی و دەربەدەری لە نێوان (شام) و (ئەستەنبۆڵ) بەسەر بردووە.

ئێستاش با بزانین (حاجی) چەند ساڵ دەربەدەر بووە و کەی چووەتە (ئەستەنبۆل)؟ بەڕێزان سەردار حەمید میران و کەریم شارەزا دەنووسن : (حاجی تاکو ساڵی (١٢٧٩) ی کۆچی بەرانبەر ١٨٦٢–١٨٦٣ (م) هەر لە کوردستانی ئێران ماوەتەوە و لەو ساڵەدا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە) (٤،ل٢٢)، پاش ماوەیەك ڕوو دەکاتە (ئەستەنبۆڵ) دیارە ئەویش کە لەساڵی ١٨٩٧ وەفاتی کردووە ئەگەر ساڵی چوونە ئەستەنبۆڵی لە ساڵی ١٨٦٣ بزانین! ئەوا حاجی قادریش (٣٤) ساڵ غەریبی ئەوتان بووە — هەرچەندە باسی ئەوە ناکرێ کە حاجی چووبێتە حەج! بەلاّم ئێمە بۆ ئەوە دەچین کە حاجی لەو ماوەیەدا سەفەری زۆری کردبێ، بەتایبەت بۆ (فەرەنسا) و (پاکستان و هیند) ئەوەتا لە شیعرێکدا باسی بورجی (ئیڤیل)* دەکات و دەنووسێ :

**قوللەیی ((ئیڤیـل)) لـە ئەفـلاکـە**
**عەکسی ئەو گەردشی لەژێر خاکە** (٢٠،ل١٨٩)

کە ئەم قوللەی ئیڤلەش لە ساڵی ١٨٨٩ دروست کرابێ، ئەوا دەبێ حاجی پاش ئەو ساڵە چووبێتە فەرەنسا و ئەوەی بە چاوی خۆی دیبێ! هەروەها چووبێتە (پاکستان) و قوبەی (کشمیر) یشی دیبێ، حاجی لەم شیعرەدا دەنووسێ:

**لـە مـەیـدانی بـەهـارا شارەکەی کـۆ**
**قوبەی کشمیری دا بەر شەق وەکو گۆ.** (٢٠،ل٢٤٧).

چونکە (حاجی) لەناو هێنانی (قوللەیی ئیڤیل) و (قوبەی کشمیر) دا بەهەمان نەفەسی دیتنی (مەیدانی بەهاری شارەکەی کۆ) یێ باسیان دەکات : ئەگەر ئەم (ئیڤیـل) و (کشـمیر) ە لێـك دوورن و ڕۆژهـەلات و ڕۆژئـاوا دەگرنـەوە ! ئـەوا بـۆ کەسێکی ئاوارە و گەڕۆك و بێ خانی، ئەم گەڕانـە دوور نییـە ! هـەر خـۆی حـاجی دەنووسێ :

**سەعدی ئەیامی خۆی نەبوو نانی**
**وەکو من بوو گەڕۆك و بێ خانـی** (٢٠،ل٢١٦).

لێرە حـاجی باسـی (بـێ نـانی) و (بـێ خـانی) و ئـاوارە و (گـەڕۆك) ی خـۆی دەکات، ئـەم گەڕۆکییـە یارمـەتی ئـەوەمان دەدات، کـە بڵـێین (حـاجی) گـەڕاوە و بەچاوی خـۆی ولاٚتـی (فەرەنسـا) و شـاری (پـاریس) و (پاکسـتان) و (کشـمیر) ی دیوە، کەواتە (حاجی) یش هەموو ساڵەکانی ئاوارەیی لـە (ئەسـتەنبۆڵ) نـەبووە. بەتایبەت کە لەو ڕۆژگارەدا سەفەر زۆری خایاندووە.

ئێسـتا هاتوچـۆی (نـالی) لـە مـاوەی (٣٨) سـاڵ ئاوارەییـدا لـە نێـوان (ئەستەنبۆڵ) و (شام)دا، چەند سـاڵی لـە (ئەسـتەنبۆڵ) بـوو ؟ ئـەی (حـاجی) لـە ماوەی لای کەم (٣٤) ساڵ غەریبی و گەڕۆکی لەنێوان (ئەسـتەنبۆڵ) و (فەرەنسـا) و (پاکستان) دا ئەویش چەند ساڵ لە (ئەستەنبۆڵ) بـووە؟ بـۆ ئـەوەی بـزانین کـە (حاجی) و (نالی) کـەی و چـۆن یـەکتریان دیـوە؟! ئـەوە ئەگـەر! ئەگـەری یـەکتر بینینەکـەیان تـەنیا بـە شـاری (ئەسـتەنبۆڵ) ببەسـتینەوە ! ! ئـەوا ئەگـەر زانینـی ماوەی مانەوەی هەر یەك لەم دوو شاعیرە لە (ئەستەنبۆڵ) کارێکی ئاسان نییە ! !

کەچی لە (ئەستەنبۆڵ) بوونی هەردووکیان لە یەك کاتدا لە شاری (ئەستەنبۆڵ) بوونێکە گومان هەڵناگرێ! ! ئەوەتا مامۆستا (محەمەد مستەفا ((حەمەبۆر)) دەنووسێ: (لە زۆر سەرچاوە دەمەکییەکان بیستوومە کە (کوردی) لە سەردانەکەی بۆ (ئەستەنبۆڵ) یدا بۆ لای (ئەحمەد پاشای بابان) چاوی بە زۆر لە هۆنەرانی وەك : (نالی و حاجی قادری کۆیی و کەیفی و هی تورکیش کەوتووە، بە تایبەت دیدەنی کردوون) (١٥،ل٢٩) ئەگەر (کوردی) باسی ئەوەی کردووە کە لە (ئەستەنبۆڵ) شاعیران نالی و حاجی و کەیفی دیوە: ئەوا ناکرێ، ئەو سێ شاعیرە لە ئەستەنبۆڵ و لەو هەموو ساڵە غەریبییە یەکتریان نەبینیبێ! ؟! بەتایبەت کە هەرسێکیان کوردن و ئاوارەی ئەستەنبۆڵن و هەرسێکیشیان شاعیری دیار و ناسراون، دەکرێ (ئەحمەد پاشای بابان) یش لە شاری ئەستەنبۆڵ بە ئەڵقەی پێکەوە بەستنەوە و نێوەندی کۆکردنەوەی کوردە ئاوارەکان بە گشتی و شاعیرو رۆشنبیران بەتایبەت بزانین! ئەوا شیعرەکانی (حاجی) یش بە خۆڕایی نییە پڕە لە باسی نالی و کەیفی ؟! ئەگەر سەرچاوەکان باسی ئەوە دەکەن کە حاجی ماوەیەك لەگەڵ بەدرخانییەکان تێکەڵ دەبێ! واتە ئەو ماوەیە کارێکی دەبێ و دەیکات! ئەوا مامۆستا (سدیق بۆرەکەیی) دەنووسێ : (نالی سەودای دیتنی ماڵی خوای دەکەوێتە سەری و سلێمانی بەجێ دێڵێ و دەچێ بۆ حەج و کە حەج دەکا دەگەڕێتەوە بۆ شام وە چەند ساڵێك لەوێ لەناو کوردەکانی شامدا ژیان دەباتە سەر و ئەوسا ڕوو دەکاتە شاری ئەستەنبۆڵ و لەوێدا چاوی دەکەوێت بە ئەحمەد پاشای بابان و ئەحمەد پاشاش لەکاری دەوڵەتی ئەو سەردەمە دایدەمەزرێنێ و ئیتر پاشماوەی ژیانی هەر لەوێدا دەباتە سەر تا ساڵی ١٢٩٠ لە تەمەنی ٨٣ ساڵیدا بادەی مەرگ لە مەیگێڕی ئاکام وەردەگرێ و دەیخواتەوەو کوردەکان تەرمەکەی لە گۆڕستانی ئەبوو ئەیوبی ئەنساریدا دەنێژن) (٣،ل٥٧٨) ئەوەی لێرە گرنگە ئەو دامەزراندنی (نالی) یە لە کاری دەوڵەتی، بەهۆی ئەحمەد پاشای بابان – کە ئەمەش بەدوور نازانرێ، چونکە پەیوەندی نێوان (نالی) و (ئەحمەد پاشای بابان) پەیوەندییەکی بەهێز و نەپچڕاو بووە، سەیرکە ئەحمەد پاشا لە پاریس باسی (نالی) بۆ (ئەلکسەندەر خۆدزکۆ) دەکات و لە ساڵی ١٨٥٣–١٨٥٤ دا خۆدزکۆ دەنووسێ : (ئەحمەد خان – مەبەستی ئەحمەد پاشایە – کە دۆستی

نالی ئەفەندییـە، بـەڵێنی دامـێ — لـە دەرفـەتێکی لـەباردا بـە سـەرۆکی زمانـەوانی ولاَتەکەیم بناسێنێ) (٦،ل٣٢).

ئەمانە هەمووی پەیوەندی نێوان (نالی) و (ئەحمەد پاشای بابان) مان بۆ دەسـەلمێنێ و ئەمـەش مەسـەلەی دامەزرانـدنی (نـالی) لـە کـاری دەوڵـەتی و جێگیربوونی بۆ ماوەیەك لە (ئەستەنبۆڵ) ساغ دەکاتـەوە! ئـەو پێشـەکییەش کـە (نالی) بۆ کتێبی (مناظر الانشاء)ی(*) نووسیوە، نیشانەی ئەوەیـە کـە نـالی لـە ئەستەنبۆڵ جێگیر بووە و پەیوەندیشی لەگەڵ دەسەڵاتدار و نووسەر و رۆشنبیر و شاعیران باش بووە. کەواتە (حاجی) و (نالی) کە هەردووکیان ئـاوارە و دەرکراو و غەریبی ئەستەنبۆڵن! هەردووکیشیان ماوەیەك لەوێ و هەریەکەیان بـەهۆی کارێك نیشتەجێ و جێگیر بوونە، ئەم جێگیربوونەش زیاتر زەمینـەی یـەکتر بینینەکـەیان خۆش دەکات.

### ئەگەری یەکتر بینینی حاجی و نالی لە کوردستان

پێشتر هەر لەم لێکۆڵینەوەیەدا نووسیمان — ئەوە بەدوور نـازانین کـە حـاجی وەختێ لە کوردستان بوو، لە سـەردەمی خوێنـدن و فـەقێیاتی و دوای خوێنـدن و سـەردەمی مەلایـەتی، نـاوی نـالی بیسـتبێ و شـیعری خوێندبێتـەوە و چـاوی پـێ کەوتبێ! چونکە شێوەی خوێندنی ئـەو دەمـە کـە لـە حـوجرە و مزگـەوت بـووە، فەقێ بۆ خوێندن ولاَتەو ولاَت و شارەو شار و مزگەوتەو مزگەوت گەڕاوە، ئـەوەش ئاشکرایە کە (نالی) پێش (حاجی) خوێندوویەتی و لـە، خـاك و خـۆڵ و شـارەکانی قـەرەداغ و سـلێمانی و (بەشـێکی کوردسـتان) گـەڕاوە، ئەمـەش وای کـردووە کـە دەنگوباسی فەقێیەتی و خوێندن و شاعیریەتی و مەلایەتی (نالی) لەنێو مزگـەوت و مەدرەسە و لەنێو فەقێ و مەلا و خەڵکی کوردستان بلاَو ببێتەوە، پاش ئەویش کە حاجی دەچێتە بەر خوێندن و لە کۆیێ و شنۆ و سـابلاَغ و (بەشـێکی کوردسـتان) لـەنێو مەدرەسـە و مزگـەوت و شـارەکانی کوردسـتان لەگـەڵ فـەقێ و مـەلایان دەخوێنێ، بێ شك دەنگوباسـی (نـالی) دەبیسـێ و دوور نییـە شیعریشـی دەسـت کەوتبێ و هەتا چاویشی پێ کەوتبێ، چونکە لە سـەردەمی فەقێیایـەتی حـاجی دا

(نالی) شاعیر و ناودار بووە، هەروەها شیعرەکانی کـە بـۆ بابانییـەکانی نووسـیوە، کە دەفەرموێ :

**تا فەلەك دەوری نەدا سەد کەوکەبی ئاوا نەبوو**

**کەوکەبی میهری موبارەك طەلعەتی پەیدا نەبوو** (١٦،ل٣٧٠)

هەروەها ئەم شیعرەش کە بۆ لەشکری بابانی نووسیوە و دەفەرموێ :

**ئەم طاقمە مومتازە کەوا خاصەیی شـاهن**

**ئاشووبی دڵی مەملەکەت و قەلبی سوپاهن** (١٦،ل٣٤٠)

ئەم شیعرانە و زۆری تری (نالی) و پێدا هەڵگوتنەکەی (ئەحمەد پاشای بابان) بە نالی و ناساندنی بە لێکۆڵەرەکی وەکو (خۆدزکۆ) و پێناسەکردنی بـە (سـەرۆکی زمانەوانی وڵاتەکەی) ئەوەمان بۆ دەردەخات کە (نالی) بە فەرمی (سەرۆکی ئەدیب و شاعیران و زمانزانانی) [٥*] ئەمارەتی بابان بووە، کەواتە شاعیریەتی نـالی و ئـەم پلـە و پایەیـەی لـە ئـەمارەتی بابـان دا، نـاو و ناوبـانگیی (نـالی) زۆرتـر بـەنێو کوردستاندا بڵاو کردۆتـەوە و چاکتر ناسـراوە، ئەگـەر ئـەوەش لـەبیر نەکـەین کـە (کۆیە) هەتا ساڵی ١٨٣٢ ی زایینی لەژێر دەستی بابانییەکان بووە، دکتۆر جەمال نەبەز دەنووسیێ : (میری کۆرە میری دەسەڵاتداری ڕەواندز بوو تا سـاڵی (١٢٤٧ ك – ١٨٣٢ز و نازناوی (پاشا)یەتی لە عوسمانیەکان وەرگرت، هەر ئەویش بوو کۆیـە و هــەریری لــەژێر دەســتی بابانییــەکان دەرهێنــا) (٢١،ل١٢٦)، ئــەم هــەموو پەیوەندییە ڕۆشنبیری و کـارگێڕی و سیاسـییەی نێـوان سـلێمانی و کـۆیێ نـاکرێ یارمـەتی ئـەوەی نـەدابێ کـە (نـالی) و (حـاجی) ئاگـاداری یـەکتر بـن، بەتایبـەت کەسێکی گەڕۆك و سەر زیندووی وەکو حاجی شاعیر و وشیار سەرو سۆراغی نـالی نەبیستبێ و بەدوایدا نەچووبێ ؟! خۆ (نالی)یەك لە ژیـانی خۆیـدا لـەو سـەردەمە، ناوو ناوبانگی گەیشتۆتە دەرەوەی وڵاتان ئـەی چـۆن نەگەیشـتۆتە کـۆیێ ؟! کـە حـاجی لـە وڵاتـی خۆشـی شـاعیر بـووبێ و شـیعری زۆری نووسـیبێ! ئـەوەتا لـە غەریبییەوە دەنووسیێ:

**ئەی ڕەفیقانی وەتەن زۆر غەزەلم ماوە لەوێ**

**لە کەنارێکــە و تــەقــدیــرە وەکو هەڵکـەوێ**

**وەك سەفینە بگەڕێ بیخەنە بەر بەحری قسەم**

**حەیفە وەك مـن لـە غەریبی بمرێت و نەتەویٚ** (٢٠،ل٢٦٢).

مەسعود محەمەد لەبارەی ئەم شیعرەوە دەنووسیٚ : (بەمە دیارە حاجی قادر بەشـێکی لـە غەزەلـەکانی لـە کوردسـتان مـاوە و لـە یـادی کـردوون و نـاتوانیٚ بیاننووسێتەوە و لە فەوتان ڕزگاریان بکات، بۆیە داوا لە برادەرانی دەکات بۆی کۆ بکەنەوە و بیان پارێزن) ١٨،ب٣،ل٦٢.

کەواتـە حـاجی لـە کوردسـتان دەمێـك بـووە شـیعری نووسـیوە " هـەموو کەسێکیش کە تازە شیعر بنووسیٚ هـەوڵ دەدات، شـاعیرانی ناسـراوی نێـو خـەڵك بناسیٚ! ئەم هەوڵدان و حەزکردنەی حاجیی لاو بۆ ناسین و بینینی (نـالی) بـەدوور نازانین.

کەواتە بەڕای ئێمـە خـاوەنی ئـەم شـیعرانە (حـاجی) ئەگـەر لـە وڵات و پـێش سـەفەری غـەریبی (نـالی) نـەدیبیٚ! ئـەوا بـیٚ شـك نـاوی بیسـتووە و شـیعری خوێندۆتـەوە، هـەر بۆیـە یـەکتربینینیان لەگـەڵ (نـالی) لـە ئەسـتەنبۆڵ کـارێکی ئاساییە.

**بینین و باسکردن:**

ئێمە جارێکی تریش بەم پرسیارە دەست پێدەکەین و دەڵێین : ئایـە حـاجی نالی دیوە؟! باشـە ئەگـەر دیویـەتی و لـە شـیعرەکانی باسـی کـردووە ؟! باشـە : حاجی لەنێو شیعرەکانیدا باسی کەسی تری کردووە، لە ئاوارەیی و لە ئەستەنبۆڵ دیتبیەتی و بە شیعر باسی کردبیٚ! هـەتا ئەگـەر نـالی دیبـیٚ، بـە شـیعریش باسـی ئەویشی کردبیٚ؟!

(حاجی) لە شاعیریەتی خۆی لە (نالی) بە کەمتر نەزانیوە! نەك هەر ئەوەنـدە بەڵکە هەندیٚ جار لە شیعردا نالی و کوردیشی جێهێشتووە.

حاجی دەفەرمویٚ :

**بەجێما (نالی) وەکو (ناڵیٚ) بەپاش کەوت (کوردی) وەکو گەردیٚ**

**کە (حاجی) غاری دا ئەسپی لە مەیدانی سوخەندانی (٢٠،ل١٧٤).**

بەڵام حاجی ئەم ئاستە بەرزەی شیعری خۆی لە پێنـاو هەسـتی نەتـەوەیی و بۆ هوشیارکردنەوەی نەتەوەکەی، گۆڕیـوە بـە شـێوەیەك کـە دەکـریٚ بـە شـیعری

(هەواڵی ڕۆژنامەیی) [٦*] ناوی ببەین، هەر بەو شێوەیە (حاجی) لەو ڕۆژگارەدا هێندە هەواڵی گرنگ و مێژوویی بۆ تۆمار کردووین، کە لە گرنگیدا بێ وێنەن.

**هەواڵی مێژوویی:**

با هەندێك لەو هەواڵە مێژووییە گرنگانە بەسەر بکەینەوە کە هەواڵی کەسانی ئاوارە و دەربەدەری کوردن و (حاجی) لە غەریبی چاوی پێ کەوتوون و بە شیعر ئەم هەواڵانەی بۆ تۆمار کردووین و لە ڕۆژنامە شیعرییەکەی خۆیدا وێنەی بۆ کێشاوین ! !

حاجی دەفەرموێ :

**لە ڕۆما کەوتە بەرچاوم کەسێکی هائیم و حەیران**
**بە هەیئەت تێگەییم کوردە بەشێوەی ئەهلی کوردستان**
**کە چوومە خدمەتی پرسیم : برادەر خەڵکی کام جێگای؟**
**لە کام لا هاتووی ؟ گریا ! گوتی بابان ! گوتم : بابان؟**
**دڵم داوە گوتم : باوکە هەموومان بێ کەسین لێرە**
**چ قەوماوە؟ گەلێ حەیفە، مەگریی هەروەکو باران.**

(٢٠، ل١٠٠)

لە گفتوگۆی نێوان (حاجی) و ئەو کەسە هائیم و حەیرانە ئەگەر بە وردی سەرنج بدەین، ئەوا لە ڕاستیدا هەواڵە چیرۆکێکی شیعری ڕۆژنامەییە ! لە وەتەی (کورد) ئاوارە بووە، ڕۆژانە ئەم چیرۆکانە دووبارە دەبنەوە ! بەڵام ئەوە هونەری (حاجی) یە زیندوویەتی داوە بەم (ڕووداو)ە و زۆر ڕووداوی تر کە ئێستا بۆ ئێمە بوونەتە مێژووێکی گرنگ.

لە جێگایەکی تر حاجی دەفەرموێ :

**لە جوملەی ماجەرای دووری ویلایەت**
**ئەمەش باسێکە خۆشە وەك حیکایەت**
**شەوێ دانیشتبووم بێ شەمع و میسباح**
**ئەتۆی هێناوە یادم "کاکە فەتتاح"**

**گــوتی: بــا کاغــەزێکی بــۆ بنێــرین**
**موحیبی ســـادیقەو هەمرازی دێرین.**

(٢٠،ل٢٣٩).

سەیرکە (حـاجی) خـۆی دەنووسـێ (باسـێکە) و ئـەم باسـەش خۆشـە وەکـو (حیکایـەت– چـیرۆك)، هــەر خۆشــی ئــەم (باســە–هــەواڵ)ە بەشـێوەی هــەواڵی رۆژنامەیی و بە شیعر دەگێڕێتەوە، ئەگەر بە وردی سـەرنج بدەینـە ئەمـەش، وەك شیعرەکەی پێشتر باری – ڕووداو– هـەواڵ و – چـیرۆك– بەسـەریدا زاڵـە، دەسـت پێکردنەکـەی وەك چـیرۆکێکی واقیعـی! کـە هـەر خۆشـی – باسـی هـەواڵ –ێکـی واقیعیە و بە (پێشەکی) و (بار–حاڵەت) و (زەمەن) و (کـات) و پاڵـەوان – کەسـی یەکـەمی (مـن) و (کەسـی دووەم) (تـۆ) و (کەسـی غائیـب – کەسـی دوور) (ئـەو) دەسـت پێـدەکات و هــەواڵی – چــیرۆکەکە! بەهــەموو مەرجــەکانی (هــەواڵ) و مەرجەکانی چیرۆك، کۆتایی بە حیکایەتە هەواڵەکـە دەهێنـێ و مێـژوویێك بـۆ ئێمـە دەگێڕێتەوە، کە لە هیچ جێگایەکی تر ئەم هەواڵە مێژوویییەمان دەست ناکەوێ.

لە ڕووی هونەرییەوە ئەگەرچی حاجی – لـە ڕووکـار– سـادەیییەکی داوە بـە شیعرەکان ئەوەی کە دکتۆر مارف پێی دەڵـێ : (شـیعرە میللـی و نوێگەرییـەکانی حاجی) بـەڵام، بـە شـارەزایی خـۆی لـە هونـەرەکانی ڕۆژنامـە و چـیرۆك و هەواڵـە چیرۆکەکە تۆڵەی کردۆتەوە و لەلایەکی ترەوە ئاستی (نووسینەکان) ی خۆی بەرز کردۆتەوە و گرەوی لە هـەمووان بردۆتـەوە. کـە هـەر لـەم هەواڵانـە دەتـوانین زۆر ڕەهەنـدی تـر بخوێنینـەوە : ((بـۆ نموونـە : ڕەهەنـدی کەسـییەتی (ئـاوارەیی) و (دەروونی) و (کۆمەڵایەتی) و (نەتەوەیی) و (ئابووری))، (حاجی) خۆی و (کەس – کارەکتەر)ە هائیم و حەیرانـەکانی کـە هەڵبـژاردوون ئەگـەر لـەم دوو نموونەیـەدا، نازانرێ (کەسی هایم و حەیران) چ کەسێکە و چ کارەیە ؟ بۆچی ئـەویش ئـاوارە و دەربەدەری (وڵاتـی رۆم)ە ! ؟ ئـەوا نموونـەی دووەم، عەبـدوڵڵا ئەفەنـدی – جـەلی زادەیە و (هەمرازی دێرین)یەتی و (زەمانێك پێکەوە – لە کوردسـتان– چـووینەتە باڵەك) [*٧] و (حاجی) پێ خاوەس بووە، لەسەر ئەم هەموو – پێ خـاوەس– ی و ناخۆشـییەی کـە حـاجی لـەنێو وڵات دیویـەتی و دواجـار لـە دەسـتیان هـەڵاتووە

ئێستاش بۆیان دەگری (ئێستای کاتی نووسینی نامەکە — بۆ حاجی کە دەمێکە دەربەدەر و غەریب و دوورە لە ولآت — ئەم — دووری — یە بەسەد قەید و حەواشی باس ناکرێ و چار هەر ئەوەیە بە سەبووری لەگەڵ — دۆزەخی دووری ڕابێ و چاوەڕێی نامەیەکی بولبول ئاسایە بە — دەست و خەتی — دۆستێکی ناو ولآت، دەنا گەڕانەوە مەحاڵە، نالی گوتەنی تا یەومی نەفخی سوور! لەم ناوهێنانەدا (حاجی) کە باسی (کەسێکی) ئاوارەی (نەناسراو) دەکات لە (ڕۆم)ای غەریبی و نامە بۆ (کەسێکی) جێماوی (ناسراو) ی نێو (ولآت) دەنێرێ! ! ئەی با بزانین چۆن باسی (کەیفی)ی شاعیر دەکات، کە پێکەوە ئاوارەی ولآتانن! ؟ لەم ئاوارەییەدا لە شاری (قوستەنتین و لە ساڵی ١٨٨٣) کۆچی دوایی دەکات، بەکۆچکردنی کەیفی حاجی لەدۆزەخی ئاوارەیی بەجێ دێڵێ! حاجی لە حەسرەتان و لە حەژمەتان قەسیدەیەکی پڕ لە فرمێسك و فەلسەفە دەنووسێ و دەیداتە دەست (سەبا) ی (قاسیدی غورەبا) بگەینێتە (قەوم و قیلە) بۆئەوەی خۆیان لە قوڕ بگرن، سەیرکە (حاجی) چی بە (سەبا) دەڵێ :

**سبەینێ هەستە مەوەستە خەبەر بگەیەنە ولآت**
**دیارە چەند حەزین و غەریب و بێ کەیفین**
**کە چوویە سەر حەدی "بابان" و عێلەکەی "جافان"**
**بگری هەروەکو بارانی ماهی فەروەردین**
**لە قوڕ بنیشە بڵێ : قەوم و قیلە هاوارە**
**ئەسیرە ((کەیفی)) لە ڕۆما لە حەپسی ژێر زەمین**

(٢٠، ل١٠٥).

حاجی دەیەوێ بڵێ : ئەگەر (کەیفی) تا ئێستا — ئاوارە و دەربەدەر بوو— ئەوا بە مردنی بووە — حەپسی ژێر زەمین — لە (ڕۆم)ا ئیتر ئەگەر ئاوارەیی ئومێدی — هاتنەوەو گەڕانەوەی — تێدابێ! ئەوا تازە حەپسی ژێر زەمینی (ڕۆم)ا — ئەو ئومێدەشی بۆ کەیفی و — قەوم و قیلەی — کەیفی نەهێشت.

حاجی بەردەوام دەبێ لەسەر ناردنی —هەواڵ— ڕووداو — ی مردنی (کەیفی) و دەنووسێ :

**لە کوردی بیگرە هەتا تورك و عارەب و عەجەمی**
**لە ئاخ و داخی دەسووتێن و شین دەکەن دەگرین** (٢٠، ل١٠٦).

لێرە حاجی لە هەواڵەکە باسی گەورەیی کەیفی و کاریگەریی مردنەکەی دەکات و دەڵێ : میللەتانی تورك و عارەب و عەجەمیش وەکو کورد، بۆی دەگرین دەنووسێ :

**حەزینی و دەرهەمـــی ئــەم شارە زۆری بێگانەن**
**لە حەسرەتی عەجەبا ! شارەزووری چەن دەگرین !** (٢٠،ل١٠٦).

ئەگەر تا ئێستا (حاجی) زۆرتر باسی کاریگەریی مردنی (کەیفی) دەکات لەسەر میللەتانی جیاجیا و خەڵکی شاری (قوستەنتین) ئەی لای خۆی حاجی مردنی کەیفی چ کاریگەرییەکی هەیە ؟ !

**لە "کوێرەدێ" یێ کە (کەیفی) تیابێ فیردەوسە**
**جەهەننەمە کە نەما (کەیفی) شاری قوستەنتین،** (٢٠،ل١٠٦).

ئەگەرچی حاجی بەناوهێنانی (کوێرەدێ !) هێما بۆ شوێنی لەدایکبوونی کەیفی دەکات، بەڵام مەبەستیەتی بڵێ : کوێرە دێیەکیش ئەگەر (کەیفی) تێدا بوایە وەك (فیردەوس) بەهەشت وابوو : کە (کەیفی) یش نەما ئەوا شاری (قوستەنتین) ی ئاوەدان و گەورە و خۆشی ئەو ڕۆژگارەش دەبێتە (جەهەننەم) دۆزەخ ! لەوەش مەبەستیەتی بڵێ ! بۆ من لەم ئاوارەییە، شاری قوستەنتین بەم هەموو خۆشییەی کە هەیبوو وەك (کوێرە دێیەك) وابوو، بەڵام هاوڕێیەتی و بوونی (کەیفی) ئەم کوێرە دێیەی بۆ کردووم بە (فیردەوس ! !) کەچی، ئێستا بە نەمانی کەیفی بۆ من سەرەڕای غوربەتی و ئاوارەیی ئەم شارە گەورە و خۆشەی دونیای ئەمڕۆ بووە بە (دۆزەخ – جەهەننەم ! !).

حاجی لە گێڕانەوەی – هەواڵ – و – حیکایەت – ی مردنی (کەیفی) بەردەوام دەبێت و باسی زۆر بابەتمان بۆ دەکات و لێرە بەدواوە لە هەواڵە شیعرییەکە، بەیادی شارەزایی (کەیفی) لە زمانەکانی (عەرەبی و تورکی و فارسی) سەرەڕای زمانی دایکی زمانی کوردی، (حاجی) یش تەواوی هەواڵە شیعرییەکە بەم زمانانە تێکهەڵکێش دەکات، تا دەگاتە باسی میراتەکانی (کەیفی) کە دوو جۆرن : یەکێکیان بەرهەمە شیعریەکانییەتی و ئەوەی تر کچ و کوڕەکانییەتی، حاجی لە

ڕووی وەفا و کۆمەڵایەتییەوە دەیەوێ لەم ئاوارەیییە (مام)ایەتییان بۆ بکات! بەلام، وا دیارە منداڵەکان هەوای وڵات ڕایان دەکێشێ و چاوەڕێی مامەکانی تریانن، کە لێرەش حاجی هەواڵەکە فراوان دەکات و دەڵێ : کەیفی ماڵ و منداڵی هەیە و لێرە ئاوارەن وەك (من) نەبوو! بێ ماڵ و بێ مەئوا.

ئەوەی لەم نموونە هێنانەوەدا مەبەستمانە ئەوەیە کە (حاجی) باسی زۆر ڕووداوی – سەرپێیی– و ڕۆژانەی کردووە! باسی مردنی زۆر کەسی کردووە! ئەی بۆچی دەبێ باسی (بینین و مردن!!) ی نالی نەکردبێ؟! ئەوەتا بە زمانی فارسی باسی مردنی (حاجی بەکر ئاغا)یەك دەکات و ساڵی مردنەکەشی تۆمار دەکات:–

**بگفتا مرندانی کز جهان رفت**

**(ابوبکر) انیس غار (أحمد)**

**بگفتم : چیست تاریخ وفاتش**

**بگفت : (وا ثاني ثنين محمد)** (٢٠،ل٣٧٣).

حاجی وەك (پەیامنێرێکی ڕۆژنامە)ی ڕۆژگاری ئاوارەیی زۆر بە دڵسۆزی و شارەزایی، بە نووسینی هەواڵی ڕووداوەکان بۆ داهاتووی وڵات کاری کردووە و هەرچی ویستوویەتی و بۆ کورد بە پێویستی زانیوە تۆماری کردووە " باشە دەبێ ئەم شاعیرە مەزن و ڕۆشنبیرە گەورەیە و ئەم کوردە دڵسۆزە، کە لە هەموو ئەو کەسانەی باسی کردوون پتر کاریگەر و سەرسام بووە بە (نالی)!! بۆچی دەبێ باسی بینین و مردنی (نالی) نەکردبێ!!؟ لەکاتێکدا هەر تەنیا لەم دیوانەی کە لەبەردەستە– ئێمە بە دڵنیاییەوە لەسەر ئەم ڕایەین کە ئەمە تەواوی شیعرەکانی حاجی نییە! نزیکەی چواردە جار حاجی بە شێوازی جیا جیا باسی (نالی) کردووە! ئێمە لەم لێکۆڵینەوەیەدا، بەجۆرێکی تر جیا لەوەی کە تا ئێستا ئەم ناوهێنانە، لێکۆڵەر و نووسەرانی بەڕێز خوێندوویانەتەوە، جارێکی تر دەیانخوێنینەوە و شییان دەکەینەوە و بەدوای وەلامی ناونیشانی لێکۆڵینەوەکەماندا دەگەڕێین، کە دەڵێ : (ئایا حاجی نالی دیوە؟!).

حاجی وەك کوردێکی ڕۆشنبیر و هوشیار، زۆر بە وردی ڕۆژانە ڕووداو و پێشهاتەکانی خوێندۆتەوە و بەردەوام میللەتی کوردی لەوە ئاگادار کردۆتەوە کە

ئێستا جیهان لە چ ئاستێکدایە و دوژمنانی خەریکی چینە و لە داهاتوو چی ڕوو دەدات، هەروەها کوردی لەوە ئاگادار کردۆتەوە کە گرنگی بە سروشت و پێکهاتەی ولاتەکەیان بدەن و ڕیز لە پیاوە گەورەکان بگرن! لەنێو ئەو پیاوە گەورە و ناودارانەی کە ناوی هێناون (نالی) لە ڕیزی پێشەوەی ناوهێنراوەکانە، عەبدوللا خدر مەولود دەنووسێ : (دەبێ چ سرڕێك هەبێت بۆ ئەوەی حاجی ئەوەندە بەو شێوە جیاجیایانە ناوی (نالی) هێنابێت ؟؟) (٥،ل٦٥).

هەروەها مارف خەزنەدار دەنووسێ : (لە سەرانسەری دیوانیدا حاجی بایەخێکی تایبەتی بە نالی داوە، لە هەموویان زیاتر یادی دەکاتەوە چونکە بە شاعیری هەرە گەورەی کوردی دەزانێ) (٨،ب،ل١٣٦) لێرە پرۆفیسۆر دکتۆر مارف خەزنەدار باسی یەکێ لەو (سرڕ) انە دەکات کە بوویتە هۆی ئەوە کە (حاجی) هێندە ناوی (نالی) بێنێ و گرنگی پێ بدات.

ڕێبوار سیوەیلی لەوەی کە شاعیران زۆر ناوی (نالی)یان هێناوە : ئەم ناوهێنانە بە (گرێی نالی) ناو دەبات و دەنووسێ: (بەم جۆرە نالی بۆتە گرێ و مەراقێك بۆ شاعیرانی پاش خۆی و لەناو ئەوانەشدا حاجی قادری کۆیی لەپێش زۆربەیانەوەیە) (١،ل٨٧). هەروەها ڕێبوار سیوەیلی ئەم (گرێی نالی)یە بە (گرێی نالی گرێیەکی پۆزەتیڤە) ناو دەبات، ئەم گرێیە پۆزەتیڤە کە مامۆستا ڕێبوار سیوەیلی باسی دەکات، ئەگەر بۆ زۆربەی شاعیرانی دوای (نالی) ڕاست بێت، شاعیران هەوڵیان دابێت شیعرەکانیان بەو نرخە بکرڕێت، کە لە مەیدانی ئەدەبدا شیعری (نالی) پێ دەکرڕێ! ئەوا بۆ (حاجی) دەبێ ئەو گرێیە بەجۆرێکی تر بکەینەوە، کە بە ڕای ئێمە نە (نالی) گرێی نالی خۆی هەبووە و نە حاجی گرێی شاعیریەتی نالی هەبووە! ئەوەی هەیە ئەوە (گرێی کۆمەڵگەیە) [(*٨)]، کە هەردووکیان زۆر بە ڕوونی بە شیعرەکانیانەوە دیارە، ئەوەتا نالی زۆر بە ڕوونی باس لەو گرێیە دەکات :

**عومرێکە بە میزانی ئەدەب توحفە فرۆشم**
**زۆرم وت و کەسم تێی نەگەیی، ئێستە خەمۆشم** (١٦،ل٢٨٠).

نالی بە میزانی ئەدەب ئەو میزانە ئەدەبەی کە نالی دەیزانی و هەر بەو میزانەش توحفەی شیعری پێ دەنووسی و هەرزان فرۆشی دەکرد بۆ میللەتەکەی!

كەچی لەنێو ئەو میللەتە (كەس تێی ناگات) و ئەویش لەداخا بێ دەنگ و خامۆش دەبێت، ئاخر خامۆشبوونی نالی لە داخی ئەو (كەس = كەسان = كۆمەڵگە) یە، كە وەك ئەو دەیەوێ لە شیعرەكانی ناگەن و ڕێزی لێ ناگرن، كە هەر تەنیا (تێگەیشتن) و (ڕێز لێگرتن) نرخی هەرزانی ئەو توحفانەیە : نالی لە زۆر جێگا و بەزۆر شێوە ئەو (گرێ و كۆمەڵگە)یەی خۆی باس كردووە.

حاجی زۆر بە ئاشكرا و ڕوونی هاواریەتی لەدەست ئەو (گرێی كۆمەڵگە)یە هاوارێك نەك هەر تەنیا لە شیعرەكانی حاجی تێناگەن و ڕێز لەخۆی ناگرن! بەڵكە ئەو میللەت و كۆمەڵگەیە ڕێز لە هەموو زانا و ناودارەكانی خۆیان ناگرن! یەكێك لەو ناودارانەش كە زۆر جار حاجی ناوی هێناوە (نالی)یە. لە شاعیریەتیشدا (حاجی) بە هیچ شێوەیەك خۆی لە (نالی) بە كەمتر نەزانیوە، نەك هەر ئەوەندە بەڵكە زۆرجار لەویش تێپەڕیوە.

حاجی دەنووسێ!

**بەجێما ((نالی)) وەكو ناڵێ بەپاش كەوت (كوردی) وەكو گەردێ**
**كە (حاجی) غاری دا ئەسپی لە مەیدانی سوخەندانی**

(٢٠، ل ١٧٤)

هەربۆیە بەلای ئێمەوە! نالی لەگەڵ ئەو هەموو شاعیریەتییەی كە پێی ناسراوە! لە حاجی شاعیر تر نییە! هەروەها (حاجی) یش بەم هەموو كوردایەتییەی كە هەیەتی! ئەویش لە نالی كوردتر نییە! بەڵام، هێندە هەیە، (شاعیر بوون) و (كورد بوون) هەر یەكەیان بە شێوەیەكە كە جیایە لە ئەوی تر. ئەو گرێیەی كە هەیە! گرێی كۆمەڵگەیە! (نالی) بە شێوازی خۆی باس لەو گرێیە دەكات و لە شیعرێكدا دەنووسێ :

**نەوعە ئینسانێ هەیە غەم قووتییە**
**من غەمی خۆم و غەمی عالەم دەخۆم**
**غەم دەڵێ : ((نالی)) كە غەم خواریم نەكا**
**ناعیلاجم من بەنی ئادەم دەخۆم**

(٢٠، ل٢٩٨)

ئەو غەم خواردنەی (نالی) غەم خواردنە لەو کۆمەڵگەیە! غـەمی کۆمەڵگـەش کە لە سنوور دەرچوو!! (گرێی کۆمەڵگە) ی لێ دروست دەبێ! (من غەمی خۆم و غەمی عالەم دەخۆم!!)

حاجی ئەو گرێی کۆمەڵگەی – گرێی میللەتی کوردە زۆربەی شیعرەکانی ئـەو گرێیەی پێوە دیارە، سەیرکە لەم شیعرەدا چۆن هۆیەکانی ئەم گرێیە باس دەکات و دەنووسێ :

**بەیتی من چونکە کەڵکیان دەگرێ**
**لە غەریبی و بێ کەسی دەمـــرێ** (٢٠ / ل١٩٤)

چونکە کۆمەڵگەی کـوردەواری قـەدری – بـەیت = شـیعر = کـوڕ– ی حـاجی ناگرن!! شیعرەکانیش کـە حـاجی لـە سـایەیانەوە بـاوکی کوڕانـە – ئـەوانیش – شـیعر و کوڕەکـانی – حـاجی! وەکـو حـاجی خـۆی لـە غـەریبی و بـێ کەسـی دەمرن!! ئەو قەدر نەگرتنـەش درێـژە دەکێشـێ – تـا ئـەو ڕۆژەی خەڵکەکـە بـە ژێردەستەیی – لەژێر بـاری ڕۆمییـان دەمـرن!! کـە مـردن لـەژێر بـاری ڕۆمییـان، ئەوسا (ئەگەر!!) لە چۆکی خۆیان بدەن و بڵێن :

**ئەم بە ئەو ئەو بە ئەم دەڵێ! کاکـە**
**سەیری قانوونی (حاجی) چەند چاکە**
**هەر چلۆنــی ئیشـــارەتی فەرمـــوو**
**وەك کەرامەت هەمووی هەر وا دەرچوو** (٢٠ / ل٢١٤)

حاجی داخی ئەوە دەخوات، هەتا خۆی زیندووە، ڕێز لە خۆی و شـیعرەکانی ناگرن و بە قسەی ناکەن! کە ئەو چاکەی ئەوانی دەوێ. تا دەفەرموێ :

**قوڕی کام جێ بکەم بەســەر خۆدا**
**ئەمەم لێ بوویتەوە عیللەتی سەودا**
**بەقسەی چاکە دەسـتیان دەگـرم**
**تەرکی ناکەم بە لۆمــە تا دەمــرم** (٢٠، ل١٩٦)

ئـــەو قـــوڕ بەســـەر خـــۆدا کردنـــەی (حـــاجی) لـــە دەســـت میللەتەکـــە و کۆمەڵگەکەیەتی، چـونکە هـەر چـی کـردووە و هەرچـی دەیکـات، بـە زانـایی و بـە

دڵسۆزییە! بەڵام، ئەو کۆمەڵگەیە دڵسۆزی خۆی ناناسی، ئەوەی کە بگوترێ، لەبارەی (گرێی نالی) لای حاجی! ئەوە گرێی شاعیریەتی نییە! بەڵکە گرێی خەڵك و دەسەڵاتە کە ئێمە وای بۆ دەچین! بەهۆی ئەوەی کە پەیوەندی نێوان، نالی و ئەحمەد پاشای بابان، پەیوەندییەکی خۆش بووە و وەك دەڵێن! ئەحمەد پاشای بابان، (نالی) لە ئەستەنبۆڵ لەکاری دەوڵەتی دامەزراندووە، ئەم دامەزراندنەی (نالی) بووەتە هۆی ئەوەی کە جێگا و کارێکی هەبێ و بەو دامەزراندنەش لەنێو خەڵك و دەسەڵات حسابێکی بۆ کراوە! بەڵام، حاجی ئەمەی بۆ نەکراوە ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی کە کارێکی دەوڵەتی نەبێت، کە کار هۆیەکە بۆ ئەوەی چاکتر تێکەڵ کۆمەڵگە ببێ و هەست بە کەسایەتی خۆی بکات — لێرەیە کە حاجی دەنووسێ :

**زاهیرەن بەیتم لە (نالی) و (کوردی) زۆر کەمتر نییە**

**تالعم بەرگەشـتەیە، بەدبەختە بەختم نووسـتووە** (٢٠، ل١٣٧)

بەناوهێنانی (نالی و کوردی) یش، ئەمە هێمایە بۆ ئەو پەیوەندییەی کە هەردوو شاعیر لەگەڵ ئەحمەد پاشای بابانیان هەبووە، ئەم پەیوەندییەش بووەتە هۆی ئەوەی کە ئەحمەد پاشا خۆی و دۆست و ناسیاوانی خۆشی کە دەسەڵاتدارانی شاری (ئەستەنبۆڵ) یشی تێدا بووە، ڕێزیان لەو دوو شاعیرە گرتووە : بەڵام! پێ دەچێ! حاجی ئەو جۆرە پەیوەندییەی لەگەڵ ئەحمەد پاشای باباندا نەبووبێ! وەك ئەوەی کە — بەتایبەت — نالی هەیبووە.

**ناوهێنانی نالی:**

لەو شیعرانەی کە (حاجی) ناوی (نالی) هێناوە، ئەگەر لە ڕووی (زەمەن)ەوە بەدوای مەبەستەکاندا بگەڕێین، ئەوا چەند زەمەنێکی جیا دەردەکەون! کە هەر زەمەنەو باس لە حاڵەتێکی (نالی) دەکات لای (حاجی) کە دەتوانین بەم شێوەیە شیعرەکانی پۆلین بکەین :

یەکەم : زەمەنی وەستاو. لێرە مەبەست ئەوەیە، بەهۆی ئەوەی کە حاجی باسی شیعرەکانی نالی دەکات، نەك نالی خۆی و شاعیریەتی نالی پەیوەند بە زەمەنەوە، بۆیە لەم شیعرانەدا زەمەن وەستاوە.

دووەم : زەمەنی ئێستا. لە ئێستا مەبەست ئێستای بوون و زیندوویێتی (نالی) یە، جا (نالی) نزیك بێت، یان دوور.

سێیەم : زەمەنی ڕابردوو. لە زەمەنی ڕابردووە، باس لە نالی دەکرێ وەك ئەوەی ئێستا نەماوە و باسی زیندوویێتی ڕابردووی نالی دەکات، کە لە ئێستا — ی شیعرەکەدا مردووە.

چوارەم : زەمەنی بینینی نالی. هەرچەندە ئەم زەمەنی بینینە لەگەڵ زەمەنی — ئیسْتا — یەك دەگرێتەوە، بەلاّم! هەموو ئێستایەك مەرج نییە بینین تێدا ڕوویدابێت.

**یەکەم :**

زەمەنی وەستاو :

لەم جۆرە شیعرانەی کە (حاجی) باسی (نالی) دەکات و دەکەونە نێو بازنەی (زەمەنی وەستاو) کە بە (زەمەنی کراوە) ش ناوبراوە ! (حاجی) دوور لە کەسایەتی (نالی) باسی شیعرەکان دەکات، زۆر پەیوەست نییە ! بە زەمەنی زیندوویێتی (نالی) یان زەمەنی دوای مردنی (نالی) و دەکرێ کاتێ حاجی شیعرەکەی نووسیوە، نالی لە ژیاندابێ یان مردووبێت.

نموونە :

**بەیتی (نالی) و بەیتی من گەر تێکەڵی یەکتر دەکەن**
**ئەحمەقی سورەت پەرست جاهیلی مەعنا نەزان.** (٢٠،ل٢٦٣)

***

**زاهیرەن بەیتم لە (نالی) و (کوردی) زۆر کەمتر نییە**
**تالعم بەرگەشتەیە بەد بەختە بەختم نووستووە** (٢٠، ل١٣٧)

***

**سەد قوببەی خەوەرنەق و سەددی سکەندەری**
**ناگاتە بەیتە کاوڵی (نالی) و مەتانەتی** (٢٠، ل١٦٤)

***

**ونی مەکەن وەکو ئاساری (نالی) و (کوردی)**
**لە سەهوی دیدە بپۆشن، گوزەر بکەن لە خەتا** (٢٠، ل٤٥)

لەم نموونانە هـەمووی (حـاجی) باسـی (بـەیت و ئاسـار) دەکـات، کـە دیـارە مەبەست شیعرەکانی (نالی) یە نەك (نالی) (خۆی) تا پەیوەست بیٚ بە زیندوویٚتی و نەمانی (نالی).

دووەم :

زەمەنی ئیٚستا : لەم شیعرانەدا (حاجی) باسی کەسایەتی شـاعیریەتی (نـالی) دەکات، واتـە ئاسـتی شـاعیریەتی (نـالی) مەبەسـتە نـەك شـیعریەتی بـەیت — و — ئاسار — و شیعر — و دەقەکان.

نموونە :

**بەجیٚما (نالی) وەکو ناڵی، بەپاش کەوت (کوردی) وەکو گەردی**
**کە (حاجی) غاری دا ئەسپی لە مەیدانی سوخەندانی** (٢٠، ل١٧٤)

***

**سولەیمانیٚکە (نالی) خاوەنی دیوان و فەرمانە**
**نییە کەس بیٚتە مەیدانی مەگەر (حاجی) خود ئاسایە** (٢٠، ل١٣٢)

***

**(نالی) و خاکی بەبە (حاجی) و کۆیە بە مەسەل**
**عەینیهی (حافیز) و شیرازە (کەلیم) و هەمەدان** (٢٠،ل٩٣)

لەم نموونانەی سەرەوە، حاجی ڕاستەوخۆ ناوی شاعیر (نالی) هیٚناوە، بـەلاّم، لەم نموونانەی خوارەوە بە شیٚوەیەکی تر باسی شاعیر دەکات.

**ئەی عوتارید لە دەرت خادیمی سەججادە بەشان**
**وەی لە کۆی فوحەسادا قەڵەمت سنجقە شان**
**(حاجی) قادر نییە بەیتیٚکی وەکو ئیٚوە بڵیٚ**
**ئەسپی کۆن زەحمەتە دەرچیٚ لەگەڵ ئاهوو ڕەوەشان** (٢٠،ل٢٦٢)

***

**لەعەینی لەعلی کانی خەتتی سەبزی بوو بە میوانی**

**نەنازێ با خضر ئیتر کە مەشهوورە بە حەیوانی** (٢٠،ل١٧٥)

ناوهێنانی (حاجی) بۆ (نالی) لەم دوو نموونەی دوایی (زەمەنی ئێستا) زۆرتر بە شێوەی (ئامرازی کەسی) یە وەك : دەرت= دەری تۆ. قەڵەمت= قەڵەمی تۆ. ئێوە. ئەمەی دواییان بە لێکچوواندنی خۆی و (نالی)یە بە (ئەسپی کۆن) و (ئاهوو رەوەشان) واتە وەك (ئاسکی تیژڕۆ و خێرا و سرك بێت) (٢٦، ل٣٢)

سێیەم :

زەمەنی ڕابردوو : لەم زەمەنەدا (حاجی قادر) وا باسی نالی دەکات کە مردووە و نەماوە. نەمانەکەشی لە نێوان (ڕابردووی نزیك) و (ڕابردووی دوور)دایە.

**ئەگەر (نالی) بوو لێرە نالی ئاوێت**

**دڵی (کوردی) بووە گەردە بەر پێت.** (٢٠،ل٢٤)

***

لەم شیعرەدا (حاجی) ناوی (نالی) دێنێ و ئامرازی (بوون – بوو) ی ڕابردووی دەداتە پاڵ و دەڵێ : لێرە ناڵی ئاوێت. ناڵ ئاوێتن. بە ئەسپ دەگوترێ. کاتی لەغار بکەوێ و بمرێ. کە حاجی لە بە ئەسپ چوواندنی (نالی) مەبەستی توانای زۆری – نالییە لەم شیعرەدا وەك توانای زۆری غاردانی ئەسپ، بەڵام! ئەو ئەسپە لێرە – واتە لە ئەستەنبۆڵ – ناڵی ئاوێت و مرد. مردنەکەش لەم نزیکانە بوو. نزیك لە زەمەنی نووسینی شیعرەکە.

**ئەو کە نۆشی شەڕابەکی تاڵی**

**(نالی) لەو عەرسەدا بووە تالی** (٢٠ل٢١٧)

لەم شیعرەدا (حاجی) بە (ئەو) ئامرازی کەسی غائیب، باسی (نالی) دەکات و دەڵێ : شەڕابەکی تاڵی نۆشی – مەبەستیەتی بڵێ : ژیانێکی ناخۆش و تاڵ ژیا و ئەم ناخۆشی و تاڵییە کوشتی : لە نیوە دێری دووەمیشدا کە دەڵێ : (نالی) لەو عەرسەدا بووە (تالی) مەبەستی ئەوەیە، نالی لەو مەیدانی عەشق و دڵدارییەدا وەك ئەسپ ناڵی باوێت لەغار دەکەوێ. عاشقیش لە مەیداندا دواکەوت و بووە کەسی سێیەم و چوارەم. ئەوانەی لەم دواییەدا مردن! کە دیارە پێش (نالی) کەسانی

ناوداری تر مردوون و حاجی ئەوانیشی ناسیوە. بۆیە مردنی (نالی) لەگەڵ مردنی ئەوان کۆدەکاتەوە هەر لێرە و لەگەڵ ئەم شیعرە، حاجی هەست بەوە دەکات کە (کاتێ)کت زانی ئەویش هەڵەنگووت و مرد و بووە بە یەکێکی تر لەو چوار پێنج کەسەی کە (حاجی) مردنەکەیانی بینیوە. دەنووسێ :

**منیش کاتێ دەزانم پێم هەڵەنگووت**
**ئەجەل بای سەرسەرە ئێمەش پەڕووپووت** (٢٠،ل٢٤)

***

**(نالی) ئوستادەکی گەلێ چا بوو**
**خزری ئابی حەیاتی مەعنا بوو** (٢٠،ل٢١٧)

لێرەش (حاجی) بە (بوو) ی زەمەنی ڕابردوو باسی (نالی) دەکات و بە ناڕاستەوخۆ دەنووسێ : نالی هەرچەندە کە مردووە، بەلأم! لە زەمەنی خۆی — ئوستادێکی گەلێ چاکی شیعر و نووسین بوو. مانای شیعرەکانی هەمووی وەك ئاوی حەیات نەمر بوون! هەرچەندە (نالی) بۆ خۆی وەکو (کەس) مردووە! بەلأم. مانا نەمرەکانی شیعرەکانی، کە ئاوی حەیاتی مەعنایان خواردووتەوە نامرن! کە شیعرەکانی (نالی) شیعری نەمربن! ئەوا خاوەنەکەشی کە ئوستادەکی گەلێ چا بوو! لە شیعر و نووسیندا ئەویش لە سایەی شیعرە نەمرەکانی! نەمرە!!

لە بەسەرکردنەوەی ئەم ناو هێنانەی (نالی) لەلایەن (حاجی) یەوە، مانای ئاگاداری و ناسینی شیعرەکانی تێدابوو، هەروەها باسی ئەوە دەکات کە (نالی) یشی دیوە! دیسان لە هەندێك لەو ناوهێنانە باسی مردن و لەدەستچوونی نالی دەکات.

## شیعری بەڵگە و مەبەست:

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە ئەو شیعرەی (حاجی) شەنوکەو بکەین، کە ئێمە وەڵامی پرسیاری ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە لەوێدا دەبینین! بەڵام، پێش ئەوەی ناوەڕۆکی شیعرەکە باس بکەین! بابزانین هەندێك لە لێکۆڵەران چۆن باسی ئەم شیعرەیان کردووە!

ئەو شیعرەی کە وەڵامی پرسیارە ناونیشـانەکەی لـەنێو خۆیـدا هـەڵگرتووە ! شیعری (ئاسمانی بێ ستوون) ی (حاجی قادر)ە.

چەند بەڕێزێك بەشێوەی جیا جیا باسی ئەم شیعرەیان کـردووە، ئێمـەش بـە کورتی چەند باسکردنێکیان بەسەر دەکەینەوە.

**دکتۆر مارف خەزنەدار :**

لـە بـەرگی چـوارەمی (مێـژووی ئـەدەبی کـوردی)دا دکتـۆر مـارف خەزنـەدار لەباسی حاجی و نالی دا دەنووسێ : (لە شیعرێکی دیکەیدا حاجی بەراورد لە نێوان خۆی و نالی دەکا :

**ئیتیفاقەن ئیتیفاقم بوو لەگەڵ (نالی) وەکو**

**تاجیر و گەوهەر لەگەڵ گەوهەر فرۆش و موشتەری**

لەم شیعرەدا حاجی دەڵێ : پێوەندی نێوان من و نالی لـە دانـانی شـیعرا وەك پەیوەندی نێوان گەوهەر فرۆش و کڕیار وایە، واتـە ئـەوان هـەردوویان لـە گەوهـەر دەگەن، ئێمەش من و نالی هەردووکمان لە شیعر دەگەین) (٨،ل١٣٧)

دکتۆر مـارف خەزنـەدار، ئـەم شـیعرەی حـاجی وا لێکداوەتـەوە، کـە حـاجی دەیەوێت پێکگرتنێك و بەراوردێك لەنێوان خۆی و نالی دا بکـات، هـەردووکیان وەك یەك شیعر – گەوهەر – ناسن.

**محەمەد عەلی قەرەداغی :**

هەرچـی مامۆسـتا محەمـەد عـەلی قەرەداغییـە، مانـای تـەواوی شـیعرەکە بـۆ مەبەستێکی تر بەکار دێنێ و دەنووسێ! (من لێرە گومانم بـۆ ئـەوە دەچـێت ئـەو غەزەلانەی کە (نـالی) پیشـانی حـاجی دەدات لـەم غەزەلانـە بـن و بـەڵکو دەسـتی قەدەر لە سووچێکدا پاراستبی..) (٩،ل٣٩١)

مامۆستا قـەرەداغی باسـی ئـەوە دەکـات، ئـەو شـیعرانەی کـە نـالی پیشـانی حاجی داوە ! ئەوانە نین کە ئێستا لەبـەر دەسـتن ! ! گومـانیش بـۆ ئـەوە دەچـێ دەستی قەدەر لە سووچێکدا پاراستبی ! واتە لە پشتی قسەکانی مامۆسـتا مانـای ئەوە هەیـە. کـە حـاجی و نـالی یـەکتریان دیـوە ! چـونکە نـالی غەزەلـەکانی خـۆی

پیشانی حاجی داوە! بەڵام، مامۆستا بەدوای غەزەلەکاندا دەگەڕێ، نەك یەکتر بینینی حاجی و نالی.

**دکتۆر عەبدوڵڵا خدر مەولود :**

دکتۆر عەبدوڵڵا خدر مەولود لە هەمووان وردتر و پڕ سەرنجتر لەبارەی ئەم شیعرەوە دواوە و باسی پەیوەندی نێوان (حاجی) و (نالی) کردووە. دکتۆر عەبدوڵڵا خدر دەنووسێ! (ئایا ئەو پەیوەندییەی نێوان حاجی و نالی تەنیا دیوان و شیعرەکانی نالی بووینە ؟ دەبێ نالی حاجی نەدیتبێ و پەیوەندییەکی کوردانە و دۆستانە یا شاگرد و مامۆستایانەیان لەنێوان نەبووبێت ؟) (٥،ل٦٥–٦٦) دکتۆر عەبدوڵڵا بەم پرسیارە وردانە دەست پێدەکات و دواجار دەنووسێ : (ئەم پرسیار و وردە سەرنجانە بۆ دواڕۆژ بەجێ دەهێڵین و بە هیوای ئەو کاتەی گۆڕەپان و شەقامەکانی ئەدەبیمان بە گلۆپی گەورە و ڕەنگاو ڕەنگ ڕووناکتر و ڕازاوەتر دەبێت.) (٥، ل٦٦)

لە بەردەوامی باسکردنی شیعرەکانی (حاجی) لە باسی (نالی) دا، کە دکتۆر عەبدوڵڵا خدر مەولود دەگاتە ئەم شیعرەی (ئیتیفاقەن ئیتیفاقم بوو)

دەنووسێ : (ئەم دێڕە بە ڕەمز و لوغز چنراوە، هەر چۆنی لێکدەیتەوە هێشتا زۆر شت یا زۆر گرێ بە نەکراوەیی دەمێنێتەوە.) (٥، ل٧١) دکتۆر لە نێوان پرسیاری ڕەوا و گومانی بەردەوامدا دێت و دەچێ و جارێکی تر دەنووسێ : (لەوانەیە هەر لەو گۆڕەی بەخۆی بڵێ ئیتیفاقم لەگەڵ نالی بوو) مەبەستی دکتۆر ئەوەیە کە حاجی لەخۆوە ئەم (ئیتیفاقم بوو)ەی هێنابێتە نێو شیعرەکەی ؟! تا جارێکی تر دەنووسێ! (دەشتوانین پێ لەسەر ئەوە دابگرین کە ئیتیفاقی لەگەڵ نالی بووە ئەو تەئکیدە دیتنی حاجی بۆ نالی لێ دەفامرێتەوە) (٥،ل٧١) بەهۆی ئەوەی ئەو مامۆستا و لێکۆڵەرە بەڕێزانە، یەك دێر و بۆ یەك مەبەست، ئەم شیعرەی (حاجی)یان خوێندووتەوە، نەگەیشتوونەتە ئەو مەبەستەی کە لە نێو تەواوی شیعرەکەدا بەرچاوە و هەیە! دکتۆر عەبدوڵڵا خدر مەولود، سەرەتا بە پرسیاری باش دەستی پێکردووە، بەڵام دوایی، بە هیوا و گومان کۆتایی پێ هێناوە.

**دەقی شیعرەکە:**

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە دەقی ئەو شیعرەی (حاجی) بەتەواوی بنووسینەوە، کە وەڵامی پرسیارە سەرەکییەکەی ئەم لێکۆڵینەوەیە لەنێو ئەو شیعرەدا دەست دەکەوێ!.

**ئاسمانی بێ ستوون**

**ئاسمانی (بێ ستوون) وەك (خوسرەوی) میهری هەڵات**
**هیندی شەو تێك چوو شکا وەك مووی زەنگی لەشکری**
**ئیتیفاقەن ئیتیفاقم بوو لەگەڵ (نالی) وەکوو**
**تاجر و گەوهەر لەگەڵ گەوهەر فرۆش و موشتەری**
**چەند غەزەل بوون تازە بافتی کارگاهی موشتەری**
**تاجیر و گەوهەر مەتاع و شامی غوربەت تاجیری**
**یەك یەکی هێنایە دەر، گەردی کەسادی لێ تەکاند**
**دایە من فەرمووی درێغا کەس نییە سەودا گەری**
**دەست بەدەستی خستم و هەم دایە بەربا مەجمەعم**
**(ئاسەفی) من بای لە جەمعی تۆ کە (حاجی)** قادری (٢٠، ل١٥١–١٥٢)

سەرەتا خوێندنەوەیەکی ئەدەبی و شیکردنەوەیەکی تایبەت بۆ ئەم شیعرە دەنووسین، دواجار مەبەستەکە لە چەند خاڵێکی کورتدا کۆدەکەینەوە.

**شیکردنەوەیەکی تایبەت :**

لە ئاسمانی بێ ستوونی (بێستون) من – حاجی – بە بینینی (نالی) وەك پاشا (خوسرەوی) پەرویز تاجی زێڕینی پاشایەتیم لەسەر نا و خۆرم دەرکەوت و – میهرم هەڵات و بەختم کرایەوە، وەك جەمشید تاجی زێڕ و گەوهەری گەشایەوە! جیهانی بە تیشکی ئەم زێڕ و گەوهەرە، ڕووناك بووەوە و ڕازایەوە.

بەم جیهان ڕووناك بوونەوە، لەشکری تاریکی، تاریکی – بێ (نالی) هێندی شەو شکا تێکچوو، بە ناڵەو هاواری زەنگی لەشکر شکان!! ڕووناکی بە یەکتر بینین بڵاو بووەوە.. دەنگی دایەوە.

بە ڕێککەوت! وا ڕێك کەوت کە من (حاجی) لەگەڵ (نالی) شاعیر ڕێککەوتم. چۆن بازرگان – تاجر – و گەوهەر پێکەوە ڕێکن! لە هەر کوێ گەوهەر هەبێ! بازرگانی گەوهەر کڕ هەیە. لە کوێش تاجیری گەوهەر فرۆش هەبێ، لەوێ تاجری گەوهەر کڕ هەیە. (من) یش (حاجی) عاشقی شیعر – گەوهەر – ی (نالی) تاجری گەوهەر کڕم! (نالی) یش خاوەنی گەوهەرە و – عومرێکە توحفە فرۆشە! هەردووکمان من و نالی بە دڵسۆزی و خۆشەویستی و پێویست بە یەکتر گەیشتینە یەك و ڕێککەوتین.

چەند غەزەلێکی تازە دانراو، چەند پارچەیەکی بە نرخی تازە چنراو، چنراوی کارگەیەکی بەناو، چەند شیعرێکی بەرزی (نالی) تازە نووسراو، موشتەری ئەمانە – بازرگانی خاوەن دراو!! ماڵی فرۆشتن – مەتاع – گەوهەری شیعر نەبینراو، موشتەری – بازرگانی کڕیار – حاجی – شیعر ناس و ڕێز لە شیعر گر و ناسراو، فرۆشیار – تاجیر (نالی) لە ئاخیری تەمەن و تازە لە شام هاتووەوە و غەریبی غوربەتی ئاوارەیی و (دەربەدەر و دەرکراو).

بازرگانی فرۆشیار – نالی – شاعیر یەك یەك گەوهەری بە نرخ و پارچە و مسوەدەی شیعرە جوانەکانی لە – کۆنە باوڵێك [٩ *] – دەرهێناو تۆزی ڕۆژگاری لەسەر لادا و گەردی کەسادی لێ تەکاند، ئەو (نالی) دایە دەست من (حاجی) و فەرمووی : ئەمانە جگەر گۆشەی منن و بە ئەمانەتەوە دەیاندەمە دەست ئێوە! لەم سەردەمی – پیری و فانی – یە دا بەتەنیا ئێوە شك دەبەم! بەداخەوە نالی – بەیتی ڕەدیفی کەس نییە و کەس نییە نرخی ئەم شیعرانە بزانی و سەوداگەریان بێت و بیانپارێزێ.

نالی بە دەستی پیرۆزی خۆی – کە گەدایەکی دەوڵەمەندە – غەزەلە تازە چنراوەکان و شیعرە تازە دانراوەکانی خۆی، گوتی : بۆ ئەوەی خەڵقی لەمنی نەدزن! ئەو گەوهەرە بەنرخانەی دایە دەستە من! حاجی – و منی خستە بەر بارێکی گران و هەموو مەجمەع – ی منی دایە بەر بای بەرپرسیاریەتییەکی گران و پیرۆز، بەداخەوە! ئاخێکی – ئاسەفی – سەرەمەرگی هەڵکێشا و چۆن یەعقوب بۆ یوسف چاوی لێڵ بوو نالی بۆ شیعر کوڕ – ە کانی تانە پەڕیە سەرچاوی و فەرمووی : تۆ (حاجی!) ئەمەت لەدەست دێ! کە بتوانی شیعرەکانی نالی، ئەو

شیعرانەی کە هێشتا کەس نەیدیون و من لە سەروبەندی مردنم : حاجی تۆ قـادری و دەتوانی : بیانپارێزە.

**ماناى تەواوی شیعرەکەی حاجی لە چەند خاڵێکی کورتدا :**

خاڵبەندکردنی ماناکان :

یەکەم : ئەم دێرە وەك سەرەتا و پێشەکییەك وایە بـۆ ڕووداو و هەواڵەکـە بـە خۆشی بینینی نالی دەست پێدەکات، حـاجی دەڵـێ : شـەوە زەنگـی بـێ هـەواڵی (نالی)م بە خۆری بینینی (نالی) شکا و تێکچوو.

دووەم : بەڕێککەوت (نالی)م بینی و هەردووکمان لەسەر ئەوە ڕێك کەوتین کە چەند شیعرێکی بڵاونەکراوەی هەیە بیداتە من و بۆی هەڵبگرم.

سـێیەم :چـەند غـەزەلێکی تـازە دانـراوی خـۆی وەك گەوهـەری گرانبـەهای کۆتایی تەمەنی بەمیرات دایە من.

چوارەم : یەك یەك ئەو غەزەلە تازە دانراوانەی دەرهێنا و تـۆزی کەسـادی لێ داتەکاند و دایە دەست من – حاجی – و گوتی: حەیف کەس نییە – جگـە لـە تـۆ – نرخیان بزانێ.

پێنجەم : (نالی) بە دەستی خۆی شیعرەکانی دایە دەست مـن و منـی خسـتە بەرامبـەر بەرپرسـیاریەتێکی گـەورە و ئـاخێکی هەڵکێشـا وەك ئـاخی یـەعقوب پێغەمبـەر بـۆ یوسـفی کـوڕی. گـوتی : مـن دەمـرم! تـۆ دەتـوانی ئـەم شـیعرانە بپـارێزی. ئـەم دێـرە کۆتـایی هـەواڵی پـیری و نزیـك مـەرگ و کۆتـایی (نـالی) تێدا دەخوێندرێتەوە.

لەم شیعرەدا حاجی قادر بە (کامیرا) ی شیعر (هەواڵ) ی بینینی (نالی) وێنـە دەکێشـێ و بـە (زمـان) ی شـیعر (دەنـگ) ی گفتوگـۆی خـۆی و نـالی لـە کـاتی بینینەکەدا تۆمار دەکات و بۆ مێژوو لە (ڕۆژنامە) ی دیوانەکەیدا بڵاوی دەکاتەوە.

## پێش ئەنجام:

ئێستا ئێمە لەبەردەم دەقێکی گرنگی مێژووییداین، کە چۆن کەس گومانی لەوە نییە! ئەم دەقە شیعرە شیعری (حاجی قادر)ە ئاواش نابی کەس گومانی لەوەش هەبێ! کە ناوەڕۆکی شیعرەکە هەواڵی یەکتر بینینی (حاجی قادر و نالی شارەزووری)مان بۆ باس دەکات، لە شاری ئەستەنبۆڵ و لە سەروبەندی پیری و ڕۆژ و مانگەکانی پێش مردنی (نالی). چۆن ئەگەر شیعرێکی تری حاجی لە مانایەك زیاتر لەنێو خۆیدا هەڵبگرێ! ئەوا ئەم شیعرە لە مانای بینینی (نالی) و شیعر لێ وەرگرتن زیاتر هیچ مانایەکی تری بۆ ناشێ. حاجی لەم شیعرەدا زۆر هونەرمەندانە، بە هونەرەکانی شیعر (کامیرا)ی وێنە گرتن و ئامێری (تۆمارکردن)ی دەنگی بەکار هێناوە و ڕاستیی ڕوودا و و هەواڵەکەی بۆ تۆمار کردووین.

لە پەراوێزی ئەم شیعرە و پەیوەندییەکانی (حاجی و نالی)دا، لە جۆری شیعرەکانی (حاجی) کە پڕن لە باسی (زیندوو و مردووان) ئەو زیندوو مردووانەی حاجی بە پێویستی زانیوە باسیان بکات و لەپاش مردنیان شیعریان بۆ بنووسێ! ئەوا دەگەینە ئەو قەناعەتەش کە (حاجی قادر) دەبێ! شیعری بۆ مەرگی (نالی)یش نووسیبێ! شیعرێکی تایبەت و شیاو، شیعرێك لە (حاجی) بوەشێتەوە و شایستەی گەورەیی و مەزنی (نالی) بێت! حاجی قادرێکی ئاوارە و دەربەدەر! (نالی)یەکی ئاوارە و دەربەدەر! مردنێکی لە دوورە وڵات، گۆڕێکی گۆڕ غەریب!! دەبێ (حاجی) چ شینێکی بۆ (نالی) گێڕابێ و چۆنی لاواندبێتەوە! چۆن کەفوکوڵی دڵی خۆی داڕژتبێ!؟ چی بۆ کورد گوتبێ و چی بە کورد گوتبێ!؟ ئەو — میهرەی کە هەڵهات و لەشکری شەوی شکاند و دنیای بۆ (حاجی) ڕووناك کردەوە!! بەمردنی ئەو میهرە! بە مردنی (نالی) چ تاریکاییەك داهاتبێ و چۆن و چەند دنیای ئاوارەیی بۆ (حاجی) تاریك کردۆتەوە. ئەو ڕۆژەی کە ئەسپی (نالی) ناڵی ئاوێت!! دەبێ ڕۆژی (حاجی) لە کام لا هەڵهاتبێ و لەکوێی ئاوا بووبێ!؟ (حاجی قادر)ێك ئەوەندە ناوی (نالی) هێنابێ و ئەوەندە بە شیعرەکانی سەرسام بووبێ! لە کاتی مردنیدا و لە غوربەتی ئاوارەییدا، لە شاری (قوستەنتین) و لە (ڕۆما) ی دوورە وڵات، بەم هەموو هوشیاری و بەم هەموو هەست ناسکیەوە، مردنی (نالی) دەبێ چ ئیحساسێکی لای (حاجی) دروست کردبێ ؟! بێ شك حاجی لە مردنی (نالی)دا شاکارێکی نووسیوە! شاکارێك لە (وتم بە بەختی خەواڵوو..) و (فەلەك بە تیر و کەمانی) بەرزتر نەبووبێ! هەرگیز لە خوارتر نەبووە! بە دڵنیاییەوە دەینووسین! (حاجی) بۆ مەرگی (نالی) شیعری نووسیوە و لە شیعرەکەشدا. بە هونەری (ئەبجەد)[*10] ساڵی مەرگی (نالی) تۆمار کردووە! بەم هیوایەی ڕۆژێ بێت، ئەم شیعرە و تەواوی شیعر و نووسینەکانی تری (نالی) و (حاجی) بدۆزرێتەوە.

## ئەنجام :

١- لە خوێندنەوەی وردی ژیان و بەرهەمی (حاجی قادر) دەگەینە ئەو ڕایەی کە حاجی قادر، وەختێ لە وڵات بووە، ناوبانگی نالی بیستووە و شیعری خوێندووتەوە و بە دووریشی نازانین کە (نالی) یشی بینیبێ، چونکە لە نێوان ساڵانی (١٨٣٠ تا ١٨٤٠) دا (نالی) شاعیرێکی ناودار و تێکەڵ بە بنەماڵە و دەسەڵاتی بابان بووە و (حاجی) لە سەرەتای شاعیریەتیدا بووە.

٢- حاجی و نالی، هەردووکیان ئاوارەی شاری ئەستەنبوڵ بوون و هەریەکەشیان چەند ساڵێك لەو شارەدا نیشتەجێ بوونە! جا بێ شك یەکتریان بینیوە، زۆرتریش بۆ ئەوە دەچێ، ئەم یەکتر بینینە کەمێك پێش مردنی (نالی) بووبێ.

٣- لە چەند شیعرێکدا کە (حاجی) باسی (نالی) دەکات، باسکردنەکان مانای ئەوە دەدەن، کە ئەو وەختەی حاجی ئەم شیعرانەی نووسیوە / (نالی) وەفاتی کردووە.

٤- شیعری (ئاسمانی بێستوون) شیعرێکە، حاجی لەم شیعرەدا زۆر بە ڕوونی باسی بینینی خۆی دەکات لەگەڵ (نالی) و چۆن ؟ چەند شیعرێکی لە (نالی) وەرگرتووە و (نالی) گوتوویەتی هەر تۆ — قادری — دەتوانی ئەم شیعرانە بپارێزی.

٥- لە دواییدا، ئێمە لەم لێکۆڵینەوەیدا دەگەینە ئەو قەناعەتەی کە حاجی ئاگاداری مەرگی (نالی) بووە و وەك چۆن بۆ مردنی کەیفی شیعرێکی جوان و گرنگی نووسیوە و ساڵی مردنەکەشی تۆمار کردووە! ئاواش شیعرێکی بۆ (نالی) یش نووسیوە و ساڵی مردنیشی تۆمار کردووە.

## پێشنیاز :

١- بەهۆی ئەوەی (عوسمانلی)یەکان ئەرشیفێکی دەوڵەمەندیان بەجێ هێشتووە و لەنێو ئەو ئەرشیفەشدا مێژوو و کلتوور و ئەدەبی ئێمە و دەنگوباسی ناودارە ئاوارەکانمان لەوێدا هەن، بەپێویستی دەزانین، کە وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی، لە گەنجە لێهاتوو بە تواناکان پسپۆڕی تایبەت پێبگەیەنێ کە زمانی — تورکی و فارسی و عەرەبی — بزانن و لێکۆڵینەوە لەنێو ئەم کلتوورە دەوڵەمەندەدا بکەن و بەدوای بەرهەمی نووسەر و شاعیرەکانماندا بگەڕێن.

٢- وەزارەت ساڵانە، چەند گەنج و لێکۆڵەری لێهاتوو هان بدات و تەرخان بکات، بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوە لەسەر ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ئەستەنبوڵ بە زمانەکانی تورکی و عەرەبی بکەن و نووسینی زۆر و دیوانە شیعر و هەواڵی گرینگیان تێدایە، کە بەرهەمی نووسەرانی کوردن.

## پەراوێز و تێبینییەکان :

(١*) – چ لە نێو دیوانە شیعر و چ لەو باسانەی، کە باسی (نالی و حاجی) دەکەن، هێمای ئەوە زۆرە کە ئەم دوو شاعیرە هەم شیعری زۆرتریان هەبووە و هەم کتێب و نووسینی تر.

(٢*) – لەم دواییەدا (بنکەی ژین) کتێبی (مناظر الانشاء)ی نووسەر (محمود الگیلانی) کە ناسراوە بە (خواجه عمادالدین گاوان) چاپ و بڵاو کردەوە کە (تقدیم وشرح الأبیات العربیة بالفارسیة) بۆ ئەم کتێبە لەلایەن (الملا خضر النالی الشهرزوري)یەوە کراوە، هەروەها (تحقیق ومراجعة وتلخیص)ەکەی بەڕێز (الدکتور صباح محمد البرزنجي) کردوویەتی. لەم پێشەکییەدا (نالی) جارێکی تر زانایی و لێهاتوویی و زمانزانی خۆی لە ئاستێکی یەکجار بەرز دەخاتە بەرچاو. سوپاس بۆ (بنکەی ژین) و (دکتۆر سەباح بەرزنجی) و هەموو ئەو بەڕێزانەی بوونە هۆی دۆزینەوە و ساغکردنەوە و چاپکردنی ئەم بەرهەمە گرنگ و بەنرخە.

(٣*) – لەڕاستیدا بۆ بوون و مردنی نالی و حاجی و هەموو نووسەرانی تر، پێویستە ڕۆژ و مانگ و ساڵی لەدایکبوون و مردنیان و شوێنی لەدایکبوون و مردن و گۆڕستانی کە لێی نێژراون بدۆزرێنەوە، حاجی ئەگەر ساڵی مردنەکەی زانراوە، ڕۆژ و مانگی مردنەکەی دیار نییە!

(٤*) – لەبارەی ناوهێنانی (نالی) لەلایەن (حاجی)یەوە، لێکۆڵەران دکتۆر مارف خەزنەدار و دکتۆر عەبدوڵڵا خدر مەولود و مامۆستا ڕێبوار سیوەیلی هەریەکە و ژمارەیەکیان نووسیوە! دکتۆر مارف (١٣) جار، عەبدوڵڵا خدر مەولود (١٣) جار و مامۆستا ڕێبوار (١١) جار.

(٥*) – ئەم وەسفکردنەی ئەحمەد پاشای بابان بۆ (نالی) بە (سەرۆکی زمانزانانی کوردستان) ڕێگای ئەوەمان بۆ خۆش دەکات، کە بڵێین : لە سەردەمی بابانەکان و بەتایبەت سەردەمی ئەحمەد پاشا – بابانەکان – لێژنە! یان ئەنجومەنی شاعیران و زمانزانانی کوردستانیان هەبووە. ئەمەش بۆخۆی لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی دەوێت.

(٦ *) – لەم جۆرە شیعرانەی حاجی، کە باس لە (رووداو) و (چیرۆك) و (هەواڵ) ی رۆژانە دەکات، رەگەزەکانی هەواڵ و چیرۆك و گێڕانەەی رووداو زۆر بە روونی لە نێو شیعرەکاندا بەرچاوە.

(٧ *) – بۆ باسی هاوڕێیەتی و پەیوەندی بنەماڵەی جەلی زادە و (حاجی) سەیری ٣ بەرگەکەی (حاجی قادری کۆیی) ی مەسعود محەمەد بکە.

(٨ *) لەگریی کۆمەڵگە، ئێمە مەبەستمان ئەوەیە کە (نالی) و (حاجی) دوو شاعیری دڵسۆز و وشیاری ئەو رۆژگارە بوون و ئاگاداری رووداوەکانی جیهان بوون و شارەزای کۆمەڵگەی خۆیانن هەربۆیە (خەمیان لێ دەخواردن و خەمیان بۆ دەخواردن)، نموونەی ئەم خەم بۆ خواردن و خەم لێ خواردنەش لە دیوانی ئەم دوو شاعیرە زۆرە.

(٩ *)– دەگێڕنەوە کە وەختێ (نالی) وەفاتی کردووە! شیعر و نووسینەکانی لەناو باولێك بووە و کوردەکان داوایان کردووە! ژنە ترکمانەکەی نەیداوە و بە ترکی گوتوویەتی : ئەفەندی هیچی لێ بەجێ نەماوە!!

(١٠ *) – حاجی لە باسی مەرگی کەیفی و کەسانی تریش، بە شێوەی هونەری کۆن، بە هونەری (پیت) بەرامبەر بە (ژمارە)، ساڵی مردنەکانیانی تۆمار کردووە! هەر (حاجی قادر)یشە ساڵی مەرگی کەیفی بۆ بە دروستی نووسیوین و ئێستا پێویستی بە لێکۆڵینەوەی پڕ لە سەرێشە نییە.

(١١ *) – سەدات ئولوگانای لێکۆڵەر ساڵی ٢٠١١ لە ئاژانسی دجلە هەواڵی دۆزینەوەی بەرهەمێکی تری (ئەحمەدی خانی) ڕاگەیاند.

(١٢*) – بەڕێز رەفیق سالح لێکۆڵەر و سەرۆکی (بنکەی ژین) لە سلێمانی لە ژمارە (٣٠٠) دووشەممە ٢٠١٢/٢/١٣ رۆژنامەی (چاودێر) باسی دۆزینەوەی بەرهەمێکی تری (نالی)ی شاعیر دەکات و باسی سێ بەرهەمی دیکەش دەکات کە بەدوایاندا دەگەڕێن.

## سەرچاوەکان :

**کتێبە کوردییەکان:**


١- ڕێبوار سیوەیلی : هاوکات و هاو شوناسی. دەزگەها سپی ڕێز چاپ و وەشانی، چاپی یەکەم، دهۆك، ٢٠٠٤.

٢- عفیف عبدالفتاح طبارە : لەگەڵ پێغەمبەران، وەرگێڕانی، کاوە هاوراز، بەشی یەکەم و دووەم، چاپی یەکەم. هەولێر ٢٠٠٥.

٣- سدیق بۆرەکەیی : مێژووی وێژەی کوردی – بەرگی دووەم، چاپی دووەم، دەزگای چاپ و پەخشی ئاراس. هەولێر – ٢٠٠٨.

٤- سەردار حەمید میران و کەریم شارەزا : دیوانی حاجی قادری کۆیی، سەعید کەرەمی – انتشارات کردستان. چاپی یەکەم. (سنه) ئیران – ١٣٩٠.

٥- عەبدوڵڵا خدر مەولود (دکتور) الا یا ایها الساقی و دە بابەتی تر، چاپخانەی هاوسەر – هەولێر – ٢٠٠١.

٦- عەبدوڵڵا حەداد (دکتۆر) : نالی لە دەرەوەی کوردستاندا. چاپی یەکەم – ٢٠٠٠.

٧- عەبدوالخالق مەعرووف : دیوانی نالی و کێ ڕاستە. پڕۆژەی (١٠٠) کتێبی کوردی – بەغدا – ١٩٨٤.

٨- مارف خەزنەدار (پڕۆفیسۆر – دکتۆر) : مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی چوارەم. چاپی دووەم، دەزگای چاپ و پەخشی ئاراس، هەولێر ٢٠١٠.

٩- م. عەلی : نالی هەر لە لوتکەدایە. ئامادەکردن. چاپخانە : دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی – ٢٠٠٩.

١٠- محەمەد عەلی قەرەداغی : بەرکوتێك لە خەرمانی شیعری سالم. دەزگای چاپ و پەخشی ئاراس. هەولێر – ٢٠١٠

١١- محەمەد عەلی قەرەداغی : بووژانەوەی مێژووی زانایانی کورد بەرگی نۆیەم – چاپی یەکەم- دەزگای چاپ و پەخشی ئاراس. هەولێر – ٢٠١٠

١٢- محەمەد عەلی قەرەداغی : بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد، بەرگی یەکەم. چاپخانەی (ومیض) بغداد – ١٩٩٨.

١٣- محەمەدی مەلا کەریم : لە پێناوی ئەدەب و لە پێناوی (نالی) دا. چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا ١٩٧٩.

١٤- محەمەدی مەلا کەریم. حاجی قادری کۆیی، شاعیری قۆناغێکی نوێیە لەژیانی نەتەوەی کورد، چاپخانەی النجاح- بەغدا ١٩٧٤.

١٥- محەمەد مستەفا (حەمە بۆر) : دیوانی کوردی. بەرگی یەکەم. دەزگای چاپ و پەخشی ئاراس. هەولێر - ٢٠١٠.
١٦- مەلا عەبدولکەریمی مدەرس : دیوانی نالی، لە بلاّو کراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد. بەغدا - ١٩٧٦.
١٧- مەسعود محەمەد : چەپکێك لە گولزاری نالی. لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد. بەغدا - ١٩٧٦.
١٨- مەسعود محەمەد : حاجی قادری کۆیی، کۆڕی زانیاری کورد - بەغدا - ١٩٧٦.
١٩- نەجمەدین جەباری (دکتۆر) : کۆمەڵە وتاری یەکەمین کۆڕی نێو نەتەوەیی ئەدەبی کوردی لە زانستگای کوردستان، نڤیساران : فەخرەدین ئامێدیان، هەورامان بەهرامی. چاپی یەکەم. زانستگای کوردستان، ئێران - ٢٠١٠.
٢٠- هێرش بێتووشی : دیوانی حاجی قادری کۆیی، ناوەندی چاپ و بلاّوکردنەوەی سەمیمی - سەردەشت، ئێران - ٢٠٠٧.

**کتێبی عەرەبی:**

٢١- جەمال نەبەز : الأمیر الكردي : ترجمة : فخری سلاحشور، دار ئاراس للطباعة والنشر، الطبعة الثانیة، اربیل - ٢٠٠٣.

**فەرهەنگی فارسی:**

٢٢- ابن خلف التبریزی - برهان قاطع، مؤسسهء مطبوعاتی فریدون علمی، ایران - ؟.

**فەرهەنگی عەرەبی:**

٢٣- محمد سعید اللحام : المعجم المفهرس لالفاظ القرآن الكریم. دار المعرفة. الطبعة الثالثة، لبنان، بیروت. ٢٠٠٥.

**فەرهەنگی کوردی:**

٢٤- هەژار - هەمبانە بۆرینە : هەمبانە بۆرینە، سروشت، چاپی یەکەم، ئێران - ١٣٦٨.
٢٥- محەمەد نووری عارف : فەرهەنگی دیوانی شاعیران، بلاّوکردنەوەی کۆڕی زانیاری کوردستان - کوردستان - هەولێر - ٢٠٠٧.

**گۆڤار:**

٢٦- گۆڤاری وان ژمارە (٢) یەکێتی نووسەران - سوید - ١٩٩٢.

## كورتەی لێكۆڵینەوەكە

ئـەم لێكۆڵینەوەیـە، لـەژێر ناونیشـانی (ئایـا... حـاجی قـادری كـۆیی، نـالی شارەزووری دیوە ؟!) هەوڵێكە بۆ وەڵامدانەوەی یەكێ لەو پرسـیارە زۆرانـەی كـە لە نێوەندی ئەدەبی كوردی هێشتا وەڵام نەدراوەتەوە! ئەوەی بووەتە هـۆی ئـەم لێكۆڵینەوەیە! ئەم ڕێزە زۆر و سەرسامییە زۆرەیە كە (حاجی قادر) بەرامبـەر بـە (نالی) هەیەتی : بەجۆرێك لـەنێو شـیعرەكانیدا نزیكـەی چـواردە جـار نـاوی (نـالی) هێناوە. هـەروەها هـەردووكیان ماوەیـەكی زۆر ئـاوارە بـوون! بەتایبـەت ئـاوارەی شاری (قوستەنتین).

بـۆ وەڵامدانــەوەی ئــەم پرســیارە و ســەلماندنی یــەكتر بینینەكــەش، بــە شێوەیەكی سەرەكی پشت بە شیعرەكانی حاجی قادر بەستراوە! كە (حاجی) بـە شێوە شیعرییە (هەواڵ)ییەكانی، زۆر بابەتی گرنگی بۆ تۆمار كـردووین، سـەبارەت بە بینینی (حاجی) بـۆ (نـالی) ئـەوا لـە قەسـیدەی (ئاسمـانی بـێ سـتوون) بـەڕای لێكۆڵەر ئـەم قەسـیدەیە، باسـی یـەكتر بینینـی ئـەم دووانـە دەكـات و لـەم یـەكتر بینینەش (نالی) چەند شیعرێكی بڵاو نەكراوەی خۆی دەداتە حاجی.

لـە كۆتـایی لێكۆڵینەوەكـەدا، چـەند ئـەنجامێك دەستنیشـان كـراوە و لەگـەڵ ئەمەشدا، چـەند پێشـنیازێكیش خراوەتـە بـەر چـاوی وەزارەتـی خوێنـدنی بـاڵا و توێژینەوەی زانستی.

## خلاصة البحث

هذا البحث الذي هو بعنوان (هل التقى الشاعر حاجي قادر الكويي فعلاً بالشاعر نالي الشهرزوري؟) محاولة للاجابة على اسئلة أثيرت في اوساط الادب الكردي عن حقيقة هذا اللقاء ودون اجابة عنها.

والذي دفع الباحث لإقامة هذا العمل هو ذلك الاعجاب والتقدير الكبيرين اللذين يبديهما حاجي في قصائده ازاء نالي على نحو بارز اذ يذكر اسمه صراحةً (١٤ مرة) اربع عشرة مرة في قصائده، وكان كلاهما بعيدين عن الوطن ولاجئين في مدينة اسطنبول كما هو المعروف.

فللاجابة على هذا السؤال واثبات ذلك اللقاء استند الباحث الى قصائد حاجي نفسها تلك القصائد التوثيقية التي سجلت لنا الكثير من الوقائع والاحداث الهامة.

ففي قصيدة (سماء بلا اعمدة) تحديداً يتحدث حاجي بوضوح عن ذلك اللقاء وكذلك اهداء نالي له بعضا من قصائده.

وفي نهاية البحث يحدد الباحث جملة نتائج، وكذلك يقدم بعض المقترحات امام الخبراء والمسؤولين في وزارة التعليم العالي والبحث العلمي، فيما يخص الموضوع.

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته

# Abstract

This study is entitled: Has Haji Qadiri Koye met Nali Shahrazoori? It is a serious attempt to answer one of these numerous unanswered questions in Kurdish literature.

The main reason behind taking such a task is that great admire and respect that Haji Qadiri Koye has for Nali. He referred to Nali fourteen times in his poetry. In addition, both of them lived for a long period in exile, especially in Constantinople.

To answer such a question, the main source is Haji Qadir's poems. For, Haji Qadir in his News Poems has left us a great amount of information. The researches sees that Haji Qadir, in his poem, (The Sky without Columns), speaks about his meeting with Nali. In effect, Nali gives Haji Qadir some of his unpublished poems.

The last part of the research is the conclusion and the findings with some recommendations to the Ministry of Higher Education and Scientific Research.

# پراكتیزەكردنی ستراتیژیەتی هەڵوەشاندنەوە لە شیعری (پایز)ی گۆراندا[1]

م.ی. عەبدولستار پیرداود حەسەن

پ.ی.د.سەردار ئەحمەد گەردی
بەشی زمانی كوردی –كۆلێژی پەروەردە
زانكۆی سەلاحەدین –هەولێر

## پێشەكی

ئەم توێژینەوەیە بە ناونیشانی (پراكتیزەكردنی ستراتیژیەتی هەڵوەشاندنەوە – لە شیعری (پایز)ی گۆراندا) لێكۆڵینەوەیەكی (رەخنەیی)یە هەوڵێكە بۆ ناساندنی میتۆد و پرەنسیپەكانی ستراتیژیەتی هەڵوەشاندنەوەگەرایی وەك بزاڤێكی نوێی قۆناغی دوای بونیادگەری. دەركەوتنی هەڵوەشاندنەوەگەرایی وەك ستراتیژیەتێكی قۆناغی دوای بونیادگەری بۆ مەبەستی پڕكردنەوەی ئەو خاڵە لاواز و پڕ ئاریشانە بوو، كە بونیادگەرییەكان لە دوای خۆیان بەجێیان هێشتبوو، هەروەها دانانی سنوورێك لەبەردەم بەبتبوونی دەق و داخرانی دەق لە رێگەی بایەخدان بە خوێنەر و ستراتیژیەتی خوێندنەوە. هەڵوەشاندنەوە نە شیكاركردنە، نە رەخنەگرتنە، نە میتۆدە، بەڵكو ستراتیژیەتێكی تۆتالیتاریانەی هەمەكییە، واتە هەموو ئەوانە لە خۆ دەگرێ، شتێك لە فەلسەفە، شتێك لە میتۆد، شتێك لە شیكاركردن. لە بواری ئەدەبیشدا تاكو ئێستا بە نوێترین تیۆری ئەدەبی دادەنرێت. ستراتیژیەتی هەڵوەشاندنەوە لە بواری ڕەخنەی ئەدەبیدا، یەكێكە لە گرنگترین بزاڤ تاكو ئەمڕۆ، كە دەمەتەقێی گەورە بورووژێنێ. دریدا لە ڕێگەی داتاشینی كۆمەڵێك زاراوەگەلی هەڵوەشاندنەوەگەریی وەك: (جیاوازی، زیادە،

---

[1] ئەم لێكۆڵینەوەیە لەنامەی ماستەری (عەبدولستار پیرداود حەسەن) وەرگیراوە (مستل) كە لە ژێر ناوی (هەڵوەشاندنەوەگەرایی لە ئەدەبی كوردیدا لە تیۆرەوە بۆ پراكتیزەكردن) بەسەرپەرشتی (پ.ی.د. سەردار ئەحمەد گەردی) لەساڵی ٢٠١٠ پێشكەشی بەشی زمانی كوردی / كۆلێژی پەروەردەی – زانكۆی سەلاحەدین كراوە.

نووسینی ئەزەلی، دواخستن، پاریزكۆن، پەرتكردن...تاد) توانی زەمین لەرزەیەك بخاتەگەڕ بۆ پشكنینی ئەو مەبەستە ژەهراوییانەی كە لەنێو فەلسەفەی میتافیزیكیانەی خۆرئاوا چێندراوە هەر لە ئەفلاتوونەوە تاكو ئێستا.

١ـ هۆی هەڵبژاردنی بابەتەكە:

هەڵوەشاندنەوەگەرایی وەك ستراتیژیەتێك باسێكی زۆر نوێ و گرینگی نێو بواری ڕەخنەی ئەدەبییە، بەتایبەت بۆ شۆڕبوونەوە بۆ ئاستی ژێرەوەی زمان و قووڵاییەكانی دەق و هەڵگرتنەوەی كایە دووانە لێكدژیەكانی دەق و هەڵوەشاندنەوە و سەرلەنوێ بونیاتنانەوەیان لە دیوێكی دیكەوە. جگەلەوە ئەم بابەتە نوێیە لای خۆمان وەك باسێكی ئەكادیمی و زانستی ئاوڕی لێ نەدراوەتەوە، ئەوەی هەیە تەنیا چەند هەوڵێكە ئەوانیش تەنیا زیاتر بەشێوەی تیۆرین و لایەنی پراكتیكییان تیا نابینرێت.

٢ـ ڕێبازی لێكۆڵینەوەكە:

ئەو ڕێبازەی كە لە شیكردنەوەكاندا دەستەبەر كراوە، ڕێبازی (مێژوویی–شیكاری)یە.

٣ـ پرۆگرامی لێكۆڵینەوەكە:

باسەكە تایبەتە بە پراكتیزەكردنی هەڵوەشاندنەوەگەرایی، دەقی (پایز)ی گۆرانی شاعیرمان هەڵبژاردووە، ئەم دەقەش، دەقێكە توانایی جێبەجێكردن و پراكتیزەكردنی بنەما و زاراوەكانی هەڵوەشاندنەوەگەرایی تێدا هەیە، بەو پێیەی دەقێكی دەوڵەمەندە لە رووی پێكهاتە و مانا و كایەی زمانییەوە، بە هۆی ئەو دەوڵەمەندێتییەی كە هەیەتی، هاتووین لە سێ ڕێگەی جیاوازەوە هەڵمان وەشاندۆتەوە و خستوومانەتە نێو تانوپۆیەكی خوێندنەوەیی هەڵوەشاندنەوەگەراییانەی سیمیۆلۆژییانەوە، ئەوانیش بریتین لە ڕێگەكانی: (پرۆسیسی هەڵگێڕانەوەی پێچەوانەیی، ستراتیژیەتی هەڵوەشاندنەوەگەراییانەی دەقدا، لۆژیكی سێیەم یان لۆژیكی هەڵوەشاندنەوە) ، لە باسێكیشدا هاتووین ئەو دەقەمان بە پێی كێڵگە واتاییەكان ریز كردووە و یەكە یەكەی دێرە شیعرەكانمان لێكداوەتەوە .

**پراکتیزەکردنی ستراتیژیەتی هەڵوەشاندنەوە**
**لە دەقی شیعریی (پایز)ی گۆران دا:**

ئەگەر پرۆسەی خوێندنەوە چەشنێك بێت لە گرێدانەوەیەکی مەعریفیانەی ئاگاییانەی تاکی خوێنەر لەمیانەی ڕوانینی لەنێو پانتایی جەستەی دەقەوە، ئەوا لەبەرامبەر ئەوەدا جەستەی دەقیش وەك فەزایەکی زمانەوانی سەربەخۆ خۆی ڕەنگرێژ دەکات. واتە دەق یەکسان دەبێت بە زمان و خوێندنەوەش یەکسان دەبێت بە مەعریفەوە (دەق// زمان)، (خوێندنەوە// مەعریفە) واتە لەو خاڵەوە ئیتر پەیوەندییەکان خۆیان دادەمەزرێنن و دروست دەکەن وەك چۆن (ئایزەر) پەیوەندی دەق بە خوێنەرەوە دیاری دەکات لەو ڕوانگەیەوە کە ((پەیوەندییەکی کارلێکی یان دیالێکتیکییە)) (١٨،ل ٤٣) ئەوەتا وەك دەبینین ((شاعیر لە ڕێگەی زمانەوە بنیاتی شیعریی دادەمەزرێنێت، بنەما و ڕەگەزە سەرەکییەکانی تری شیعر"وەك (مۆسیقاو وێنەی شیعریی) بەهۆی زمانەوە ئەنجام دەدرێن)) (٤، ل٨٩) ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە دەقی زیندوو ئەو دەقەیە کە بارگاوییە بە مەعریفە و ئێستاتیکای زمانەوە، بۆیە چەندە کارابین لە شۆڕبوونەوە بۆ هەناوی دەق و ئاستی ژێرەوەی زمان، ئەوەندە کاراتر دەبین لە هەڵوەشاندنەوەی بونیادی ئامادەیی دەق و هەڵگرتنەوەی مانا شاراوەکانی ئەودیو کایەکانی زمان، کە بە فیکر و مەعریفە رووپۆش کراون، ئەوسا پرۆسیسی خوێندنەوە دەبێتە جۆرێك لە چێژ وەرگرتن ((خوێندنەوەی دەق بەمانای گەڕانە بەدووی چێژدا)) (١٢، ل ٥٢) بۆیە خوێندنەوەی هەڵوەشاندنەوە زیاتر خوێندنەوەیەکە مەبەستیەتی لە چەندین ڕووگەی جیا جیاوە بونیادی ئامادەیی ((دەق هەڵوەشێنێتەوە و سەرلەنوێ لە شێوە و وێنایەکی تر دەق ئامادە و دروست بکاتەوە)) ( ٣٤، ل ١٩) ، بۆ ئەوەی بەردەوام دەق لە بەرهەمهێنانی مانادا بەشداری پێبکات، ئەوەتا وەك چۆن دەبینین ((شیعر بەردەوام لەنێوان هەڵوەشانەوە و بونیادنانەوەدا، لە نێوان گوتن و نەگوتندا گوتارەکانی خۆی هەڵدەدا)) ( ١٠، ل١٤٨) دەشێ لە دەقدا هەندێ نیشانە هەبن ڕێنوێنی جۆری خوێندنەوەکەمان بۆ بکەن، بەو مانایەی لە ڕووگە جیاجیاکانی دەقدا چەند خاڵ و وێنە و ئاماژەیەك هەبن کاتێك بەر زەینی خوێنەر دەکەون، کە ڕەنگە کۆی ئەو

ئاماژە و دالانە ڕێنوێنی دەرگاکردنەوەی بونیادی ئامادەیی دەقمان بۆ بکەن و ببن بـە ڕۆشـنکەرەوەیەك لەبـەردەم پرۆسیسـی خوێندنـەوە و ڕۆچـوونە نێـو جیهـانی فـــەنتازیایی دەق، کـــە لـــە کـــاتی مومارەســـەکردن لەتـــەك دەق و چـــەند جـــار خوێندنەوەیـدا کەشـفی رووگـە نادیارەکـانی یەکـەم هـەنگاوی خوێندنـەوەمان بـۆ بکەن، چونکە لەودیو هەر ئاماژە و وتراوێك، نەوتراوێك هەیە هەروەك بارت دەڵێت: ((هەموو وتراوێك نە وتراوێك دەشارێتەوە)) ( ٣، ل١٣)  کە دواجار دەشێ خوێنـەر لە کەشفکردنی رووە کاریگەر و جوان و درەوشاوەکانی خاڵە نەوتراوەکانی چـێژی مەعریفـە و ئێسـتاتیکای زمـان بەرجەسـتە بکـات. بـە واتایـەکی دیکـە دەشـێ مەبەستمان لە نەخشەڕێژی ئەو خوێندنەوەیەدا، بە دیوێك لـە دیوەکـان هاوتـەریب بێتەوە لەو ڕوانینەی (دریدا) کاتێك دەڵێت: ((خاڵی سـەنتراڵ بـۆ ئێمـە ئـەوەن کـە نەستی دانەر کامەیە، بەڵکو ئەمەیـە کـە نەسـتی دەق چییە)) (٢٣، ل٥٧٤)  واتـە کـاری ئێمـە زیـاتر لـە هـەناوی دەقـدا خـۆی هەڵدەگرێتـەوە. ئەگـەر لـە ڕوانگـەی (بارت)ەوە سـەیری ئـەو یەکێتییـە ئۆرگانییـەی نێـوان ژیـان و دەق بکـەین کاتێـك دەڵێت: ((ژیان دەقە)) (١٢، ل٤٦) . واتە دەکرێ وا وێناکانمـان بـۆ ئـەو مەبەسـتە هەڵبگرینـەوە، بـەوەی مـادام ژیـان یەکسـانە بـە دەق، کەواتـە دەکـرێ جەسـتەی شیعریش ئەو تایبەتمەندییە بەخۆی هەڵبگرێ، کەواتە ((شیعر ژیانە)) (١٢، ل١٥٦) ، دەکرێ ژیانیش وەك ئەزموونێکی مرۆڤەکان سەیر بکەین، کە شـاعیر لـە ڕێگـەی شـیعرەکەیەوە ئـەزموونی خـۆی لـە ڕێگـەی زمانـەوە سـەرلەنوێ دادەڕێژێتـەوە، ((شیعر جۆرێك ئەزموونی زمانییە)) (٩، ل٨٠) بەکورتی دەکرێ لـەو هاوکێشـەیەوە ئەو پەیوەستبوونانە وا بخەینە روو:

| | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| (ژیان | × | (شیعر | × | (ژیان | = | (شیعر | × | (ژیان | = | (شیعر |
| (دەق | | (ژیان | | (ئەزموون | | (دەق | | (ئەزموون | | (دەق ئەزموون)ە |

لە ئەنجامی ئەو هاوکێشەیە دەتوانین بڵێین: (گۆران)ی شاعیر ویستوویەتی لە رێگەی ئەزموونی ژیانیەوە دەقێکی شیعری بەرهەم بێنێ، کە رەنگدانەوەی ئەو واقیعە بێت کە تێیدا ژیانی بەسەربردووە ((تێکستی شیعر ڕەنگدانەوەی واقیعی فەنتازیای شاعیرە)) (٢١، ل١٣) . ئەوەتا ئەگەر سەیری ژیانی گۆران بکەین لە دەقی (پایز)دا، ئەوا ((جگە لە رەشبینی و شەوەزەنگی ژیان بەولاوە هیچی تر بەدی ناکرێت پارچە شیعرەکە لە سەرەتاوە تا کۆتایی بە شێوەیەکی رۆمانتیکیی سەخت و پڕ ئەندێشە تێ دەپەڕێت، هەڵوێستی گۆران بەچڕی تێدا گەلاڵە کراوە هەموو هەست و هۆشێکی تێکەلاوی ناو پارچە شیعرەکەی کردووە، سەر گوزشتەی ژانی پڕ لە ئازارو ئەشکەنجەی تیادا ڕەنگی داوەتەوە)) ( ١٩، ل٢٠٢-٢٠٣) ، بەلام ئەوەی جێگەی سەرنجە و دەبێت شاعیر زۆر وریایانە لە کاتی بونیادنانی ئەو دەقە شیعرییە، زۆر ئاگایانە مامەڵە لەگەڵ بونیادی زمان بکات، چونکە زمانی شیعر جیاوازە لەگەڵ زمانی ئاسایی، بۆیە پێویستە شاعیر لە رێگەی تێکشکاندنی نۆرمی زمانی ئاساییەوە، خەریکی بونیاتنانەوەی زمانێکی فەنتازییانەی کراوە بێت بۆ دەقەکەی، وەك (شەفیعی کەدکەنی) دەڵێت: ((شیعر تێکشکاندنی نۆرمی(Norm) زمانی ئاساییە)) ( ١٤، ل١٣) ، ئەگینا زمانی ئەو دەقە ناتوانێ بە زیندوویەتی بۆ ئایندە بژێت. ئەگەر لەژێر ئەو ڕوانینەوە سەیری دەقی (پایز)ی گۆران بکەین، ئەوا ئەو روانینە بەرجەستە دەکەین، هەر بۆیە ئەو دەقە توانیویەتی بە کراوەیی خۆی لە بەردەم روانینەکانی خوێنەر هەڵبخات، بۆیە دەکرێ دەقی شیعری وا بناسێنین ((چالاکییەکی زمانییە، هەولی پێکهێنانی جوانی دەدات، کە ئاماژە بۆ واتای دەروونی و بیری و کۆمەلایەتی. . دەدات)) (٣٣، ل١٠٠) . کەواتە لێرەدا دەگەینە ئەو راستییەی کە ((شیعر زمانێکە لەنێو زماندا)) ( ٥، ل٢١٥) .

دەقی (پایز)ی گۆران یەکێکە لەو دەقە زیندووانەی کەوا دەکرێت لە چەندین رووگەی جیاجیاوە هەڵیبوەشێنینەوە و بیخەینە نێو تانوپۆی خوێندنەوەیەکی ئاگاییانەی مەعریفییانە، ئەمە بەو پێیەی کە ((دەقی پایز، یەکێتی مانا دەپارێزێ و سنوورێکی تۆکمە و بەهێزی بۆ مانا داناوە و بەرامبەر بەمەش هەموو سنوورەکانی خوێندنەوەی شێوەیی شیعری بە کراوەیی و والایی هێشتۆتەوە) )

(٧،ل٤٤٦) . بۆیە لێرەوە هەوڵدەدەین بەپێی ستراتیژیەتی هەڵوەشاندنەوە لە سێ رووگەوە ئەم دەقە بخوێنینەوە، لەگەڵ ئەوەشدا دەكرێ جگە لەم خوێندنەوانەی ئێمە خوێنەری دیكە هەبێ لە رووگەیەكی تری خوێندنەوەیدا، خوێندنەوە بۆ لایەنێكی دی ئەم دەقە بكات، ئەوەتا (پۆل دی مان) دەق بە جۆرە پێكهاتەیەكی وا دەبینێ كە بەردەوام حاڵەتی"ناخوێندنەوەیی"تیادا دەمێنێتەوە، ئەمیش پێوەندیی بە (ناحەتمییەتی ماناكان)ی دەقەوە هەیە، واتە دەق هەرچەندێ بخوێنرێتەوە و ماناكانی راڤە بكرێ، هێشتا بواری زۆرتر بۆ خوێندنەوەی تر و راڤەی جۆراوجۆری تر دەمێنێ) (٣،ل١٥٥) ، تەنانەت (دریدا)ش هاودیدە لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا هەروەك دەڵێت: ((هەموو خوێندنەوە و نووسینێك توانای هەڵوەشاندنەوەی هەیە و هیچ خوێندنەوە و راڤەكردنێكی دەق دوا راڤەكردن و خوێندنەوەی نییە، ئەگەر بێت و دوا خوێندنەوەی منیش بێت)) (٢٧،ل٤١) ، چونكە كاتێك ئەگەر بمانەوێت لە رێگەی ئاركیۆلۆژیای مەعریفەكەی (فۆكۆ)وە شۆڕ ببینەوە بۆ هەناوی دەق، ئەوا ئەوسا دەگەین بەو راستییەی كەوا ئاستی ژێرەوەی هەر دەقێك پڕیەتی لە درز و كایەی كپكراو ((دەق بۆشایی زۆری تێدایە و ناوچەكانی بێدەنگی زۆرە)) ( ٣٦، ل٢٤٢). ئیدی خوێنەر لە كاتی شۆڕبوونەوەی بۆ نێو هەناوی دەقدا، لە توانایدا هەیە سەرجەم ئەو درز و ناوچە بێدەنگانەی بونیادی دەق بە مانا پڕبكاتەوە هەروەك (ئەمبرتۆ ئیكۆ) دەڵێت: ((ئەوە خوێنەرە شوێنە سپییەكانی تێكست پڕ دەكاتەوە)) ( ١١،ل ٢٩) .

سەرەتا بە پێویستی دەزانین دەقە شیعرییەكەی (پایز) وەك خۆی بخەینەڕوو:

١- پایز! پایز!
٢- بووكی پرچ زەرد،
٣- من مات، تۆ زیز
٤- هەردوو هاودەرد !
٥- من فرمێسكم، تۆ بارانت،
٦- من هەناسەم، تۆ بای ساردت،
٧- من خەم، تۆ هەوری گریانت..

٨– دوایی نایە: دادم، دادت،
٩– هەرگیز، هەرگیز
١٠– پایز! پایز!
١١– پایز! پایز!
١٢– شان و مل رووت،
١٣– من مات، تۆ زیز،
١٤– هەردووکمان جووت
١٥– هەر چەند گوڵ سیس ئەبێ بگرین،
١٦– ئاڵتوونی دار ئەڕژێ بگرین،
١٧– پۆلی باڵدار ئەفڕێ بگرین،
١٨– بگرین،، بگرین. . چاومان نەسڕین،
١٩– هەرگیز، هەرگیز،
٢٠– پایز! پایز! ( ١٥، ل١٦٣–١٦٤) .

بۆ ئەوەی لە ڕێگەی ستراتیژیەتی هەڵوەشاندنەوەوە بونیادی گشتی ئەم دەقەی (پایز) ڕاڤە بکەین و بخوێنینەوە، لە سەرەتادا پێویستە دەست بکەین بە هەڵوەشاندنەوەی سیستەمە یەك بەدوایەك هاتووەکانی سەرجەم وشە و ڕستەکانی ئەم دەقە، چونکە ((دەقی پایز خەسڵەتێکی بنچینەیی تیایە، ئەویش بنیاتی"مات بوون"ە، کە بنیاتی دەقی بەگشتی پێکهێناوە لە شێوەی بازنەیی دایە، بە"پایز پایز" دەستی پێ کردووە و بە هەمان شێوە دەق کۆتایی هاتووە)) ( ٣٠،ل٧٨) ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە دەقی پایز وەك وێنەیەکی گشتییە لەسەر شێوازی بازنەی داخراو بنیات نراوە، بازنەکەش بازنەی داخراوە، ئەم هەوڵەش لە پێناو وردوخاشکردنی ستراکتۆرە ئامادەییەکەی دەق و، سەرلەنوێ دامەزراندنەوەی جەستەیەکی نوێتری دەلالیانەی دەق و، گەیشتن بە سەرجەم رایەڵ و ئاماژە و کۆد و ماناکانی ئەو دیو پەیڤ و دێرە وتراوەکان. هەر لەمیانەی ئەم پرۆسەیەشدا لە هەر جۆرێکی خوێندنەوەیی و هەڵوەشاندنەوەگەراییانەی ئەم دەقەی پایزدا، بایەخێکی زۆر بە دۆزینەوەی چەمکە دووانە لێکدژەکان و سەراوژێرکردنیان دەدەین، هاوکات لە کاری رەنگرێژکردنی فرەدیدی خوێندنەوەیی و دۆزینەوەی

بونیادە واتاییەكان و مەغزای هزری نێو هەناوی ئەم دەقـەدا دەبـین. كاتێـك ئـەم دەقەی گۆران دەخوێنینەوە، هەست بەوە دەكەین، كە ئەم دەقە بریتییـە لـە دوو دەق و دوو فەزا و دوو جەستە، ئەمەش بە حوكمی ئەوەی كە هەر دەق و فەزایەك وەك دوو بـوونی سـەربەخۆ دەركـەوتوون ((لـە بناغـەوە ئـەم رسـتانە دوو دەقـی سەربەخۆیان لێ دروست دەبێ، كە هەر دەقێكیان بنیاتێكی سـەربەخۆ هەڵدەگرێ و بەتێكهـەڵكێش كردنیشـیان هـەردوو بنیـات، یـەك بنیـاتی سـەربەخۆ دروسـت دەكەن)) (٧، ل٤٤٦). ئەم جوان دارشتنەی بونیادی گشتی دەقیش دەبێتە مایەی ئـەوەی كـە رێگـەمان بـۆ والاّ بكـات لـە بـەردەم دەروازەكـانی خوێندنـەوەو هەڵگرتنەوەی مانا نەوتراوەكان، بۆیە دەكرێت ئـەم دەقـە لـە چـەندین رەهەنـدی جیاوازەوە بخوێنینەوە، چونكە ((یەكێك لە نهێنییە هەرە شاراوەكانی دەقی پایز، پێكهـاتنی شـێوەیی چـنییەتیی رێكخسـتنی رسـتە و وشـەكانی شـیعرە، ئـەو رێكخسـتنەی چـەند ئەگـەرێكی خوێندنـەوەی جیـاواز لـە دەقـدا دەكاتـەوە)) (٧،ل٤٤٧).

**لە رێگەی پرۆسێسی هەڵگێرانەوەی پێچەوانەیی:**

ئەم هەنگاوە زیاتر وەك هەنگاوێكی گشتگیری (**هەڵگێرانەوەی پێچەوانەیی**) بۆ بونیادی گشتی ئەم دەقە خۆی ئامادە دەكات، واتە پراكتیزەكردنـی سـتراتیژیەتی هەڵوەشاندنەوە لە هـەناوی ئـەم بونیـادە یـەك بەدوایـەك هـاتووەی دەقـی (پـایز) هاتۆتـە دەسـت، ئـەو هـەنگاوەش لـە دووتـۆی چـەند هـەنگاوێكی دی خـۆی هەڵدەگرێتـەوە. لێـرەدا یەكـە یەكـەی هـەنگاوەكان دەخەینـەروو: لـە سـەرەتادا هەوڵدەدەین بـە كـرداری هەڵگێرانـەوەی یەكـەم دێـری پارچـەی دووەم بـۆ یەكـەم دێری پارچەی یەكەم هەڵبستین، واتـە هەڵگێرانـەوەی پێچـەوانەیی بەشـێوەیەكی یەك بەدوایەك هاتوو، ئەو كات پەیوەندیەكی پێچەوانەیی لە نێـوان هـەردوو فـەزا و پارچەی دەقەكەدا دروست دەبێت، ئەمەش دەبێتە مایەی ئەوەی خوێنـەر هەسـت بەوە بكات كە وێنە و فۆرمێكی دی كەوتۆتە بەر دید و وێنایـەكی دی بـۆ دروسـت بووە. لە پرۆسێسی هەڵگێرانەوەی رستەكانیشدا بـەرووی چەشـنێك لـە كرانـەوەی دەمامكەكان و دۆزینەوەی ئیحـای ئـەودیو پـەیڤ و دیـوە شـاراوەكان دەبینـەوە،

بەواتا (بارت)یەکەی کە بە (سێبەری دەق) وەسفی دەکات، دەکرێ لە وێنەی (١) ئەم هەنگاوانە وا بخەینە روو:



وێنەی (١)

(پایز) ئەو ناونیشانە پڕ جووڵە و پڕ لە ئیحایەیە کە (گۆران)ی شاعیر خولقێنەریەتی، دەشێ بە تەنیا بەو چوار پەیڤە ڕەنگ پایزییە، دەقێکی بچووککراوەی پڕ لە رەنگ و پڕ لە ئیحا فۆڕمەڵە بکات. ، چونکە ناونیشان وەك رۆشناییيەك دەتوانێت تیشك پرژێنی سەراپای بونیادی ئامادەیی دەقەکە بکات، هەروەك (دریدا) دەڵێت: ((ناونیشان چراخانی جەستەی دەقە)) (٢٨،ل٢٣). بۆیە دەکرێ لەئەنجامی نزیککردنەوەی رایەڵە دەلالییەکانی ناونیشانی (پایز)و رایەڵە پڕ جووڵە ئیحا بەخشەکانی بونیاد و مەتنی دەقەکە، زیاتر دەقەکەمان بۆ رووناك ببێتەوە، چونکە هەردوو جومگەکانی ناونیشان و مەتن وەك دوو بازنە، یەکتری تەواو دەکەن و، بەیەکەوە دەبن بەیاریدەدەر بۆ زیاتر رۆشنکردنەوە و دۆزینەوەی سەرجەم کایە دەلالییەکان، تەنانەت بەو پێیەی (ناونیشان) وەزیفەی بەرفراوانکردنی مەداری دەقی لە ئەستۆدایە، ئەوا ناونیشانی (پایز)ی گۆران شاعیریش هەمان وەزیفە لەخۆدەگرێ و دەرفەتی کرانەوە لەبەردەم ستراتیژیەتی هەڵوەشاندنەوە و پرۆسێسەکانی فرە خوێندنەوەییمان بۆ دەرەخسێنێ. لێرەدا ناونیشانی (پایز) وەك ((دەقێکی بچکۆڵەی چڕ کراوەی ڕستەیی پڕ لە ئیحا)) (٣،ل٧٣) بۆ هەیکەل و جەستەی شیعرێکی (٢٠) دێری دەناسێنین، واتە چۆن

جەستەی كەسێك لە (سەر)ەوە دەناسینەوە، ئاواش ناونیشانی پایز دەوری ئەو (كەللەی سەر)ە دەبینیٚ بۆ جەستەی شیعریی پایز. لە دواییدا ئەركی دەستپێك و مەتنی دەقەكە دێنە پێشەوە بۆ تەواوكردنی هەیكەل و جەستەی شیعرەكە بەگشتی ((سەر/ ناونیشان) و (مل/ دەستپێك) و (جەستە/ مەتن) دەبن بە پێكهاتەیەكی هاوگونجاوی هەر دەقێك)) ( ٣،ل٧٤). دەشیٚ دواجار هەرسیٚ جومگە سەرەكییەكانی (ناونیشان/ دەسپێك/ مەتن) بەیەكەوە لە فۆڕمی كوتلەیەكدا ببن بە چەشنە هارمۆنییەتێك بۆ ئەو ستراتیژیەتەی كە هەیكەلی دەقێكی پڕ لەماناو دەلالەت بونیاد دەنێت، كەواتە دەكریٚ كورتەی هاوكێشەكە (1A+2B+3C⇉4D) وەك لە وێنەی(٢)دا



وێنەی (٢)

ئەمجارە ئەگەر رستەیەكی بەشی یەكەمی شیعرەكە لە بەرایی بەشی دووەمی شیعرەكە دابنێین، ئەوا ریزبوونێكی دی رستەیی و وێنایەكی دیكەمان بەم شێوەیە دەست دەكەوێت:

وێنەی(٣)



| | |
|---|---|
| 1- پایز! پایز! ⬅ | 11-پایز! پایز! ⬅ |
| 2- بووکی پرچ زەرد، ⬅ | 12-شان و مل رووت، ⬅ |
| 3- من مات، تۆ زیز ⬅ | 13-من مات، تۆ زیز، ⬅ |
| 4- هەردوو هاودەرد ! ⬅ | 14-هەردووکمان جووت ⬅ |
| 5- من فرمێسکم، تۆ بارانت، ⬅ | 15-هەر چەند گوڵ سیس ئەبێ بگرین، ⬅ |
| 6- من هەناسەم، تۆ بای ساردت، ⬅ | 16-ئاڵتوونی دار ئەڕژێ بگرین، ⬅ |
| 7- من خەم، تۆ هەوری گریانت. ⬅ | 17-پۆلی باڵدار ئەفڕێ بگرین، ⬅ |
| 8- دوایی نایە: دادم، دادت، ⬅ | 18-بگرین،، بگرین. چاومان نەسڕین، ⬅ |
| 9– هەرگیز، هەرگیز، ⬅ | 19-هەرگیز، هەرگیز، ⬅ |
| 10- پایز! پایز! ⬅ | 20-پایز! پایز! ⬅ |

لە ئاکامی ئەم ریزبوونەی سەرەوەی رستەکان، کە لەبەرامبەر یەکتریدا دانراون، بۆتە مایەی ئەوەی کەوا بونیاد و فۆرمێکی دیمان بۆ بنەخشێنێ، کە جیایە لە هارمۆنیەتی یەکەم و بنەڕەتی شیعرەکە، کەوا سەرجەم دێری رستەکانی بەشی یەکەم و دووەم بەسەریەکەوە هاتبوون، بەڵام وێنەی (٣) بونیادی دەقەکەی کردۆتە بونیادێکی دی، کەوا ئەم بەرامبەریکردنی ریزبەندی رستەکانی بەشی یەکەم و دووەم توانیویانە واتایەکی نوێتر و گونجاو دروست بکەن و راڤەیەکی دی هەڵبگرن، کە هەنگاوێکی دیکەیە رووەو دۆزینەوەی مانا نەوتراوەکان: دێرە شیعرەکانی (١–١١)◄**(پایز! پایز!)✕ ٢**◄بەئەنجامدانی کردەی بەرامبەرکردنی دێری (١–١١) واتایەکی دی هاتۆتە ئارا، بەم کردەی بەرامبەریکردنە، چوار وشەی پایز بەسەریەکەوە دەلالەت لە جەختکردنەوەیەك دەکەن کە ئەویش جەختکردنەوەیەکی پڕاوپڕی وشەی پایزە، کە هەم لە رووی دەلالەتەوە بازنەبەندییەك بەچواردەوری دەلالەتەکانی (پایز، هەڵوەرین، ڕژان، مەرگ، فەنابوون،.... تاد)مان بۆ بەرهەم دێنن، هەم جەختکردنەوەیەکیشە لەسەر هارمۆنیەتی ئیقاعی وشەکان، کە بە دەنگی (ز) هەر چوار وشەی (پایز) دەبن بە

دەنگێکی گەورەتر لە پێناو گەیاندنی کرۆکی مەغزای شیعرەکە. دێرە شیعرەکانی **(٢-١٢) ◄(بووکی پرچ زەرد،← شان و مل رووت،)◄** وێنای بووکێکی پرچ زەردی شان و مل رووتمان بۆ دەکێشێ، کە لەم ریزبوونەی شێوەی (٣) دا، کردەی وێنابوونی خودی بووکەکەمان زۆر بە روونی بۆ ئاشکرا دەبێت، بە پێچەوانەی ریزبوونی رستەکانی نێو بونیادە بنەڕەتییەکەی شیعرەکە، کە ماوەیەکی زۆر کەوتۆتە نێوان (بووکی پرچ زەرد و شان و مل رووت). دێرە شیعرەکانی **(٣-١٣) ◄(من مات، تۆ زین)✕٢ ◄**هاو وێنە و هاوشێوەی دووبارەبوونەوەی دێرەکانی (١-١١) وشەکان لە هەردوو دێرەکانی **(٢-١٢)**بە یەك هەناسە و یەك رەنگ رەنگڕێژ کراونەتەوە، ئەمەش دەبێتە مایەی جەختکردنەوەیەکی دی لە بابەت ئەوەی کە خوێنەر توندتر لەوە ئاگادار ببێتەوە کە (شاعیر) لەبەرامبەر باکگراوەندی وێناکانی پایز (سیسبوون، زەردهەڵگەڕان، هەڵوەرین، مەرگ، فەنابوون،....تاد) (مات)ەو (بووك)یش هاوشێوەی شاعیر (زین)ە، ئەم دووانەی (شاعیر/ بووك) درێژ دەبێتەوە بۆ مەدلوولەکانی (نێر/ مێ)←(خودێکی ماتبوو/ خودێکی زیزبوو)،... تاد. شاعیر دەیەوێت لە رێگەی ئەم دووانەیەی (خود/ شاعیر/ نێر) ←(خود/ بووك/ مێ) کردەی ماتبوون و نامۆبوونەکە بەرفراوانتر بکاتەوە، بەوەی کەوا کاتێك ڕەشەبای مەرگ هەڵدەکات، هەموو رەگەزێك لەگەڵ خۆی ون دەکات. گۆران لەو دوو دێرەدا هەڵوێستی خۆی بە هەموو هەست و نەستێکەوە دەربڕیوە و تێکەڵی دێڕەکانی کردووە، وەك ((ئافرەتێکی خاوەن هەست و نەست هەڵسوکەوتی لەتەکدا کردووە کە بە جووتە هاوبەشی ئازار و ئەشکەنجەی ژیان دەکەن و هیچ سنوورێك لە نێوانیانا نامێنێت و هەریەکەیان دەبنە تەواوکەری ئەوی تریان، ماتیی گۆران زیزیی پایزە و هەردووکیان هاودەردی یەکترین)) دێرە شیعرەکانی **(٤-١٤)◄(هەردوو هاودەرد! ← هەردووکمان جووت)◄**چەشنی کردەیەکی بیرکارییانە **(هەردوو (٢٠،ل٧٨) ← هەردووکمان)** لەگەڵ یەکتریدا کورت دەکرێنەوە، **(هاودەرد← جووت)** دەمێننەوە، ئەمەش بەو واتایە خۆی هەڵدەگرێتەوە کە بەجووتە (شاعیر/ بووك) هاوشێوە چۆن بەشدارن لە ژیان دروستکردن و گۆڕینەوەی پەیوەندییە

ئیرۆسییەکانیان، ئاواش دەبێت بەشداربن لە ڕەهەندەکانی دیکەی ژیان و دیوەکەی تری هەموو چەمکەکانی دیکەی ژیان، تەنانەت مردنیش.

(هەردوو) / (هاودەرد) × (جووت) / (هەردووکمان) = (جووت) / (هاودەرد) (بە جووتە هاودەردن) (شاعیر/ پایزەبووك)

خود ↓ (شاعیر) ، بابەت ↓ (پایزەبووك)

شاعیر ئاگایانە توانیویەتی پارچەی یەکەم لەگەڵ پارچەی دووەم بە هۆی دانانی دوو وشەی هاوتای (هاودەردی)و (جووتبوون) لێك جیا بکاتەوە، کە (١٠) رستەی یەکەم پەیوەستبوونی شاعیر لەگەڵ خودێکی هاوچەشنی خۆیەتی کە ئەویش (بوکە پایزە)، کەچی (١٠) رستەی پارچەی دووەم پەیوەستبوونی شاعیر لەگەڵ (بابەت)ەکە (سروشت)ە. دێرە شیعرەکانی (٥–١٥) ◄ **(من فرمێسکم، تۆ بارانت، ← هەر چەند گوڵ سیس ئەبێ بگرین،)** ◄ لەم دوو دێرەدا دەکرێ وا مەدلوول و ماناکانی ئەودیو وشەکانیان هەڵبگرینەوە، ئەویش لەڕێگەی هەڵگێڕانەوەی رستەکان و کردەی پێچەوانەیی خوێندنەوەیی، وەك: هەرچەند گوڵ سیس ئەبێ، پێویستە لەسەر (منی شاعیر/ تۆی بووك) چەشنی فرمێسك و باران هەر بگرین و هەر بگرین! و هەرگیز هەرگیز! چاویشمان نەسڕین. دێرە شیعرەکانی (٦–١٦) ◄ **(من هەناسەم، تۆ بای ساردت، ← ئاڵتوونی دار ئەڕژێ بگرین،)** ◄ هاووێنەی دوو دێرەکەی سەرەوە، هەمان پرۆسە ئەنجام دەدەین، لە ئەنجامدا وا ماناکانیان هەڵدەگرینەوە، کاتێك ئاڵتوونی دار دەڕژێ و بەرهەمی وڵات بەرەو کەمبوونەوە ئەچێ، هەموو ڕەهەندەکانی وڵات تووشی جۆرێك لە قەیران دەبێتەوە، کاتێك قەیرانیش دەسازێ جوانییەکان رووەو وێرانەیی دەبنەوە ((شاعیر بەرهەمی چواندووە بە ئاڵتوون، دیارە ئاڵتوونیش لەنێو دنیای ئابووریدا بووەتە پێوەرێك بۆ گەشەی ئابووری و خۆشگوزەرانی کۆمەڵگا. کاتێك بەرهەم زۆر دەبێ ئەوا بازاڕ گەرم و سەرمایە فرە دەبێ، سەرمایەش دەبێتە ئاڵتوون و، زۆریی ئاڵتوونیش دەبێتە بەهێزبوونی دەوڵەت و کۆمەڵگا و بەرەوپێشچوونی))

(٢٥،ل٤٩–٥٠). کاتێك ئەوماڵوێرانییە روو لە ئێمە دەکات، ئەوسا دەبێ بەدیار ئەم نالەبارییەی ژیان، من ئاهی سارد و تۆش چەشنی بای سارد خەم بخۆین و ئاخ هەڵکێشین ((هەر وەرزێ لە وەرزەکانی ساڵ زیاتر خەمباری پێوە دیاربێ، ئەوەیان زیاتر لە دەروونی مرۆڤدا جێگیر دەبێ و بەراوردی دەکات لەگەڵ ساڵەکانی ژیان و تەمەنی خۆیدا هەرچەندە گەڵای درەختەکان دەڕژێ ساڵەکانی تەمەنی کەم دەبنەوە)) ( ٣١،ل٤٨). دێرە شیعرەکانی (٧–١٧) ◄**(من خەم، تۆ هەوری گریانت. . ← پۆلی باڵدار ئەفڕێ بگرین،)**◄بە هەمان نەمەتی سەرەوە دەکرێ بەم شێوەیە ماناکانی ئەودیو ئەم دوو نیوە دێرەی سەرەوە هەڵبگرینەوە (فڕینی پۆلی باڵدار) دەشێ ئاماژە بێت لەوەی کەوا چەشنە نائارامییەك لەو شوێنە هەبێت، کە رووبەرووی باڵندەکان بۆتەوە و بۆتە مایەی شێواندنی رەوشەکە، ئەمەش دەشێ بەواتای لەدەستدانی ئاشتی بێت، چونکە کاتێك کاری (بگرین) بەشێوەیەکی رێزمانی لێکدەدەینەوە بریتییە لە **(ب+گر+ین)**≡ **(نیشانە+ رەگی کار+ جێناوی لکاو بۆ کەسی یەکەمی کۆ)** واتە پرۆسەی گریانەکە روو لە ئێمەیە، واتە وڵات بە کۆی هاوڵاتیانەوە لە چرکەساتی نەمانی ئاشتی (پێویستە بگرین) ، چونکە لە دەستدانی ئاشتی قات و قڕی و وێرانەیی و جەنگی بەدواوەیە. دەشێ ئەم دێرەش لە رووی پەیوەستبوونی بە (رووداو) خۆی تەریب بکاتەوە لەگەڵ دێری سەرەوە (٦–١٦) بەوەی کە بەرهەم نەمێنێ، رووداوی وێرانەیی و نەمانی ئاشتەوایشی بەدوادا دێت. دێرە شیعرەکانی (٨–١٨) ◄**(دوایی نایە: دادم، دادت،← بگرین، بگرین.. چاومان نەسڕین،)** ◄شاعیر جێکەوتی وێرانەیی و نەمانی ئاشتەوایی لە وڵات بە ئازار و مەینەتی و برینێکی زۆر بەسۆ دەزانێ، بۆیە سەرەتا بەر لەوەی ئەو هەنگاوانەی **(سیسبوونی گوڵ←نەمانی جوانی)**، **(ڕژانی ئاڵتوون←نەمانی بەرهەم)**، **(فڕینی باڵدار←نەمانی ئاشتی)** لە وڵات روویدات، بە پێویستی دەزانێ کە دەبێ **(بگرین،، بگرین. . چاومان نەسڕین،)**، واتە پێویستە بەر لە روودانی ئەو کردەی وێرانەییە، دەست بکەین بە رێگە چارەی گونجاو بۆ ئەوەی بەربەستێك لە بەردەم ئەم پرۆسە وێرانەییە دروست بکەین. ئەگەر بە وردی سەیری جێکەوتی ئەم سێینەیی دێرە شیعرە بکەین، دەبینین شاعیر باکگڕاوەندە دەلالییەکەی درێژ کردۆتەوە بۆ ئایندە (کە دەشێ ئایندەی وڵات

بێت) واتە وەك زەنگێك بێت بۆ گەلی کورد بەوەی کەوا پێویستە ئاگاداری ولآت بن، بەرلەوەی لافاوی وێرانەیی هەڵبکات. دێرە شیعرەکانی (٩–١٩)◄ ( **هەرگیز، هەرگیز،)×٢** ◄ ئەم پرۆسەی دووبارەکردنەوەیە لە شیعردا لە پێناو چێژ بەخشین و سەرنجڕاکێشانی دیدی خوێنەرە بۆ ئەم وشەیە ((دووبارەکردنەوە لە شیعردا دوو مەبەست دەپێکێت: یەکەم"چێژ بەخشین، کە مەبەستێکی ئیستاتیکی ڕووتە، دووەمیش" سەرنجڕاکێشانی خوێنەر بۆ ئەو وشە)) (٤، ل٢٠٧). ئەم جەختکردنەوەیە توندتر دەبێت لە چاو شێوە داڕشتنی بنەڕەتییەکەی شیعرەکە، چونکە وشەی (هەرگیز) چوار جار دووبارە بۆتەوە لەوەی دوو جار بێت، ئەمەش ((بە واتەبوونێك لە ئارادایە کە هیچ ساتێکی کامەرانی لەخۆدا هەڵنەگرتووە، بوونێکە دەستەبالآیە، بوونی حوکمێکی هەمیشەیی و هەڵنەوەشاوە و نەگۆڕ لە واقیعێکدا کە لە توانای هیچ هێزێکدا نییە بیگۆڕێ) ) (٧،ل٤٥٦) ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە بەشێوەیەکی کۆتایی داد و فیغانەکە **(دوای نایە)**، واتە بێ سوود دەبێت و هیچ ئەنجامێکی نابێت. دێرە شیعرەکانی (١٠–٢٠)◄ **(پایز! پایز!)×٢** ◄ دووبارەبوونەوەی پرۆسەی دێرەکانی (١–١١)یە، کە شاعیر ویستوویەتی بازنەبەندییەك بە شیعرەکە بدات، بۆ ئەوەی لە ڕێگەی ئەم بازنەبەندییەوە، چەند رایەڵەیەکی فکریمان پێبدات وەك: جێکەوتی ئەم بازنەبەندییە بۆ ئەوەی جاویدانییەك دروست بکات، بەوەی کە ڕووبەڕووی مەرگ بێتەوە کە (کۆتایی)یە، واتە شاعیر دەیەوێت لە ڕێگەی پرۆسەی دووبارەبوونەوەی دەنگ و بڕگە و وشە و رستەکان بەردەوامی بە ژیان بدات، بۆ ئەوەی مەرگ جێکەوتی خۆی لەسەر جێ نەهێڵێت ((پایز لای شاعیرە رۆمانتیکەکان پایزی عومرە و نموونەی پەستییە)) (٢٠،ل٧٨). ئەگەر هاتوو لە وێنایەکی دیکەدا ئەم ریزبەندییەی سەرەوە جارێکی دی پێچەوانە بکەینەوە و هەڵیان بگێڕینەوەو، لەتەك یەکتردا دایانبنێینەوە، ئەوا ریزبەندی رستەکان فۆرم و وێنایەکی دی لە چەشنی بازنەمان پێدەبەخشن و، لەگەڵ ئەم بۆچوونەی سەرەوە یەك دەگرنەوە کە باسمان لێوەکرد، بازنەبەندییەکەش بەم شێوەی خوارەوە دەکەوێتەوە کە لە چوارچێوەی ئەو چوارگۆشەیە دەیخەینەڕوو:

وێنەی(٤)

| | |
|---|---|
| 11- پایز! پایز! | پایز! پایز! -1 |
| 12- شان و مل رووت، | بووکی پرچ زەرد-2 |
| 13- من مات، تۆ زیز، | من مات ، تۆ زیز -3 |
| 14- هەردووکمان جووت | هەردوو هاودەرد ! -4 |
| 15-هەر چەند گوڵ سیس ئەبێ بگرین، | من فرمێسکم، تۆ بارانت، -5 |
| 16- ئاڵتوونی دار ئەڕژێ بگرین، | من هەناسەم، تۆ بای ساردت، -6 |
| 17- پۆلی باڵدار ئەفڕێ بگرین، | من خەم، تۆ هەوری گریانت.. -7 |
| 18-بگرین، بگرین.. چاومان نەسڕین، | دوایی نایە: دادم، دادت، -8 |
| 19- هەرگیز، هەرگیز، | هەرگیز، هەرگیز،– 9 |
| 20- پایز! پایز! | پایز! پایز!– 10 |

ئـەوەی جێگـەی ئاماژەیـە لـەم شـێوە وێنەیـەی (٤)ەوە، ئەوەیـە کـە بـۆ خوێندنەوە و راڤەکردنی بونیـادی شـێوە وێنـەی (٤) پێویسـت بـەوە ناکـات سـەر لەنوێ راڤەیان بۆ بکەینەوە، چونکە خوێندنـەوە و راڤەکردنەکـە لـە خوێندنـەوەی شێوە وێنەی (٣) نزیکە، بەڵام هەندێك تێبینی دیکەمان لەلا دروست دەکات، کـە بە پێویستی دەزانین لێرەدا ئاماژەیان پێبدەین:

١–ئەگەر لە رووی شێوە وێنەوەی (٤)ەوە سـەیری بونیـادی دەقەکـە بکـەین، ئەوا هەست بە چەشنە بازنەبەندییـەك دەکـەین کـە لـە نێـو چوارگۆشـەکەدا خـولی خواردۆتەوە، ئەمەش لە دەرئەنجامی دێرە شیعرەکانی هـەردوو پارچـەدا (١–٢٠)، کەچـی ئەگـەر سـەیری نـاوەرۆك و ئاسـتی دەلالی وشـە و رسـتەکان بکـەین، ئـەوا دەبیـنین هـەمان مانـای بازنەبەنـدی وەردەگـرن و دەبەخشـن، کـە لـە سـەرەوە ئاماژەمان پێدا بە تایبەت لە کاتی راڤەی دێرەکاندا، دەشێ ئەو تەکنیکەش گۆران بۆ ئەو مەبەستە هێنابی، تاوەکو نەمری بە شیعرەکە بدات هاوچەشنی بازنەبەندی هەموو رەگەزەکانی بوون.

٢– بەجێهێنانی پرۆسەی دووبارەکردنەوە، کە جوانییەك بە کردە شـیعرییەکە دەبەخشێت، وەك:

دووبارەکردنەوەی (فرێز  هەرگیز هەرگیز  هەرگیز هەرگیز
پایز پایز  پایز پایز
رستە  من مات تۆ زیز  من مات تۆ زیز) (٢٦،ل١٩١) .

٣– دوو جێناوی سەربەخۆ (من، تۆ) و دوو جێناوی لکاوی (م، ت) لە هەردوو پارچەی شیعرەکەدا دەرکەوتوون و بە یەکسانی هەنگاویان ناوە.

٤– ئەگەر سەیری رستەکانی (١٥،١٦،١٧) بکەین، ئەوا دەبینین سێ کار دەرکەوتوون، کە وەك یەکسان و هاوتان لە هەر سێ رستەدا (رانەبردوو، تێنەپەڕ، ئەرێ)ن، کەچی کارەکانی (سیسبوون و دوایی نەهاتن و نەسڕین) تێپەڕن. تەنانەت ئەگەر سەیری جووڵەی کارەکان بکەین لەو دێرانەی کە وەرمانگرتوون، ئەوا دەبینین جووڵەکان بەو فۆرمە خۆیان دەخەنە روو:

((کاتێ گوڵ سیس ئەبێ بگرین ← جووڵەیەکی ئاسۆییە.
ئاڵتوونی دار ئەڕژێ بگرین ← جووڵەیەکی ستوونی بەرەوخوارە.
پۆلی باڵدار ئەفڕێ ← جووڵەیەکی ستوونی بەرەو ژوور




)) (١٦،ل٢٠٣) .

٥– ئەگەر بە وردی سەیرێکی رێژەی وشەکان لە هەر پارچەیەکدا بکەین، دەبینین پارچەی یەکەم لە (٣٣) وشەدا پێکهاتووە و بە هەمان شێوە پارچەی دووەمیش لە (٣٣) وشەدا پێکهاتووە ((بە هەردوو تەوەرەکە لە"٦٦"یەکەی زمانییە، ناو+ فرمان+ ئاوەڵناو+ ئامرازی پەیوەندی" ئەگەرچی هەردوو تەوەرەکە

هاوتان لە وشەدا، بەڵام لە رووی پێكهاتە و دەلالییەوە جیاوازن)) (٣٠، ل٧٨). خەیاڵێكی رۆمانتیسیزمانەی زۆر قووڵی تێدایە بۆتە مایەی خوڵقاندنی وێنەی هونەری پڕ لە ئێستاتیكا و كەشكۆڵی سۆزی شاعیر ((وێنە لە شیعردا ئەو شێوەیەیە كە سۆزی شاعیری تێدا دەتوێتەوە)) (٣٠، ل٨). یان بە دیوێكی دی ((وێنە شوێنێكی لە شیعری شاعیرە نوێخوازەكاندا داگیر كردووە، رەگەزێكە لە رەگەزە سەرەكییەكانی بنیادی شیعریدا)) (١٧،ل١٣٣) ، وەكو (بووكی پرچ زەرد)، (شان و مل رووت)، (رژانی ئاڵتوونی دار)، (فڕینی پۆڵی باڵدار).... تاد

٦- لەبابەت سەرواوە، گۆران سێ چوارینەی پێشەوەی بە سەرەوای (بەنۆرە-متناوب) هێناوە، كە بەم جۆرە دارێژراوە (اب اب)، چوارینەی كۆتایی هەموو لە تەكانی لەسەر یەك سەروا دەڕوا، ئەمەش پێی دەگوترێ (چوارینەی تەواو). هەروەها ((لە دێرەكانی (١٨،١٧،١٦،١٥) جۆرە سەروایەكی ناوەكی دروست بووە، رۆڵی سەرەكییان لە دیاریكردنی ئاڕاستەكانی گریان و بەگەردوونكردنی دەلالەتەكاندا هەیە، دەبێ، ئەڕژێ، ئەفڕێ، بڕین، ئەمەش پارچەبوون و بڵاوبوونەوەی سەروایە بەسەر جەستەی شیعرەكەدا)) (١٦،ل٢٠٥).

٧- بونیادی دەقی پایز لەسەر كێشی بڕگەیی (پەنجەیی-خۆماڵی) نووسراوە و كێشەكەشی كێشی ئازادە، واتە ئەو دەقە كێشەكەی لە ((كێشی هەشت بڕگەیی و دەستەپێی جیاواز پێك هاتووە، گۆران بە شێوەیەكی جیاواز بەكاری هێناوە و دەستەپێی جیاوازی لێ دروست كردووە، ئەم كێشە لە هەرە كێشە دیارەكانی هەڵبەستی كوردی هاوچەرخە و لە كێشەكانی تر زیاتر مەودای بەكارهێنانی دەستە"پێ"ی جیاوازی هەیە، كە ئەوانیش جگە لە (٤+٤) كە دەستە"پێ"ی (٣+٥) یان"٥+٣"و "٢+٦"یان (٢+٢+٤) ن)) (٣٠،ل٨١).

٨- لە رووی وشەوە ((وشەی گۆران كورت و كەم بڕگە و سووك و بەگوێ ئاشنان، زۆر كەم وشەی درێژ و ئاڵۆزی بەكارهێناوە)) (٢٠،ل١٢٤).

٩- گۆران لە دێرەكانی (٥،٦،٧) باس لە كردەی باران بارین دەكات، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنج بێت ئەوەیە كە ((لە سروشتا بە پێی دیالیكتێكی ناوەوەی دیاردەكانی باران یاسایەكی فیزیاوی بەڕێوەی دەبات كە بە پێچەوانەی پرۆسیسی دروست بوونی) بارانە لەناو دەقەكەدا، لە دەقەكەی گۆرانا سەرەتا باران هاتووە و

دوایی بای سارد و ئینجا هەور کەچی لە سروشتدا بەپێچەوانەوە سەرەتا هەور و دوایی تر بای سارد دێ ئینجا باران دەبارێت)) (٢٩،ل٣).

١٠– گۆران زۆر بە وردبینانە ئەو دەقەی داچاندووە، چونکە ئەگەر ((سەرنج بدەینە لایەنی سەر ژمێریکردنی دەنگەکان، بۆمان دەردەکەوێ کە"١٥"رستەی یەکەم ژمارەی دەنگە پەنجەییەکانی (٥٦) یەکەی دەنگن، ئەگەر بەشی دووەمی شیعرەکەش دەنگەکانی بژمێرین دەبینین بەهەمان شێوە (٥٦) دەنگن، ئەمەش دەلالەتێکە بۆ رێکخستن و پاراستنی سەربەخۆیی هەر بەشێك لە شیعرەکە و دەربرینێك لە جوانکاریی دەنگەکانی شیعر)) (٧،ل٤٤٩).

١١– ئەگەر سەیری بونیاتی بڕگەیی لە دەقی پایزدا بکەین، دەبینین (("گۆران"بنیاتی دەقی"پایز"ی لە چەند بڕگەیەکی شیعری پێکهێناوە و شێوەیەکی ئەندازەیی لەخۆ گرتووە و لەگەڵ بڕگەی بنچینەییدا، بە درێژایی دەقەکە بەشێك لەم بنیاتە دووبارە ئەبێتەوە ئەبێتە بنچینەی بنیاتی گشتی دەق، بەشەکانی تری بڕگەکان لەگەڵ بەشێك لەم بنیاتە گەشە ئەکەن و یەکگرتوویی دەقیش دەپارێزن، بەهۆی دووبارە بوونەوەی بنیاتی ئەو بڕگەیە)) (٣٠،ل٧٩).

**کێڵگە واتاییەکان لەستراکتۆری بنەڕەتیی شیعری (پاین)دا:**

ئەگەر بە دیدێکی گشتگیر سەیری بونیادی ئامادەی شیعری پایزی گۆران بکەین، ئەوا دەتوانین دەقی"پایز" لە چەند فیلدێکی واتاییەوە هەڵبگرینەوە، کە دەشێ لە کرۆکی ئەو چەمکە دووانە لێکدژیانەی وەك: (پیریی/ لاوی)، (ژیان/ مردن)، (سروشت/ خود)(ترس/ بوێری)، (بە هیوایی/ بێ هیوایی)، (پێکەنین/ گریان)، (نێرسالاری/ مێ سالاری)، (ناوەوە/ دەرەوە)، (ئامادەبوون/ ئامادەنەبوون)دا، ئاماژە بۆ چەند فیلدێکی واتایی بکەین کە کۆی رایەڵە گشتییەکانی لەسەر وەستاوە، وەك: (تروسکایی ژیان، نائومێدی، فەنابوون، خەم و نیگەرانی). ئەگەر کۆی گشتی وشەکانی نێو دەقەکە کۆ بکەینەوە بۆ دەستکەوتنی دەرئەنجامی زانینی مەغزای دەقە شیعرییەکە، ئەوا کلیلێکمان بۆ بەرهەم دێت بۆ کردنەوەی مەغزای دەقەکە و زانینی رێژەی فیلدەکان لەو دەقەدا. لە پێناو هەلگرتنەوەی فیلدە واتایی و ئاستە دەلالییەکانی نێو هەناوی ڕستە و

دێرەکان، دەکرێ دیدمان چڕ بکەینەوە لەم چەند کێڵگە واتاییــەی خـوارەوە، کـە لە باکگڕاوەندی واتا وتراوەکان (مێتا واتاکان) هەڵمان گرتۆتەوە:

١- **ترووسکایی ژیان:** یەکێکە لە فیڵدە واتاییەکانی ئەم دەقەی پـایز، کـەوا زۆر بە کزی لە دێرەکانی (٢،١٢،١٤) خۆیان دەخەنە روو:

**٢- بووکی پرچ زەرد،**

**١٢- شان و مل رووت**

**١٤- هەردووکمان جووت**

٢- **خەم و نیگەرانی:** خەم و نیگەرانی و ڕاڕایی یەکێکە لە کێڵگە واتاییــەکان و پانتاییەکی زۆری بونیادی دەقەکەیان داگیرکردووە، خەم و نیگەرانی بۆ نەمانی جوانی کە لە دێرەکانی (٣،٤،٨،١٣،١٥،١٦،١٧) دەردەکەون، هـەموویان ئامـاژەی بۆ مردنیان لەخۆ گرتووە، مـردنیش چـەمکێکە لـەو چـەمکانەی کـە زۆربـەی زۆری شاعیرە رۆمانسییەکان خۆیان پێوە خەریك کردوون.

**٣- من مات، تۆ زیز:**

**١٤- هەردوو هاودەرد!**

**٨- دوایی نایە: دادم، دادت،**

**١٣- من مات، تۆ زیز،**

**١٥- هەر چەند گوڵ سیس ئەبێ بگرین،**

**١٦- ئاڵتوونی دار ئەڕژێ بگرین،**

**١٧- پۆلی باڵدار ئەفڕێ بگرین،**

٣- **نائومێـدی:** نائومێـدی کـە بـە رەنگێکـی دی دەچـێتەوە ژێـر چـەتری بـێ هیوایی و بێزاری، لە دێرەکـانی (٥،٦،٧،٩،١٨،١٩)دا ریزبوونـە، رووبـەرێکی زۆری لە بونیادی ئامادەیی شیعرەکەدا کۆنترۆڵ کردووە.

**٥- من فرمێسکم، تۆ بارانت،**

**٦- من هەناسەم، تۆ بای ساردت،**

**٧- من خەم، تۆ هەوری گریانت..**

**٩- هەرگیز، هەرگیز**

**١٨- بگرین،، بگرین. .چاومان نەسڕین،**

**١٩- هەرگیز، هەرگیز،**

٤– **فەنابوون:** فەنابوون چەمك و رایەڵەیەكی دیكەیە و، دەكرێ لەودیو ئەو وشانە رایەڵەیەكی دی واتایی بدۆزینەوە، ئەویش دوا وێستگەیی ژیان و فەنابوونە و، دەشێ لە ژێر كێڵگەی واتایی (مەرگ و فەنابوون) ریزیان بكەین، هاوكات كێڵگەیەكی دی واتاییە و لە دێرەكانی (٢٠،١١،١٠،١)دا خۆیان رەنگڕێژ كردووە:

**١– پایز! پایز!**

**١٠– پایز! پایز!**

**١١– پایز! پایز!**

**٢٠– پایز! پایز!**

٥– **بازنەی مەرگ:** لەم فیڵدەدا كێڵگە واتاییەكانی (فەنابوون، خەم و نیگەرانی، نائومێدی) خۆیان هەڵدەگرنەوە و ریزدەبن، كە هەموو دێرە شیعرەكانی دەقەكە دەگرێتەوە، جگە لە دێرەكانی (١٤،١٢،٢) نەبن.

٦– **بازنەی ژیان :** ئەو كێڵگە واتاییەش تەنیا فیڵدی (ترووسكایی ژیان) دەگرێتەوە، كە لە دێرەكانی (١٤،١٢،٢)دا ریزبوونە. دەكرێ كۆی سەرجەم كێڵگە واتاییەكانی ئەو دەقەی گۆران لە وێنەی (٥)دا، بە پێی رێژەكانیان وێنا بكەی



ئەگەر هەردوو بازنەكانی (مەگ و ژیان)یش وەك دوو بازنەی دەلالی وەربگرین، كە دەرئەنجامی كۆی هەرچوار فیلدە واتاییەكانی دەقی (پایز)ن، ئەوا دەكرێ لەم هێڵكارییەی خوارەوەدا دەرئەنجامی گشتی فیلدە واتاییەكان كە بە چ ئاراستەیەكدا هەنگاویان هەڵهێناوە بدۆزینەوە. لەم هێڵكارییەدا دەرئەنجامی گشتی دەقی (پایز) بە ئاراستەی مەرگ و فەنابوون رۆیشتووە، كە رێژەكەی (٨٨٪)ە و، زۆر زیاترە لە رێژە بازنەی ژیان كە وەك ترووسكاییەك دیارە و رێژەكەی (١٢٪)یە، هەروەك لە وێنەی (٦)دا، خراوەتە ڕوو :




وێنەی (٦)

**لە رێگەی ستراتیژیەتی هەڵوەشاندنەوەگەراییانەی دەقدا:**

لە رووگەیەكی دیكەی ئەم ستراتیژیەتەوە، دەكرێ خوێندنەوە بۆ دەقی (پایز)ی گۆران بكەین، ئەویش بە هەڵگرتنەوەی دووانە لێكدژەكانی هەناوی دەق و پرۆسەی هەڵگەڕانەوەی ئەو چەمكە دووانە لێكدژانە، كە دەشێ لە خوارەوە زیاتر لەسەری رابوەستین و یەكە یەكەی هەنگاوەكانی پراكتیزە بكەین:

١- بە حوكمی ئەوەی كە بونیادی دەقی (پایز) هەڵگری تۆی جیاوازییە، واتە دەقی پایز بەحوكمی ئەو زمانە هونەرییەوە توانیویەتی چەندین مانا لەودیو وشەكاندا هەڵبگرێ، ئەمە سەرەڕای جیاوازی لە مانا و لە چەمكە دووانە لێكدژەكان. بە واتایەكی دی كاتێك دەگەینە ئەو راستییەی كە ئەم دەقە هەڵگری ئێستاتیكییەتی زمانییە، ئەوا بە پێی ستراتیژیەتی هەڵوەشاندنەوە رێگەی كاركردنمان لەبەردەم ئاسان دەبێت، چونكە ئەم ستراتیژیەتە بە شوێن زمان و خلیسكانی زمانیدا وێڵە و دەیەوێت هەنگاوەكانی پراكتیزە بكات، لێرەدا دەگەینە ئەو بڕوایەی كە دەكرێ خوێندنەوەی دەقی پایز بە پێی ستراتیژیەتی هەڵوەشاندنەوە ئەنجام بدەین.

٢- دۆزینەوەی كایە و وشە دژ هەڵگرەكان (دووانە لێكدژەكان) لە هەناوی دەقە شیعرییە بنەڕەتییەكەی پایزدا بریتین لە دێرەكانی (٨،٧،٦،٥،٣)كە ئەمانەی خوارەوەن:

شاعیر لەدێری سێیەمدا لە چەشنی دیالۆگێكدا لەگەڵ جەستەی پایزدا كاتێك كە دەڵێت: **(من مات، تۆ زیز)** واتە بەچەشنی زیزی تۆ من ماتم بەرامبەر پرسی فەنابوون و مەرگ، یان ئەگەر تۆ زیزی لە بەرامبەر ئەم پرسە، ئەوا لە بەرامبەر فۆبیای مەرگ من ماتم، كە چۆن جوانیی گوڵەكان لەناو دەبات. لەدێری پێنجەمدا كەرەستەی ماتی شاعیر (فرمێسك، هەناسە، خەم)ە، كەچی كەرەستەی زیزبوونی پایزی بووك (باران، با، گریان)ە، بەوەی كە دەڵێت: **(من فرمێسكم، تۆ بارانت، من هەناسەم، تۆ بای ساردت، من خەم، تۆ هەوری گریانت)** لە نیەتی ئێمەدا چاكتر وابوو شاعیر توخمە بەدەنگەكانی وەك: (باران، با، گریان)ی بدابوایە پاڵ رەگەزی شاعیریەتی خۆی و توخمە بێدەنگەكانی بدابوایە پاڵ رەگەزی مێ، چونكە (مێ/ بووك) نیانترە لە (نێر/ شاعیر) یان بەواتایەكی دی دەنگی نێر تیژترە لە دەنگی مێ، ئەمە ئەگەر لە مانا فیزیكییەكەیەوە سەیری بكەین، بەڵام ئەم بەپێچەوانەكردنەوەیە لەلایەن شاعیر مەبەست و مەغزای خۆی هەیە، ئەویش رەنگە لەبەر ئەوەی وەرزی پایز وەرزێكە هەڵگری سیفەتی (هاروهاج، بەدەنگ، توندوتیژ، شكێنەر، مەرگهێن... تاد) بێت.

بۆیە شاعیر لە بەرامبەر ئەم هەموو سیفەتەدا وای بە باش زانیبێ، بەڵام ئەوەی گۆران ئەنجامی داوە، بەبەرداکردنی رەنگێکی ئیستاتیکی و هونەرییە لە هەناوی ئەم وەرزە توندوتیژە کوژرێنەری ئەو هەموو جوانییەی سروشت، تەنیا لەبەر ئەم هۆکارەی بووبێت، بەڵام رەنگە دواجار لە تێڕوانینی ئێمەوە تووشی جۆرێك لە هەژمونی هەڵوەشاندنەوە ببێتەوە. یان بە جۆرێکی دی ئێمە ئەو خلیسکانە زمانییەی شاعیر کەشف بکەین ئەویش بریتییە لە جۆرە هاودژییەك، کە لە فۆرمی (نێر سالاری)دا خۆی هەڵدەگرێتەوە، ئەویش بەو واتایەی کە هەمیشە نێر بە حوکمی هەبوونی هێز، کەرەستە باشەکان بۆ خۆی بخوازێ و کەرەستە هاروهاج و ناشرینەکان بدات بە ئەوی بەرامبەر، ((کێشە و ململانێکانی لەو سیستەمەدا خۆی ئەنوێنێ بە شێوەیەکی تراژیدی لە نێوان"من- تۆ" "بووکی پرچ زەرد"ی زاڵ دەرەخسێنێ و دەیەوێت رۆڵی دایك سالاری بەسەر (منی) بێ هێزدا بسەپێنێ، کە دووانە دژ بەیەکی"نێر- مێ"تیایە)) (٣٠، ل٧٩) .

لێرەدا رووبەڕووی کە دووانە لێکدژەکانی (من/ ئەو) دەبینەوە، کە دەشێ ریشەی ئەم چەمکە دووانەلێکدژانە خۆی درێژ بکاتەوە بۆ قووڵایی رایەڵە کلتوورییەکان بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی، وەك: (خۆرئاوا/ خۆرهەڵات)، (شارستانییەت/ بەربەرییەت)، (نێرسالاری/ مێ سالاری)، (دەنگ/ نووسین)، (ئامادەگی/ نائامادەگی)، (ژیان/ مەرگ)، (ژەهر/ چارەسەر)، (خودا/ شەیتان)... تاد. شاعیر لە سەرەتای پارچەی یەکەمی شیعرەکەوە تاوەکو کۆتایی پارچەی یەکەمی شیعرەکە (١-١٠) بە شێوازی دووانەیی شیعرەکەی تێپەڕاندووەو، لە پارچەی دووەمی شیعرەکەش ناوە ناوە دووانەی چەمکەکانی هێناوەتەوە. دوای هەنگاوی رەنگڕێژکردنی چەمکە دووانەییەکان شاعیر بە کارێکی تێپەڕاندنی **(دوایی نایە)** زەنگی ئاگاداری بۆ خوێنەران لێدەدات، بەوەی کە ئەم حاڵەتە فەنابوونەی مەرگ کۆتایی نایەت، هەربۆیە بەشێوەی بازنەیی هەمیشەیی **(هەرگیز، هەرگیز، پایز! پایز!)** ئەم حاڵەتەی هێشتۆتەوە، بۆ ئەوەی تاکو ژیان بەردەوام بێ ئەم هەرگیزیەتەش هەر بمێنێ، ئەمەش بەردەوامییەکی بە شیعرەکە داوە، کە بە پایز پایز دەست پێدەکات و بە پایز پایزیش کۆتایی پێ هێناوە.

ئـەوەی لێـرەدا پەیوەسـتە بـە خوێندنـەوە و ڕاڤـەکانی ئێمـەوە لـە هـەناوی ئـەم دەقەدا، دەکرێ لە وێنە هێڵکاری (٧) زیاتر روون ببێتەوە:




وێنەی (٧)

دوای ئەوەی ئاماژەمان بـە دووانـە لێکـدژەکانی ئـەم دەقـە دا، دەکـرێ دوای ئـەم هەنگاوە، دەست بکەین بە پرۆسەی ئاوەژووکردنەوەی چەمکە دووانـە لێکـدژەکان و، سەرلەنوێ ڕاڤەکردنەوەی ئەم چەمکانە، وەك لە خوارەوە بە شێوەی هێڵکـاری خراوەتەڕوو:

**وێنەی (٨)**

**(پرۆسەی بەر لە ئاوەژووکردنەوەی دووانە لێکدژەکان)**




**وێنەی (٩)**

**(پرۆسەی ئاوەژووکردنەوەی دووانە لێکدژەکان)**




لەم هێڵکارییەدا پرۆسێسی دووانە لێکدژەکانی وەك: **(مات، فرمێسك، خەم)** لە (خود/ شاعیر) وەردەگرینەوە و دەیدەینە پاڵ (بابەت/ سروشت)، بەپێچەوانەشەوە دووانە لێکدژەکانی وەك: **(زیز، بای سارد، هەوری گریان)** لە

(بابەت/ سروشت) وەردەگرینەوە و دەیدەینە پاڵ (خود/ شاعیر) تاوەکو بگەین بە ئاکام و خوێندنەوەیەکی دی. واتە لە ڕێگەی ستراتیژیەتی هەڵوەشاندنەوەی چەمکە دووانە لێکدژەکان دەمانەوێت تێڕوانینەکان بگۆڕین، بۆ ئەوەی مانای دی و ڕوانینی دی لەودیو دەمامکی وشەکان بدۆزینەوە: ئێستا دوای گۆڕینی شوێنی دووانە لێکدژەکانی چوارگۆشەی (١) بۆ نێو چوارگۆشەی (٢) وێنەی (٨،٩)وە بەپێچەوانەشەوە، ئەوا چەمکە زبر و هاروهاجەکانی وەك: (زیز، بای سارد، هەوری گریان) دەدرێنە پاڵ خودی (شاعیر/ نێر/♀) هەروەها چەمکە کپ و بێدەنگەکانی وەك: (مات، فرمێسك، خەم) دەخرێنە پاڵ (سروشت/ مێ/♂) ڕاڤەی دوای پرۆسیسی ئاوەژووکردنەوەکە دووانەی چەمکەکان وادەکەونەوە: شاعیر لە خەمی لافاوی مەرگ و فەنابوون وەك بووکێکی زیزبوو خەمەکەی وەك بای سارد هەڵدەکات و دەداتە گریان، ئەمەش نیشانەی ئەوپەڕی بێ ئومێدییە و ناتوانێ لە هەناوی خۆیدا کپی بکات و دەری نەبڕێت، کەچی بە پێچەوانەوە ئەمجارە پایزە بووك حاڵەتە نەرم و نیانی و بێدەنگییەکەی وەردەگرێتەوە، بەوەی لە بەرامبەی خەمی هەڵکردنی بای مەرگ و فەنابوون وەك کەسێکی ماتبوو و بە بێدەنگی دەست دەکات بە فرمێسك ڕشتن و خەم خواردن. دەکرێ لە ئاکامدا هەردوو جەمسەر (شاعیر (خود)/ نێر/♀)و ((سروشت (بابەت)/ مێ/♂) لە هاوکێشەیەکدا کۆبکرێنەوە، بەوەی کە هەردوو جەمسەر لە کۆتاییدا (هەردووکمان جووت) جووت دەبن، کە ئەم جووتبوونەش هەم ئیحایەکی سێکسی دەدات، هەم دەربڕی ئاوێتەبوونی خود و سروشتمان بۆ بەیان دەکەن، وەك لەم هاوکێشەیەدا بەرجەستە دەبن (جووتبوونی خود + سروشت لایەنی نێوان پیاو و ئافرەتە، هەربۆیە تارمایی ئافرەت ئامادەیە، بەڵام پەنهانە، لەکۆتاییدا دەڵێت:

خود + سروشت = خود + ئافرەت

سروشت = ئافرەت) (١٦، ل٢٠٣) .

لێرەدا لە ڕێگەی ڕاڤە و شکاندنی بەربەست و دەمامکەکانی وشە و ماناکان، گەیشتینە ڕاڤە و خوێندنەوەیەکی دی، ئەمەش دووجار لەگەڵ ئامانجی ستراتیژیەتی هەڵوەشاندنەوە یەك دەگرێتەوە، بەوەی کە لە هەوڵی فرە ڕەهەندی و کرانەوەی ماناکان و شکاندنی دەمامکەکاندا تێدەکۆشێت.

**لە ڕێگەی لۆژیكی سێیەم یان لۆژیكی هەڵوەشاندنەوەدا:**

دەكرێ ئەمجارە لە رووگەیەكی دیكەی ئەم ستراتیژیەتەوە خوێندنەوە بۆ دەقی (پایز)ی گۆران بكەین، كە بە ڕێگەی (لۆژیكی سێیەم یان لۆژیكی هەڵوەشاندنەوە) ناسراوە. دەكرێ لێرەوە سیتماتیكیەتی ئەم لۆژیكە لەم هێڵكارییە وێنەیەی (١٠) روونتر دەربكەوێت:



وێنەی (١٠)

ئەوەی لێرەدا دەمانەوێت پیادەی بكەین و بیخەینەڕوو، لۆژیكی (٣)یە، كە بە لۆژیكی هەڵوەشاندنەوە ناسراوە. ئەم لۆژیكە لەنێوان جەمسەرەكانی عەفەوییەت و ڕەهاییەت كار دەكات، كار لە پێناو چەندین هەنگاو و چەندین دۆزینەوە دەكات، سەرەتا لە ڕێگەی دروستكردنی فەزایەكی گوماناوی بەوەی كە دەكرێت لە ڕێگەی پرۆسیسی گومانەوە لە هەوڵی هەڵوەشاندنەوەی میتافیزیكیای ئامادەی هەر نێوەندێك دابین، بەوە كە دەشێ هەر دەقێك لە سەرمەدییەت رزگار بكرێت و

کار لە پێناو کرانەوەی دەق و فرەمانایی بکرێت، چونکە هەمیشە میتافیزیکیای ئامادە و تاك جەمسەر دەیەوێت لە ڕێگەی دامەزراندنی نێوەند، سەروەرییەت بە خۆی بدات و ئەوی بەرامبەریش بەرکەنار بکات. ئیدی ئەم لۆژیکی (٣)یە، کار بۆ ڕماندنی سێبەری میتافیزیکیا دەکات، ئەویش لە ڕێگەی خولّقاندنی جیاوازی و تێکدانی چەمکە دووانەیییەکانی وەك: (نێر/ مێ، قسە/ نووسین، خێر/ شەڕ، باش/ خراپ، گیان/ ماددە، دال/ مەدلوول، ناوەوە/ دەرەوە، ئامادە/ نائامادە، هەست/ نەست، سەنتەر/ پەراوێز، بون/ ماهیەت، سەرەتا/ کۆتایی....تاد). لێرەدا دەشێ لە ڕێگەی پراکتیزەکردنی چەند هەنگاوێکی ئەم لۆژیکی (٣)یەوە، کەشفی چەند یەکەیەکی نەوتراو بکەین، کە لە هەناوی دەقی (پایز)دا جێگەی بۆ کراوەتەوە، وە کارکردن بۆ لە باربردنی ئەو گریمانە میتافیزیکیایەی کە لەم دەقەدا کارمان بۆ دەڕەخسێنێ، بەوەی کە سەرمەدییەتێك بەو فکرە میتافیزیکییە دراوە، کە ئەویش چەمکی **(مردن)**ە. ئەگەر لە سەرەتاوە تاکو کۆتایی دەقەکە، لە دێری (١ تا ٢٠) سەیری رووبەری ئەم دەقە بکەین، ئەوا دەبینین شاعیر کەوتۆتە نێو فەزایەکی زۆر چڕی بەمەرگ و فەنابوون پۆشراو، بەوەی کە سەرجەم وشەکان هەر لە سەرەتای یەکەم دێرەوە تاکو کۆتایی شیعرەکە، بە ڕەنگێکی خەماوی کپ و سارد و مەرگهێنەوە ڕەنگ کراون و سنوورێکیان بۆ دەستنیشان کردووە ((سنووری بێدەنگی، واتە سنووری مەرگ)) ( ١٢،ل١٧٨) ، وشەکانیش **(مات، زیز، دەرد، فرمێسك، بای سارد، خەم، هەوری گریان، داد، پایز، سیس بوون، ڕژانی ئالّتوون، فڕینی بالّدار، چاو نەسڕین)** ن، ئەگەر هەموو وشەکان بەچوار دەوری یەکدیدا لە شێوەی بازنەیەك وێنا بکەیت، ئەوا دەشێ شیعرێکی وێنەداری بازنەییمان بۆ بکێشرێ، مەبەست لەو بنیاتە بازنەیییەش لە روانینی شاعیرەوە دەکرێ رەنگدانەوەی ئەو بارە نیگەرانی و دەروونییەی شاعیر بێت ((دەست پێکردنی دەق بە هەلّوێستێك یاخود دۆخێکی دەروونی و لە کۆتاییشدا بگەڕێتەوە سەر هەمان هەلّوێست لە دەقدا، یاخود شاعیر پەنا دەباتە بەر دووبارە بوونەوەی یەکەم دێر و ناوەڕۆکی دەق)) (٣٠، ل٥٤). واتە ریزکردنی فەزا و بونیادی گشتی ئەم دەقە لە شێوەی بازنەبەندییەکدا، دەشێ بگەڕێتەوە بۆ پەیوەستبوونی بە دۆخێکی (سایکۆلۆژی/ سایکۆ– سۆسیۆلۆژیا)نەی نووسەر. بە گشتی بونیادی

دەقی پایز لە رووداوێك دەچێت لە سەر بنەما و شێوگێکی بازنـەیی خـۆی دروسـت دەکـات، کـە لـە چـەند وێنــە و دیمــەن و داڕشــتەیەکدا پێکهــاتووە و ((جـۆرە پەیوەندییەکی تایبەتی لەنێوانیانـدا هەیـە و شـێوەیەکی یـەکگرتوو و هاوئاوازیـان لـەخۆگرتووە بـەدەوری یـەك ناوەڕۆکـدا دەسـووڕێنەوەو دەچـنەوە یەکـەم خـاڵی دەسـتپێکردن و لـە پێنـاو وێنـەی سـەرەکیدان)) (٣٠،ل٥٤) کـە ئـەویش وێنـەی مەرگە، واتە مەرگ یەکەم خاڵی دەستپێکە و سەرجەم وێنە و داڕشتە شیعرییەکان لـە پێنـاو گەیانـدنی مـەغزای نووسـەر و وێنـەی سـەرەکیدا کاردەکـەن، وەك لـەم هێڵکارییە وێنەییەی (١١)دا، دەرکەوتووە:




**وێنەی (١١)**

لــەم وێنەیــەدا زۆر بــە روونــی پیمــەی ســەرەکی بونیــادی شــیعری (پــایز) دەرکەوتووە، ئەو رونییەش بۆ فاکتەری روونی مانـا و رسـتەکانی نێـو شـیعرەکە دەگەڕێتەوە، چـونکە ((پیمـە لـە (مانـا)وە لـە دایـك دەبێـت، مانـای روون پیمـەی

ڕوونمان دەداتیٚ، بەلاٚم مانای نادیار یا شاراوەو ناڕۆشن پیمەی لێڵ و نائاشکرامان دەداتیٚ)) (٣،ل٧٢). لەم وێنەیەدا دەبینین سەرجەم وشە و وێنە شیعرییەکان لە خزمەتی گەیاندنی مەغزای بونیادی شیعرەکە و خاڵی ناوەند و سەرەکی بونیادەکەدا هەنگاو دەنێن، کە ئەویش خاڵ و چەقی (مەرگ)ە. (گۆران) لەو دەقەدا دەیەوێت لە پێناو مانەوەی خۆی و شتە جوانەکاندا بە شوێن گوتارێکدا بگەڕێت، ئەو گوتارەی کە شوناس بە جەستەی ببەخشێت و لە هەوڵی مانەوە لە ئایندەدا هەنگاو بنێت، واتە هەوڵی شیعر نووسین یەکسانە بە هەوڵی زیندوو ڕاگرتنی نووسەر لە ئایندەدا، بۆ شاعیر بەردەوام دەیەوێت شوناس و بوونێك بۆ جەستەی شیعر و خۆی بەرهەم بهێنێت، چونکە وەك (هایدگەر) دەڵێت: ((مرۆڤ ئەو کەسەیە هەمیشە خەریکی دروستکردنی بوونی خۆیەتی)) (٣٧، ل٥٦٤) . بۆیە کاتێك شۆڕ دەبینەوە بۆ هەڵگرتنەوەی ئەو مانایانەی کەوتوونەتە ئەودیو ڕایەڵ و وێناکانی دەقی پایز، ئەوا دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە بەڵیٚ (گۆران) ویستوویەتی لەم دەقەدا ڕەنگڕێژی گوتارێك بکات، کە لە توانایدا هەبێت دونیایەك پرسیار سەبارەت بە دووالیزمەی (ژیان و مەرگ) بخاتە ڕوو، وەك: ((پرسیاری چۆن پێبکەنین لەو کاتەی کە جوانییەکان لەنێو پەنجەکانمان دەمرن و، ئێمەش بەرەو مردن دەبەن؟ چۆن بژین لەو کاتەدا کە ژیان ترس و ڕاراییی و بێهوودەیی دەرِوونی بۆ هەمیشە تاقە دەسەڵاتێکی هورووژمبەرە لە پێوەندییەکانی تاکێکی بیرکەرەوە بۆ دونیا؟ چۆن بە هیواکانمان بچینە نێو ژیانێکەوە لەو کاتەدا کە ئێمە لەنێو هیواکاندا بە تراژیدیا لە چوارچێوە دراوین؟؟)) ( ٧،ل٤٥٩) . ئەمانەو چەندین پرسیاری دی کە کەوتوونەتە ئەودیو زمانە ئاساییەکەی دەق (مێتا زمان)، کە پەیوەستبوونی خۆیان لەم دەقەدا دەخەنەڕوو. واتە دەکریٚ سەرجەم پرسیارەکان خۆیان لە نێو دووانە جەمسەرەکانی (ژیان–مردن) ڕایەڵە بکەنەوە، ئەوەتا وەك شاعیر دەڵێت: **(گوڵ سیس ئەبیٚ بگرین، ئاڵتوونی دار ئەڕژیٚ بگرین، پۆڵی باڵدار ئەفڕیٚ بگرین)** لێرەدا هەموو کردارەکان (سیسبوون، ڕژان، فڕین) دەلالەت لە هەناوی دەربڕین لە مردن و جیابوونەوە و فەنابوون دەکەن، کە ئەمەش ئەوپەڕی بێزاری و نیگەرانی شاعیر نیشان دەدەن، ئیدی پایز لە دیدی شاعیر دەبێتە وەرزی (کۆچکردنی باڵندەکان و وەرزی مردنی هەموو بەها

جوانەكانی ژیان، ئیدی دوای ئەو هەموو فەزا مەرگاوییە شاعیر چیتر ناگەڕێت بەشوێن (( وشەی پڕ لە حیكمەت و پەند و ئیدیۆمی رازاوەی زمانەوانی و رستەسازیدا ماناكانی خۆی یا وەسفێك بۆ خۆی كامل بكا، ئەو بە ئاقارێكدا دەڕوا كە پڕە لە شكستیی ئەزموونەكانی ژیان، نووسینەوەی شیعر و ساتەكانی، دوای رەشەبا كاوڵكارییەكانی بوونە، شاعیر كەسێكە لە نێوان وەرزەكانی مردن و تەنیایی و خەمدا بیر دەكاتەوە)) (٧،ل٤٥٣) . بۆیە لە دیدی گۆرانەوە چیتر پایز وەك ئەو وێنە ئێستاتیكییە نامێنێتەوە، كە جوانیبەخش بێت، بەڵكو ئەمجارە جۆرە دەمامكێكی دی دەپۆشێ، بەوەی دەبێتە بكوژی هەموو جوانییەكانی بوون، دەبێتە ئامرازی خەساندنی هەموو یەكە ئیرۆسییەكان، بۆیە شاعیر لەبەرامبەر ئەو هێزەدا ئیرادە لەدەست دەدات و دەستەوەستان دەبێت، هەروەك دەڵێت: (**بگرین، بگرین..چاومان نەسرین،**).

ئەگەر شۆڕ ببینەوە بۆ هەڵگرتنەوەی ئەو تێڕوانینانەی كە هزرمەندان و فەیلەسووفان خستوویانەتە ڕوو دەربارەی دووانەی چەمكەكانی وەك (ژیان/ مردن)، ئەوا دەبینین را و بۆچوونێكی زۆری لەسەر خراوەتە ڕوو بەتایبەت لەلای (هیگل)ەوە، ئەویش لە بابەتەكانی هەریەك لە (هونەر، مەرگ، بوون، ژیان،....تاد) پەیوەستبوونیان بە ئێستاتیكاوە. (گۆران) لەم دەقەدا چۆن توانیویەتی بونیادی ئامادەیی دەقەكەی لە سەر سیستەمی زنجیرەیی و یەك بەدوایەك هاتوویی دابڕێژێ، ئاواش توانیویەتی كەناڵەكانی مەرگ و ژیان بەشوێن یەكدا ریز بكات ((لە هەردوو بەشی مەرگ و ژیان بەدوای یەكداهاتن ئامادەیە، لە هەردووكیشیان چێژی بوون و نەمان هەیە، ئەم بوون و نەمانە لە هەردووكیاندا یەك ئاستی نییە، لە قۆناغی مەرگدا بەدوای یەكداهاتن بارێكی سەنگین و ئاڵۆز و تراژیدیانەی هەیە، كە چارەسەر و لێكدانەوەكانی گەلێك سەنگینن و هەروا بە ئاسانی نایەنە دی، لە مەرگدا بەدوای یەكداهاتن ڕوویەكی شاراوەی هەیە)) (١٢،ل٢٢–٢٣). ئەگەر لە نزیكەوە لە باكگراوەندی دێرەكانی (١تا٢٠)ی شیعرەكەدا بڕوانین، ئەوا دەبینین بونیادی ئامادەی ئەو دەقەی (پایز) لە شێوە نەخشەی دوو جەمسەری دژ بەیەكی (ژیان/ مەرگ) وەستاوە، كە هەر یەكێك لەو جەمسەرانەش چەندین یەكەی دی بەخۆوە هەڵگرتووە كە وەك نووكی

سێگۆشەیەك، چەند دانە یەکەی چەمکەکان زیاتر بن ئەوەندە فەزای ژێرەوەی سێگۆشەکە بەرینتر دەبێت، لەبەرامبەر ئەمیشدا رووەکەی دیکەی سێگۆشەکە لێك دەکشێ و زیاتر فراوانتر دەبێت. واتە چەندە قوولْ ببینەوە بەنێو چەمك و ئەداکانی بازنەی ژیان، ئەوەندەش مەداری سێگۆشەکە تیژتر و فراوانتر دەبێت، بە پێچەوانەشەوە دیوی مەرگیش بەم شێوەیە ئەدا بەخۆی دەدات، ئەمەش بە حوکمی ئەوەی ((دەق ململانێی نێوان، ژیان و مەرگە)) (١٢،ل٤٦) ، وەك لە وێنەی (١٢)دا، خراوەتە ڕوو:



دەقـی (پـایز) بـە حـوكمی ئـەو داڕشـتە زمانییـەی كـە هەیـەتی، توانیویـەتی وێنایەكی نوێی مەعریفی و فەلسەفییانەی قووڵمان بۆ بكێشێ، كە خۆی پەیوەست بكاتەوە بە فەزای مەرگ، واتە ئەوە تێگەیشتن و خوێندنەوەی گۆرانی شاعیرە بۆ چەمكی مـردن، چـونكە ((یـەكێك لـە خەسـڵەتە هـەرە گرنگـەكانی شـیعر بریتییـە لەدۆزینـەوەی شـێوەی نـوێ بـۆ گوزارشـتكردن لـەخۆی لـە پێكهاتـە بونیـادی و فەلسەفییەكانی خۆی)) (١٣،ل١٢٧). واتە ئەوە گۆرانە دەیەوێت لە دووتۆی زمانی شیعرەوە جارێكی دی وێنەی پەیوەندییەكانی نێـوان واقیـع و مـرۆڤ و زمانمـان بـۆ دابڕێژێتـەوە ((شـیعر پەیوەنـدی نێـوان واقیـع و مـرۆڤ و نوێكردنـەوەی زمانـە لـە دووتوێی جیاوازییەكاندا)) (١٠، ل١٤١–١٤٢). یان دەشێ بەو واتایە بڵێین: گـەڕانی شاعیر لە هەناوی زماندا لە پێناو ئەوەیە كە دەروازەیەك لە بـەردەم تەقاندنـەوەی سەرجەم ئەو وزە شاراوانە والأ بكات كە لە زماندا ونن ((گەڕانی شاعیر لـە زمانـدا، جارێك بە مەسخكردنی واتاكان، جارێك بە شیكردنەوەی ڕستە و وشـەكان، جارێـك بە پەرتكردنەوەی دەلالەتەكان، تەقاندنەوەی ئەو هێزە شـاراوانەیە كـە لـە زمانـدا بزربوونە)) (٢٢،ل٣٧). بۆیە ئەگەر بـەجۆرێك لـە جۆرەكـان ((شـیعر كەشـفكردن)) (٢،ل٨) . بێـت، ئـەوا گـۆران دەیـەوێت لـە دەقـی (پـایز)دا كەشـفی نهێنییـەكانی گەردوونمان بۆ بكات و، لە دیدی خۆیەوە راڤە و خوێندنـەوەی ئـەو خاڵـە نادیـار و پرسیار هەڵگرانەمان بـۆ بگوازێتـەوە، هـەر بۆیـە شـاعیر بـۆ ڕەواندنـەوەی خـەم و پەستیی خۆی، وێنەیەكی هاوچەشنی خۆی لە سروشـت وەردەگرێـت، بـۆ ئـەوەی لەكاتی خەم و نیگەرانییەكانیدا سەر بە سینەی یەكتر بكـەن و بـۆ یـەكتری بگـرین ((گۆران بە وەرزی ساڵدا دەگەڕێ لە هـەموویان خـەمناكتر دەدۆزێتـەوە تـا بكاتـە هاوڕێی دەروونی پەستی و لەگەڵ ئـەودا بـۆ بـەختی دەگـری)) (١،ل١٢٧). لێـرەدا گۆران دەیەوێت لە ڕێگەی دۆزینەوەی هاوڕێی (پایزە بووك)، گفتوگۆ سازبكات، بۆ ئەوەی نەمریی بە بوون و ژیانیان بدات، لە ڕێگەی بونیادنان و نووسینەوەی شیعر (دەنگ/ نووسین)، تاوەكو لە هەناوی زماندا سـەرجەم ئەرشـیف و یادەوەرییـەكان بڕوێنـێ، بـۆ ئـەوەی لـە ڕێگـەی ئـەو بـە زمانكردنـە، جاویـدانی بـە شـیعر و بـوون ببەخشێت.

## ئەنجامەکان

لە ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوەیەدا گەیشتینە ئەو ڕاستییانەی خوارەوە:

١- دەقی (پایز) یەکێکە لەو دەقە زیندووانەی کەوا دەکرێت لە چەندین رووگەی جیا جیاوە هەڵیبوەشێنینەوە و بیخەینە نێو تانوپۆی خوێندنەوەیەکی ئاگاییانەی مەعریفیانەوە، چونکە دەقی پایز، یەکێتی مانا دەپارێزێ و سنوورێکی تۆکمە و بەهێزی بۆ مانا داناوە و بەرامبەر بەمەش هەموو سنوورەکانی خوێندنەوەی شێوەیی شیعری بە کراوەیی و والآیی هێشتۆتەوە.

٢- دەرئەنجامی گشتی دەقی (پایز) بە ئاراستەی مەرگ و فەنابوون رۆیشتووە، کە رێژەکەی (٨٨٪)ە و، زۆر زیاترە لە رێژە بازنەی ژیان کە وەك تروسکاییەك دیارە، کە رێژەکەی تەنیا (١٢٪) یە.

٣- لەرێگەی تێکشکاندنی نۆرمی زمانی ئاساییەوە خەریکی بونیاتنانەوەی زمانێکی فەنتازیانەی کراوەیە بۆ دەقەکەی هەر ئەمەشە وای کردووە دەقەکەی توانیویەتی بەکراوەیی خۆی لەبەر دەم ڕوانینەکانی خوێنەر هەڵبخات و وەکو دەقێکی زیندوو دەکرێت لە چەندین ڕووگەی جیاجیاوە هەڵبوەشێنرێتەوە و بخرێتە ناو تانوپۆی خوێندنەوەیەکی ئاگاییانەی مەعریفییانە.

٤- لە هەڵگێڕانەوەی یەکەم دێری پارچەی دووەم بۆ یەکەم دێری پارچەی یەکەم واتە هەڵگێڕانەوەی پێچەوانەیی بە شێوەیەکی بەدوایەك هاتوو ، پەیوەندییەکی پێچەوانەیی لەنێوان هەردوو فەزای پارچەی دەقەکەدا دروست دەبێت ئەمەش دەبێتە مایەی ئەوەی خوێنەر هەست بەوە بکات کە وێنە و فۆرمێکی تری کەوتۆتە بەر دید و وێنایەکی تازەوە بۆ دروست بووە . کە چەشنێك لە کرانەوەی دەمامك و دۆزینەوەی ئیحای ئەودیو پەردەو پەیڤ و دیوە شاراوەکان دەخاتە ڕوو.

٥- جۆرە هەڵخلیسکانێکی زمانی تیایە کە بریتییە لە جۆرەها دژیەك کە لەخودی نێرسالاری خۆی هەڵدەگەڕێتەوە ئەویش بەو واتایەی کە هەمیشە نێر بەحوکمی هەبوونی هێز کەرەستە باشەکان بۆ خۆی بخوازێ و کەرەستە هارو هاج و ناشیرنەکان بدات بە بەرامبەرەکەی .

# سەرچاوە كان

١- بەكوردی

أ- كتێب


١- ئەدەبیاتی نوێی كوردی، د.عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ، چاپخانەی خوێندنی باڵا، هەولێر، ١٩٩٠.

٢- ئەدۆنیس، عەبدولموتەڵیب عەبدوڵلا، چ١، لە بڵاوكراوەكانی سەنتەری لێكۆڵینەوەی فیكری و ئەدەبیی نما، هەولێر، ٢٠٠٥

٣- ئەزموونی خوێندنەوە (چەند لاپەڕەیەكی ڕەخنەیی)، نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد، چ١، لە بڵاوكراوەكانی دەزگای چاپ و بەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٦..

٤- ئێستاتیكای دەقی شیعریی كوردی: كوردستانی عێراق ١٩٥٠-١٩٧٠، جەبار ئەحمەد حسێن، چ١، لە بڵاوكراوەكانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٨ .

٥- بیری ڕەخنەیی هاوچەرخ، و: نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد، چ١، دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی موكریان، هەولێر، ٢٠٠١..

٦- پێكهاتەو راڤەی دەق، بابك ئەحمەدی، و: مەسعوود بابایی، كتێبی سێیەم، چ١، لە بڵاوكراوەكانی سەنتەری لێكۆڵینەوەی فیكری و ئەدەبیی نما، هەولێر، ٢٠٠٥

٧- تیۆری بنیاتی شاراوە، نەجات حەمید ئەحمەد، چ١، دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨

٨- جاك دریدا و هەڵوەشاندنەوە (لێكوڵینەكا دەسپێكی)، فاضل عمر، چاپخانەی هاوار ـ دهۆك، ٢٠٠٥.

٩- جوانیناسیی شكست، موراد فەرهادپوور، و: مەنسوور تەیفووری، چ١، چاپخانەی رەنج، ٢٠٠٦

١٠- خەیاڵی زمان، عەبدولموتەلیب عەبدوڵلا، لە بڵاوكراوەكانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٤.

١١- خوێنەری كوشندە، بەختیار عەلی، چاپخانەی رەنج، ٢٠٠٥.

١٢- داهێنان و مەرگ، سەلاح حەسەن پاڵەوان، لە بڵاوكراوەكانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٣

١٣– دەق و راڤەکاری، شیکردنەوەی ئەو رستانەی دەکەونە دیوی شاراوەی دەقەوە، ئاوات محەمەد، چ١، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٨.
١٤– دەنگی بلووریینی دەق، عەبدولخالق یەعقووبی، چاپخانەی راز، سلێمانی، ٢٠٠٥.
١٥– دیوانی گۆران، عەبدوڵلا سلێمان، محەمەدی مەلا کەریم، چ٢، سلێمانی، ٢٠٠١..
١٦– ڕەخنەی بونیادگەری لە تیۆرەوە بۆ پراکتیزەکردن، د.عەلی تاهیر حسەین، لە بلاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٨ .
١٧– ڕەخنەی نوێی کوردی، د.کەمال مەعرووف، وەزارەتی رۆشنبیری– بەڕێوەبەرێتی چاپ و بلاوکردنەوەی سلێمانی، ٢٠٠٧
١٨– رێبازەکانی رەخنە، ئایان ماکلین، و: عەتا قەرەداخی، چ١، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٦
١٩– رێبازی ڕۆمانتیکی لە ئەدەبی کوردی دا، خورشید ڕەشید ئەحمەد، دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، چاپخانەی الجاحظ– بغداد، ١٩٨٩: ل٢٠٢– ٢٠٣.
٢٠– سروشت لە شیعری گۆران دا، د.فازیل مەجید مەحمود، چ١، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٧ .
٢١ - شەش لێکۆڵینەوەی شیعری، ئازاد ئەحمەد مەحموود، چ١، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨ .
٢٢– مێژووی خود لەناو لەنگەرییەکدا، نەجات حەمید ئەحمەد، چاپخانەی کریستاڵ، هەولێر، ١٩٩٧ .
٢٣– هەقیقەت و جوانی، بابەك ئەحمەدی، و: مەسعود بابایی، چ١، دەزگای بلاوکردنەوەی موکریانی، دهۆك، ٢٠٠٨ .
٢٤– هەڵوەشاندنەوەگەرایی، پیر ڤی. زیما، و: رێبین رەسول ئیسماعیل، چ١، دەزگای رێبین بۆ چاپ و پەخشی کتێب، ٢٠٠٤

**ب– گۆڤار:**

٢٥– ئارکیۆلۆژیای ئەپستیمی میشیل فۆکۆ و خوێندنەوەی ئەودیوی شیعری (پاییز)ی گۆران، حەیدەر جەوهەر، گۆڤاری نووسەری نوێ، ژ (٣٤)، ئەیلوولی، ٢٠٠٦، ل٤١.
٢٦– جوانییەکانی گوتن لە (پاییز)ی گۆراندا، ئەکرەم عەنەبی، گۆڤاری هەژان، ژ(٢)، هاوینی ١٩٩٩، ل١٩٠.

٢٧– ڕایەڵەکانی (سیحری فانتازیا) لە دەقی (زارا) دا، ستاری پیرداودی، گۆڤاری ڕامان، ژ٥٢، ٥ی تشرنی یەکەم، ٢٠٠٠، ل٤١.
٢٨– میتامۆرفۆس لەنێوان (وەهم – واقیع)دا، ستاری پیرداودی، گۆڤاری کاروان، ژ١٧١، ئاداری ٢٠٠٣، ل٢٣

**ج– ڕۆژنامە:**

٢٩– تێکشکانی دیالەکتیکی خود و سروشت لە شیعری پایزی گۆراندا، مەریوان وریا قانع ،ڕ– ئاسۆ، ژ١٨، ساڵی١٩٨٩..

**د– نامەی ئەکادیمی:**

٣٠– وێنەی شیعری لە ڕێبازی ڕۆمانتیکی کوردی دا، عبدالقادر محمد امین محمد، نامەی ماستەر، کۆلیجی زمان، زانکۆی سلێمانی، شوباتی ٢٠٠٠.

**٢– بە عەرەبی:**

**ا– کتێب:**

٣١– الرومانتيكية، د.محمد غنيمي هلال، دار الثقافة، بيروت، ١٩٧٣، ص٤٨
٣٢– قضايا النقد الادبي المعاصر، د. سمير سعيد حجازي، ط١، دار الافاق العربية، ٢٠٠٧..
٣٣– مداخل الى علم الجمال الادبي، عبدالمنعم تليمة، دار الثقافة للطباعة والنشر، قاهرة، ١٩٧٨..
٣٤– مرجع الطلاب في النقد التطبيقي، د. عماد علي سليم الخطيب، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت–لبنان، ٢٠٠٧.
٣٥– معرفة الاخر مدخل الى المناهج النقدية الحديثة، عبدالله ابراهيم وآخرون، المركز الثقافي العربي، بيروت، ١٩٩٠

**ب– گۆڤار:**

٣٦– المرايا المحدبة من البنيوية الى التفكيك، تاليف: د. عبدالعزيز حمودة، عالم المعرفة، ١٩٩٨، ص٢٤٢.

**٣– بە فارسی**

٣٧– ساختار و تاويل متن، بابك احمدى، چاپ نهم، تهران، ١٣٨٦

## ملخص البحث

((تطبيق استراتيجية التفكيكية في نص (الخريف) للشاعر (گۆران) ))

دراسة نقدية. محاولة لتعريف منهج التفكيكية ومبادئها الأستراتيجية كونها حركة جديدة جائت بعد البنيوية . انها بحث جديد وذو شأن في مجال النقد الأدبي سيما في أستغوار المستوى الأدنى للغة وأعماق النص وألتقاط الكيانات المتضادة للنص وتفكيكها ومن ثم أعادة بنائها من جديد . التفكيكية كحركة نقدية جديدة دخلت الى النقد الادبي الكوردي عن طريق ماترجمت الى اللغة العربية . ولكن لحد الآن لم يقدروا أن يستفيد من مباديء العلمي لحركات النقد مابعد البنيوية وخاصة التفكيكية. ان تحليل نص (الخريف) على أساس التفكيكية يظهر لنا انها ذات أبعاد عديدة حيث نقدر أن نغير شكل بنية النص بأشكال عديدة من أن يتغير المعنى الأصلي للنص وهذا دليل على أصالة النص.

# Abstract

This study entitled “Practicing Dèconstruction method in the Text (Autumm) by the poet Goran” is an attempt to define the deconstructionism method and its principles as being a contemporary literary movement which emerged after Constructionism. It is a new significant research in the field of literary criticism especially for probing the deep level of language and then reconstructing it anew.

The research is the application of deconstructionsim to Kurdish literature. Here we chose one text, a poem, entitled (autumn) by the Kurdish poet Goran. Principals and principles of deconstrucionism can be applied to this text.

Finally, we put, at the end, a list of references and dictionaries and an abstract in both Arabic and English languages

# مێژووی ئاڵای کوردستان

د.ئازاد عوبێد ساڵح
بەشی مێژوو- کۆلیژی ئەدەبیات،
زانکۆی سەلاحەددین- هەولێر

**پێشەکی**

ئاڵا نیشانەی سەروەری و شکۆمەندی و شانازیی هەر وڵات و دەوڵەتێکە. ئەرکی هەر هاووڵاتییەکە خزمەتی ئاڵای نیشتمانەکەی بکات، گەل و نەتەوەکان، هەمیشە لە هەوڵی بەرز راگرتنیدان. ئاڵا بۆ نەتەوەیەکی بێ قەوارەی سیاسیی وەك کورد، ئامرازێکی کاریگەرە بۆ بزواندنی هەستی نەتەوایەتی و نیشتمانی. لەبەر ئەوەی زۆر لایەنی مێژووی ئاڵای ئێمە زانستانە لێی نەکۆڵدراوەتەوە، بۆیە بایەخپێدانی ئەرکی نیشتمانی رۆڵەکانییەتی کاری بۆ بکەن.

لەم رووەوە بایەخدان بە مێژووی ئاڵای کوردستان و سەر و سۆراخکردن و بەدواداچوونی وەك کارێکی زانستی مێژووی کورد بە ئەرکێکی پێویست زانرا، بەتایبەتی کە تا ئێستا لێکۆڵینەوەیەکی زانستی لەبارەیەوە نەکراوە، جگە لەوەش هێشتا خەڵکانێکی زۆر، تەنانەت نەك ئاسایی، بەڵکو رووناکبیران و نووسەران و خەڵکی خوێندەواریش، شتێکی وای لێ نازانن.

گیروگرفتی ئەم توێژینەوەیە نەبوونی زانیاری و کەمی سەرچاوەی باوەڕپێکراو و رەسەنە، ئەویش لەبەر بارودۆخی تایبەتی کوردستان داگیرکردنی، نەتوانراوە، زانیاری و بەڵگەنامەکان هەڵبگیرێن و بپارێزرێن. ئەوەی تا ئێستاکەش لە بارەی ئەو بابەتە لەبەر دەستە و هەیە، زۆربەی هەرە زۆری دووبارەکردنەوەی زانیارییەکانی یەکدییە و زۆربەیان بێ سەرچاوەن.

ئەم بابەتە سەرەتا لە پێناسە و جۆرەکانی ئالآ و دروستکردنی، مێـژووی دێرینی لای نەتەوەگەلی جیاواز دەخاتەڕوو، هەر لە دێرزەمانەوە تـا ڕۆژگـاری نوێ، پاشان باسی ئەو ڕاپەڕین و شۆڕشانەی کورد، کـە ئالآیـان هـەڵکردووە، لــە ســەدەی بیســتەم، لــە ســەرەتای دروســتبوونی کۆمەڵــەو ڕێکخــراوە سیاسـییەکانی کوردسـتان، چـونکە ئەمانـە بـە پلـەی یەکـەم بایـەخیان بـە دروسـتکردنی ئـالآ لـە ڕۆژگـارە جیاجیاکانـدا داوە، شۆڕشـی مـەلا سـەلیم بەتلیسی، قۆچگیری، شێخ مەحموود، سمکۆی شکاک، شێخ سەعیدی پیران، کۆمەڵەی خۆیبوون، کۆمەڵەی هیـوا، ژێکـاف و کۆمـاری کوردسـتان ١٩٤٦... هتد.

بەتایبەتیش کۆمەڵەی تەشکیلاتی ئیجتیماعی کـورد لـە ئەسـتەمبۆڵ لـە کۆتایی ساڵی ١٩١٩ سەرەتای ساڵی ١٩٢٠، کـە بـۆ یەکـەم جـار ئـەو ئالآیـەی ئێستای داهێناوە.

ئەو سەرچاوانەی بەشێوەیەکی سەرەکی کاری لەسەر کراوە: (**الموسوعة العربيــة**) بــۆ پێناســە و کورتــە مێژوویــەکی ســەرهەڵدانی ئــالآ بــە گشــتی و (**الموسوعة العربية العالمية**) هەروەها (**ئەحمەد قەلقەشەندی**) (**صبح الاعشى في صناعة الانشاء**).

(**زنار سلۆپی، قەدری جەمیل پاشا**)، لە یادەوەرییەکانی بە ناوی (**دۆزی کوردستان**) سەرچاوەیەکی زۆر بە نرخە و زانیاری زۆر گرنگـی سـەبارەت بـە ڕەوشی سیاسی کوردستان لە سـەدەی بیسـتەم تێدایـە. کۆبەرهـەمی ژمـارە حـەوتی (**جـەمال نەبـەز**) وتـارێکی سـەبارەت بـە ئـالآی کوردسـتان بـەناوی (**سەرنجێك لە بارەی دیرۆکی ئالآی کوردسـتانەوە**) تێدایـە و زانیـاری گرنگـی دەربارەی ئالآ تێدایە. هەروەها کەڵك لە ژمارەیەك گۆڤار و ڕۆژنامەی کـوردی وەرگیراوە، کە زانیاری گرنگیان لەو بارەیەوە تێدایە.

ئەمە و چەندین سەرچاوەی دیکەی گرنگ کـە لـە لیسـتی سەرچـاوەکاندا ئاماژەی پێکراوە.

**پێناسەی ئاڵا**

**ئـــاڵا** Flag: لـــە ڕووی زمانـــەوە شـــتێکە هەڵـــدەدرێت بـــە مەبەســـتی ڕێنوێنیکردنی نەشارەزایان، یان ئـەوەی لـە تەنیشـت ڕێگایـان دادەنرێـت بـۆ ڕێنوێنیکردن لەسەر زەوی، یان شاخی درێـژ. ئـاڵا ئەوەیـە کـە سـەربازەکان لەسەری کۆدەبنەوە یان ئەوەی بەسەری ڕمەوە دەکرێت ، ئاڵا، ئاڵای شەڕە، لە ناوەکانی دیکەی ئاڵا دورفس ئاڵایەکی مەزن بووە، بەند، بەیرەق، سنجق، ...هتد. ڕەنگ دروشم، هێمان لە شەڕ و گەڕان و میرنشینیدا[1].

لە فەرهەنگە کوردییەکانیشدا، ئاڵا: "**١- پارچەیەك قومـاش هەرچـێکی بیّ و هەر چەندێك بێت.٢- پارچە قوماش یا کەولێك بوە، بە سـەری ڕمـب و نێزەوە دەکرا و شکڵی گیاندار یان شتێکی تری لە سەر دەکێشـرا. زەمـانی کۆن نیشانەی لەشکر و ئۆردووی جیاجیا بوە، هەر لەشکریّ هەوڵی دەدا، لە شەڕا ئاڵای لەشکری دوژمن بگریّ یا بیخا ، کەوتن یا گیرانی ئاڵای لەشکرێك شکسـتی تێدەخسـت، لـە چـەرخی نۆزدەهـەمڕا، ئـاڵا بۆتـە نیشـانەی گـەلیّ ڕێکخراو یا دەزگای تریش، لە هەمووان موهیمتر بۆتە نیشانەی سـەربەخۆیی نەتەوەکان و ڕەنگا و ڕەنگیش بوە.**"[2]، هـەروەها بەیـداغ، بەیـداخ، ئـاڵایی، بەندێر، بەیرەق، بێـراق، ئالـە، درەویـش، تیپێـك پێشـمەرگەی ٤٠٠٠ کەسـی، قەڵەمی نووسین ، بە کار هێنراون.[3]

ئـاڵا نـاوێکی گشـتییە بـە هـەر شـێوە و جۆرێـك دەگوترێـت، ئـاڵای نیشـتمانیش لـە دابـی دبلۆماسـیدا هێمـای دەوڵـەت و نیشـانەی سـەروەری و کەرامەتییـەتی، بـەزۆری لـە قوماشـێکی تایبـەت دروسـت دەکرێـت، چـەندین ڕەنگ و دروشمی دیاریکراوی تێدایە، بـەپێی قـانون یـان فـەرمانێکی یاسـایی تایبـەت. پێوانـە مامناوەندییـەکانی ئـاڵای ڕەسمیـی گـەورە ١٢٠×٨٠ یـان ١٥٠×٢٢٥سم، پانیشی سێیەکی درێژییەکەیەتی.[4]

ئاڵا: دەوڵەت وەك هێمـا و نیشـانەیەك بـەرزی دەکاتـەوە بـۆ ئـەوەی لـە دەوڵەتـەکانی دیکـەی جـودا بکاتـەوە، ڕەنگـە بریقـەدارەکانی و نەخشـەی سەرنجڕاکێشە، کە هێمای خاکی نیشتمان، گەل و حکومەتە، لەگەڵ ئەو بەها

و ڕوومەتانەی کە ڕۆڵەکانی نەتەوە بڕوایان پێ هەیە. ئاڵای نیشتمان هەستی کامەرانی خەڵك دەجوولێنێ یان گیانی ئازایەتییان تێدا دەوروژێنێ و بەرەو گیانفیداییان دەبات، خەڵکێکی زۆر لە پێناو پاراستنی ئاڵای نیشتمانی مردن، بۆ ئەوەی دووچاری نوشستی و ڕیسوابوون نەبێت[٥].

**کورتە مێژوویەك**

بە پێی سەرچاوەکان زەحمەتە بزانرێت کەی یەکەم جار ئاڵا بەکارهاتووە ، دەکرێ بڵێین ئەوە بەندە بە تێگەیشتن لە چمکی ئاڵا و پێناسەکردنی ... ئەگەر مەبەست ڕەنگ و دروشم و ئەو نیشانانە بن کە ئاڵاکانی لێ دەرهێنراون، ڕەنگە ئەوکاتە پێناسەکە هەمەلایەنتر بێت.... ڕەنگە میسرییە کۆنەکان سەرەتا ئاڵایان بەکاریان هێنابێت.[٦]

لەسەر ئەو نووسراوەی سەر بەردەکەی سەرپل لە نزیك شاری زەهاو سەدەی بیست و شەشەمی پێش زاینی، لولوییەکان لە نیوەی دووەمی هەزارەی سێیەمی پێش زایین، دەوڵەتێك بوون و بریتی بوون لە چەند چینێکی کۆمەلایەتی ، بەلام وەکو سەرچاوە ئاشوورییەکان باسی دەکەن، ئاڵا و دامەزراندنی یاسای دەوڵەتی لە ناو ئەو هۆزانەدا تەنیا لە سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زاییندا بینراوە[٧].

"**ئێرانییەکان ئەو بەیداخەیان** (درەفشی کاویان – توێژەر) **بە هی ڕۆژگارانی کەونارای مێژووی خۆیان دەزانی وەختایەك هەزار ساڵ بەسەر زوڵم و زۆرداری** (دەهاگ – ضحاك)**ی داگیرکەرا تێپەڕی، ئاسنگەرێك بەناوی (کاوگ) بەروانکەی چەرمینی خۆی بەسەرە نێزەوە کرد و پێی نایە مەیدانی شۆڕش. ڕاپەڕیوان دەهاگیان سەرەونخون کرد و (فەرەیدوون)یان لە جێی دانا، کە شازادەیەکی تازە لاوی تۆرەمەی پادشایانی پێشوو بوو، لەودەمی ڕا بەروانکەی کاوگی ئاسنگەر بوو بە ئاڵای سوڵتانەکانی ئێران و ناویان نا** (درەفشی کاویان –ئاڵای کاوەیی)"[٨]. سەبارەت بە ئاڵای ئێرانی کۆن لە سەردەمە جیاجیاکاندا، عەبدولڕەحمان مزووریی توێژەر، وردەکاریی لەو

بارەیەوە کردووەو تێیدا باسی"**مێژوا ئـالایێن ئێرانـیٚ ژ دەسـپێکیٚ تـا کـەتنا ساسـانیان**"ی کـردووە.[٩] لـە باسـی ئـالای (**درەفشـی کاویـان**)یـش، چـەند مێژوونووسێکی عەرەب و ئێرانی باسی ئەو ئالایەیان کردووە، کـە سـەرەنجام لە شەڕی قادسیەدا کەوتە دەست عـەرەبان و بـە فـەرمانی خـەلیفـەی دووەم پارچە پارچە کرا و سووتێندرا[١٠].

لە شارستانییەتی دووئاوان (**میسۆپۆتامیا**) و ولاتی شامیشدا، ئالای لەو شێوەیە هەبووە، ئالاکان هەر تەنیا واتای ئایینی یان هێمایی نەبووە، بـەڵکو فینیقییەکان و یۆنانییەکان بە مەبەستی گۆڕینەوەی هێما و زانیاری لە کـاری دەریاییدا و بۆ دیـاریکردنی شـوێنی سـەرکردە بـەکار هێنـراون. ڕۆمانییـەکان شەش جۆر ئالایان بۆ هێزە وشکانی و دەریاییەکان بـەکارهێناوە، ئالایـەکیان هەبووە چوارگۆشەیی بـووە لـە قوماشـێکی چەسـپاو لێوارەکـانی دانـە دانـە بووە ڕەنگـی ئەرخـەوانی، سـوور یـان شـین بـووە و بـە شیشـەیەکی پانـەوە دەکرا، لەسەر نووکی ڕمێك هەڵۆیـەکی کـانزایی بەسـەرەوە بـووە، هـەروەها ئالایـەکی دیکەشـیان هـەبووە بـە نـاوی (**تـەنیین - واتـە مـارێکی مـەزن**) لـە قوماشێکی شێوە لوولەیی پێك هاتبوو، وەك تەنێك بای تیٚ دەکـرا، لـە مـاری دەکرد و دوژمنانی دەترساند، ئەوەیان لە پارسەکان وەرگرتبوو، پتریـش بـە داهێنانی چینییەکان دەچێت، تا دوای ڕووخانی ڕۆماش لە ئـەوروپا هـەر بـاو بـوو. بەریتانییـەکانیش تـا سـاڵی ١٤٨٥ز بـەکاریان هێنـاوە، بـەلام دواتـر فەڕەنسی و ئەڵمانەکانیش هەڵۆ کانزاییەکەیان وەرگرتبوو[١١] .

أ- ئالا پارچە قوماشێکی ڕەنگاوڕەنگە، هەندیٚ هێماو نیشانەی پێوەیە ئامـاژە بـە مانایـەکی تایبـەتی دەکـات، سـەربازەکان لـە پێشـەوەی سـوپا هەڵیدەگرن، لە جـەژن و بۆنەکانیشـدا لەسـەر خانووەکـان هەڵیـدەدەن. ئـالا وەك لاپەڕەیـەك وایـە کـە شـەڕەف و سـەروەری و شـکۆمەندی و مێـژووی نەتەوەکـەی لەسـەر نووسـرابێتەوە، گەلـە کۆنـەکان بـەکاریان هێنـاوە، بەتایبـەتیش میسـری و ئاشـوورییەکان. لـە کتێبـە ئاسمانییـەکانی بـەر لـە ئیسلامدا هاتووە. گریك و ڕۆمانەکان بەکاریان هێناوە. ئالا هێمـا و مەبەسـتی

ئایینی و سەربازی هەبووە، هەڵۆ و باز (**النسر والعقاب**) دروشمی ڕۆمانەکان بووە، لەسەر نووکی ڕمەکانیان قایمیان دەکرد، لە ژێرەوەش ئاڵای ڕۆمانەکان شۆڕ دەکرایەوە(١٢).

ب- عەرەبەکانیش لە ڕۆژگاری نەزانی (**الجاهلية**) دا ئاڵای جۆراوجۆریان هەبووە، شێوە و ڕەنگەکانیان جیاواز بووە و بەسەر ڕمەکانیانەوە دەکرد و سوارێك لە ناوەڕاستی جەنگاوەرەکاندا ڕایدەگرت، پێیان دەگوت ئاڵای شەڕ، ئاڵا پارچەیەکی دڕاوی کراس بوو و لوول دەدرا و بەداری ڕمەکانەوە گرێدەدرا، تەنیا لە کاتی پێویستی دەکرایەوە، ناویان لەوانە نابوو عەسائب (**العصائب**) کۆی (عصابة) چونکە بەسەر ڕمەکانەوە لەسەر ڕا دەبەسترا، واتە (**بەستراوەکان**). پێغەمبەر (د.خ) ئاڵای بۆ ئەمیری لقە (**سرية**) کان دەبەست کە دەیناردن، خۆشی ئاڵایەکی سپی هەبوو لە کاتی شەڕەکاندا هەڵیدەدا و ئاڵایەکی ڕەشیشی هەبوو ناوی (العقاب) بووە، عەلی کوڕی ئەبی تالیب لە ڕۆژی بەدری گەورە هەڵیگرتبوو(١٣).

سەبارەت بە ئاڵای خەلیفەکانیش ئەوا دروشمی ئاڵایان هەبوو، دروشمی ئەمەوییەکان کەسك بووە، هەرچی عەباسییەکانن، ئەوا دروشمیان ڕەنگی ڕەش بوو بە سپی ناوی خەلیفەی لەسەر نووسراوە. فاتمییەکانیش دروشمەکانی تایبەت بە مەلیکیان بەکاردەهێنا، وەك کەژاوەی گەوران بوو، لەوانەش تاج و شیشەی ئاسن و چەتر و ئاڵا، بەرزترینیان دوو بوون پێیان دەگوترا دوو ئاڵای سپاسگوزاری (**الحمد**) لەسەریان نووسرابوو ﴿**نصر من الله و فتح قريب**﴾ ژمارەیان (٢١) ئاڵا بووە بیست و یەك سوارەی مێرد منداڵەکانی خەلیفە هەڵیان دەگرت. لە هەردوو دەوڵەتی زەنگی و ئەیووبیشدا چەتر هەبووە، گومەزێکی ئاوریشمی بووە بە زێڕ ڕازێندراوەتەوە و لە سەرووشییەوە باڵندەیەکی زیوی بە زێڕ داپۆشراو هەبووە، هەرچی ئاڵاکەیانە چەند ئاڵایەك بووە، وەك ئاڵای مەزن لە ئاوریشمی زەرد و بە زێڕ نەخشێنراوە و ناو و نازناوەکانی سوڵتانی لەسەر بووە، پێیان گوتووە (**العصابة**) بەستراو، ئاڵای مەزن لە سەرەکەی کەزییە (**خصلة**)یەکی بە مووی

هەیە پێی دەڵێن (جالیش) لەگەڵ ئالای زەردی بچووك پێیان گوتووە (سەناجق – كۆی سنجق) ئەوەی هەڵیشی گرتووە پێیان گوتووە (**سەنجقدار**)، یەكەمین كەس لە مەلیكەكان كە سنجقی لەسەر سەری داناوە غازی كوڕی زەنگی برای سوڵتان نورەددین بووە. حەوت ڕەنگ دروشمی زاهیر بیبرس مەلیك بووە و ئالایەكەشی زەرد بووە.(١٤)

ئالای سەلاحەددینی ئەیووبی (١١٣٨–١١٩٣ز) زەرد بووە، لە ناوەڕاستەكەیدا وێنەی باڵندەی هەڵۆ (النسر)ی هەیە، كە نیشانەی هێزو بڕوابوونە بەسەركەوتن. لە نێو ئالاكاندا ((**ئالای مەزن لە ئاوریشمی زەرد بە زێڕ نەخشێندرابوو، ناو و نازناوەكانی سوڵتانی لەسەر بوو، پێیان دەگوت** (العصابة)، **ئالای مەزن لە سەرەكەی كەزییەكی پرچی هەبوو پێیان دەگوت** (جالیش)، **ئالا زەردە بچووكەكانیش پێیان دەگوت** (سەناجق).))(١٥).

**ئالا لە سەدەكانی ناوەڕاست**

لەگەڵ بەرەو پێشچوونی دەرەبەگی، بەكارهێنانی ئالاش لە ئاهەنگ و بۆنە جیاجیاكاندا زێدە بووە، لە دەسپێكی سەدەی دوازدەیەمدا هەركەسێكی دیار و بە ڕوومەت ئالا و دروشمێكی هەبوو كە نیشانەی پلەوپایەی بوو لە كۆمەڵ یان هێزە چەكدارەكان یان لە ناوچەی بن دەسەڵات و مەڵبەندەكەیدا. لە هەمان كاتدا خەریك بوو ئالا دەبووە هێمای شار و دەوڵەت بە گشتی بەتایبەتیش لە ئەورووپادا، هەموو شارە كۆمارییەكانی ئیتاڵیا ئالای خۆیان هەبوو، شارەكانی هانزای ئەڵمانیا ئالایان هەبوو، كە تا هەنووكەش هەندێكیان بەكاردێت، هەروەها سوپاو هێزە چەكدارەكان ئالای تایبەت بە خۆیان هەبوو، بێجگە لە ئالای سەركردەكان.(١٦)

لە ڕۆژگاری ناوەڕاستدا لە ئەورووپا، ئالای زۆر بەكارهاتوون، لە هەموویان كۆنتر ئالای سووری دانیماركییە خاچێكی سپی پێوەیە و هەتا ئەمڕۆكەش هەر بەكاردێ، فەڕەنساش ئالایەكی كۆنی بەكارهێناوە، كە هێمای بۆسان دنیس، دواتر ئالای سپی بوربونی جێگای گرتەوە، دواتریش ئالای سێگۆشەی

ڕەنگاو ڕەنگ. هەرچی ئاڵای بەریتانیاشە، هەردوو خاچەکەی ئاماژەیە بۆ سان جۆرج، سان ئەندرو سان باتریك، کە هەرسێکیان قەشەی نیشتمانپەروەری ئینگلتەرا و ئەسکوتلەندە و ئێرلەندە بوون. لە ولآتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا لە کانوونی دووەمی ١٧٧٦ جۆرج واشنتۆنی یەکەمین سەرۆکی ولآتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، یەکەمین ئاڵای ئەو ولآتەی لە شاری کیمبردج لە ولایەتی مساشوسێتس هەڵدا، کۆنگرێسیش لە ساڵی ١٧٧٧ ڕەزامەندی لەسەر شێوەی ئاڵای ئێستای ئەمەریکا دەربڕی(١٧).

عوسمانییەکان لە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتەکەیاندا، ئاڵای سپییان بەکارهێناوە و پاشان کردیانە سەوز و دواتریش سوور، کە تا کۆتایی ماوە، لە سەرەتاوە هەر بە تەنیا سوور نەبوو، بەڵکو لەناوەڕاستیدا بازنەیەکی سەوزی هێلکەیی هەبوو، سێ مانگی تێدابووە، ئەوەیان ئاڵای سوڵتان بووە. ئاڵای دیکەشیان هەبووە تایبەت بووە بە وەزیرەکان و کەتیبەکانی سەربازی و ڕەنگەکانیش جۆراوجۆر بوونە، سوور و زەرد، ئەو کەسانەی نازناوی پاشاشیان هەبووە، ئاڵاکەیان سپی بووە. مانگیش دروشمی ولآتانی ڕۆژهەلآت بووە، هەروەها دروشمی سەلجووقی و عوسمانییەکانیش بووە. دوا ئاڵای عوسمانی، ئاڵای سوور و مانگ و ئەستێرەی سپی تێدابووە، کە دەوڵەتی تورکیاش دامەزرایەوە هەر ئەو ئاڵایەیان بەکارهێنا، هەرچەندە هەموو شتیان گۆڕی، بەلآم ئەو ئاڵایەی سەردەمی عوسمانی هەر مایەوە(١٨).

سەبارەت بە ئاڵای ولآتانی عەرەبیش بە نموونە میسر وەك دیارترین ولآتی عەرەبی، هەر لە ڕۆژگاری محەمەد عەلی (١٧٦٠-١٨٤٩)یەوە دە جار ئاڵاکەی گۆڕاوە و حەوت ئاڵای جۆراوجۆری هەبووە، سەرەتای سەرهەڵدانی ئاڵا لە میسر لە سوپاوە بووە. لەسەر دیواری پەرستگاکانی میسرییە کۆنەکانیش، وێنەی ئاڵاهەڵگر هەن و زۆر بە جوانی وەك کار و شوێنەوارێکی بەرز ئاماژەی پێ کراوە و گۆڕەکانیان پێ ڕازێندراوەتەوە. ئەمەش هەر یەك ئاڵا نەبووە، بەڵکو ئاڵای جیا جیا بووە، بەپێی هەرێم و لەشکرەکانی سوپا،

دیاره هەر ڕەنگ نەبوو، بەڵکو نەخشیشیان جیا بووە، هەیانە بەرانێك تاجێکی ڕۆژئاسای بەسەرەوەیە.... کاتێك میسر داگیر کرا ئاڵای هەڵۆی ڕۆمانی لێ هەڵکرا تا موسڵمانان لە ١٨ی ڕەبیعی دووەمی ساڵی ٢٠ك/ ١٦ی نیسانی ٦٤١ز، فەتحیان کرد و میسر بووە بەشێك لە دەوڵەتی ئیسلامی. لە ڕۆژگاری پێغەمبەر (د.خ)دا، ئاڵاکەی ڕەش بووە، دواتر ئەمەوییەکان سپی و عەباسییەکانیش ڕەش و تا سەردەمی فاتمییەکان لە ١٦ی شەعبانی ٣٥٨ك – ٥ تەمموزی ٩٦٩ز) ڕەنگەکەی گۆڕا بۆ سەوز، کە فاتمییەکان کردبوویانە ئاڵای دەوڵەتەکەیان. لە ئەیلوولی ١١٧١ز کە سەلاحەددینی ئەیووبی کۆتایی بە دەوڵەتی فاتمی هێنا، سەلاحەددین هەر ئاڵای ڕەشی عەباسی بەکارهێنا، بەر لەوەی دانی پێدابنرێ وەك سوڵتانی میسر و شام لە ساڵی ١٢٥٣ز، کە مەمالیکیش هاتن، ئەوان ئاڵای زەردیان هەڵکرد[(١٩)].

کاتێ عوسمانییەکان لە ساڵی ١٥١٧ز میسریان داگیرکرد، ئاڵای زەردیان داگرت، ئاڵای خۆیان بەرزکردەوە کە سوور بوو، ڕەنگەکەی لە سەلجووقییەکان و مانگەکەشی لە بیزەنتییەکان وەرگیرابوو، ماوەیەکی درێژ ئەوە ئاڵای میسر بووە، بە هەنگاونانی بەرەو سەربەخۆیی لە ڕۆژگاری محەمەد عەلی، ئاڵاکەشی هەموار کرا، بەپێی ئەو دانپێدانانەی دەوڵەتی عوسمانی بە بنەماڵەی محەمەد عەلی وەك حاکمی دەوڵەتەکە، ئەوەبوو لە ساڵی ١٨٢٦ز شێوەی ئەستێرەکەیان گۆڕی لە شەش لاییەوە بۆ پێنج لایی، ئەمەش گۆڕانێکی گەورە بوو، دواتریش بەپێی سەردەمەکان، گۆڕانی دیکەی بە سەرداهات[(٢٠)].

### ئاڵای نەتەوەیی

لەگەڵ دەسپێکی سەدەی شازدەیەم، لەو کاتەی ئەورووپاییەکان دەستیان بە گەڕان بەدەریاکاندا کرد لەدەرەوەی ناوی هەرێمی خۆیاندا، لەپێناو بازرگانی و دۆزینەوە و شەڕ یان چەتەگەری دەریایی، کەشتییەکان پێویستییان بە شتێك هەبوو جیایان بکاتەوە و پێی بناسرێنەوە، ئاڵای

پاشایەتی تایبەت بە بنەماڵەی بوربونی فەرەنسی و ئەسپانی زۆر ئـالۆز بـوو، دەوڵەتەکانی دیکەش لاسـاییان کردنـەوە هـەر یەکـەو ڕەنگێـك و دروشمێکـی جیاوازی بۆخۆی دانابوو، شەریتی شـین و سـپی بـۆ فەرەنسـا بـوو، سـوور و سپی بـۆ ئینگلتـەرە بـوو، کەسـك و سـپی بـۆ پورتگـال بـوو، لـەوەوە ئـالأی نەتەوایەتی سەری هەڵدا، کە زۆربـەیان تـاکو ئێسـتا بـەکاری دەهێـنن. بـەرە بەرە ئالأ شوێنێکی سۆزداری وەرگرت بەپێی گـۆڕانی چـمکی ئـالأ پـتر قـووڵ بۆوە و بووە هێمای سەرجەم نەتەوە، بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکانیش ڕەنگی سوور و سپی و شین و سەوزیان بەکاردەهێنا، لە هەمان کاتدا ئـەو ئالأیانـەی کە دروشمەکانی هێـز و دەسـەلأتیان هـەڵگرتبوو وەك شـێر و هـەڵۆ و ئـەوانی دیکـە شـوێن و پایـەی خۆیـان بـەرە بـەرە لەدەسـت دەدا بەدەسـتپێکردنی **سەدەی هەژدەیەم**(٢١).

## مێژووی ئالأی کوردی

ئەوەی جێی سەرنجە هیچ یەك لـە میرنشـینە کوردییـەکان باسـی بـوونی ئالأیـــان ناکرێــت، بــۆ نموونـــە کـــە باســـی ســـەربەخۆیی و لێـــدانی دراو و خوێندنەوەی خوتبەی هەینی بە ناوی میرەکانیانـەوە دەکرێـت، بـەلأم باسـی **هەڵکردنی** ئالأ و بوونی ئالأ ناکرێت، کە ئەویش بەشێکی گرنگی شکۆمەندی و سەربەخۆییە(٢٢).

لـــەو بارەیـــەوە بـــە پێـــی سەروســـۆراخ و پـــرس و راوێـــژی تـــۆژەر، سەرچاوەکان ئاماژە بە بـوونی ئالأکانیـان ناکـەن. بـۆ نموونـە عەبـدولڕەقیب یوسف ئاماژە بە دروشمی دەوڵەتی دۆستەکی دەکات کە شێر بـووە، لەسـەر شوێنەوارەکانی ئەو ڕۆژگارە نەخش کـراون، وەك ئـەوەی سـەر پـردی ئامـەد **(دیاربەکر)** و لەسەر دەرگای خەرپوت هەر لە ئامەد(٢٣).

ئەولیا چـەلەبی **(سـەدەی حەڤـدەم)**، گەڕیـدەی عوسمـانی، لـە وەسـفی قایمەکاری قەلأی بەدلیسدا ئاماژەی بە بورج و شوورەکانی کردووە، کە تۆپی

لێ دامەزراوە و عەسکەری بێ ژمارەیان لێ بووە و هەموو ((**دانە بورجەکانی بە ئالآی ڕەنگاو ڕەنگ ڕازاوەتەوە**))[٢٤].

سەرچاوە هەیە باسی ڕەنگەکانی سوور و زەرد و سەوز و لە ناو زەردەکەشدا ڕۆژ هەیە، واتە ئالآی ئەمڕۆی کوردستان ـ دەکات، گوایە ئەم ئالآیە بۆ ساڵی ١٨٢١ز ڕۆژگاری میر بەدرخان میری بۆتانی دەباتەوە، بێ ئەوەی ئاماژە بە سەرچاوەیەك بکات[٢٥].

بە پێی بەڵگەنامەیەك لە شۆڕشی یەزدان شێردا لە ساڵانی ١٨٥٣ـ١٨٥٦، ئالآی هەبووە، ئەویش لە بەیتێکی فۆلکلۆریدا، کە لە سەر زاری جوولەکەیەکی کوردستان، لە ساڵی ١٨٨٧ تۆمار کراوە و دەڵێت:

گۆ ئەو زاخۆییێ ب رووت و کەڤۆتان
بەیراق بوونە جۆت ب جۆتان
بەرێ خۆ دانە جزیرا بۆتان[٢٦]

## کورد و ئالآی عێراق

سەبارەت بە دروشم و ئالآی عێراقیش، بەپێی یاسای دروشمی دەوڵەتی عێراق ژمارە (٢٥)ی ساڵی ١٩٣١، هێمای هەردوو نەتەوەی عەرەب و کوردی تێدایەو بەپێی ماددەی چواری دەروازەی یاسای بنەڕەتی عێراق، لە باسی شێوەی ئالآی عێراقدا ئاماژە بە بوونی دوو ئەستێرە دەکات، کە هێمان بۆ هەردوو نەتەوەی عەرەب و کورد لە عێراقدا[٢٧]. هەر لەو ڕووەوە لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیاشدا داواکراوە، ((**هەستی کوردەکان لەبەرچاو بگیرێ و هێمایەکی کورد بۆ ئالآی عێراق زیاد بکرێ**))[٢٨].

لە ڕۆژگاری دوای ١٤ ی تەممووزی ١٩٥٨دا، بەپێی یاسای ئالآی کۆماری عێراقی نوێ ئاماژە بە هاوبەشیی کورد و عەرەب کراوە[٢٩]. لەو ئالآیەدا کە لە لە شێوەی لاکێشەدا بووە، دابەشی سەر سێ لاکێشەی یەکسان کراوە بە ڕەنگەکانی: ڕەش و سەوز و سپی و سوور و زەرد، لە ناوەڕاستی لاکێشە

سپییەکەدا، ئەستێرەیەکی عەرەبی بە ڕەنگی سوور هەیە، کە هێمای شۆڕشی ١٤ ی تەممووزە، هەرچی ڕەنگەکانن ئەوا بە ڕیز ئاماژەن بۆ ئاڵای پێغەمبەر (د.خ)، عەلەوییەکان، عەرەبی شام لە ئەندەلوس، سەلاحەددینی ئەیووبی، هەرچی رەنگە هەشت سووچە سوورەکە و بازنە زەردەکەن هێمان بۆ عەرەب و کورد))[٣٠].

**مێژووی ئاڵای کوردستان لە سەردەمی نوێدا**

**ئاڵای ڕاپەڕینی بتلیس ساڵی ١٩١٤**

ڕاپەڕینی ساڵی بتلیس ١٩١٤ کە بە ڕابەری ڕێکخراوی نهێنی (ئیرشاد) بووە، ئامانجی ڕاپەڕینەکە دامەزراندنی میرنشینێکی کوردی سەربەخۆ بووە، لەو ڕاپەڕینەدا ((**پێشمەرگە کوردەکان بانگەواز و بەیاننامەیان لە دژی زوڵم و زۆری تورکان بڵاو دەکردەوە، لە کۆماچ وەکو ڕەمزی سەربەخۆیی ئاڵای کوردستانیان هەڵکردبوو**[٣١]. **یەکێك لە پیاوەکانی مەلا سەلیم بە ناوی زەینەددین، کە لەگەڵ شۆڕشگێڕان هاتوونەتە ناو شار، ئاڵای کوردستانیان لەو گەڕەکەی کە لێی بوونە هەڵکردووە))** [٣٢]. لە ڕێڕەوی ڕووداوەکانی شۆڕشدا ئاڵای شۆڕشگێڕەکان کەوتە دەست تورکەکان، ((**ئەم ئاڵایە لە قوماشێکی زبر دروست کرابوو، بە ئایەتی قورئان ڕازێندرابۆوە**))[٣٣]. لە سەرچاوەیەکی دیکەشدا ئاماژە بە هەڵکردنی ئاڵای کوردستان لەسەر قەڵای بتلیس دەکات، لەدوای گرتنی شاری بتلیس لە نۆی مایسی ١٩١٤، لە لایەن ڕاپەڕیوان بە رابەری مەلا سەلیم هیزانی[٣٤].

**ئاڵای شۆڕشی قۆچگیری (١٩١٩-١٩٢١)**

لە شۆڕشی (قۆچگیری) [٣٥]دا کە لە ناوچەی دەرسیم و خوزات بەرپابوو، بانگی سەربەخۆیی کوردستان درا و لە خوزات و عیمرانیدا ئاڵای کورد هەڵکرا[٣٦]. لە ڕووداوێکی دیکەشدا ((**ئاڵای کوردستان لەسەر بنکەی پۆلیسی**

**ناوەڕاستی ئومرانیە بەرز کرایەوە)**، هەروەها ئاڵای کوردستان لەسەر ئاغدانی دەشەکایەوە کە جێگای سەید ڕەزا (١٨٦٢–١٩٣٧) بوو[٣٧].

**ئاڵای سەردەمی شێخ مەحموودی حەفید (١٩١٩–١٩٢٧)**

لە سەردەمی شێخ مەحموود (١٨٨١–١٩٥٦)دا، ئاڵایەکی دیکەی کوردی **هەڵکراوە**، هەروەك سەرچاوەکان ئاماژەی پێدەکەن، جاری یەکەم ئەو ئاڵایە لە ساڵی ١٩١٩ لەسەر بینایەی فەرمانگەی ئەفسەری سیاسی بەریتانیادا، کە پێشتر ئاڵای بەریتانیای بەسەرەوە بوو هەڵکراوە، ئاڵاکەش لە مانگێکی سوور و زەمینەیەکی کەسکدا بووە[٣٨].

دەسەڵاتی شێخ مەحموود دروشمیشی هەبووە، کە گوڵە گەنم و گوڵە جۆ و گەڵا تووتن بووە و لە ساڵی ١٩١٩ پەسەند کراوە. هەمان ئاڵای جارانیشی جارێکی دیکەش لە کاتژمێری ١٢ی نیوەڕۆی ڕۆژی ١٧ی ئەیلوولی ١٩٢٢، لەسەر قشڵەی سوپا هەڵکراوە، چەکیشی تێدا ئاگردراوە[٣٩].

ڕەفیق حیلمی (١٨٩٨–١٩٦٠) سەبارەت بە ئاڵای ڕۆژگاری شێخ مەحموود بەسەر ناوی (**هەڵکرانی ئاڵای کوردستان**) نووسیویە:

کۆبوونەوەیەکی گەورە لە ماڵی شێخ قادر (١٨٩٥–١٩٥٩) سەرۆکی ئەنجوومەنی میللی ڕێك خرا، دوای گفتوگۆیەکی دووردرێژ بڕیار درا، کۆنگرەیەکی گەورە لە مزگەوتی گەورە ڕێك بخەن بۆئەوەی "**بە دەستوورێکی ڕەسمی ئاڵای میللی کورد**" هەڵبکرێ، لەو ڕۆژەدا نزیکەی دە هەزار کەس لەو شوێنە کۆبوونەتەوە و لەو ڕێوڕەسمەدا، لە درێژەی وتەکانیدا، ڕەفیق حیلمی دەنووسێت: "**پیاوم ئەویست کە لەو ساتەدا فرمێسکی شادمانی نەڕێژی، من بەسەر دونیاوە نەمابووم. لە ئاسمانی خەیاڵا پەڕ بازیم ئەکرد و ئەفڕیم. لەپڕ سەرکەوتمە سەر کورسی یەك، ووتارێکی دووردرێژم خویندەوە. لەبەر نەك لەسەر کاغەز. ووشەکانی وەکو (تەرزە) لەدەمم ئەهاتە دەرێ، بەڵام تەرزەیەکی وا بەراستی کە لە ناوەندی ووتارەکەدا موچرکێکی سارد بە لەشما هات. دانەکانم کەوتە چۆقە و**

**ئـەژنۆکانم هاتـە لـەرزین. ئەوەنـدە نـەمابوو کـە لـە کورسـی یەکـە بکەومـە خوارەوە. بەڵام دانم بە خۆمـا گـرت و هـەر چـۆنی بـێ ووتارەکـەم گەیانـدە دوایی. ئینجا لەگەڵ گۆرانی تایبەتی قوتابیان و دەنگی (مۆزیقە)ی عەسکەر ئـاڵای کوردسـتانی بـەریز ووردە ووردە بـەرز بـوەوە و هـەڵکرا..."**[٤٠]. لـە وێنەیەکی ئەو رۆژگارەی لەشکری کوردستانی سـەردەمی شـێخ مـەحموود، **(ئاڵای کوردستان)** بەرز کراوەتەوە[٤١].

هەر سەبارەت بە ئاڵای رۆژگـاری شـێخ مـەحموود، د.عـزەددین مسـتەفا رەسووڵ دەڵێت ئاڵای تایبەتی نەبووە، بەڵکو شێخ گوتبووی: **"با حاجی مەلا رەسووڵ لە مزگەوتی گەورەوە ئەو ئاڵایەی کاك ئەحمەد بێنێ کە بۆ شـەڕی شوعەیبە و غەزای ڕووس دایە دەسـتم ، بـەڵێ ئـەو ئاڵایـە هێنـرا و ئاڵاکـەی ئینگلیز لەسەر شارەوانی فڕێدراو ئەو ئاڵا سـەوزە دانـرا"**[٤٢]. بـەڵام وەك لـە سەرەوە باس کرا دیارە ئاڵای تایبەتی هەبووە.

یەکێك لەو تۆمەتانەی خرابووە پاڵ شێخ مەحموود لە دیـوانی عـورفی لـە بەغدا، کە هەموو حاکمەکانی ئینگلیز بوونە، لە دوای بـە دیلگـرتنی لەشـەڕی دەربەنـدی بازیـان لـە نزیـك سـلێمانی لـە مایسـی ١٩١٩ **"داگـرتنی بـەبیاخی بریتانیای گەورە و دڕاندنی و لـەجێی ئـەو هـەڵکردنی بـەبیاخی کوردسـتان"** بوو[٤٣].

**ئاڵا و کۆمەڵەی کوردستان(١٩١٧)**

ئەکرەم جەمیل پاشـایە (١٨٩١-١٩٧٤) باسـی دامەزرانـدنی کۆمەڵەیـەك دەکات بەناوی **(کوردستان)**[٤٤]. لە دیاربەکر کە بە یەکەم کۆمەڵـەی سیاسـی کوردی دادەنێـت، کـە بـە هەشـت نـۆ مـانگ پـێش دامەزرانـدنی جەمعییـەتی تـەعالی کوردسـتان کـەوتووە[٤٥]. جەمعیـەتی تـەعالی کوردسـتان لـە ١٧ ی کانوونی یەکەمی ١٩١٨) دامەزراوە [٤٦] . کەواتە کۆمەڵەی کوردسـتان لەمـەڕ ئەکرەم جەمیل پاشـا دەبـێ لـە نیـوەی یەکـەمی سـاڵی ١٩١٧ دامـەزرابێت ، بەڵام ئەکرەم جەمیل پاشا لە گێڕانەوەی بیرەوەرییەکانیدا باسـی بـارودۆخی

دوای ئاگربەستی مودروس دەکات(٤٧). دیارە ئاگربەستی ناوبراویش لە ٣٠ی تشرینی یەکەمی ١٩١٨ بووە(٤٨). بە هەر حال ئەو کۆمەڵەیە لەسەر بارەگاکەی ئالای کوردی سێ ڕەنگی سوور و سپی و سەوز و خۆری، هەڵکردووە(٤٩).

**جەمعییەتی تەعالی کوردستان و ئالای کوردستان**

لە ڕێڕەوی دادگاییکردنی شێخ عەبدولقادری نەهری (١٨٥٧–١٩٢٥)، کە لە ١٥و١٩ی مایسی١٩٢٥ لە ڕۆژنامەی **(وەقت)**ی تورکیدا بلاو کراونەتەوە، ئەندامێکی دادگا ئەو پرسیارەی لێ کردووە: "لەکاتی{کارتی} پێناسی جەمعییەتدا **(مەبەست جەمعییەتی تەعالی کوردستانە)**، لەخوارەوە ڕەنگی سەوز هەیەو لە ناوەڕاستیشدا خۆرێکی زەرد ئایا ئەمە ئالایە؟ عەبدولقادریش بە تووڕەییەوە وتی: **(وا دیارە دەبێتە ئالای کورد.)** "(٥٠).

هەر لە پەیوەندی بەو ئالایەوە، لە ئیفادەی کوڕ سەعیدیشدا هاتووە: **"....ئالا سەوزەکەی سەر کارتی پێناسەی جەمعییەتی تەعالیی کورد، بە واتای خودموختاری کوردە و جەمعییەتەکە بۆ خودموختاری هەوڵی داوە"**(٥١).

سەید محەمەدی کوڕی سەید عەبدولقادریش لە ئیفادەکەیدا دەڵێت: **"کاتبی عمومی** (نووسەری گشتی) **زەینەلعابدین ئالا سەوزەکەی سەر کارتی پێناسی جەمعییەتی دروست کردووە. ئالای عوسمانی کوژایەوە. ئالای کوردستانیشمان لە باتی ئەو دروست کرد وەك خۆر بدرەوشێتەوە."**(٥٢).

ئەوەی جێی سەرنجە ئەوە لەگەڵ ئالای کۆمەڵەی تەشکیلاتی ئیجتماعی کورد، جیاوازە.

**ئالای کۆمەڵەی تەشکیلاتی ئیجتماعی کورد**

لە ٢٠ ی گولانی ساڵی ١٩٢٠ کۆمەڵەی تەشکیلاتی ئیجتماعی کورد لە کۆمەڵەی تەعالی کوردستان جیابۆتەوە، ئەوەش لە ئاکامی جیاوازی

هەڵوێستیان بەرانبەر تورك و دەوڵەتی عوسمانی کە ئەنجامەکەی بە لێکترازانی کۆمەڵی تەعالی کوردستان کەوتەوە و کۆمەڵەی تەشکیلاتی ئیجتماعی کوردی لێ کەوتەوە بەسەرۆکایەتی ئەمین عالی بەدرخان (١٨٥١ـ١٩٢٦) و ژمارەیەکی دیکە بوون[٥٣].

کۆنترین سەرچاوە سەبارەت بە ئاڵای ئێستای کوردستان زنار سلۆپی (**قەدری جەمیل پاشا**) (١٨٩٢–١٩٧٣)یە، کە لە بیرەوەرییەکانیدا ئاماژەی بە ئاڵای کوردستان و ڕەنگەکانی کردووە:

**((کۆمەڵەی هاوبەندی کۆمەڵایەتی ئاڵای سێ ڕەنگی کوردستانی داناوە لەسەرەوە تەختەیەکی سوور لەناوەڕاستدا تەختەیەکی سپی ، ڕۆژێکی پڕشنگداری تێدایە وە تەختەی خوارەوەشی سەوزە ، وەك ئاڵای نیشتمانی کوردان بڵاو کرایەوە)** [٥٤].

بەڵام زانیارییەکانی زنار سلۆپی بنەمای هەموو بۆچوونەکانی دروستکردنی ئاڵای کوردستانە ، دانەری کتێبی (جەمعیەتی تەعالی کوردستان)یش هەمان زانیاری دووبارە کردۆتەوە ، کەوا جەمعیەتی تەشکیلاتی ئیجتیماعی داهێنەری ئاڵاکەیە و بە یەکەم ئاڵای کوردیشی داناوە[٥٥].

جەمال نەبەز لەسەر زاری کامەران بەدرخان (١٨٩٥ـ ١٩٧٨)یش گوتوویە ئەو ئاڵایە لە سەروبەندی هاتنە کایەی پەیمانی سیڤەر ١٩٢٠ لای جەنراڵ شەریف پاشا بووە[٥٦].

لە ڕێڕەوی دادگاییکردنی سەید عەبدولقادر و هاوڕێکانی لە ١٩ی ئایاری ١٩٢٥دا، لە سەر زاری سەید محەمەدی کوڕی سەید عەبدولقادردا، ناوی زەینەددین عابدین وەك سکرتێری یانە (مەبەست کۆمەڵەی تەعالی کوردستانە – توێژەر)، هاتووە، کە **"ئاڵای داهێنا، ئاڵای عوسمانی داگیرا ، ئێمە ئاڵای کوردیمان هەڵدا تا وەك خۆر بدرەوشێتەوە."**[٥٧].

لە ڕێڕەوی دادگاییکردنی کەمال فەوزیش (١٨٨٤،١٨٨٢–١٩٢٥)دا، پرسیاری لێ کراوە کەوا **"لە جەمعییەتەکەتاندا** – مەبەستی جەمعیەتی

تەشکیلاتی ئیجتیماعییەی کوردە – تۆژەر) **ئاڵایەکی کوردستان دروست کراوە، بینیوتانە؟"**[٥٨].

سەبارەت بە دانانی ئەو ڕەنگانە ئاماژە بەوە دەکرێت کە زەین لعابدین دروستکەری ئاڵای کوردستان، نیشانەی ئاڵاکەی وەك ئێرانییەکان، هیندییەکان، ئیتالییەکان و زۆر وڵاتی تر لە ڕەنگ و نیشانەی ئاڵای مادەکان وەرگرتووە بەو پێیە کە هیرۆدۆت و کتسیاس مێژوونووسانی کۆنی یۆنانی گوتوویانە، میتانییەکان و کاوییەکان و ئیمپراتۆری ماد کە پایتەختەکەی (**ئەکباتانە**) (**هەمەدانی ئەمڕۆ**)، خاوەنی ئاڵای سێ ڕەنگی سوور، سپی و سەوز بوون و نیشانەی جۆراوجۆری وەك تاج، هەتاو و شێریان لە ناوەندی ئاڵاکەیاندا هەبووە[٥٩].

نوێترین زانیاری لەو بارەیەوە، وتارێکی د. جەمال نەبەزە، لەسەر زاری شاکر مەجرووم ئەم ئاڵایە دراوەتە پاڵ ئەحمەد موختار بەگی جاف (١٨٩٧-١٩٣٥)ی شاعیر و تێدا دەڵێت:

**"ئاڵای کوردستان لە سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانیدا، لە لایەن هۆنەری نیشتمانپەروەری کورد، ئەحمەد موختار جافەوە لە هەڵەبجە نەخشیکێشراوە و، دوایی پاش تەواوبوونی جەنگ لە لایەن مێجەر نوئێل ئەدوار چاڵز ولیام نوئێل براوە بۆ سەرکردە کوردەکانی باکووری کوردستان، لە کاتێکدا کە مێجەر نوئێل بە دزییەوە گەشتێکی بەوێدا کردووە"**[٦٠].

ئەم بۆچوونە ڕەخنەی لێ دەگیرێت، چونکە ئەحمەد موختار جاف لە ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانی تەمەنی  بەو جۆرە نەبووە بیر لە دانانی ئاڵا بکاتەوە، لە پاڵیشیدا وەك شاعیریش، تەنانەت وشەی (ئاڵا، بەیداخ، پەرچەم)ی لە شیعرەکانیدا بە کارنەهێناوە.[٦١]

سەبارەت بە گەشتەکەش، لە ڕۆژانەکەی نوئێلدا هیچ ئاماژەیەك بۆ بردنی ئاڵای تێدا نییە[٦٢].

جەمال نەبەز لەسەر زاری ڕەشید شەوقی (١٨٩٣-١٩٦٧)، دەڵێت: **ئاڵای کوردستان لە ڕۆژگاری جەنگی یەکەمی جیهانییەوە هەیە.**[٦٣]

له لایەکی دیکەوە هەر جەمال نەبەز لە سەر زاری مەلا محەمەدی قزڵجی (١٨٩٥ –١٩٥٩)، دەڵێت: **"کە ئەو ئاڵایە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، لە سەردەمی سمکۆدا هەبووە، پاشان کەوتووەتە لای عەزیز زەندی، کە لە کۆتایی ساڵی ١٩٣٧دا** "کۆمەڵەی ئازادیخوازی کوردستان"**ی دامەزراند ، بە تێکچوونی حیزبەکەی و هاتنە کایەی کۆمەڵەی ژێکاف، کەوتە لای دامەزرێنەرانی ژێکاف، بەڵام کۆمەڵەی ژێکاف لەبەر ئەوەی دڵنیا نەبوو، لەوەی هەل بۆ کورد هەڵدەکەوێ، "قەوارەیەك بۆ خۆیان ساز بکەن، جارێ ئاڵاکەیان لە گۆڤارەکەیاندا** "نیشتمان" **چاپنەکرد، بەڵکو تەنێ (خۆر)ەکەیان چاپ کرد لە نێو بازنەیەکدا، دوایی کە کۆماری کوردستان داخویانیکرد، ئەوجا پێشەوای شەهید قازی محەمەدی ئەو ئاڵایەی کرد بە ئاڵای کۆماری کوردستان"**[٦٤]. بەڵام ئەوەی عەزیز زەندی جۆرێکی دیکەیە، دواتر باسی دەکەین.

سەبارەت بە لێکدانەوەی ڕەنگەکانی ئاڵای کوردستان (**سپی بەرانبەر بەفرە ، کەسك بەرانبەر کشتوکاڵ، سوور بەرانبەر خوێنی شەهیدان ، زەردیش واتە خۆر**[٦٥].

جەمال نەبەز لەسەر زاری شاکر مەجرووم دەڵێت: **ڕەنگەکانی ئاڵای کوردستان لە ڕەنگەکانی سروشتی کوردستان وەرگیراون**[٦٦].

**زەینەلعابدین کێیە؟**

زانیاری لەبارەی کەسایەتی زەینەلعابدین زۆر کەمە ، ئەوەی تا ئێستا بۆ ئێمە دەرکەوتووە ، ناوبراو کوڕی (**محەمەد فانی**)یە، لە شاری سلێمانی نیشتەجێ بووە و دوو برای بە ناوەکانی دکتۆر مەسعوود فانی (١٨٨٩–١٩٧٩) و عەلی عیلمی (١٨٨٩–١٩٦٤) هەبووە[٦٧].

سەبارەت بە زەینەلعابدین هەندێ زانیاریش لای حوزنی موکریانی (١٨٩٣–١٩٤٧) تۆمارکراوە، کاتێ لە ناوەڕاستی سییەکاندا حوزنی لە هەوڵی دەرکردنی ڕۆژنامەیەکدا بووە، داوای لێ کراوە دەبێ زەینەلعابدین

وەك بەڕێوەبەری بەرپرس لە گەڵیدا بێت، بـەڵام كارەكـە لەگـەڵ ئـەو سـەری نەگرتووە[٦٨]. زەینەلعابدین ئەندامی كۆمەڵـەی تـەعالی كوردسـتان بـووە[٦٩]. زەینـە لعابـدین رۆڵـەی رواندزە و مامۆسـتای یاسـا و كـاتبی گشـتی پـارتی حورپییەت و ئیئتیلاف بووە، بە ئەدەنەلی زەینەلعابدین ناسـراوە، ماوەیـەكی زۆر لـە میسـر ماوەتـەوە، بـرای عـەلی عیلمـی و مەسـعوود فانییـە، خـەڵكی سلێمانییە، لە رواندز مـردووە[٧٠]. هـەروەها بەڕێوەبـەری قوتابخانـەی قـەڵای كەركووكیش بووە[٧١].

**ڕاپەڕینی سمكۆ و ئاڵا**

ڕاپەڕینی سمكۆ (١٨٩٥–١٩٣٠) كە لە ڕۆژهەڵاتی كوردستان بەرپا بوو ، هەنـدێ سەرچـاوە ئامـاژە بەهـەڵكردنی ئاڵایـەك دەكـەن ، لەوانـە حـوزنی موكریانی (١٨٩٣–١٩٤٧) دەڵێت: ((**سەید تەها كە سـەید عەبدوڵڵای ناردە سـەر عـەلی زەمانیـان، مولاحـەزەی فـەرموو تـۆپی داشـا مەجیـد نایـەڵێت بجوولێتـەوە، ئـاڵای خـۆی ، كـە نیشـانەی ڕەش بـوو دا بـە شـێخ عەبدوڵڵا فەرمووی ئێستاكە دەبێ داشا مەجیـد بگـرن.... ئـاڵای سـەید تـەها لەسـەر تـەپلی سـەری داشـا مەجیـد چـەقاند.**))[٧٢]. پێدەچـێ ئـەو ئاڵایـە هـەر بـۆ خۆناسـینەوە بێـت ، نـەك ئـاڵای نەتـەوەیی. ((**... عەجـەم لـە تـەورێزدا تەشویشێكی تێكەوت ، لاهووتی خان بە ئاشكرا ئاڵای سمكۆیان هەڵدا**))[٧٣] .((**... هەرچـەندە هـەموو كوردسـتان تـاكو دەچـێتە لوڕسـتان و لـەك، ئامادەبوونە لە عەجەم بڵند بن و ئاڵای سمكۆ هەڵكەن....**))[٧٤].

لە دیدارێكی مسـتەفا پاشـا یـامولكی (١٨٦٦ـ١٩٣٦)، كـاتێ پرسـیاری هەڵنـەكردنی ئـاڵای تایبـەتی لـێ دەكـات، لـە وەڵامـدا سمكـۆ گوتوویـە: "**....سەبارەت بە ئاڵا ئەوا پێم وانییە پێویست بە بوونی بكات، بەڵام دیارە شكاكەكان ئاڵای جۆراوجۆریان هەیە، وەك دەبینی هـەر تیپـی شـەڕكەرە و ئاڵای خۆیان هەیە**" [٧٥].

**"..... ئاڵای تایبەتی خۆی هەڵدەكا. ئاڵاكەی سمكۆ بریتی بوو لە دوو ئامێری شاخاوی كە بە شێوەی خاچ لەیەكیان داوە و لەسەری نووسرابوو (كوردستانی ئازاد)، ئەویش لەساڵی ١٩٢٢"** [٧٦].

بەڵام سەرچاوەیەكی دیكە سەبارەت بە ئاڵای سمكۆ دەڵێت **" ئاڵای كوردی بریتی بوو لە دوو تۆپی چیایی لێك تێپەڕیو بوو كە كوردستانی سەربەخۆی لە سەر نەخش كرابوو"**[٧٧].

سەبارەت بە بوونی ئاڵای تایبەتی سمكۆ، ئەوا لەبەردەم وەڵامەكەی سمكۆ بۆ یاموڵكی هیچیان خۆ ناگرن، پاشان ئەو تێكەڵاوییە لە وەسفی جۆری ئاڵاكە، شتێكی وا نادەن بە دەستەوە.

## ئاڵای كوردستان لە شۆڕشی ساڵی ١٩٢٥

لە شۆڕشی ساڵی ١٩٢٥ ی باكووری كوردستان بە ڕابەری شێخ سەعیدی پیران (١٨٦٥–١٩٢٥)، ئاڵای كوردستان هەڵكراوە و ژمارەیەك نووسەر ئاماژەیان بە هەڵكردنی ئاڵای كوردستان كردووە.

لە هەواڵێكی خێرادا كە باس لە دادگاییكردنی شۆڕشگێڕانی كورد دەكات ڕۆژنامەی (**العراق**) باس لە ئاڵای كوردستان دەكات كە پارچە قوماشێكی سەوزە و ڕۆژێكی پڕشنگدار لە ناوەڕاستیدایە ، وەك دەڵێت: (( **هەموو كوردێك تامەزرۆی هەڵكردنیەتی**))[٧٨].

لە ئیفادەكانی ناو دادگای ئیستقلالی شەرقدا كە لە ڕۆژەكانی ١٥ و ١٩ ی مایسی ١٩٢٥ لە ڕۆژنامەی (**وقت**)دا بڵاوكراوەتەوە و پەیامنێرەكەی (**ناشیت هەقی**) بووە، لە كاتی پرسیاركردن لە سەید عەبدولقادری نەهری (١٨٥٧–١٩٢٥) باسی ئەو ئاڵایە كراوە كە جەمعیەتی تەشكیلاتی ئیجتیماعیەی كورد دروستی كردووە[٧٩].

لە ڕێڕەوی دادگاییكردنی سەید عەبدولقادردا، باسی پێناسەی كارتی جەمعیەتی تەعالی كوردستان كراوە، كە ڕەنگی سەوز لە خوارەوەو لە ناوەڕاستیشدا خۆرێكی زەرد بووە[٨٠]. ئەم ئاڵایە پێناسەی جەمعیەتەكەیە

کـه ڕەنگــی ســەوزە[٨١]. لــە ئیفــادەی ســەید محەمــەدی کــوڕی ســەید عەبدولقادردا هاتووە، کە ئەم ئاڵایە نووسەری گشتی (**کاتب عمومی**) دروستی کردووە[٨٢].

بەپێی سەرچاوەیەکی دیکە لە هەمان دادگاییکردنی سەید عەبدولقادری سەید عوبیدوڵڵای شەمزینی سەرۆکی پێشووی کۆمەڵەی تـەعالی کوردستان، لە دادگای ئیستقلالدا تووشی گەلێك لێپێچینەوە بووە و گوتوویە: **"بیرمان لە دامەزرانـدنی کوردسـتانێکی سـەربەخۆ و ئاڵایـەکی کـوردی پێکهـاتوو لـە ڕەنگـەکانی** (سـوور و زەرد و سـپی) **و خـۆرێکی پرشـنگدار لـە ناوەڕاسـتیدا دەکردەوە کە لەگەڵ مێژوو و گیانی نەتەوایـەتی کـورددا بگونجێـت ئەمـەش مافێکی کوردەکانە"**[٨٣].

ئەوەی جێی سـەرنجە باسـی ڕەنگـی زەرد بـۆ ئاڵاکـە کـراوە لـە جیـاتی سەوز، کەچی لە سەرچـاوەیەکی دیکـەدا دەڵێـت: لـە دانیشـتنی ڕۆژی ١٦ ی مایس، سەرۆکی دادگای سەربەخۆ (**ئیستقلال**) ئەو پرسیارەی کردووە ، کـە هەندێ ڕۆژنامە بلاویان کردۆتـەوە ...."**ئـەو ئاڵایـە کـە لاتـان بـوو** (ئاڵاکـەی نیشـان دا کـە پارچـەیەکی کەسـك لـە ناوەڕاسـتی ڕۆژێـك تیشـکەکانی بـلاو کردبۆوە ) **وەڵامی شێخ سەعید ئەوە بوو: ئەوە ئاڵای کوردەو هەموو کوردێك دەخوازێ لە ولاتەکـەی بـەرزی بکاتـەوە"**[٨٤]. لێـرەدا جۆرێـك تێکـەڵاوی لـە وەسفی ئاڵاکاندا هەیە.

**ئاڵا و کوردستانی سوور**

لە باسـی کوردسـتانی سـوور لـە یـەکێتی سـۆڤیەتی جارانیشـدا، کـە لـە بیستەکاندا لە ئەرمینیا دامەزراوە، لەو کارەدا مسـتەفاییف کـە کوردێکـە لـە ئۆزباکسـتان دەژیـا و پۆلیسـی لـەوێ تـەواو کـردووە و خانەنشـین کـراوە، دواتـریش چـۆتە ئـەرمینیا و لەگـەڵ (١٥–٢٠) پیـاودا (**کۆمـاری سـوور**)یـان ڕاگەیاندووە، هـەر لـەوێ ئاڵاکـەیان هەڵواسـی و کۆمارێکیـان دامەزرانـدووە و دیاری کرد و لەژێر ئاڵاکە سەرکۆماریان دانا و چەند وەزارەتێکیـان نـاو لێنـاو

نان و چایەکیان خواردۆتەوە و چوونەتەوە ماڵی خۆیان و هەر ئەو ڕۆژەش کۆمارەکە تێك چوو، ئەمەش لەبەر ئەوەی مستەفاییف گوتبووی ٢٠ هەزار چەکدار ئامادە دەکات و ئەمەش ترسی لای ئەرمەنەکان دروست کردووە و لەنێو خۆیان هەوڵەکەیان لەناوبرد(٨٥). بەڵام باسی شێوەی ئالآکەی نەکراوە.

**ئالآی کوردستان لە ڕۆژگاری کۆمەڵەی خۆیبووندا (١٩٢٧-١٩٣٢)**

یەکێك لە کارە دیار و بەرچاوەکانی کۆمەڵەی خۆیبوون هەڵکردنی ئالآی کوردستان بووە، لە سەرچاوەیەکدا ئاوا باسی ئالآی خۆیبوون کراوە بەبێ ناوهێنانی سەرچاوەی زانیارییەکانی: **"ئەم ئالآیە لەسەرەوە بۆ خوارێ لە سێ ڕەنگان پێك هاتووە ، سوور، زەرد وە سەوز وە لە ناو ڕەنگە زەردەکەیدا وێنەی ڕۆژ هەیە ...ئەم ئالآیە لە ١٨٢١ ی میلادی دا دەرکەوت کە امیر (بەدرخان) لە تەمەنی ١٨ سالی دا سەرۆکایەتی امارەتی دوورگە (جزیرە) ی ناوچەی (بۆتان)ی بەدەستەوە گرت."** (٨٦).

کۆمەڵەی خۆیبوون لە ڕۆژی ٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٧ لە شارۆچکەی بحمدون لە لوبنان دامەزراوە (٨٧)، ئەو ڕێکخراوە دروشمی تایبەتی خۆی هەبووە و ئالآی کوردستانیشی هەڵکردووە. دروشمی کۆمەڵەی خۆیبوون خەنجەرێك بووە لەناوەڕاستی گوڵە گەنمێك و پەڕە مووچەیەکی نووسین و خۆرێکی پڕشنگداریش لەسەرەوە هەمووانی داگرتووە ، ئالآکەشی ، ئالآی سێ ڕەنگی کوردستان لەسەر لووتکەی ئارارات هەڵکردووە ، ئەم ئالآیە لاکێشەیەك بووە بە درێژایی کراوەتە سێ بەشی یەکسان سوور و سپی و کەسك لە خوارەوە خۆرێکی پڕشنگداریش لە ناوەڕاستیدایە (٨٨). ئەوەی جێی سەرنجە لەو سەرچاوەیەدا ئاماژە بە دروستکردنی ئالآکە لە لایەن ئەمین عالی بەدرخان و هاوڕێکانی دەکات (٨٩).

سەرچاوەی ئەو زانیارییەش بیرەوەرییەکانی ئیحسان نوری پاشا (١٨٩٨-١٩٧٦)ی سەرکردەی ڕاپەڕینی ئاگری خۆیەتی کە ئاماژەی بە

هەڵکردنی ئاڵای کوردستان کردووە لە رۆژگاری راپەرینەکەدا [٩٠]، تەنانەت وێنەشی هەیە[٩١].

دیارە لە بلاّوکراوەکانی خۆیبوونیشدا ئاماژە بە ئاڵایەکەیان کراوە و وێنەشی بلاّوکراوەتەوە[٩٢]. وێنەی ئەو ئاڵایە کاتی خۆی لەسەر بەرگی بلاّوکراوەی ژمارە (١)ی خۆیبوون بە زمانی ئینگلیزی بلاّوکراوەتەوە، بە ناوی (The Case Of Kurdistan Against Turkey)، کە لە ساڵی ١٩٢٨ لە فلادلفیا بە زمانی ئینگلیزی دەرچووە[٩٣].

لە سەرچاوەیەکی دیکەشدا هەر ئەمە دووپات کراوەتەوە[٩٤]. ئەوەی جێی سەرنجە هەر ئاماژە بە سێ ڕەنگی ئاڵاکە کراوە ، بێ ئەوەی ئاماژە بە خۆرە زەردەکەی ناوەراستی بکرێت.

بەلای توێژەرەوە ئەو زانیارییانە دروست نین ، تەنیا قسەی سەر زاری خەڵك بووە، بێ ئەوەی سەرچاوەی متمانە پێکراو لەبەردەست دابن ، چونکە ئەو سەردەمە سەرچاوە لەبارەی مێژووی کورد زۆر دەگمەن بووە. لە پەنجاکاندا وەك د. عیزەدین مستەفا رەسووڵ نووسیویە: ((**بەیداخەکەی خۆیبوون لە سوریا و لوبنانەوە لەسەر ئاسن دەهات ، خەڵك دەیانکرد بە یەخەی خۆیانەوە ، تەنانەت لە هەڵوێستێکدا بە میستەر شۆتەری حاکمی بەریتانیا وتراوە: "ئەمە بەیداخی کوردستانە، ئەگەر ئێوە بۆمان هەڵناکەن ، رووس بۆمان هەڵدەکات"** [٩٥].

## حیزبی هیوا و ئاڵای کوردستان

لەگەڵ دامەزراندنی حیزبی هیوا لە ساڵانی سییەکانی سەدەی بیستەمدا، بۆ چوونە ڕیزی ئەم حیزبە دەبوا سوێند بە قورئان و خەنجەر و ئاڵای کوردستان بخورێت، کە خیانەت لە نەتەوەکەی نەکات و خۆی بکاتە قوربانی کوردستان[٩٦]. وێڕای ئەوە لەسەر یەکێك لە بلاّوکراوەکانی گۆڤارێکی حیزبی هیوادا وێنەی ئاڵای کوردستانی بە سەر یەکێك لە ژمارەکانییەوە لە لای چەپی ژمارە (T) بە ڕەنگاو ڕەنگی کێشراوە[٩٧].

**حیزبی ئازادی کوردستان و ئالأی کوردستان**

ئەم حیزبە لە ساڵی ١٩٣٨ لە لایەن عەزیز زەندی (١٨٩٨-١٩٧٢) لە رۆژهەلأتی کوردستان دامەزراوە و تا ساڵی١٩٤٢ ، ئەم حیزبە دروشمی هەبووە، کوردەکانی ورمێ لە راپەرینەکەی ساڵانی١٩٤١ -١٩٤٢بەرپابوو، راپەڕیوان ئالأیەکیان هەبووە، بریتی بووە لە:**"دوو خەنجەری راست و چەپ، سێ ئەستێرە لە سەر تەختێکی سەوز لە شوعاری حیزبی ئازادی کوردستانەوە وەرگیراوە"**(٩٨). کەواتە حیزبی ئازادی کوردستانیش ئالأی هەبووە.

**ئالأی سەردەمی کۆماری کوردستان**

کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان (٩٩). هەمان ئالأی کۆمەڵەی تەشکیلاتی ئیجتماعی وەك ئالأی نەتەوەیی ناسیوە (١٠٠) کۆمەڵە لە رۆژی ٩ مای ١٩٤٥ بە بۆنەی سەرکەوتنی هاوپەیمانان بەسەر فاشیزمدا لە شاری مەهاباد جەژنی گرت و ئالأی نەتەوایەتی کوردییان هەڵکردووە (١٠١).

کۆماری کوردستان لە مەهاباد لە ٢٢ی کانوونی دووەمی ١٩٤٦ بە پێشەوایەتی قازی محەمەد (١٩٠١-١٩٤٧) دامەزرا(١٠٢). بەر لە راگەیاندنی دامەزراندنی کۆمار ، ئالأی کوردستان هەڵکراوە، ئەویش: **" لە سەعات (١٠) رۆژی ٩/٢٦/ ٢٤ (١٩٤٥/١٢/١٧) دا ئالأی پیرۆزی کوردستان، بە قەدر و عزەتێکی یەگجار زۆر لەسەر بانی یانەی (هیئەتی رئیسەی میللی) و یانەی پێشمەرگان لە مەهاباد هەڵکرا. لەلایەك قوتابیان کچ و کوڕ قامی ملیان دەخوێندەوە لە لایەکیش موزیك لێدەدرا ، لە لایەکی کەشەوە پێشمەرگان شیلینگیان دەکرد. دە هەزار نەفەر هوریایان دەکێشا و چەپڵەیان لێدەدا ، پێشەوای بەرز و مەزنی کوردستان جەنابی قازی محەمەد پیرۆزبایی لە میللەتی کورد کرد و فەرمووی: مێژوو نیشان نادا هیچ میللەتێك توانیبێتی بێ خوێن ڕێژی ئالأی ڕزگاری خۆی هەڵکا، بەلأم میللەتی کورد توانی بەبێ**

**ئەوەی خوێن لە کەپووی کەس بێت بە هۆی لیاقەت و کارزانییەوە ئالای ئازادی هەڵکا و خۆی بە دونیای تەمەدون بناسێنیٚ"** [١٠٣].

لە ڕۆژی ١٧ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥ لە شاری مەهاباد، لە سەعات ١٠ ی بەیانی بە ئامادەبوونی خەڵکێکی زۆری چینە جیاجیاکانی کوردستان و لە بارەگای حیزبی دیموکراتی کوردستان، لە ڕێوڕەسمێکی شکۆدار و بە ئامادەبوونی پێشەوا قازی محەمەد ، بە خوێندنی سروودی نەتەوەیی [١٠٤]، ئالای کوردستان هەڵکراوە، دواتریش ئەو ئالایە لە شارەکانی دیکەی وەك: بۆکان ، نەغەدە ، شنۆ و میاندواو، هەڵکراوە [١٠٥].

**"ئالای کۆماری کوردستان هەمان ئالای کۆمەڵەی تەشکیلاتی ئیجتماعی کوردییە بە هەندێ دەستکاریەوە، هەروەها کۆمار هێمایەکی هەبووە کە بریتی بوو لە ئالای کوردستان هەڵکراوە، لە ناوەندیدا دوو گوڵە گەنم کە قوماشێکی سوور و باریکی لە دەور ئالاوە ، لە ناوەندی گوڵە گەنمەکەدا تیشکی هەتاوەکە نوکی قەڵەمێکی لێ دەرکەوتووە ، ئەو هێمایە لە بۆنەکاندا لەگەڵ ئالای کوردستان دادەنرا"** [١٠٦].

سەبارەت بە ئالای کۆماری کوردستان ، لە سەرچاوەیەکدا هاتووە ، ئەو کاتەی قەدری جەمیل پاشا سەردانی کۆماری کوردستانی کردووە لە مەهاباد چەند دانەیەکی لە ئالای کوردستانی پێ بووە ، کە لەو ساڵانەدا لە بەیروت دروست کرابوون ، دانەیەکی لەو ئالایە بە یەخەی پێشەوا قازی محەمەد کردووە ئەمیش گوتوویە: **"بە ڕاستی ئالایەکی جوانە و با هەر ئەوە ئالای جمهوریەت بێ ، بەڵام با قەڵەمێك و گوڵە جۆ یان گەنمێك لەملاو ئەولای ڕۆژەکە دابنرێ"** [١٠٧]. بەڵام وەك بینیمان ئەو ئالایە بەر لە هاتنی قەدری جەمیل پاشا، هەڵکراوە.

لە وتارێکی کوردتدا لە ڕاڤەی ئەو ئالایەدا نووسراوە: ئالاکە سێ ڕەنگە، سوور و سپی و سەوز و لەناو سپیەکەدا دروشمی کۆماری تێدایە ، کە بریتی بوو لە دوو گوڵە گەنم و جۆ و وێنەی خۆر و لە ناو خۆرەکەشدا وێنەی قەڵەمە، کە ئەویش بریتی بوو لە پەڕەمووچەیەك ، سوورەکە: خوێن ،

سـپیەکە: کفـن، سـەوزەکەش: سروشـتی سـەوزی کوردسـتانە ، گـەنم و جۆیەکەشی بە پیتیی خاکی کوردستانە و خۆرەکەش نیشانەی خۆشەویستی و دێرینیی کوردانە، قەڵەمەکەش خوێندن و زانستە[١٠٨].

لەدوا دیداری پێشەوا قـازی محەمـەد و مـەلا مسـتەفای بـارزانی (١٩٠٣–١٩٧٩)، لـە ئێـوارەی ڕۆژی ١٩٤٦/١٢/١٦ قـازی محەمـەد دوای ئـەوەی ڕازی نابێت لە گەڵی بڕوات ، ئاڵای کوردستان لە گیرفانی دەردەهێنێت و دەیداتـە دەست مەلا مستەفا بارزانی و پێی دەڵێت: ئەوە ڕەمزی کوردستانە، بە تۆی دەسپێرم ، وەك ئەمانەت لە ئەستۆت[١٠٩].

لەدیدارێکی موحسین دزەیی لەگەڵ میناخانم (١٩٠٨ ـ١٩٩٦)ی خێزانی پیشـەوا قـازی محەمـەد، لـە ئـابی ١٩٥٨دا، لـە شـاری میـۆنیخی ئـەلمانیادا، لەسـەر زاری مینـا خانمـدا دەڵێـت:"....**لـەو کاتـەدا قـازی محەمـەد ئـاڵای کوردستانی دا یە دەست هەڤاڵی ڕێگای تێکۆشانی (مستەفا بارزانی) و وتی، ئـەو ئاڵایـەت تەسـلیم دەکـەم و تکـا دەکـەم بیپـارێزە، بـارزانی ئاڵایەکـەی وەرگرت...**"[١١٠]

هەروەها فەلەکەدین کاکەییش لە نامەیەکدا هەمان ئەو بۆچوونە دووپـات دەکاتەوە و نووسیویە: "لە هەشتاکاندا، مەکتەبی سیاسی پـارتی لـە (**ڕاژان**) بوو، گوندی شێخی نەهرییە، لە ناوچەی مەرگەوەڕ لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان.

سەرۆکی بـەڕێز مەسـعود بـارزانی چـەند ئەنـدامێکی مەکتـەبی سیاسـیی دەعوەت کرد بۆ بارەگاکەی، کە لەوانەی ماون لـە یـادم مـاون: د. ڕۆژ نـوری شاوەیس، د. محەمەد سالح جمعە، د. جرجیس حەسـەن، بەنـدە و یـەك دوو هەڤالی دیکە.

گوتی: دیاریەکی مێژووییتان پیشاندەدەم.

هێنای...بوخچەیەکی بچووك بەسترابوو، باش بەسترابوو، هەڵگیرابوو. لە بەرچاومان کردیەوە بە سەرسامیەوە چاومان بە ئالایەکی بچووکی سـەرمێزی کوردستان کەوت. گوتی: **ئەمە ئاڵایەکە پێشـەوا قـازی محەمـەد لـە مـەهاباد تەسلیمی مەلا مستەفای کردووە.**"[١١١]

**ئاڵای کوردستان لە دوای راپەڕینی ١٩٩١**

لە دوای راپەڕینی بەهاری ١٩٩١، وێڕای ئەوەی کە کۆمەڵەی جوگرافیای سیاسی بەریتانیا بە ڕەسمی دانی بەو ئاڵایەی کوردستاندا ناوە وەك ئاڵای نیشتمانی خاکی کوردستان(١١٢).

لە بارودۆخی نوێی دوای راپەڕین، باسی ئاڵا کەوتە سەر زاران، لە گۆڤار و رۆژنامەکاندا مشتومڕ سەبارەت بە داهێنەری ئاڵای کوردستان هاتە ئاراوە. بەپێی ئاگادارییی توێژەر، سەرەتا لە وتارێکی بەدران ئەحمەدەوە بوو، تێیدا باس لە رەمزی نافیع رەشید هەولێری (١٩١٧-١٩٤٧) و گۆتفرید میووللەری ئەڵمانی (١٩١٤-٢٠١٠) کراوە، کە لە کردەیەکی سیاسییدا لە ساڵی ١٩٤٣دا هاوکار بوونە ئەو دووانە داهێنەری ئەو ئاڵایەی کوردستان بووبن(١١٣).

بەلاَم ئەو بۆچوونە، بە چەند بەڵگەیەك رەت کراوەتەوە و سەلمێنراوە مێژووەکەی زۆر لەوە زووترە(١١٤). هەر ئەم بۆچوونەی بەدران، دووجاری دیکەش دووپات کراوەتەوە، کەچی وەلاَمەکەی پشتگوێ خراوە.(١١٥)

دامەزراندنی پەرلەمانی کوردستان لە ئاکامی هەڵبژاردنی ١٩٩٢/٥/٢٠، دواتریش راگەیاندنی فیدراڵی لە ١٩٩٢/١٠/٤، خاڵێکی وەرچەرخانی زۆر گرنگ بوو لە مێژووی نوێ و هاوچەرخی کورد، لەو بارەیەوە نووسەران، داوایان کردووە هەنگاوی داهاتوو هەڵکردنی ئاڵای کوردستان بێت، کە تا ئەو رۆژە جگە لە پارتی (**پاسۆك**) هیچ لایەنەك بە راشکاوانە داوای لەو جۆرەیان نەبووە(١١٦).

لەو وتارەدا راشکاوانە بە پاڵپشتی سەرچاوەی پێویست ئاماژە بە لایەنی دروستکەری ئاڵا کراوە، کە (**کۆمەڵەی تەشکیلاتی ئیجتیماعی**)یە، دواتریش کورتە مێژوویەکی هەڵکردنی ئاڵا لە سەردەمە جیاجیاکاندا خراوەتە روو، بۆ ئەو رۆژە زانیاری نوێ بوون(١١٧).

ئەوەبوو پەرلەمانی کوردستان بەپێی بڕیاری ژمارە (٢٦)ی ١٩٩٩/١١/١١، یاسای ژمارە (١٤)ی ساڵی ١٩٩٩، کە تایبەتە بە ئاڵای هەرێمی کوردستانی عێراق، دەرکردووە، تێیدا شێوازی ئاڵاکە و پێوانەکان و

شێوازی هەڵدانی دیاری کراوە. بە داخەوە لەوێش لەو یاسایەدا هەمان بیست و یەك تیشك بۆ خۆرەکە دیاری کراوە، بە واتای جەژنی نەورۆز، کە دیارە ئەمەساڵی زایینییە نەك کوردی، کە لە (١)ی خاکەلێوە دەست پێدەکات[١١٨].

سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیرانیش سیستەمی ئاڵای کوردستانی بە ژمارە(٢)ی ساڵی ٢٠٠٤ دەرکرد، تێیدا پێوانەی ئاڵا و شوێن و بۆنەکانی هەڵکردنی دیاری کردووە.[١١٩] دواتریش سەرۆکایەتی هەرێم بە فەرمانی هەرێمی ژمارە(٦٠)، ٢٠٠٦/٧/٦ شوێنی هەڵکردنی دیاری کردووە.[١٢٠]

ئەوەش هێنانەدی ئاواتێکی گەورەی کوردان بوو. تەنانەت یەکێك لە ئەندام پەرلەمانەکان لە خۆشیی دەرکردنی یاسای ئاڵای هەرێمی کوردستان، بوورابۆوە[١٢١].

لە بارەی ئاڵای کوردستانەوە، عەبدوڵڵا زەنگەنە لە وتارێکیدا ئەو پرسیارەی کردووە ،**"ئاڵای کوردستان ئایا دەبێ هەڵگەڕاوەی ئاڵای وڵاتێکی دیکە بووبێت؟"**[١٢٢]. کە گوایە ئاڵای کوردستان هەڵگەڕاوەی ئاڵای دەوڵەتی ئێرانە[١٢٣]. بەڵام دواتر هەر خۆی بە پاڵپشتی گۆڤاری (**هاوار**)ی ژمارە (١١)، ١٠ی چریا پاشی ١٩٣٢ی جەلادەت بەدرخان (١٨٩٧-١٩٥١)، بە روونی سەلماندوویەتی کە ئەم ئاڵایە هەڵگەڕاوەی هیچ ئاڵایەك نییە، بەو مانایەی کە لە پێش دامەزراندنی کۆمار، لە ساڵی ١٩٤٦دا هەبووە[١٢٤]. جەلادەت بەدرخانیش ئەو ئاڵایەی بە بۆنەی شەهیدبوونی شێخ عەبدولڕەحمان گارسی لەو ساڵەدا بڵاوکردۆتەوە[١٢٥].

### ئاڵای کوردستان و رووناکبیرانی کورد

بێگومان ئاڵا وەك هێما و نیشانەی سەروەری، هەمیشە مایەی شانازی و شکۆمەندییە، نەخوازە بۆ میللەتێکی کە هێشتا نەبۆتە خاوەنی قەوارەی سیاسیی خۆی. لەو رووەوە، هەڵگرتن و بینین و دروستکردن و چنینی ئەو ئاڵایە لە لایەن خەڵکی کوردستان بە گشتی و رووناکبیران مایەی شانازی بووە.

لـه نامەیـەکی مسـتەفا خۆشـناو (١٩١٢–١٩٤٧) دا، بـۆ مـەلا مسـتەفا بارزانی لە ١٩٤٥/٣/١٨دا هاتووە، دەڵێت: **ئاڵایەك** (بەیداخ)**ێك لـە سـووریاوە هاتووە، لە لامانە لەماڵی شێخ صادق پاراستوومانە**[١٢٦].

یوسف مەلـەك (١٨٩٩–١٩٥٩) ڕۆشـنبیری دیـاری ئاسـووری نووسـیویە: **"هەر بژی کوردستانی ئازاد و سەربەست لەژێر سایەی ئاڵا سێ ڕەنگییەکەی کە هێمان بۆ سروشـت و ژیـان و پـاکی"**، ئـەو ئاڵایـە جارێك یوسـف مەلـەك گەیاندۆتە فاتیکان[١٢٧].

لـە کـارێکی سیاسـی گـەورەی وەك کـردەی مـامۆت MAMMOTH کـە ڕەمزی نـافیع ڕەشـید (١٩١٧–١٩٤٧) و گۆتفرید یۆهـانز میوللـەر لـە سـاڵی ١٩٤٣ کە لە ئەڵمانیاوە بە فڕۆکە هاتنەوە کوردستان، بـۆ ئـەوەی ڕاپـەڕینێك لە دژی ئینگلیز بەرپا بکـەن، بـەڵام سـەری نـەگرت، ئـەوا سـوێندخواردن بـۆ ناپاکی نەکردن دەبوا بە ئاڵای ئەڵمانیا و ئاڵای کوردستان بووە[١٢٨].

گۆڤـار و ڕۆژنامـە کوردییـەکانیش بایـەخیان بـە ئـاڵای کوردسـتان وەك سیمای شکۆمەندی داوە و چ بە ناونانیان، بۆ نموونـە وەك ئـەو بڵاوکراوانـەی کە لە ناوەوە و دەرەوەی کوردستان دەرکراون: ئـاڵا، ئـاڵای بـەرگری، ئـاڵای پێشمەرگە، ئـاڵای سـوور، ئـاڵای سـووری کوردایـەتی، ئـاڵای ئیسـلام، ئـاڵای ئازادی، ئاڵای یەکێتی و چەندانی دیکەش.[١٢٩]

یان دانانی وێنەکەی لەگەڵ ناوی بڵاوکراوەکانیان، چ بە وتارنووسین. بۆ نموونـە گۆڤـاری (BULLTIN) بۆلتـەنی مەڵبەنـدی تۆژینـەوەی کـوردی لـە لەندەن کە د. کامـەران بـەدرخان (١٨٩٧–١٩٧٨)، لـە سـاڵی ١٩٤٨، ژمـارە (١)ی دەرکـردووە، لـە ژمـارە (٩)ی سـاڵی ١٩٤٩، کـە بـە زمـانی ئینگلیـزی دەرچووە، ئاڵای کوردستانی لە سەر بەرگی داناوە[١٣٠].

لە دیدارێکی مومتاز حەیدەریدا گوتی: یەکەم جـار ئـاڵای کوردسـتانم لـە وێنەیەکی تێکۆشەری ناسراو ئەحمەد حەمەدئەمین دزەیی بینیـوە لـە سـاڵی ١٩٥٦. هەروەها یەکەمین جاریش وەك مەدالیا ئاڵای کوردستانم لـە ئاهـەنگی

نەورۆزی ساڵی ١٩٥٧، بە بەرۆکی مەئموون دەباغەوە (١٩٣٦ـ١٩٦٣) بینی کە وتاری خوێندۆتەوە[(١٣١)].

لە هەڵمەتێکی پۆلیسی عیراق بۆ سەر ماڵی تیکۆشەری ناسراو مەئموون دەباغ، لە ساڵی ١٩٥٧، ناچار دەبێت هەرچی سەروکاری بە کاری سیاسییەوە هەیە لەناوببات، جگە لە مەدالیایەك ئاڵای کوردستانی لەسەر بووە، لەگەڵ وێنەی رەمزی نافیع رەشیدی تێکۆشەری ناوداری هەولێر [(١٣٢)].

جەمال خەزنەداریش دەڵێت: کاتی خۆی کە گۆڤاری (دەفتەری کوردەواری)مان دەرکرد، سێ ژمارەی بە سێ رەنگ لێ دەرچوو، کە مەبەستیش لێی ئاڵای کوردستان بوو[(١٣٣)].

فەلەکەدین کاکەیی روناکبیر و سیاسەتمەداریش لە بابەتێکیدا لە ساڵی ١٩٨٦ باسی ئاڵای کوردستانی کردووە[(١٣٤)].

رۆژنامەی تەڤگەر TEVGER ئۆرگانی تەڤگەرا رزگاریا کوردستانێ، کە لە سوێد بە هەردوو زمانی کوردی و تورکی دەرچووە، ئاڵای کوردستانی داناوە[(١٣٥)]. لەو رووە عەلی جوکڵ (١٩٢٢–٢٠١٢) مامۆستایەکی رۆشنبیری هەولێر ئاماژە بەوە دەکات، کە بۆ یەکەم جار ئاڵای کوردستانی لە ماڵی کانەبی عەزیز ئاغای دەزیی بینیوە لە بەغدا و بە دیوارەوە هەڵواسرابوو و کچەکانی بە دەست دروویبوویان[(١٣٦)].

جەوهەر غەمگینی (١٩٣٤–٢٠١٢) روناکبیریش سەبارەت بە ئاڵای کوردستان دەڵێت: **"شەکانەوەی ئاڵای کوردستان بە گەورەترین قازانج دەزانم"**[(١٣٧)]. د. سامیە شاکر (**مەشخەڵ**)ی شاعیریش دەڵێت: **"ئاڵای کوردستانمان دەکێشا و دەمانهاویشتە ماڵی نەیاران"**[(١٣٨)].

هەر لەو بوارەدا، عەبدوڵڵا پەشێوی شاعیر لە دیمانەیەکدا گوتوویە: بەر لە سی ساڵ بیری لە هەڵکردنی ئاڵا کردۆتەوە و پاشان دەڵێت:**"کە دانیشتنە هاوبەشەکەی تەلاری پەرلەمانم دیت و ئاڵای کوردستانم بینی دەشەکێتەوە، لە خۆشیان گریام و هەر ئەو ساتە تەلەفۆنم کرد بلیتی گەڕانەوەم بۆ ببڕن"**[(١٣٩)].

گۆرانیبێژانیش پشکیان لەمەدا هەیە، هەر بۆ نموونە، بورهان مەجید، گۆرانی بۆ ئالآی کوردستان گوتووە، بەلأم فەوتاندوویانە[١٤٠]. ئەمە جگە لەوەی زۆربەی شاعیرانی کورد، شیعریان بۆ ئالآ نووسیوە و لەو بارەیەوە هەستی خۆیان دەربڕیوە[١٤١]. دیارە ئەمانە تەنیا وەك نموونە باس کراون.

بە گشتی کوردیش وەك هەر نەتەوەیەکی سەر ئەم زەمینە بیری لە هەڵکردنی ئالآ کردۆتەوە و بەپێی سەردەم و بارودۆخی لەبار هەوڵی داوە، ئالآی هەبێت، ئەگەرچی هەلومەرجەکان زۆر تەسکیش بوونە. دەبێ ئاماژە بەوەش بکەین کەوا پارت و رێکخراوەکانیش زۆربەیان ئالآی تایبەت بە خۆیان هەیە.

## ئه نجام

ئـالا مێژوویـەکی دێـرینی هەیـە، لەگـەڵ سـەرهەڵدانی شارسـتانێتییەکان پەیدابووە، وەك نیشانەی رێز و رووەت و شکۆمەندی، سەرچاوەی بەرایی لـە سەربازییەوەیە. هەر شارستانییەت و دەوڵەت تەنانـەت کەسـایەتیش ئالأیـان هـەبووە. بـە درێـژایی مێـژوو گۆڕانکـاری زۆر لـە ئـالأدا رووی داوە. ئـالا رەنگاورەنگ بووە، هەر رەنگەی مانای خۆی هەبووە.

بـۆ کـورد ئـەوەی تێبـینی دەکـرێ، سەرچـاوەکانی بەردەسـت هـیچ ئاماژەیـەکیان سـەبارەت بـە ئـالا تێـدا نییـە بـەر لـە سـەدەی بیسـتەم. لـە هەمووشی گرنگتر ئالأی نەتەوایەتییە، کە بە سەرهەڵدانی دەوڵەتی نەتەوەیی ئەویش بەرجەستە بووە.

لـە سـەدەی بیسـتەم بـە سـەرهەڵدانی راپـەڕین و شـۆڕش و کۆمـەڵ و رێکخراو و پارتەکان، کوردیش ئـالأی دروست کـرد، کـە هـەر یەکـە و بـەپێی بۆچوون و تێڕوانینی خۆی ئالأی داهێناوە. بەلأم لـە هـەموویان بەرجەسـتەتر ئەو ئالأیەیە کە کۆمەڵەی تەشکیلاتی ئیجتمـاعی کـورد دایهێنـاوە و لـە سـێ تەختەی بەڕیز : سوور، سپی، سەوز، خۆرێکی پڕشنگداری لە ناوەڕاستدایە، هەر رەنگە و مانای خۆی هەیە و بەزۆریش دەربڕی سروشتی کوردستانە.

ئەم ئالأیە لـە لایـەن زۆرینـەی خـەڵکی کوردسـتان دانـی پێـدانراوە و لـە هەرێمی کوردسـتانیش یاسـای بـۆ دەرکـراوە و ئیسـتا هـەڵکراوە و کۆمەڵـەی جوگرافیناسانی نێودەوڵەتیش دانی پێداناوە.


پەرلەمان

رۆژنامەی ئەنجوومەنی نیشتمانیی کوردستانی عێراقە

ژمارە «٥٣» ١٩٩٩/١١/٢٤ سالّی هەشتەم

لەم ژمارەیەدا

بڕیاری ژمارە ,٢٦, لە ١١/١١/١٩٩٩دا

یاسای ژمارە «١٤»ی سالّی ١٩٩٩

یاسای ئالّای هەرێمی کوردستانی عێراق

پەرلەمان ياسا

**بە ناوی خوای بەخشندە میهرەبان**

**بە ناوی گەلەوە**
**ئەنجوومەنی نیشتمانیی کوردستانی عێراق**
**ژمارەی بڕیار: ٢٦**
**مێژووی بڕیار: ١٩٩٩/١١/١١**

**بڕیار**

پشت بەو دەسەڵاتەی کە بەپێی برگە «٣»ی ماددە «٢» لە یاسای ژمارە «١٠»ی ساڵی ١٩٩٧ پێمان دراوەو لەسەر ئەو بنەمایەی کە ئەنجوومەنی نیشتمانیی کوردستانی عێراق لە دانیشتنی ڕۆژی ١٩٩٩/١١/١١یدا یاساکاری کردووە، ئەم یاسایەمان دەرهێنا:

**یاسای ژمارە «١٤»ی ساڵی ١٩٩٩**
**یاسای ئاڵای هەرێمی کوردستانی عێراق**

**ماددەی یەکەم:**

هەرێمی کوردستانی عێراق ئاڵایەکی دەبێت بە شێوەی لاکێشەیی، کە پانییەکەی دوو لەسەر سێی درێژییەکەی دەبێت و، دابەش کراوە لەسەر سێ لاکێشەی ئاسۆیی یەکسان لە درێژی و پانی داو، پێکهاتەکەی بەم شێوەیەیە:

١ـ لاکێشەی سەرەوە ڕەنگی سوورەو، هێمای شەهیدانی بزاڤی ڕزگاری خوازی کوردە.

٢ـ لاکێشەی ناوەڕاست ڕەنگی سپی دەبێت، هێمای ئاشتی و ئازادی و دیموکراسی و لێبوردنە (تسامح)، کە خەڵکی کوردستان ئاواتە خوازیەتی.

٣ـ خۆرێکی زەرد دەکەوێتە ناوەڕاستی لاکێشە سپییەکەوەو، چەقەکەی خاڵی یەکتر برینی تیرەی لاکێشە سپییەکە دەبێت و، تیرەی خۆرەکە ئەوەندەی پانایی لاکێشە سپییەکە دەبێت و، (٢١) بیست و یەک تیشکی لێوە دەردەچێت بە شێوەی سێ گۆشەی دوولا یەکسان و، بنکەکانی ($\frac{١}{٢١}$)

١٩٩٩/١١/٢٤ ژمارە «٥٣» ١

یاسا    پەرلەمان

یەک لەسەر بیست و یەک لە چێوەی گۆی خۆرەکە دەبێت و، درێژیشیان بگاتە نیوەی هەردوو لاکێشە سوورو سەوزەکە. خۆرە زەردەکە هێمای بەردەوام بوونی ژیان و زانست و هیوا و ئومێدەو، (٢١) بیست و یەک تیشکەکەیش هێمای جەژنی نەورۆزی نەتەوایەتییە، رۆژی بەرخودان و راپەرین و شۆرش رزگاریی دژ بە زوڵم و زۆرو چەوساندنەوە.

٤- لاکێشەی خوارەوە رەنگی سەوز دەبێت و، هێمای کشتوکاڵ و سروشت و ژینگەی کوردستانە.

**ماددەی دووەم:**

ئەو جێگایانەی کە ئاڵاکەی لەسەر هەڵدەدرێت لە (پەیرەو) دیاری دەکرێت.

**ماددەی سێیەم:**

هەڵکردنی ئاڵا لە کاتی خۆرهەڵاتن دا دەبێت و، هاتنە خوارەوەشی لە کاتی خۆرئاوا بووندا.

**ماددەی چوارەم:**

دروست و چاپ و دابەش کردنی ئاڵا بە رەزامەندی وەزارەتی رۆشنبیری دەبێت.

**ماددەی پێنجەم:**

نابێت ئاڵا لە بۆنە نیشتمانی و نەتەوایەتی و ئاهەنگەکان دا بەرز بکرێتەوە یان بە کار بێت، ئەگەر هاتو کەم و کوری هەبوو لەمەڕ گۆڕانی رەنگەکانی و پاک و پوختی و درانی.

**ماددەی شەشەم:**

هەڵدانی ئاڵا شان بە شانی ئاڵای عێراق دەبێت لەو بۆنانەی کە ئاڵای عێراقی تێدا هەڵدەدرێت و، تا قەوارەی دەستووری فیدرالییەت دەچەسپێت بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە عێراق دا.

**ماددەی حەوتەم:**

ئەنجوومەنی وەزیران بۆی هەیە پەیرەوێکی تایبەتی دەربکات بۆ ئاسان کردنی جێبەجێ کردنی بەندەکانی ئەم یاسایە.

**مادده هەشتەم:**

کار بە هیچ دەقێک ناکرێت کە لەگەڵ حوکمەکانی ئەم یاسایەدا هاو دژ بێت.

١٩٩٩/١١/٢٤    ژمارە «٥٣»    ٢

یاسا  پەرلەمان

**ماددەی نۆیەم:**

دەبێ ئەنجوومەنی وەزیران ئەم یاسایە جێبەجێ بکات.

**ماددەی دەیەم:**

ئەم یاسایە لە مێژووی دەرهێنانییەوە جێبەجێ دەکرێت و لە ڕۆژنامەی ڕەسمیدا بڵاو دەکرێتەوە.

**جوهر نامق سالم**

**سەرۆکی ئەنجوومەنی نیشتمانیی کوردستانی عێراق**

**هۆیە پێویستەکان**

هەر کیانێکی سیاسی بە جیاوازی پلەو شێوازە دەستوورییەکەیەوە، ئاڵایەکی هەیە کە گوزارشت لە جوامێری و کەرامەتی گەلەکەی دەکات و سومبولیەتی، لە شێوەو ڕەنگ و پێک هاتەکانیدا، پاڵەوانێتی ئەو گەل و نیشتمانەو سەربەرزییەکانی ڕەنگ دەدەنەوە.
دەوڵەت تاکە کیانێکی سیاسی نییە کە ئاڵایەکی جیاواز بۆ خۆی دەست نیشان دەکات، بەڵکو ئەو هەرێمانەی کە لە ژێر چاودێریدا بوون و ئەو کیانانەی کە لە ژێر ئینتیداب و پارێزگاری دەوڵەتاندا بوون، هەروەها ئەو هەرێم و ویلایەت و میرنشینیانەش بە هەموو جۆرەکانیانەوە کە لە یەکێتییە فیدرالییەکاندانە، ئاڵایەکیان بۆ خۆیان دەست نیشان کردووە، یان دەست نیشان دەکەن، وەک سومبولێک کە لەگەڵ کیانەکانی تردا لێکیان جیا بکاتەوە.
با ئەوەشی بخرێتە سەر کە هەندێ دەوڵەتی ساکاری لێک نەبەستراو (غیر مركبة) مافی داوە بە هەندێ لەو یەکە (وحدة) ئیداریانەی کە لێیانەوە پێک هاتووە ئاڵای تایبەتی خۆیان هەبێ.
پەرلەمانی کوردستانی عێراق بە بڕیاری مێژوویی ژمارە (٢٢)ی خۆی لە ڕۆژی ١٩٩٢/١٠/٤دا و بە تێکڕای دەنگ چارەنووسی گەلی کوردی لە کوردستانی عێراق دیاریی کردو، پەیوەندییە دەستوورییەکانی بۆ ئەم قۆناغە لەگەڵ دەسەلاتی مەرکەزیدا لەسەر بنەمای یەکێتی فیدرالی لە ناو عێراقێکی دیموکراسی پەرلەمانیدا دیاری کرد کە باوەڕی بە سیستەمی فرەحزبی هەبێ و ڕێز لە مافەکانی مرۆڤ بگرێ کە لە بەڵگەنامە دەوڵەتیەکاندا دانی پیانراوە.
ئەم بڕیارە تێکڕای دەنگی خەڵکی کوردستانی بە هەموو پێک هاتەو توێژو ڕێکخراوەکانییەوە بەدەست هێنا، هەروەها زۆربەی هەرە زۆری هێزە ڕکابەرەکانی عێراق پشتگرییان لێ کرد، بۆیە هەرێمی کوردستانی عێراق مافی خۆی بوو ئاڵایەک بۆ خۆی دیاری بکات، کە گوزارشت لە قارەمانێتی و سەربەرزییەکانی و، هەروەها لە دیرۆک و خەبات و بۆچوونەکانی گەلەکەی بکات.
کوردستان ئاڵای خۆی هەبووە کە لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەی دوای خۆی دەستاو دەست هاتووەو سەرکردە دڵسۆزەکانی کورد پاراستوویانەو داکۆکیان لێ کردووە، تا سەرکردەی نەمری کورد قازی محەمەد بەر لە شەهید بوونی تەسلیم بە سەرکردەی ڕوحی هەمیشە زیندووی نەتەوەی کورد مستەفا بارزانی کرد، کە ئەویش بەوپەڕی دڵسۆزی و خۆ بەخت کاریەوە پارێزگاری و بەرگری لێ کردوو هەر بە شەکاوەیی مایەوە.
بۆ بەرز نرخاندنی ئەو ڕێکردنە مێژووییەو ئەو دڵسۆزی و لە خۆ بردەییە، هەروەها بۆ بە ئەنجام گەیاندنی خەونی دێرینی گەلەکەمان و بە پیرەوە چوونی ئارەزووەکانی و جێ بەجێ کردنی ئیرادەی ئەم گەلە و بۆ بەرجەستە کردنی یاساکاری و قانونی ئەم ئاڵایە کە بۆ یەکەمین جارە لە دیرۆکی کوردو کوردستاندا دێتە دی، ئەم یاسایە دەرهێنرا.

١٩٩٩/١١/٢٤ — ژمارە «٥٣» — ٣

فـــەرمـان  وەقـایعی کـوردسـتان

**هەرێمی کـوردستان**
**سەرۆك**
**ژمارە: ٦٠**
**بەروار: ٢٠٠٦/٧/٦**

## (فەرمـــانی هەرێمی)

پشت بەستن بەو دەسـەلاّتانەی پێمانـدراوە بـەپێی یاسـای سـەرۆکایەتی هـەرێم ژمـارە (١)ی سـالی ٢٠٠٥ی هەموار کراو بەیاسای ژمارە٢یسالی ٢٠٠٦،بریارماندا بەوەی:
(ئالاّی کوردستان)بەتەنها لەم شوێنانەی لای خوارەوە هەلّبکرێت:
١-سەرجەم دام و دەزگا حکومییەکانی هەرێمی کوردستان .
٢-سەرجەم بارەگاکانی لەشکری کوردستان .
٣-سەرجەم بازگەکانی هەرێمی کوردستان .
٤-حیزبە سیاسیەکان دەتوانن لەبارەگاکانیاندا لەتەك ئالاّی کوردستاندا ئالاّی حزبەکانیان هەلّبکەن.
٥-لەهەریۆنەیەکی رەسمیدا کەپێویست بەهـەلّکردنی ئـالاّی عێـراق بکـات،ئـەوە ئـالاّی شۆرشـی ١٤ی تەموزی سالی ١٩٥٨هەلّدەکرێت،تا ئالاّیەکی دیکەی بەپێی دەستور بۆ دەولەتی عێراق فیـدرال دەست نیشان دەکرێت.

نوسراوە لەهەولێر لە رۆژی چواری مانگی حەوتی سالّی ٢٠٠٦.

**مسعود بـارزانی**
**سەرۆکی هەرێمی کوردستان-عێراق**

وەقایعی کوردستان ⚖ سیستەم

## سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران

پشت بەحوکمەکانی مادده (٧) لە یاسای ئاڵای هەرێمی کوردستانی عێراق ژمارە (١٤) ساڵی ١٩٩٩ ، ئەنجومەنی وەزیران لە کۆبوونەوەی ژمارە (٤١)ی رۆژی ٢٦/٧/٢٠٠٤ بڕیاریدا بە دەرکردنی ئەم سیستەمەی خوارەوە:

### سیستەمی ئاڵای کوردستان
### ژمارە ( ٢ ) ساڵی ٢٠٠٤

**ماددەی یەکەم**: پێوانەی ئاڵای کوردستان بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت:
پێوانەی ئاڵای گەورە بەم پێوانەیەی خوارەوە دەبێت:

أ‌-١٢٠ سم X ١٨٠ سم .

ب-١٠٠ سم X ١٥٠ سم .

ج-٦٠ سم X ٩٠ سم .

بەڵام پێوانەی ئاڵای بچوك لە هەر پێوانەیەك بێت بەهەمان شێوەی بڕگەی (١) یەك دەبێت.

**ماددەی دووەم**: ئاڵای کوردستان رۆژانە لەسەر ئەم باڵەخانانەی خوارەوە هەڵدەدرێت:

- سەرۆکایەتی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان.
- سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران و هەموو وەزارەتەکان.
- پارێزگاکان، قائمقامیەتەکان، ناحیەکان.
- سەرجەم بارەگاو یەکەسەربازییە سنوورییەکانی هەرێمی کوردستان.
- ئەو بنکە پۆلیسیانەی کە دەکەونە دەرەوەی یەکە ئیدارییەکان و یان ناوچە سنوورییەکان کە لە لایەن وەزیری ناوخۆ دیاری دەکرێن.

**ماددەی سێیەم**: ئاڵای کوردستان لەسەر ئەم باڵەخانە حکومیانەی کە لە مادەی (٢) دا باسی لێوە نەکراوە لەو بۆنەو یادەوەریانەی خوارەوە هەڵدەدرێت:

١-هەموو رۆژانی پشووی رەسمی.

٢-هەموو ئەو بۆنەو یادەوەرییە نیشتمانییە گرنگانەی کە لە لایەن ئەنجومەنی وەزیران بە پشووی رەسمی دادەنرێن.

٣-دەکرێت رۆژانی پێنجشەممە لە گۆڕەپانی قوتابخانەکاندا رێوڕەسمی هەڵدانی ئاڵای کوردستان (سڵاوی ئاڵا ـ تحية العلم) لەگەڵ سروودی نیشتمانی بەڕێوە بچێت.

٤-هەر بۆنەو شوێنێکی تری تایبەتی کە لە لایەن سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانەوە دیاری دەکرێت.

**ماددەی چوارەم**: ئاڵای کوردستان تاکو پشتێندی ستوون هەڵدەدرێت، لەو کاتانەی خوارەوەدا:

١-لە روودانی هەر کارەساتێکی نیشتمانی و نەتەوەیی.

٢-لەکاتی رێو رەسمی بەخاك سپاردنی سەرۆکی هەرێمی کوردستان.

٣-لەکاتی رێورەسمی بەخاك سپاردنی سەرۆکی ئەنجومەنی نیشتمانیی و، یان سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

٤-لە هەر حاڵەتێکی تر، کە لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانەوە بە رۆژی ماتەمینی گشتی دادەنرێت.

**ماددەی پێنجەم**: دەسەڵاتی مۆڵەتدان بە چاپکردن و دروستکردنی ئاڵای کوردستان، یان بازرگانی پێکردنی بەهەموو جۆرو شێوەکانی ئاڵا لە پەڕۆو کاغەزو هەر کانزایەك بێت، دەدرێت بە وەزیری رۆشنبیری، کە بە پێی رێنمایی تایبەت رێوشوێنەکانی دیاری دەکات، بەشێوەیەك کە لەگەڵ یاسای ئاڵای کوردستان و ئەم سیستەمە بگونجێت.

**ماددەی شەشەم**: لەسەر وەزیرەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستانە، ئەم سیستەمە جێبەجێ بکەن.

**ماددەی حەوتەم**: ئەم سیستەمە لە رۆژی بڵاوکردنەوەی لە (وەقائعی کوردستان)دا کاری پێ دەکرێت.

نێچیرڤان بارزانی
سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران



کوردستانێکی سەربەخۆ     گەلێکی ئازاد

مژدە     مژدە

بەڕێوەبەری نوسینگەی زانکۆی کامبرج

لە کۆلیجی پاشایان دا • محازەرەیەك دەربارەی مەینەتیو داماوی پەناهەندە کوردەکان •

دەلێتەوە لەسەر داوای ڕێکخراوی جیهانی سێیەمی ڕێکخراوی مافەکانی مرۆڤ لەدانیشتگای

کامبرج دکتۆر (کامران دلسۆز) محازەرەیەکی دەربارەی مەینەتیو داماوی کورد • پەناهەندەکانی بەریتانیا

خەلکێکی زۆری بەریتانی ئامادەی ئەو کۆڕە بوون و محازەرەکە دووسعاتی خایاند

هەروەها (زوهیر الهاشمي) بەشعداری محازەرەکەی کرد و بەڕێز (جون باکلاوود)

دامەزرێنەری ڕێکخراوی مافەکانی مرۆڤ لە دانیشگای کامبرج سەرپەرشتی کۆڕ محازەرەکەی کرد هەواڵەکەشیان

لەڕۆژنامەکاندا بلاو کردەوە •

کۆمەڵەی جوغرافیای سیاسی بەریتانیا بڕیاری دا بەرەسمی دان بە ئالای نیشتمانی کوردستان بنێت کۆمەڵەی

جوغرافیای سیاسی جیهانی بەریتانیا کەبارەگاکەی لەندەنە بڕیاری دا بە شێوەیەکی ڕەسمی دان

(بە ئالای نیشتمانی خاکی کوردوستان دا بنی) بەهەرسێ ڕەنگەکەیەوە و وێنەی خۆر لەناوە ڕاستیا بێت

وە ئەم بڕیارەش لە کۆبونەوەی ساڵانەی ئەم دوایانەدا هاتوە شان بە شانی لەگەل دان نانی بە ئالای

(فلستین و سیخ و ئەریتری) دا لە لایەن هەمان ڕێکخراوەوە کەلەپێش چەند ساڵێك دا درابوو وە بەپێی

ئەم بڕیارە گرنگە ئالای کوردستان لە بلاوکراوەکانی ڕێکخراوی جوغرافیای سیاسی دا لە سەرانسەری جیهان

بلاو دەکرێتەوە و دەچەسپێندرێ •

(نوسینگەی ڕاگەیاندنی کوردوستان بەریتانیا) لندن ـ بەریتانیا

١٩٩١/١٢/١٠



دەزگای ڕوشنبیری و ڕاگەیاندن

## پەراوێزەکان:

(١) الموسوعة العربية الجمهورية العربية السورية / رئاسة الجمهورية، هيئة الموسوعة العربية، المجلد١٣، ط١، دمشق، ٢٠٠٥، ص٣٩٤، (مادة العلم ، محمد وليد الجلاد).

(٢) عبدالرحمن محمدامین زەبیحی، قامووسی زمانی کوردی، بەرگی یەکەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٧، ل٥٦.

(٣) بۆ زانیاری بڕوانە: عبدالرحمن محمدامین زەبیحی، قامووسی زمانی کوردی، بەرگی دووەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٩، ل٢٢٨؛ گیو موکریانی، فەرهەنگی کوردستان، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ١٩٩٩، ل١٣، ٩٩.

(٤) نفس المصدر .

(٥) الموسوعة العربية العالمية ، مجلد ١٦، ط٢، الرياض، ١٩٩٩، ص٣٨٤.

(٦) الموسوعة العربية الجمهورية العربية السورية / رئاسة الجمهورية ، هيئة الموسوعة العربية، المجلد١٣، ط١ ، ص٣٩٤.

(٧) ئی.م. دیاکۆنۆف، میدیا، و: بورهان قانع، دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، دار الحرية، بەغدا، ١٩٧٨. ل١٥٩–١٦٠.

(٨) ئارتوور کریستێنسێن، ئێرانی سەردەمی ساسانییەکان، لە فارسییەوە وەرگێڕانی: سەلاحەددین ئاشتی، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل٦٢٢.

(٩) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: عبدالرحمن مزووری، کاوەیێ ئاسنگەر ئەفسانا نو هاتیە چێکرن، "ھاڤیبون" (گۆڤار)، بەرلین، ژمارە(١٨) ٢٠٠٧، ل٧–٣٤.

(١٠) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ئارتوور کریستێنسێن، ئێرانی سەردەمی ساسانییەکان، لە فارسییەوە وەرگێڕانی: سەلاحەددین ئاشتی، ل٦٢٢–٦٢٤، سەرجەمی بەرهەمی حوسێن حوزنی ، بەرگی یەکەم، کۆکردنەوەی: دەزگای ئاراس، هێنانە سەر ڕێنووسی نوێی کوردی: مەحموود زامدار، پێداچوونەوەی : عەبدوڵڵا زەنگەنە و فەخرەدین ئامێدی، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٧١–٧٢.

(١١) الموسوعة العربية الجمهورية العربية السورية / رئاسة الجمهورية ، هيئة الموسوعة العربية، المجلد١٣، ط١ ، ص٣٩٤.

(١٢) الموسوعة العربية الميسرة، المجلد الثاني، دار النهضة للطبع و النشر، لبنان، ١٩٨٠، ص١٢٢٥.

(١٣) الموسوعة العربية الجمهورية العربية السورية / رئاسة الجمهورية، هيئـة الموسـوعة العربيـة، المجلد١٣، ط١ ، ص٣٩٨.

(١٤) نفس المصدر.

(١٥) احمد بن علي القلقشندي ، صبح الاعشى في صناعة الانشاء ، ج٤، شرح وعلق عليـه وقابـل نصوصه: محمد حسين شمس الدين، دار الكتب العلميـة ، بـيروت، ١٩٨٧؛ د.محسـن محمـد حسين، الجيش الايوبي في عهد صلاح الـدين، دار اراس للطباعـة والنشـر(١٩٠)، اربيـل،٢٠٠٣، ص١٠٦.

(١٦) الموسوعة العربية الجمهورية العربية السورية / رئاسة الجمهورية ، هيئة الموسـوعة العربيـة، المجلد١٣، ط١ ، ص٤٠٠.

(١٧) الموسوعة العربية الميسرة، المجلد الثاني، ص١٢٢٥.

(١٨) احمد تيمور ، تأريخ العلم العثماني، القاهرة ، ١٣٤٢هـ، ص١٩.

(١٩) بۆ زانیاری زیـاتر بڕوانـه: محمـد القدوسـي، علـم مصـر تـأريخ القتـال والاسـتقلال، "دبـي الثقافية" (مجلة) ، دبي، العدد(٢٧)، أغسطس ٢٠٠٧، ص١٢١–١٢٤.

(٢٠) الموسوعة العربية الجمهورية العربية السورية / رئاسة الجمهورية ، هيئـة الموسـوعة العربيـة، المجلد١٣، ط١ ،ص٤٠١.

(٢١) نفس المصدر .

(٢٢) بـۆ زانیـاری زیـاتر بڕوانـه: د.سـعد بشـير اسـكندر ، قيـام النظـام الأمـاراتى في كردسـتان وسقوطه مابين منتصف القرن العاشر و منتصف القـرن التاسـع عشـر، دار الشـؤون الثقافيـة العامة ، بغداد ٢٠٠٥ ، ١٢٣، ص٣١١–٣٢٥.

(٢٣) بۆ زانیاری زیـاتر بڕوانـه: عبـدالرقيب يوسـف، الدولـة الدوسـتكية في كردسـتان الوسـطى ، الجزء الثـاني ، القسـم الحضـاري، ط٢، دار اراس للطباعـة والنشـر، اربيـل، ٢٠٠١، ص١٢٣–١٢٥.

(٢٤) ئەولیا چەلەبی، کورد لە مێژووی دراوسێکانیدا، و: سەعید ناکام ، لە بڵاوکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٩، ل٢٤٤.

(٢٥) عبدالحميد اسماعيل، مێژووی ئالآی (کۆمەڵەی خۆیبوون) لە تورکیا، "هـەتاو" (گۆڤـار)، (هەولێر)، ژمارە(١٨٠)، ٣٠/٦/١٩٦٠. ل٩.

[26] Dîroka Ala Kurdan

http://www.xirabetuwa.com/Sections-artid-19.html

Ev stran ji alî Prym û Socin lî Kurdistanê ji devê Cano û Yahudîyekî Zaxoyî ku navê wî Pînhas e, hatîye girtin. Ji bo agahdarîyên zêdetin ên li ser vê sitranê binêre:
-Prym und Socîn, Kurdîsche Sammlungen, Erzählungen u. Lieder în Dîalekt des Tûr 'Abîdîn, St. Petersbourg, 1887, r. 64

(٢٧) الدليل العراقي لسنة ١٩٣٦ ، ص١٢٢؛ السيد عبدالرزاق الحسني، تأريخ الوزارات العراقية، ط٧، دار الشؤون الثقافية، بغداد، ١٩٨٨، ص٣٣٩.

(٢٨) کوردستانی عێراق لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیادا ، لە ئینگلیزییەوە وەریگێڕاوە: سەلمان عەلی، پێشەکی و پێداچوونەوەی: سدیق ساڵح، یەکەم بەرگ، بنکەی ژین، سلێمانی ٢٠٠٥، ل٢١.

(٢٩) "ژین" (ڕۆژنامە)، سلێمانی، ژمارە (١٤٥٧)، ١٩٥٩/٧/٢، ل١.

(٣٠) د. عبدالفتاح علي البوتاني، التطورات السياسية الداخلية في العراق ١٤ تموز ١٩٥٨-٨شباط ١٩٦٣، دار سپيريز للطباعة والنشر- دهوك، مطبعة خاني، دهوك، ٢٠٠٧، ص٥٤.

(٣١) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: د.جلیلی جەلیل، هەندێ سیمای ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتووری کورد لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا، وەرگێڕانی: ئەنوەر قادر محەمەد لە رووسییەوە، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٣، ل١٥٤.

(٣٢) هەمان سەرچاوە، ل١٥٨.

(٣٣) هەمان سەرچاوە، ل١٦١؛ د . صلاح محمد سليم هروري ، تەڤگەرا ئیرشاد و ئیرتقایا کوردی و سەرهەڵدانا بەدلیسێ یا ساڵا ١٩١٤، "مەتین" (گۆڤار)، دهۆك، خولا (٤)، ژ (١٣٣)، تیرمەها ٢٠٠٥، ل٤٣.

(٣٤) جەمیل توران، گوڵە بەفرینەی خوێناوی، وەرگێڕانی لە یۆنانییەوە: عەلی فەتحی، چاپخانەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٣٣-٣٤.

(٣٥) هەموو ناوچە هاوسێکانی ڕۆژئاوای دێرسیم بەرەو سێواس دەگرێتەوە ، هانز -لۆکاس کییسێر، ڕاپەڕینی کوردە عەلەوییەکانی دەرسیم ١٩١٩-١٩٢١ (قۆچگیری) ، لەفڕەنسییەوە وەرگێڕانی: نەجاتی عەبدوڵلا، بنکەی ژین، چ٢، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل١٧.

(٣٦) اسماعیل حەقی شاوەیس، شۆڕشگێڕی قوچگیری، "ڕۆژی نوێ"( گۆڤار)، سلێمانی، ژمارە(٤)، تەمووزی ١٩٦١، ل٦؛ ژمارە(٥) ئابی ساڵی ١٩٦١، ل٢٣. وەك نوری دەرسیمی یەکێ لە ڕابەرانی شۆڕشی قۆچگیری ساڵی ١٣٣٧ك/ ١٩٢ - نووسیویە ، نەخشەیان لە

شۆڕشەکەدا بەر لە هەر شتێك دەرکردنی بەیاننامەی ئازادی کوردستان و بەرزکردنەوەی ئاڵای کوردستان بووە لەسەر شاری هۆزات.

(٣٧) بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە شۆڕشی قۆچگیری بڕوانە: د.نوری دەرسیمی ، دەرسیم لە مێژووی کوردستاندا، و: د.ئەحمەد فەتاح دزەیی، دەزگای چاپ و بلاَوکردنەوەی موکریانی، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١، ل١٥٦ ،١٦٧، ١٩٣؛ الاثار الكاملة للدكتور أحمد عثمان أبوبكر، اعداد: ازاد عبيد صالح، مركز ژين لأحياء التراث الوثائقي والصحفي، مطبعة شڤان، سليمانية، ص٤٠.

(٣٨) س.ج. ادموندز، كرد و ترك و عرب، ترجمة: جرجيس فتح الله ، دار التآخي، بغداد، ١٩٧١، ص٣٤؛ ئەحمەد خواجە، بەرگی یەکەم، چ. شەفیق بغداد، ١٩٦٨، ل٥٥.

(٣٩) ئەحمەد خواجە، چیم دی، بەرگی یەکەم ، ل٩٩؛ بەرگی سێیەم، لە دوای لاپەڕە ١٠٠ لاپەڕەکە خۆی ژمارەی بەسەرەوە نییە دیارە ئەو ئاڵایە لەگەڵ ئاڵای جەمعیەتی تەشکیلاتی ئیجتماعی کورد جیایە.

(٤٠) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: رەفیق حیلمی، یادداشت، چ٢، ل ٥١٢–٥١٣.

(٤١) رەفیق حیلمی، یادداشت، چ٢، ل٥٣٠.

(٤٢) بڕوانە: د.عیزەدین مستەفا رەسول، دیسان ئاڵای کوردستان، سایتی خەندان ، ڕۆژی ٢٠١٠/٨/٣١.

(٤٢) رەفیق حیلمی، یادداشت، بەشی یەکەم، چاپی دووەم، چاپخانەی رۆشنبیری و لاوان، هەولێر، ١٩٨٨، ل ١٢٧–١٦٥.

(٤٤) ئەو کۆمەڵەیە چاپخانەیەکی بچووکی نوێی لە پەتریاکییەی کلدانی لە دیار بەکر کڕیوە کە بە یەکەم چاپخانەی کوردی لە کوردستان دانراوە، بەو چاپخانەیە ڕۆژنامەیەکیان بە ناوی (گازی) بەچوار لاپەڕە دەرکردووە. بۆ زانیاری پتر بڕوانە: اكرم جميل باشا، مذكراتي، ت: د.قدري الدياربكري، ط٣، دياربكر، ٢٠٠٧ ص٢٥.

(٤٥) اكرم جميل باشا ، مذكراتي ، ص٢٤–٢٥.

(٤٦) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: ئیسماعیل گوێڵداش، جەمعییەتی تەعالیی کوردستان، وەرگێڕانی: زریان رۆژهەلاَتی، بنکەی ژین، ز(١٢٧)، سلێمانی، ٢٠١١، ل١٣.

(٤٧) اكرم جميل باشا ، مذكراتي، ص٢١.

(٤٨) بيار مصطفى سيف الدين، السياسة البريطانية تجاه تركيا وأثرها في كوردستان ١٩٢٣–١٩٢٦، دار سبيريز للطباعة والنشر ، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠٤، ص٢١.

(٤٩) اكرم جميل پاشا، مذكراتي، ص٤٠.

(٥٠) مالمیسانژ، پێگەی کەمال فەوزی بتلیسی لە ڕێکخراوەکانی کورددا، لە تورکییەوە وەرگێڕانی: زریان ڕۆژهەلاتی، پێداچوونەوەی: سدیق سالح، بنکەی ژین، چ. شڤان، سلێمانی،٢٠٠٧، ل٢٠٦،٢٠٣.

(٥١) هەمان سەرچاوە،ل٢٠٦–٢٠٧.

(٥٢) هەمان سەرچاوە، ل٢١٠.

(٥٣) بۆ زانیاری پتر بروانە: عەلی تەتەر نێروەیی ، بزاڤا سیاسی ل کوردستانێ ١٩٠٨–١٩٢٧، چاپخانا وەزارەتا پەروەردێ – هەولێر ، دەزگەهێ سپیریز یا چاپ و وەشانێ ، دهۆك. کۆمەڵەی تەعالی کوردستان لە ٢٠ ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١٨ بە سەرۆکایەتی شێخ عەبدولقادری نەهری دامەزراوە. بۆ زانیاری زیاتر بروانە: نێروەیی ، ل١٥٠.

(٥٤) زنار سلوپي في سبيل كوردستان، ترجمة: رضوان علي باديني، رابطة كاوة للثقافة الكوردية ، بيروت ، ١٩٨٧، ص٦٩؛ قەدری جەمیل پاشا (زنار سلوپی) دۆزی کوردستان، و: فەیزوڵلا برایم خان و بارزان وهاب، لە بلاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری هەرێمی کوردستان، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی بیر (١٢) چ٣، دیار بەکر، ٢٠٠٧ ، ل٧١؛ منذر الموصلي، الحياة السياسية والحزبية في كوردستان، ١٩٩٢،ص٢٥٨. ئەوەی ( موسلی ) یش هەر لە سلوپی وەرگیراوە.

(٥٥) بروانە: ئیسماعیل گوێڵداش، جەمعییەتی تەعالیی کوردستان، وەرگێڕانی: زریان ڕۆژهەلاتی، ل٢٦٤–٢٦٥.

(٥٦) جەمال نەبەز، کۆبەرهەم ،ژمارە (٧) زنجیرەی وتاری وتوێژ لەگەڵ دەزگەی ڕاگەیاندنی گشتی، ژمارە(٢)، چ١، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٤٠٢.

(٥٧) قەتلوعامی کورد لە تورکیا، لە فەرانسییەوە وەرگێڕانی، پێشەکی و پەراوێزنووسینی: نەجاتی عەبدوڵلا، لە بلاوکراوەکانی جڤاتا وەلاتیێ کوردا (خۆیبوون)، ژمارە(٢) بنکەی ژین، چ، شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل٥٣.

(٥٨) مالمیسانژ، پێگەی کەمال فەوزی بتلیسی لە ڕێکخراوەکانی کورددا، لە تورکییەوە وەرگێڕانی : زریان ڕۆژهەلاتی، ، ل٩٩.

(٥٩) حامید گەوهەری، کۆماری کوردستان، ل١٥١–١٥٢.

(٦٠) جەمال نەبەز، کۆبەرهەم ،ژمارە (٧) زنجیرەی وتاری وتوێژ لەگەڵ دەزگەی ڕاگەیاندنی گشتی، ژمارە(٢)، چ١، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٤٠١.

(٦١) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: دیوانی ئەحمەد موختار جاف، ئامادەکردن و بەراوردکردن و لێکدانەوە و پێشەکی بۆ نووسینی: پرۆفسیۆر دوکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، چ. الادیب، بەغدا، ١٩٨٦.

(٦٢) بڕوانە: یادداشتەکانی مەیجەر نوئێل لە کوردستان، وەرگێڕانی: حسین احمد جاف و حسین عثمان نێرگسەجاری، چ.ئۆفسیت حسام، بەغدا، ١٩٨٤.

(٦٣) جەمال نەبەز، س. پ، ل ٤٠٢.

(٦٤) بڕوانە: جەمال نەبەز، هـ. س، ل ٤٠٢.

(٦٥) بڕوانە: هلبین محمدامین المزوري، حزبي هیوا – الامل – ١٩١٩–١٩٤٦، دراسة تأریخیة سیاسیة، دار سپیریز للطباعة والنشر ، مطبعة حاجي هاشم، اربیل، ٢٠٠٨، ص٦١هـ.

(٦٦) جەمال نەبەز، س. پ..، ل٤٠١.

(٦٧) روهات الاکوم: خوییون و ثورة اگری، الترجمة العربیة: باشراف رابطة کاوة للثقافة الکردیة، مراجعة: شکور مصطفی، مطبعة اوفسیت هەولیر، اربیل، ٢٠٠٠، ص٢٣. سەبارەت بەو بنەماڵەیە عەبدوڵلا زەنگەنە وردەکاری باشی بۆ کردووە و زۆرترین ئاگاداری لەبارەیەوە نووسیوە و وەك خۆشی نووسیویە، وردەکاری و سەروسۆراخ و بەدواداچوونی پتری دەوێت. بۆ زانیاری پتر بڕوانە: ڕۆژی کورد، ئامادەکردن و لێکۆڵینەوەی: عەبدوڵلا زەنگەنە، پێشەکی: د.ئیسماعیل شوکر، بنکەی ژین، چ.شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٩٦–١٠٠.

(٦٨) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: سەرجەمی بەرهەمی حسین حوزنی، کۆکردنەوە و لەچاپدانی دەزگای ئاراس، بەسەرپەرشتی: د.کوردستان موکریانی، هێنانە سەر ڕێنووسی نوێی کوردی: مەحموود زامدار، پێداچوونەوەی: عەبدوڵلا زەنگەنە و فەخرەدین ئامێدی، بەرگی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٦٠٦–٦٠٧، (لێرەدا خاکی لەجیاتی فانی نووسراوە)، هەمان سەرچاوە.

(٦٩) بڕوانە: عەلی تەتەر نێروەیی، ل١٥٠.

(٧٠) ئیسماعیل گوێڵداش، جەمعیەتی تەعالیی کوردستان، وەرگێڕانی زریان رۆژهەلاتی،ل٦٦.

(٧١ ) "ژیان"(رۆژنامە)، سلێمانی، ژمارە(٢٤١)، ٢٩/مایسی/١٩٣٠.

(٧٢) سەرجەم بەرهەمی حوزنی موکریانی، ل٥٢٤–٥٢٥.

(٧٣) هەمان سەرچاوە، ل٥٢٨–٥٢٩.

(٧٤) هەمان سەرچاوە، ل٥٣١.

(٧٥) بەڵگەنامەی بەریتانیایی ژمارە(F.O 371 /7781) سلێمانیە ١٩٢١/١٢/١٢بە وەرگرتن لە(د.عثمان علي، دراسات في الحركة الكردية المعاصرة١٨٣٣ـ١٩٤٦، منشورات مكتبة التفسير، اربيل، ٢٠٠٣،ص٣٦٧؛ كريس كۆچيرا، وەرگێڕانی: محەمەد رەیانی، چاپخانەی صدف تاران، ١٣٦٩(١٩٩٠)، ل٩٤.

(٧٦) لاهوتی، کوردستان و کورد، د. جەبار قادر لە روسییەوە کردوویە بە کوردی و تێبینی لەسەر نووسیوە، "هەزارمێرد" (گۆڤار)، سلێمانی، ژمارە(٣) ئاداری ١٩٩٨، ل١٧٢.

(٧٧) د. عثمان علي، دراسات...ص٣٤٨.

(٧٨) "العراق"( جريدة)، بغداد، العدد (١٥٤٣)، ١٩٢٥/٦/١.

(٧٩) مالمیسانژ ، پێگەی کەمال فەوزی بەتلیسی لە ڕێکخراوەکانی کورددا ، ل٩٩.

(٨٠) هەمان سەرچاوە ،ل٢٠٦.

(٨١) هەمان سەرچاوە ،ل٢٠٧.

(٨٢) مالمیسانژ، ل٢١٠.

(٨٣) عەبدولعەزیز یامولکی ، کوردستان و ڕاپەڕینەکانی کورد، و: شێرزاد کەریم، ئامادەکردنی: سدیق ساڵح، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم(٣٧)، سلێمانی ١٩٩٩، ل٧٩.

(٨٤) د. كمال مظهر احمد، انتفاضة ١٩٢٥ في كردستان تركيا ، رابطة كاوة للثقافة الكردية(٦٦)، ص٩٠–٩١.

(٨٥) دیدارێك لەگەڵ بەشیر سەبری "میدیا"( ڕۆژنامە)، هەولێر، ژمارە (٨٢) ، ٢٠٠٠/١٢/١٥، ل٥. ناوبراو ٢٠ ساڵ لێکۆڵینەوەی لەمەڕ کورد لە ڕووسیا کردووە و ئەندامی لێکۆڵینەوەی کوردییە لە ڕووسیا. بە وەرگرتن (لە غازی حەسەن، خوێندەواری ، دەزگای ئاراس ، هەولێر، ٢٠٠٠، ل٢٤٤–٢٤٥).

(٨٦) عبدالحمید اسماعیل، مێژووی ئاڵای (کۆمەڵەی خۆیبوون) لە تورکیادا "هەتاو" (گۆڤار)، هەولێر، ژ(١٨٠)، ٣٠حوزەیران ١٩٦٠، ل٩.

(٨٧) بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە خۆیبوون، بڕوانە: کۆنی ڕەش ، جمعیە خۆیبون ١٩٢٧ وقائع ثورة ارارات ١٩٣٠، تقديم ومراجعة : الدكتور عبدالفتاح علي بوتاني ، مؤسسة موكرياني للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠٠.

(٨٨) کۆنیێ ڕەش، المصدر السابق، ص٤٦–٤٧.

(٨٩) نفس المصدر، ص٤٧.

(٩٠) بیرەوەریەکانی ئیحسان نوری پاشا، و: وریا قانع، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر،٢٠٠١، ل٥٩، ٨٥.

[91]Dr.BLTCH CHIRGUH,Kurt Sorunu,Kokeni Ve Nedenleri, avesta |KURDOLOJ|, Istanbul, 2009, p.114.

لە وێنەکەدا دوو پێشمەرگە لە سەر شاخێن، یەکیان بە دووربین سەیر دەکات و ئەوەی دیکەش ڕاوەستاوە و لە پشتەوەشیان ئاڵای کوردستان هەڵکراوە. لە ژێر وێنەکەدا بە تورکی نووسراوە:

Botan dağlarinda Kürt ulusal güçlerinin öncü birlıği ve Kürt bayrağı.

(٩٢) بڕوانە: قەتلوعامی کورد لە تورکیا، ٢٠٠٨، ل٨٢؛ د.بلەچ شێرکۆ، القضیة الکوردیة، ماضی الکورد وحاضرهم، دار اراس للطباعة والنشر، ط٢، مطبعة اراس، اربیل، ٢٠١١، ص١٩-٢١-٤٠-٧٠-١٠٠.

(٩٣) بڕوانە: قەتلوعامی کورد لە تورکیا، لە فرانسییەوە وەرگێڕانی و پێشەکی و پەراوێزنووسینی: نەجاتی عەبدوڵلا، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ٩، ١٦، ٨٢.

(٩٤) بڕوانە: kone Res, Ala Kurdan di Nevbera Bedirxani u (Barzaniyande, "Digle" Govara, Hewler) J24,Adar 2000. ؛ ژویس بلو، مسألە کرد برسی تاریخی وجامعە شناسی، ترجمە: دکتر برویز امین، چ١، تهران ١٣٧٩، ص٤٥.

(٩٥) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: د. عیزەدین مستەفا رەسول، بەشێك لە یاداشتەکانم ، بەرگی یەکەم ، چاپخانەی دەزگای حەمدی، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل١٢٤-١٢٥.

(٩٦) هلبین محمدامین المزوري ، حزبي هیوا – الامل – ١٩١٩-١٩٤٦، ص٦١؛ کەریم زەند، گەشتی زەند ، تۆماری تەمەن، بەرگی یەکەم، دەزگای سپیریز یا چاپ و وەشانێ ، چاپخانە وەزارەتە پەروەردێ، هەولێر، ٢٠٠٤، ل١٤٤؛ مذکرات نوري شاویس، من منشورات حزب الشعب الدیموقراطي الکردستاني، ص٢٤.

(٩٧) طارق جامباز، هەفتەنامەی (گۆڤار) لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری- لێژنەی چاپەمەنی ژمارە (٣٦)، چاپخانەی کریستال، هەولێر، ١٩٩٨، ل٣١،١٢،٩.

(٩٨) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: د. یاسین سەردەشتی، چەند راستییەکی مێژوویی سەبارەت بەحیزبی ئازادی کوردستان. www.dimane. com

(٩٩) بۆ زانیاری دەربارەی بڕوانە: حامید گەوهەری: کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس (٢٤٦)، هەولێر، ٢٠٠٤، ئەرشیفی ڕاپۆرتی کونسولی سۆڤیەت لە ورمێ.

(١٠٠) وەزارەتی دەرەوەی رووسیای فیدراتیڤ، ئومر،/٣٢٧، پ٣٦٩، لاپەڕەکانی ٥١-٥٤. بە وەرگرتن لە: (حامید گەوهەری: کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان، ل١٥١).

(١٠١) ڕاپۆرتی باڵوێزی سۆڤیەت لە ئێران ڕۆژی ١٢/١٠/١٩٤٥ لە بەشێك لە ڕاپۆرتی ڕەوانکراو لە ئێرانەوە بۆ گ.م، دیمیترۆف، سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتی سۆڤیەت ، لەسەر ڕووداوەکانی کوردستان و پارتی ژێکاف ، لە ١٢/١٠/١٩٤٥ ، ئەرشیفی ناوەندی هەڵگرتن ، لێکۆڵینەوەی بەڵگەنامە مێژووییەکانی سەردەم ، ف ١٧/ نو ١٢٨ / د٤٤/ لاپەڕەکانی ٧٢-٧٩، بە وەرگرتن لە: ( حامید گەوهەری ، کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان ، ل١٥١).

(١٠٢) سەبارەت بە دامەزراندنی کۆماری کوردستان و قازی محەمەد. بڕوانە: د. یاسین سەردەشتی ، کوردستانی ئێران لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی لە جووڵانەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کورد ١٩٣٩-١٩٧٩، زنجیرە کتێبی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی سەردەم(٢٢١) سلێمانی، ٢٠٠٣.

(١٠٣) هەڵاڵە(گۆڤار)، بۆکان، ژمارە (١)، ڕەشەمەی ١٩٤٥،١٣٢٤، ل١١ ، بە وەرگرتن لە( د. هیمداد حوسێن ، ڕۆژنامەوانی کوردی ، ل٧٢٧).

(١٠٤) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: هەڵکردنی ئالای مقدسی کوردستان لە مەهاباد "کوردستان" گۆڤار ، مەهاباد، ژمارە (٣) خاکەلێوەی ١٣٢٥ (١٩٤٥)، د. هیمداد حوسێن، ڕۆژنامەوانی کوردی لە سەردەمی کۆماری دیموکراتی کوردستان ١٩٤٣-١٩٤٧، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس (٧٧١)، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٥٢٣، حامید گەوهەری ، کۆماری کوردستان ٢٢/١/١٩٤٦- ١٧/١٢/١٩٤٦، چ. حاجی شەهاب، هەولێر ، ٢٠١١ ، ل١٤٤.

(١٠٥) بڕوانە: "کوردستان" ڕۆژنامە، مەهاباد، ژمارە (١)، ١١ ژانویە ١٩٤٦، ل٢، ژمارە(٥)، ٢٠ ژانویە ١٩٤٦، ل٢؛ ژمارە (٣٧)، ٢٠ ئاوریل ١٩٤٦، ل٢، ژمارە(٤٣)، ٤مە ١٩٤٦، ل٣.

(١٠٦) بڕوانە: حامید گەوهەری ، کۆماری کوردستان، ل٢٥، وێنەی هەیە).

(١٠٧) بڕوانە: د.عیزەدین مستەفا ڕەسول، دیسان ئالای کوردستان، سایتی خەندان، ٣١/٨/٢٠١٠.

(١٠٨) بڕوانە: عبدالحمید اسماعیل، مێژووی ئاڵای کۆماری کوردستانی ئێران، هەتاو (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (١٨١)، ١٥ی تەموزی١٩٦٠، ل٤٢.

(١٠٩) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مسعود بارزانی ، بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد ١٩٣١–١٩٥٨، وەرگێڕانی: سەعید ناکام، چاپخانەی خەبات، دهۆك، ١٩٩٨، ل١٦٩.

(١١٠) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: موحسین دزەیی، وێستگەکانی ژیانم، تاریق ئیبراهیم شەریف بە عەرەبی گفتوگۆیەکەی سازداوە، ئیسماعیل بەرزنجی کردوویەتی بە کوردی، دەزگای چاپ و بلاْوکردنەوەی ئاراس ژمارە(٨٨٠)، هەولێر، ٢٠٠٩، ل١٠٠ـ١٠١.

(١١١) نامەی فەلەکەدین کاکەیی لە ڕۆژی ٢٠١٢/٨/٨.

(١١٢) بڕوانە: بلاْوکراوەی دەزگای ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی پاسۆك لە ١٩٩١/١٢/١٠.

(١١٣) بڕوانە: بەدران ئەحمەد حەبیب، ڕەمزی نافیع ڕەشید، ئەو کوردەی ئالاْی کوردستانی داهێنا، "ئالاْی ئازادی" (ڕۆژنامە)، هەولێر، ژمارە ٢١، ١٩٩٢/٤/٢٦، ل ٥–٦.

(١١٤) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: ئازاد عوبێد ساڵح ، ئالاْی کوردستان، "ئالاْی ئازادی"، ژمارە (٢٤)، ١٩٩٢/٥/٢٤، ل٥؛ د.ئازاد عوبێد، دیسان کێ ئالاْی کوردستانی داهێنا؟، "K21"(گۆڤار)، هەولێر، ژمارە(٧)،٢٠١٠، ل٤١ـ٤٧.

(١١٥) بڕوانە: محەمەد گۆران، نەریمان خۆشناو، ڕەمزی نافیع ڕۆڵەیەکی هەولێری فیداکاری سەربەخۆی کوردستان، "بەدرخان" (مانگنامە)، هەولێر، ژمارە ١٢٥؛ محەمەد گۆران، نەریمان خۆشناو، ڕەمزی نافیع ، ڕۆڵەیەکی هەولێری فیداکاری سەربەخۆیی کوردستان، لە بلاْوکراوەکانی دەزگای چاپ و بلاْوکردنەوەی بەدرخان، چاپخانەی نەوا، هەولێر، ٢٠٠٨ ؛ عەبدولستار ئەحمەد سەعدون، ئالاْی کوردستان لە نێوان شەریعەت و یاسادا، لە بلاْوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری ، هەولێر، ل٣٩–٤١. . هیچ ئاماژەیەك بەو وەلاْمەی سەرەوە نەکراوە.

(١١٦) بڕوانە: ئازاد عوبێد ساڵح، ئینجا نۆرەی هەڵکردنی ئالاْیە، "ئالاْی ئازادی"، ژمارە(٤٤)، ١٩٩٢/١٠/١٨، ل٢.

(١١٧) بڕوانە: ئازاد عوبێد ساڵح، ئینجا نۆرەی هەڵکردنی ئالاْیە، "ئالاْی ئازادی"، ژمارە(٤٤)، ١٩٩٢/١٠/١٨، ل٢.

(١١٨) "پەرلەمان"، (ڕۆژنامە)، هەولێر، ژمارە (٥٣)، ١٩٩٩/١١/٢٤.

(١١٩) "وەقایعی کوردستان" (ڕۆژنامەی ڕەسمی حکومەتی کوردستان)، هەولێر، ژمارە(٥١)، ٢٠٠٤/١٠/٢٨، ل١٩.

(١٢٠) "وەقایعی کوردستان"، ژمارە(٦٢)، ٢٠٠٦/٨/٢٧، ل١١.

(١٢١) "هەرێم"، (گۆڤار)، ژمارە (٣٨٠)، ٢٠٠٦/٩/١٢.

(١٢٢) بڕوانە: عەبدوڵڵا زەنگەنە، "ژینۆ"،(گۆڤار)، لەندەن، ژمارە (٢٨)، کانوونی یەکەمی ٢٠٠١، ل٧–١١.

(١٢٣) وليم ايغلتن الابن، جمهورية مهاباد، ترجمة وتعليق: جرجيس فتح الله، ط٢، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ١٩٩٩، ص٧٦–٧٧.

(١٢٤) عەبدوڵڵا زەنگەنە، ئاڵای کوردستان هەڵگەڕاوەی هیچ ئاڵایەکی دیکە نییە، "ڕۆژنامەنووس" (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (١٢)، پایزی ٢٠٠٧، دوابەرگی ناوەوە.

(١٢٥) بڕوانە: موسەدەق توڤی، ئالایێ کوردستانێ د دیرۆکیدا، "دهۆك" (گۆڤار)، ژمارە (٣٢) چریا ئێکی ٢٠٠٦، ل٧.

(١٢٦) بڕوانە: فەیسەڵ دەباغ، حیزبی هیوا و شۆڕشی "١٩٤٣–١٩٤٥"ی بارزان، دەزگای بلاوکردنەوەی گولان، چ. ڕۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٧، ل٦٧.

(١٢٧) يوسف ملك، كردستان او بلاد الكرد: مراجعة ومقدمة: د.عزالدين مصطفى رسول، ط٢، منشورات مكتب الفكر والتوعية في الاتحاد الوطني الكردستاني، السليمانية، ٢٠٠٦، ص٣٥–٤٤.

(١٢٨) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: گۆتفرید یۆهانز میوللەر، لە ڕۆژهەلاتی گڕگرتوودا، بەدران ئەحمەد حەبیب لە ئینگلیزییەوە کردوویە بە کوردی، د. مارف خەزنەدار پێداچوونەوە و پێشەکی و تێبینی لەسەر نووسیوە، هەولێر، ١٩٩٢؛ بەدران ئەحمەد حەبیب، ڕەمزی نافیع ڕەشید ئەو کوردەی ئاڵای کوردستانی داهێنا، "ئاڵای ئازادی"، ژمارە (٢١)، ١٩٩٢/٤/٢٦، ل ٥–٦.

(١٢٩) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: جەمال خەزنەدار، ئینسکلوپیدیای ڕۆژنامەگەریی کوردی ١٨٩٨ـ٢٠١٠، پێداچوونەوە و پوختەکردن: عەبدوڵڵا زەنگەنە، لە بلاوکراوەکانی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان/گۆڤاری ڕۆژنامەنووس (٤)، هەولێر، ٢٠١١، ل ٥٥٢ـ٥٥٣.

(١٣٠) بڕوانە: فەرهاد پیربال، بزاڤی ڕۆژنامەگەریی کوردی لە ئەورووپا و ئەمریکا ١٨٩٧–١٩٩٢، "سەنتەری برایەتی" (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (٥)، ١٩٩٨، ل١٣٩.

(١٣١) دیدار لەگەڵ مومتاز حەیدەری ڕۆژی ٢٠١٢/٧/١٧، هەولێر.

(١٣٢) د. ئازاد عوبێد ساڵح، مەئموون دەباغ: ژیان و خەباتی سیاسی ١٩٣٦ـ١٩٦٣، " زانکۆ" (گۆڤاری زانستە مرۆڤایەتییەکانی زانکۆی سەلاحەددین/ هەولێر)، ژمارە (٤٢)،ساڵی ٢٠٠٩، ل٥٣.

(١٣٣) دیدار لەگەڵ جەمال خەزنەدار، لە دایكبوونی هەولێر، رۆژنامەنووسێكی دیارە، هەولێر، ٢٠١٠/١٢/٥.

(١٣٤) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: فلك الدين كاكەیي، القذافي والقضية الكردية، منشورات دار آراس للطباعة والنشر (٧٥٩)، اربيل، ٢٠٠٨، ص١٦٢ـ١٦٥.

(١٣٥) بڕوانە: "TEVGER" (رۆژنامە)، سوید، هژمار (٢)، ساڵی (١)، ئاداری ١٩٨٩، ل١.

(١٣٦) بڕوانە: دیدار لەگەڵ عەلی جوكڵ، "هەولێر" (هەفتەنامە)، هەولێر، ژمارە ٢٣، ٢٠٠٧/٥/٣، ل ٦.

(١٣٧) بڕوانە: نافیع دیبەگەیی، دیدار لەگەڵ جەوهەر غەمگین، "هەولێر"، ژمارە ٢٩، ٢٠٠٧/٦/٤، ل٦.

(١٣٨) بڕوانە: نافیع دیبەگەیی، دیدار لەگەڵ سامیە شاكر (مەشخەڵ)، "هەولێر"، ژمارە ٢٤، ٢٠٠٧/٥/١،ل ٦.

(١٣٩) بڕوانە:عەبدوڵلا پەشێو: خەونەكانم هەموویان لە دەوری سەربەخۆیی دەسووڕێنەوە، دیمانە: ئاسۆ حەسەن– محەمەد خدر مەولوود، "هەرێم"(گۆڤار)، هەولێر، ژمارە(٢٨٩)، ٢٠٠٢/١١/١، ل١٤.

(١٤٠) بڕوانە: "رووداو" (رۆژنامە)، دیمانە لەگەڵ بورهان مەجید، ژمارە (٣٠)، ٢٠٠٨/١١/٣، ل١٠.

(١٤١) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: ئازاد مزووری، ئاڵایێ كوردستانێ سمبولا مەیا نەتەوی دناڤ شعرێن شاعران دە، لە بلاوكراوەكانی یەكێتی قوتابیانی كوردستان، ژمارە (١٩)، چاپخانەی هاوسەر، هەولێر، ٢٠٠٧ ؛ فەرهاد پیربال، ئالای كوردستان، "واتە" (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (١٦)، تشرینی دووەمی ٢٠١١.

## لیستی سەرچاوەکان:

### سەرچاوە بە زمانی کوردی:

#### بەڵگەنامە

(١) بلاوکراوەی دەزگای رۆشنبیری و راگەیاندنی پاسۆك لە ١٩٩١/١٢/١٠.
(٢) ئەرشیفی راپۆرتی کونسوڵی سۆڤیەت لە ورمێ، وەزارەتی دەرەوەی روسیای فیدراتیف، ئومر، ٣٢٧، پ٣٦٩، لاپەڕەکانی ٥١-٥٤ (بەوەرگرتن لە حامید گەوهەری: کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان، هەولێر، ٢٠٠٤).
(٣) راپۆرتی باڵوێزی سۆڤیەت لە ئێران رۆژی ١٩٤٥/١٠/١٢ لە بەشێك لە راپۆرتی رەوانکراو لە ئێرانەوە بۆ گ.م، دیمیترۆف، سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتی سۆڤیەت، لەسەر رووداوەکانی کوردستان و پارتی ژێکاف، لە ١٩٤٥/١٠/١٢ ، ئەرشیفی ناوەندی هەڵگرتن، لێکۆڵینەوەی بەڵگەنامە مێژووییەکانی سەردەم، ف ١٧/ نو ١٢٨ / د٤٤/ لاپەڕەکانی ٧٢-٧٩، (بە وەرگرتن لەحامید گەوهەری، کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان، هەولێر، ٢٠٠٤).
(٤) بەڵگەنامەی بەریتانیایی ژمارە (F.O 371 /7781) سلێمانیە ١٩٢١/١٢/١٢ بە وەرگرتن لە (د. عثمان علي، دراسات في الحركة الكوردية المعاصرة ١٨٣٣ـ١٩٤٦، منشورات مكتبة التفسير، اربيل، ٢٠٠٣، ص٣٦٧).

#### کتێب بە زمانی کوردی

(١) ئارتوور کریستێنسێن ، ئێرانی سەردەمی ساسانییەکان ، لە فارسییەوە وەرگێڕانی سەلاحەددین ئاشتی، سلێمانی، ٢٠٠٦.
(٢) ئازاد مزووری، ئالایێ کوردستانێ سمبولا مەیا نەتەوی دناڤ شعرێن شاعران دە، لە بلاوکراوەکانی یەکێتی قوتابیانی کوردستان، ژمارە (١٩)، چاپخانەی هاوسەر، هەولێر، ٢٠٠٧.
(٣) ئەحمەد خواجە، چیم دی، بەرگی یەکەم ، چ. شەفیق بغداد، ١٩٦٨.
(٤) -------، چیم دی، بەرگی سێیەم، چ. راپەڕین، سلێمانی، ١٩٧٠.
(٥) ئەولیا چەلەبی، کورد لە مێژووی دراوسێکانیدا، و: سەعید ناکام ، لە بلاوکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٩.

(٦) ئـی.م. دیـاكۆنۆف، میـدیا، و: بورهـان قـانع، دەزگـای رۆشـنبیری و بڵاوكردنـەوەی كوردی، دار الحرية، بەغدا، ١٩٧٨.
(٧) بیرەوەرییەكانی ئیحسان نوری پاشا، و: وریا قانع، دەزگـای چـاپ و بڵاوكردنـەوەی موكریانی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١.
(٨) جلیلی جەلیل (د.)، هەندێ سیمای ژیانی كۆمەڵایەتی و سیاسی و كولتـووری كـورد لە كۆتایی سەدەی نۆزدەیـەم و سـەرەتای سـەدەی بیسـتەمدا، وەرگێڕانـی: ئـەنوەر قادر محەمەد لە رووسییەوە، ستۆكهۆڵم، ١٩٩٣.
(٩) جەمیل توران، گوڵە بەفرینەی خوێناوی، وەرگێڕانی لە یۆنانییـەوە: عـەلی فـەتحی، دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨.
(١٠) حامیـد گەوهــەری، كۆمــاری كوردســتان ١٩٤٦/١/٢٢– ١٩٤٦/١٢/١٧، چ حــاجی شەهاب، هەولێر، ٢٠١١.
(١١) ————————، كۆمەڵەی ژیانـەوەی كوردسـتان، دەزگـای چـاپ و بڵاوكردنـەوەی ئاراس (٢٤٦)، هەولێر، ٢٠٠٤.
(١٢) ڕۆژی كــورد، ئامــادەكردن و لێكۆڵینـــەوەی: عەبــدوڵڵا زەنگەنــە، پێشــەكی: د. ئیسماعیل شوكر، بنكەی ژین، چ. شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٥.
(١٣) سەرجەمی بەرهەمی حسێن حوزنی، كۆكردنەوە و لەچاپدانی دەزگـای ئـاراس، بـە سەرپەرشتی: د. كوردستان موكریانی، هێنانە سەر ڕێنووسی نوێی كوردی: مەحمود زامـدار، پێداچـوونەوەی: عەبـدوڵڵا زەنگەنـە و فـەخرەدین ئامێـدی، بـەرگی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٧.
(١٤) طـارق جامبـاز، هەفتەنامـەی (گۆڤـار)، لـە بڵاوكراوەكـانی وەزارەتـی ڕۆشـنبیری– لێژنەی چاپەمەنی ژمارە (٣٦)، چاپخانەی كریستال، هەولێر، ١٩٩٨.
(١٥) عەبدولعــەزیز یــامولكی، كوردســتان و ڕاپەڕینــەكانی كــورد، و: شــێرزاد كــەریم، ئامـادەكردنی: سـدیق سـاڵح ، دەزگـای چـاپ و پەخشـی سـەردەم (٣٧)، سـلێمانی ١٩٩٩.
(١٦) عبدالرحمن محمدامین زەبیحی، قامووسی زمانی كوردی، بەرگی یەكەم، چاپخانەی كۆڕی زانیاری كورد، بەغدا، ١٩٧٧.
(١٧) ————————————، قامووسی زمانی كوردی، بـەرگی دووەم، چـاپخانەی كۆڕی زانیاری كورد، بەغدا، ١٩٧٩.

(١٨) عەبدولستار ئەحمەد سەعدون، ئاڵای کوردستان لە نێوان شەریعەت و یاسادا، لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری ، هەولێر
(١٩) عەلی تەتەر نێروەیی، بزاڤا سیاسی ل کوردستانێ ١٩٠٨–١٩٢٧، چاپخانا وەزارەتا پەروەردێ – هەولێر ، دەزگەهێ سپیریز یا چاپ و وەشانێ ، دهۆك.
(٢٠) عیزەدین مستەفا رەسول (د.)، بەشێك لە یاداشتەکانم ، بەرگی یەکەم، چاپخانەی دەزگای حەمدی ، سلێمانی، ٢٠٠٦.
(٢١) قەتلوعامی کورد لە تورکیا، لە فەرەنسییەوە وەرگێڕانی، پێشەکی و پەراوێز نووسینی: نەجاتی عەبدوڵلا، لە بڵاوکراوەکانی جڤاتا وەلاتیێ کوردا (خۆیبوون)، ژمارە (٢) بنکەی ژین، چ، شڤان سلێمانی، ٢٠٠٨.
(٢٢) غازی حەسەن، خوێندەواری، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٠.
(٢٣) قەدری جەمیل پاشا (زنار سلوپی) دۆزی کوردستان، و: فەیزوڵلا برایم خان و بارزان وهاب، لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری هەرێمی کوردستان ، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بیر (١٢) چ٣، دیار بەکر، ٢٠٠٧.
(٢٤) کریس کۆچیرا، وەرگێڕانی: محمد رەیانی، چاپخانەی صدف تاران، ١٣٦٩، (١٩٩٠).
(٢٥) کەریم زەند، گەشتی زەند، تۆماری تەمەن ، بەرگی یەکەم، دەزگای سپیریز یا چاپ و وەشانێ ، چاپخانا وەزارەتا پەروەردێ ، هەولێر، ٢٠٠٤.
(٢٦) کوردستانی عێراق لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیادا ، لە ئینگلیزییەوە وەریگێڕاوە: سەلمان عەلی، پێشەکی و پێداچوونەوەی : سدیق ساڵح، یەکەم بەرگ، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٥.
(٢٧) گیو موکریانی، فەرهەنگی کوردستان، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ١٩٩٩.
(٢٨) مالمیسانژ، پێگەی کەمال فەوزی بتلیسی لە رێکخراوەکانی کورددا، وەرگێڕانی لە تورکییەوە: زریان رۆژهەلاتی، پێداچوونەوەی: سدیق ساڵح، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٧.
(٢٩) مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد، ١٩٣١–١٩٥٨، وەرگێڕانی: سەعید ناکام، چاپخانەی خەبات، دهۆك، ١٩٩٨.
(٣٠) محەمەد گۆران، نەریمان خۆشناو، رەمزی نافیع رۆڵەیەکی هەولێری فیداکاری سەربەخۆی کوردستان، "بەدرخان" (مانگنامە)، هەولێر، ژمارە ١٢٥؛. محەمەد

گۆران، نەریمان خۆشناو، ڕەمزی نافیع ، ڕۆڵەیەکی هەولێری فیداکاری سەربەخۆیی کوردستان، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان، چاپخانەی نەوا، هەولێر،٢٠٠٨ ؛عەبدولستار ئەحمەد سەعدون، ئاڵای کوردستان لە نێوان شەریعەت و یاسادا، لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر.

(٣١) نوری دەرسیمی (د.)، دەرسیم لە مێژووی کوردستاندا ، و: د. ئەحمەد فەتاح دزەیی، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١.

(٣٢) هانز– لۆکاس کییسێر، ڕاپەڕینی کوردە عەلەوییەکانی دەرسیم ١٩١٩–١٩٢١ (قۆچگیری)، لە فەڕەنسییەوە وەرگێڕانی: نەجاتی عەبدوڵڵا، بنکەی ژین، چ٢، سلێمانی، ٢٠٠٦.

(٣٣) هیمدادی حوسێن (د.)، ڕۆژنامەوانیی کوردی لە سەردەمی کۆماری دیموکراتی کوردستان ١٩٤٣–١٩٤٧، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس (٧٧١)، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان، هەولێر، ٢٠٠٨.

(٣٤) یاسین سەردەشتی (د.)، کوردستانی ئێران لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی لە جووڵانەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کورد ١٩٣٩–١٩٧٩، زنجیرە کتێبی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی سەردەم (٢٢١) سلێمانی، ٢٠٠٣.

### وتاری گۆڤار و ڕۆژنامەکان

(١) ئازاد عوبێد ساڵح، ئینجا نۆرەی هەڵکردنی ئاڵایە، "ئاڵای ئازادی"، ژمارە (٤٤)، ١٩٩٢/١٠/١٨.

(٢) ـــــــــــــ ، ئاڵای کوردستان، "ئاڵای ئازادی"، ژمارە (٢٤)، ١٩٩٢/٥/٢٤.

(٣)ـــــــــــــ، دیسان کێ ئاڵای کوردستانی داهێنا؟، "K21" (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (٧)،٢٠١٠، ل٤١ـ٤٧.

(٤) د.ئازاد عوبێد ساڵح، مەئموون دەباغ: ژیان و خەباتی سیاسی١٩٣٦ـ١٩٦٣، "زانکۆ" (گۆڤاری زانستە مرۆڤایەتییەکانی زانکۆی سەلاحەددین/ هەولێر)، ژمارە (٤٢)، ساڵی ٢٠٠٩.

(٥) اسماعیــل حــەقی شــاوەیس، شۆڕشــگێڕی قــوچ گــیری "ڕۆژی نــویٚ" (گۆڤــار)، سلێمانی، ژمارە (٤)، تەمووزی ١٩٦١ ؛ ژمارە (٥) ئابی ساڵی ١٩٦١.
(٦) بەدران ئەحمەد حەبیب، ڕەمـزی نـافیع ڕەشـید، ئـەو كـوردەی ئـالآی كوردسـتانی داهێنا، "ئالآی ئازادی" (ڕۆژنامە)، هەولێر، ژمارە ٢١، ١٩٩٢/٤/٢٦.
(٧) "TEVGER "(ڕۆژنامە)، سوید، هژمار (٢)، ساڵی (١)، ئاداری ١٩٨٩.
(٨) "پـەرلەمان"، (ڕۆژنامە)، هەولێر، ژمارە (٥٣)، ١٩٩٩/١١/٢٤.
(٩) خالید دەربەندی، دیدارێك لەگەڵ د. بەشیر سەبری "میدیا"( ڕۆژنامە)، هەولێر، ژمارە (٨٢)، ٢٠٠٠/١٢/١٥، ل٥؛ غازی حەسەن، خوێندەواری ، دەزگای ئاراس ، هەولێر، ٢٠٠٠، ل٢٤٤ـ٢٤٥. ناوبراو ٢٠ ساڵ لێكۆڵینەوەی لەمەڕ كورد لە ڕووسیا كردووە و ئەندامی لێكۆڵینەوەی كوردییە لە ڕووسیا.
(١٠) دیمانە لەگەڵ بورهان مەجید،"رووداو"(رۆژنامە)، هەولێر، ژمارە(٣٠)، ٢٠٠٨/١١/٣.
(١١) "ژیان"(رۆژنامە)، سلێمانی، ژمارە (٢٤١)، ٢٩/مایسی/١٩٣٠.
(١٢) "ژین"(ڕۆژنامە)، سلێمانی، ژمارە(١٤٥٧)، ١٩٥٩/٧/٢.
(١٣) صلاح هروری (د.)، تەڤگەرا ئیرشاد و ئیرتقایا كـوردی و سـەرهەڵدانا بەدلیسـیٚ یـا سالا ١٩١٤، "مەتین" (گۆڤار)، دهۆك، خولا (٤) ژ (١٣٣)، تیرمەها ٢٠٠٥.
(١٤) عبدالحمیـد اسماعیـل، مێـژووی ئـالآی كۆمـاری كوردسـتانی ئێـران ، "هــەتاو" (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە ١٨١، ١٥ ی تەموزی ١٩٦٠.
(١٥) ـــــــــــــ، مێـژووی ئـالآی (كۆمەڵـەی خۆیبـوون) لـە توركیادا"هـەتاو"، ژمارە (١٨٠) ، ٣٠ حوزەیران ١٩٦٠.
(١٦) عبـدالرحمن مـزوری، كـاوەییٚ ئاسـنگەر ئەفسـانا نـو هاتیـە چـێكرن، "هـاڤیبون" (گۆڤار)، بەرلین، ژمارە (١٨) ٢٠٠٧.
(١٧) عەبـدوڵڵا پەشـێو: خەونـەكانم هـەموویان لـە دەوری سـەربەخۆیی دەسـووڕێنەوە، دیمانــە: ئاسـۆ حەسـەن– محەمـەد خـدر مـەولوود، "هــەرێم" (گۆڤـار)، هــەولێر، ژمارە(٢٨٩)، ٢٠٠٢/١١/١.
(١٨) عەبـدوڵڵا زەنگەنـە، ئـالآی كوردسـتان هەڵگـەڕاوەی هـیچ ئالآیـەكی دیكـە نییـە، "ڕۆژنامەنووس" (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (١٢)، پایزی ٢٠٠٧.
(١٩) عەبـدوڵڵا زەنگەنـە، "ژینـۆ"، (گۆڤـار)، لەنـدەن، ژمـارە (٢٨)، كـانوونی یەكـەمی ٢٠٠١.

(٢٠) فەرهاد پیرباڵ، ئالأی کوردستان، "واتە" (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (١٦)، تشرینی دووەمی ٢٠١١.
(٢١) فەرهاد پیربال، بزاڤی رۆژنامەگەریی کوردی لە ئەورووپا و ئەمریکا ١٨٩٧–١٩٩٢، "سەنتەری برایەتی" (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (٥)، ١٩٩٨.
(٢٢) "کوردستان" رۆژنامە، مەهاباد، ژمارە (١)، ١١ژانویە ١٩٤٦، ژمارە (٥) ٢٠ ژانویە ١٩٤٦، ژمارە (٣٧)، ٢٠ ئاوریل ١٩٤٦، ژمارە (٤٣)، ٤ مە ١٩٤٦.
(٢٣) لاهوتی، کوردستان و کورد، د. جەبار قادر لە روسییەوە کردوویە بە کوردی و تێبینی لەسەر نووسیوە، "هەزارمێرد" (گۆڤار)، سلێمانی، ژمارە (٣) ئاداری ١٩٩٨.
(٢٤) موسەدەق توڤی، ئالأیێ کوردستانێ د دیرۆکیدا، "دهۆک" (گۆڤار)، ژمارە (٣٢) چریا ئێکی ٢٠٠٦.
(٢٥) نافیع دیبەگەیی، دیدار لەگەڵ جەوهەر غەمگین، "هەولێر"، ژمارە ٢٩، ٢٠٠٧/٦/٤.
(٢٦) نافیع دیبەگەیی، دیدار لەگەڵ عەلی جوکل، "هەولێر" (هەفتەنامە)، هەولێر، ژمارە ٢٣، ٢٠٠٧/٥/٣.
(٢٧) نافیع دیبەگەیی، دیدار لەگەڵ سامیە شاکر (مەشخەڵ)، "هەولێر"، ژمارە ٢٤، ٢٠٠٧/٥/١.
(٢٨)"هەرێم"، (گۆڤار)، ژمارە (٣٨٠)، ٢٠٠٦/٩/١٢.
(٢٩) "هەلأڵە" (گۆڤار)، بۆکان، ژمارە (١)، رەشەمەی ١٩٤٥،١٣٢٤، (بەوەرگرتن لە د. هیمداد حوسێن، رۆژنامەوانی کوردی لە سەردەمی کۆماری دیموکراتی کوردستان ١٩٤٣–١٩٤٧، دەزگای چاپ و بلأوکردنەوەی ئاراس (٧٧١)، هەولێر، ٢٠٠٨).
(٣٠) هەڵکردنی ئالأی مقدسی کوردستان لە مەهاباد، "کوردستان"( گۆڤار )، مەهاباد، ژمارە (٣) خاکەلێوەی ١٣٢٥ (١٩٤٥).

### کتێب بە زمانی عەرەبی:

(١) الدليل العراقي لسنة ١٩٣٦.
(٢) الموسوعة العربية الجمهورية العربية السورية / رئاسة الجمهورية ، هيئة الموسوعة العربية، المجلد١٣، ط١، دمشق، ٢٠٠٥، (مادة العلم ، محمد وليد الجلاد).
(٣) الموسوعة العربية العالمية، مجلد ١٦، ط٢، الرياض ١٩٩٩.
(٤) الموسوعة العربية الميسرة، المجلد الثاني.

(٥) احمد بن علي القلقشندي، صبح الاعشى في صناعة الانشاء، ج٤، شرح وعلق عليه وقابل نصوصه، محمد حسين شمس الدين، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٩٨٧، د. محسن محمد حسين، الجيش الايوبي في عهد صلاح الدين، دار آراس للطباعة والنشر (١٩٠)، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠٣.
(٦) احمد تيمور، تأريخ العلم العثماني، القاهرة، ١٣٤٢هـ.
(٧) الاثار الكاملة للدكتور أحمد عثمان أبوبكر، اعداد: ازاد عبيد صالح، مركز ژين لأبحاث التراث الوثائقي والصحفي، مطبعة شڤان، سليمانية، ٢٠٠٩.
(٨) اكرم جميل باشا، مذكراتي، ت: د.قدري الدياربكري، ط٣، دياربكر، ٢٠٠٧.
(٩) بيار مصطفى سيف الدين، السياسة البريطانية تجاه تركيا وأثرها في كوردستان ١٩٢٣–١٩٢٦، دار سپيريز للطباعة والنشر، مطبعة وزارة التربية اربيل.
(١٠) بلەج شێرکۆ (د.)، القضية الكوردية، ماضي الكورد وحاضرهم، دار اراس، ط٢، مطبعة اراس، اربيل، ٢٠١١.
(١١) روهات الاكوم : خويبون وثورة اگرى، الترجمة العربية: باشراف رابطة كاوة للثقافة الكردية، مراجعة: شكور مصطفى، مطبعة اوفيست هەولێر، اربيل، ٢٠٠٠.
(١٢) زنار سلوپى، في سبيل كوردستان، ترجمة: رضوان علي باديني، رابطة كاوة للثقافة الكردية، بيروت، ١٩٨٧.
(١٣) س.ج. ادموندز، كرد و ترك و عرب، ترجمة: جرجيس فتح الله، دار التآخي، بغداد، ١٩٧١.
(١٤) سعد بشير اسكندر (د.)، قيام النظام الأماراتى في كردستان وسقوطه مابين منتصف القرن العاشر ومنتصف القرن التاسع عشر، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد ٢٠٠٥.
(١٥) السيد عبدالرزاق الحسني، تأريخ الوزارات العراقية، ط٧، دار الشؤون الثقافية، بغداد، ١٩٨٨.
(١٦) عبدالرقيب يوسف الدولة الدوستكية في كردستان الوسطى، الجزء الثاني، القسم الحضاري، ط٢، دار آراس للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠١.
(١٧) عبدالفتاح علي البوتاني (د.)، التطورات السياسية الداخلية في العراق ١٤ تموز ١٩٥٨– ٨ شباط ١٩٦٣، دار سپيريز للطباعة والنشر دهوك، مطبعة خاني، دهوك، ٢٠٠٧.

(١٨) عثمان علي (د.)، دراسات في الحركة الكوردية المعاصرة ١٨٣٣-١٩٤٦، منشورات مكتبة التفسير، اربيل، ٢٠٠٣.

(١٩) فلك الدين كاكه يي، القذافي والقضية الكردية، منشورات دار آراس للطباعة والنشر (٧٥٩)، اربيل، ٢٠٠٨.

(٢٠) كمال مظهر احمد (د.)، انتفاضة ١٩٢٥ في كردستان تركيا، رابطة كاوة للثقافة الكردية (٦٦)، ٢٠٠١.

(٢١) كۆنى ڕەش، جمعية خۆيبون ١٩٢٧ وقائع ثورة آرارات ١٩٣٠، تقديم ومراجعة: الدكتور عبدالفتاح علي بوتاني، مؤسسة موكرياني للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠٠.

(٢٢) منذر الموصلي، الحياة السياسية والحزبية في كوردستان، دار رياض الريس للكتب والنشر، لندن، ١٩٩١.

(٢٣) هلبين محمدامين المزوري، حزبي هيوا – الامل – ١٩١٩–١٩٤٦ دراسة تأريخية سياسية – دار سپيريز للطباعة والنشر، مطبعة حاجي هاشم، اربيل، ٢٠٠٨.

(٢٤) يوسف ملك، كردستان او بلاد الكرد: مراجعة ومقدمة: د.عزالدين مصطفى رسول، ط٢، منشورات مكتب الفكر والتوعية في الاتحاد الوطني الكردستاني، السليمانية، ٢٠٠٦

(٢٥) ژويس بلو، مسأله كرد برسى تاريخى وجامعه شناسى، ترجمه: دكتر بُرويز امين، چ١، تهران ١٣٧٩.

(٢٦) مذكرات نوري شاويس، منشورات حزب الشعب الديمقراطي الكردستاني.

### گۆڤار و ڕۆژنامه به زمانی عەرەبی

(١) "العراق"( جريدة)، بغداد، العدد (١٥٤٣)، ١/٦/١٩٢٥.

(٢) محمد القدوسي، علم مصر تأريخ القتال والاستقلال،"دبي الثقافية"(مجلة)، دبي، العدد (٢٧)، أغسطس ٢٠٠٧.

### سەرچاوە بە لاتینی:

(1) Kone Res, Ala Kurdan di nevbera Bedirxani u Barzaniyande, Govara Digle, J24,Adar 2000

**ماڵپەڕ:**

(١) عیزەدین مستەفا رەسول (د.)، دیسان ئالأی کوردستان، سایتی خەندان، ڕۆژی ٢٠١٠/٨/٣١.

(٢) یاسین سەردەشتی (د.)، چەند راستییەکی مێژوویی سەبارەت بەحیزبی ئازادی کوردستان. www.dimane. com

**دیدار:**

(١) دیدار لەگەڵ جەمال خەزنەدار، هەولێر، ٢٠١٠/١٢/٥.

(٢) دیدار لەگەڵ مومتاز حەیدەری، هەولێر، ٢٠١٢/٧/١٧.

## ملخص البحث

للعلم تاريخ قديم، تزامن ظهوره واستخدامه مع ظهور الحضارات، واستخدم **(العلم)** كرمز للاحترام والمكانة والسيادة، ومصدره الاولى مستنبط من التقاليد العسكرية، فكان لكل حضارة ودولة حتى الشخصيات (**علما**).

طوال التاريخ حدثت تغيرات كثيرة على ـ علم ـ، والعلم كان دوما ملونا، وكل لون يرمز الى معنى خاص به.

والملاحظ لدى الكورد، وقبل القرن العشرين، بان المصادر المتوفرة، لم تحتوي على اية اشارة للعلم، والاهم هو ـ العلم القومي ـ والذي يظهر ويتجسد مع تشكيل الدولة القومية.

في القرن العشرين ومع اندلاع الانتفاضات والثورات وتشكيل المنظمات والجمعيات والاحزاب، ظهر (**علم**) خاص بالشعب الكوردي، فكان متعدد الاشكال والالوان، فكل جهة وحسب وجهة نظرها حددت هذه الاشكال والالوان، الا ان اكثرهم تجسيدا وتمثيلا، هو العلم الذي قامت جمعية التشكيلات الاجتماعية الكوردية بتحديد الوانه وشكله، محتويا على مستطيلات ثلاثة ذات الوان: (**الاحمر، الابيض، الاخضر**)، مع (**شمس مشع**) في الوسط، ويحمل كل لون دلالته الخاصة معبرا على الاكثر عن الطبيعة الكوردستانية.

والعلم هذا، اعترف به معظم ابناء شعب كوردستان، وفي اقليم كوردستان، تم سن قانون خاص به، ومرفوع حاليا في الاقليم، كما واعترف به جمعية الجغرافيين الدولية.

# Abstract

Flag possesses an ancient history whose emergence coincided with the rise of civilizations. It was used as a sign of respect, status and sovereignty. Its early inception goes to military traditions since every civilization and state or even personality had science.

Flag has witnessed numerous changes, when colors were added to it , each color symbolized a peculiar meaning.

What is noted from the Kurdish history is that all the sources available do not contain any reference to flags whatsoever let alone the national flag, which is externalized with the formation of a national state.

During the twentieth century and parallel with the outbreak of Kurdish uprisings and revolutions and the founding of numerous organizations and political parties, there appeared a special flag that exclusively belonged to the Kurds. It was multi-color and shape as each party drew its contours in its own perspective. Yet, the most salient and popular was the flag designed by the Kurdish Society for Social Divisions, which contained three colors: red, white and green with a shining sun in the middle. Each color, of course, bears a special meaning mostly expressive of Kurdistan's nature. This flag is the one that is now acknowledged by all the Kurdish people Kurdistan-wide, and in Kurdistan Region of Iraq, a special law has been legislated for it, which is flown in the Region and is recognized by the International Geographers Association.

# مێژووی کوردناسی لە ئینستیتوتی دەستنووسەکانی ڕۆژهەلاّت

## (کوردۆلۆجیا لە سالاّنی ١٩٥٩ – ٢٠٠٥)

پرۆفیسۆر زاریّ یوسوپۆڤا
وەرگێڕانی پرۆفیسۆر جەبار قادر

کۆردۆلۆجیا، وەکو برانشێکی تایبەتیی ڕۆژهەلاّتناسی ئەکادیمی لە ڕووسیا، لەسەر بنەمای چالاکییەکانی ژمارەیەك زانای بە توانا و بەناوبانگ وەکو: ڤ.دیتێل، ڤ. ئە. ژوکۆڤسکی، ڤ.ڤ.ڤلیامینۆف – زیرینۆف، پیۆتەر لێرخ، ئەلیکسەندەر ژابا، ڤ.ڤ. مینۆرسکی، و ڤاسیلی.پ. نیکیتین دامەزرا.

ئەوەی ڕاستیبێ ڕۆلّی سەرەکی، لە دامەزراندن و گەشەکردنی توێژینەوەی کوردی لە سان– پیتەرسبورگ، دەگەڕێتەوە بۆ ئی. ئە. ئۆربیللی، دەتوانین بلّێین ئەو باوکی ڕاستەقینەی قوتابخانەی کوردۆلۆجیای پیتەرسبورگە و نووسەری ژمارەیەك وتاری بەنرخە لە بارەی مێژوو و کولتوور، ئەدەبیات، زمان و فۆلکلۆری کوردەوە.

گرووپی کوردناسی، لە سالّی ١٩٥٩دا، بە دەستپێشخەری ئۆربیللی لە لقی ئینستیتوتی ڕۆژهەلاّتناسی، کە هەر خۆی سەرۆکایەتی دەکرد، دامەزرا. ئۆربیللی لە ڕاگەیاندنی دامەزراندنی ئەو گرووپەدا وتی: "بە لەبەر چاوگرتنی پێویستی بە شارەزایی لە بواری کوردناسیدا و بەرەو کردنەوەی بەشی کوردۆلۆجیا........ لە ١ی مارتی ١٩٥٩ گرووپێك لە کوردناسان، کە ئێستا سەر بە بەشی ئێرانیستیکان (ئێراننناسی)، بە سەرۆکایەتی خۆم لەو ئەندامانە دادەمەزرێ: ك. ك. کوردۆییێف (قەناتێ کوردۆ)، ئی. ئی. دیمینێیەڤا (ڤاسیلێیڤا) و قوتابیانی دکتۆرا ئی. ئە. سەمیرنۆڤا، زاریّ یوسوپۆڤا، کەریمی ئەیووبی و جەلیلۆف (جەلیلێ جەلیل).

ئامانجی ئەم گرووپە لێکۆڵینەوەیە لە بوارەکانی مێژوو، کولتوور و زمانی گەلی کورد. بەم شێوەیە سەردەمێکی تازە لە گەشەکردنی کوردۆلۆجیا لە ڕووسیا دەستی پێکرد و لەم خاڵەوە تاوەکو ئێستاش کوردناسی لە ڕووسیا لە سەر ئەو خەتە دەڕوات کە ئۆربیللی دەستنیشانی کرد.

زمان بواری یەکەمی لێکۆڵینەوەکان بوو، بە تایبەتی توێژینەوەی زمانەوانی بۆ کار و چالاکییەکانی گرووپەکە گرنگ بوو. توێژەرە سەرەکییەکانی ئەم گرووپە، قەناتیێ کوردۆ و تسوکەرمان و قوتابییەکانیان وەکو سەمیرنۆڤا ( کە ئێستا توێژەرە لە ئینستیتوتی زمان لە ئەکادیمیای زانستیی ڕووسیا) و زاریێ یوسوپۆڤا (کە مۆرفۆلۆجیا، فۆنەتیك و سینتاکسی زمانی ئەدەبیی کورد و دیالێکتەکانی دەخوێند) بوون ، ئەمانە چەند کتێبێکی ڕێزمان و فەرهەنگیان خستە بەردەست و هەندێ تێکستی فۆلکلۆرییان بلاْوکردەوە، کە کەرەسەی زمانەوانی دەوڵەمەندیان لە خۆدا کۆکردبۆوە و یەکجار پێویستن بۆ توێژینەوەی بەراوردکاری دیالێکتەلۆگیا (لێکۆڵینەوە لە دیالێکتەکان).

سەردەمی گرنگی مێژووی توێژینەوەی زمانەوانی گرێدراوە بە کار و چالاکی ماندوونەناسانەی قەناتیێ کوردۆ، توێژینەوە دەسپێك و پێشەنگەکانی ئەو زۆر گرنگ بوون بۆ گەشەکردنی کوردۆلۆجیا لە ڕووسیا. قەناتیێ کوردۆ ژمارەیەك لێکۆڵینەوەی بەڵگەیی لە بواری زمانی کوردیدا بەرهەم هێنا، کە دواتر بوونە بنەمایەك بۆ زمانزانانی کورد، وەکو: یەکەمین ڕێزمانی کوردی، (( ڕێزمانی زمانی کوردی (کرمانجی) )) لە ساڵی ١٩٥٧، فەرهەنگی کوردی– ڕووسی (١٩٦٠)، ڕێزمانی بەراوردکاری زمانی کوردی لە سەر بنەمای کەرەستەی دیالێکتەکانی کرمانجی و سۆرانی (١٩٧٨). لە نێو ئەو نووسینانەی کوردۆ، کە بلاْونەکراونەتەوە و زیاتر سەرنجڕاکێشن، "توێژینەوەی دیالێکتی کوردی زازا"یە. هەروەها "پوختەیەك لە کوردناسی ڕووسی و سۆڤیەتی". کوردۆ، لە تەك لێکۆڵینەوە بەردەوامەکانیدا، لە بواری زمانی کوردی، لە گەلێ بواری تردا وەکو: ئەدەبی کوردی، مێژوو، ئایین و بلاْوکراوەکانیش کاری دەکرد و بەرهەمی بلاْو دەکردەوە. هەروەها قەناتیێ کوردۆ توانایەکی زۆری لە ئامادەکردنی کادر و پسپۆری ئەکادیمی بۆ کورد و کوردستان خەرج کرد، ئەوڕۆ قوتابییەکانی ئەو لە زمانزانان،

مێژوونووسـان، پسـپۆڕانی ئـەدەبیات لـە ناوەنـدە زانسـتییەکان لـە ڕووسـیا و لـە دەرەوەی ڕووسیاش سەرکەوتووانە کار دەکەن. کوردۆ لـە سـالآنی١٩٦٠–١٩٨٥دا سـەرۆکایەتی گرووپـی کوردۆلۆجیـای دەکـرد و چـالاکییەکانی کاریگـەریی زۆریـان لەسەر گەشەکردنی کوردناسی لە ڕووسیا و دەرەوەی ڕووسیاش هەبوو.

زمانزانێکی تری ناودار، کە بەرهەمـەکانی بـۆ ڕێزمـانی کرمـانجی کوردەکـانی ئەرمەنستان تەرخان کرابوون، ئی. ئی. تسوکەرمانە. لـە نـاو بەرهەمـەکانی ئـەودا "پوختەی ڕێزمانی کوردی" (١٩٦٢)، کە بۆ دیالێکتی کرمانجی، بەتایبەتی زازاکی تـەرخان کرابـوو. هـەروەها "کرمـانجی خوراسـان" ١٩٨٦، کـە بـۆ یـەکێ لـە شـێوەزارەکانی کرمـانجی تـەرخانی کردبـوو و دیـالێکتی کوردەکـانی تورکمەنستانیشی دەگرتەوە، کە باو و باپیرانیان لە خوراسانی ئێرانەوە هاتبوون. هـەروەها لێکۆڵینەوەیـەکی سەرنجڕاکێشـی تسـوکەرمان لەگـەڵ یـەکێ لـە قوتابییەکانیدا، شیکۆییێ گەسـانیان (کـە لـە تەمـەنی لاوییـدا کۆچـی دوایـی کـرد) لەبارەی (تێپەڕاندنی سیستەمی بێلایەنی گـوێ پێنـەدراو لـە دەقـە ئەدەبییـەکانی کوردانی ئەرمەنستاندا) بوو.

گرووپـی کوردناسـی، هـەر لـە سـەرەتای سـاڵی ١٩٦٠دا، دەسـتی کـرد بـە توێژینەوەی دیالێکتی کوردیی باشوور، کە ئەوانەی قسە بەم دیالێکتـە دەکـەن لـە کوردسـتانی عێـراق و ئێـران دەژێـن. بـە سەرپەرشـتی قـەناتێ کـوردۆ سـێ تێـزی دکتۆرا لـەم بـوارەدا ئامـادەکران "دروسـتبوونی کـاری ئـاڵۆز لـە زمـانی کوردیـدا، سۆرانی" لەلایەن سەمیرنۆڤاوە، پێشـگر و پاشـگر لـە دیـالێکتی باشـووری زمـانی کوردیـدا – سـۆرانی" لـە لایـەن زارێ یوسـوپۆڤاوە،"مێژووی لێکسـیکۆگرافیای کوردی، بنەماکانی دانانی فەرهەنگی ڕووسی –  کوردی" لەلایـەن عەبـدولڕەحمان مارفەوە (١٩٧٢)، ( دکتۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارف.).

گرووپـی زمانزانـانی کوردۆلۆجیـا، سـالآنی دواتـر، ژمارەیـەك کتێبیـان بـلاو کردەوە، لە بـارەی فـەرمان و لێکسـیکۆلۆجی لـە هەنـدێ لـە زاراوەکـانی باشـوور وەکو: سۆرانی (لەلایەن قـەناتێ کـوردۆ و زارێ) و زاراوەی مـوکری (سـەمیرنۆڤا و کـەریمی ئـەیووبی) و هـەورامی (ز. یوسـوپۆڤا) و گـۆرانی (یوسـوپۆڤا و ن. سەفرۆنەڤا). لێرەدا لەسەر بنەمای تێکسـتە زارەکییـەکان لـە هـەورامی و گۆرانی

کۆڵیبوونەوە. ئەم لێکۆڵینەوانە بوون بە بنەمایەك بۆ میتۆدێکی نوێ لەبواری زمانزانیی کوردیدا. لێکۆڵینەوە لەم دیالێکتانە زۆر گرنگە بۆ زانستی دیالێکتۆلۆجیا، چونکە هەندێ لە شارەزایانی ئێرانیستیکا (وەکو د. مەکەنزی و جۆیس بلۆ) و کوردناس (ر. تسەبولۆف)، بەبێ بەڵگەی باوەڕپێکراو، لافی ئەوە لێدەدەن کە ئەم دیالێکتانە پەیوەندییان بە کوردییەوە نییە. هەر وەکو لێکۆڵینەوەکانی پێشتری قەناتێ کوردۆ لە بارەی دیالێکتی زازا و توێژینەوەکانی کەریمی ئەیووبی و سەمیرنۆڤا لە بارەی دیالێکتەکانی باشووری زمانی کوردی، ئەوەیان دەرخستووە کە ئەو ئێراننناس و کوردناسانە بە هەڵەدا چوونە و بۆچوونەکانیان لە جێگەی خۆیاندا نین و هیچ بنەمای زانستییان نییە.

دووەمین ئامانجی گرووپی کوردناسیی سانپیتەرسبورگ توێژینەوەی ئەدەبی کلاسیکی و هاوچەرخی کورد بوو. مارگرێتا ڕودێنکۆ (مخابن کە زوو کۆچی دوایی کرد) ڕۆڵی گرنگی لەم بوارەدا گێڕا. ئەو یەکەمین زانا بوو کە پەیدۆزی (تەحقیق)ی گرنگترین تێکستەکانی ئەدەبی کوردی کرد و بڵاوی کردنەوە، وەکو: (شێخی سەنعان)ی فەقیێ تەیران، کە لە سەدەی چواردەهەمی زاینیدا ژیاوە، (یوسف و زولێخای) سەلیمێ سلێمانی، کە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی شازدەهەمی زاینی. (مەم و زینی) ئەحمەدی خانیی سەدەی حەڤدەهەمی زاینی و (لەیلاو مەجنوونی) حارسی بدلیسی، کە ئەویش هەر لە سەدەی حەڤدەهەمدا ژیاوە. هەروەها ڕودێنکۆ یەکەمین کەتەلۆگی گشتگیریی دەستنووسە کوردییەکانی لە کتێبخانەی نیشتیمانی لێنینگراد (ئینستیتوتی دەستنووسەکانی ڕۆژهەڵات) ئامادە کرد و لە ساڵی ١٩٦١دا بلاْوکرایەوە. ئەم دەستنووسانە لە لایەن زانا و دیپلۆماتە ڕووسەکانەوە بەدەستهێنران وەکو ب. ئە. دۆرن، ڤ. ڤ. ڤلیامینۆف – زیرنۆف، ئەلیکسەندەر ژابا.......هتد .

ئەرکی لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردیی سەدەکانی ناوەڕاست کەوتە ئەستۆی ژ. س. موسائیلیان کە قوتابی رودێنکۆ بوو. تێزی دکتۆراکەی بۆ یەکێ لە دەقە ئەدەبییە میللییە گرنگەکان تەرخان کرد، کە ئەویش (زەمبیل فرۆشە). ئەم دەقە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی پازدەهەم و شازدەهەم. لە دواییدا ئەم تێزە بوو بە بنەمای کتێبێك، کە لە ساڵی ١٩٨٣ بڵاو کرایەوە. ئەم چاپەش دەقە

پەیدۆزکراوەکە دەگرێتە خۆ، کە لە سەر بنەمای شەش دەستنووس لە کتێبخانەی نیشتیمانی لە لێنینگراد هەڵگیرابوون. لە تەك دەقێکی تردا کە لە لایەن شاعیرێکی کوردەوە لە سەدەی هەژدەهەم بە فراوانکردنەوە بە شیعر وتوویەتیەوە. هەروەها لە کتێبەکەدا هەندێ ڤێرشنی فۆلکلۆریی ئەم داستانە بڵاوکراونەتەوە.

یەکێ لە دەستکەوتە زانستییە گەورەکانی قەناتێ کوردۆ، لە بواری ئەدەبیاتدا، ئەنتۆلۆگیای شیعری کوردییە لە دوو بەرگدا، کە هەر بەخۆی لە ساڵانی ١٩٨٣–١٩٨٥ سەرپەرشتی کردووە. ئەم ئەنتۆلۆگیایە شیعری ٢١ شاعیر، لە سەدەکانی دەیەم تا بیستەم، دەگرێتەخۆ. هەروەها کوردۆ، لە بواری ئەدەبی هاوچەرخی کوردیدا، سەرپەرشتی هەندێ تێزی دکتۆرای کرد وەکو: "داهێنانی شاعیری پێشکەوتووخوازی کورد هەژار" لە لایەن کەریمی ئەیووبییەوە لە ساڵی ١٩٦١ بەرگری لێ کرا. هەروەها ( لەبارەی مێژووی ئەدەبی کوردییەوە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم ) لە لایەن مارف خەزنەدارەوە، کە وەکو کتێبیش لە ژێر ناوونیشانی (چەمکێك لە مێژووی ئەدەبی هاوچەرخی کوردی) لە ساڵی١٩٦٧ بڵاوی کردەوە. هەروەها "مێژووی گەشەکردنی چیرۆکی هونەریی هاوچەرخی کورد لە عێراق لە ساڵانی ١٩٢٥–١٩٦٠" لە لایەن جەمشید حەیدەری (١٩٧٧). ز. ن. فۆرۆژیکیناش سەرپەرشتی تێزی دکتۆرای ئەنوەر قادر محەمەد (جاف) ی کرد لە ژێر ناوونیشانی"لیریکی شاعیری کوردی سەدەی نۆزدەهەم بە دیالێکتی گۆرانی مەولەوی"، کە لە ساڵی ١٩٨٦، بەرگری لێ کرا.

گرووپی زانایانی کوردۆلۆجیا، لە تەك لێکۆڵینەوە لە مێژووی نووسراودا، دەستیان کرد بە کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوە و لێکدانەوەی فۆلکلۆری کوردی بەتایبەتی لە دیالێکتی کرمانجی ژووروو. لە نێو بەرهەمە سەرەتاییەکانی ئەم بوارەدا کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی دەقە فۆلکلۆرییەکان بوو، وەکو گۆرانییە سەر بە ژانرە جیاوازەکان، ئەفسانەکان، چیرۆکە خەیاڵییەکان، پەندی پێشینان و مەتەڵۆك و نوکتە. ئەم شتانە هەمووی لە لایەن کارمەندانەوە کۆکراونەتەوە لە کاتی گەشتە زانستییەکاندا بۆ ئەو ناوچانەی کوردی یەکێتی سۆڤیەتی جارانی لێ دەژیان. ئۆربیللی، قەناتێ کوردۆ و ڕۆدێنکۆ یەکەمین هەنگاویان لەم بوارەدا

هەڵهێنا . بەتایبەتی ئەو کەرەستانە گرنگن کە ئۆربیللی لە کاتی خۆیدا لە ناوچەی مۆکس لە تورکیا کۆی کردبوونەوە و ئێستا لە توانای ئێمەدا نییە ئەو کارە بکەین، ئەوەش لە کاتی گەشتەکەیدا بۆ ئەوێ لە ساڵانی ١٩١١-١٩١٤. لە سەر ئەو بنەمایە ئۆربیللی فەرهەنگی کوردی - ڕووسی دانا، کە دوای تێپەڕبوونی ساڵانێکی زۆر، لە ساڵی ٢٠٠٢دا، بۆ یەکەمین جار لە یەریڤانی پایتەختی ئەرمەنستان چاپ کرا. فەرهەنگەکە لە لایەن تسوکەرمان و موسائیلیانەوە بۆ چاپ ئامادە کرا، موسائیلیان کتێبی "گۆرانییە میللییە کوردییەکان" یشی بۆ چاپ ئامادە کرد و لە ساڵی ١٩٨٦ لە سەر بنەمای دەستنووسە کۆکراوەکانی ئەلیکسەندەر ژابا، کە لە کتێبخانەی نیشتیمانی لێنینگراد پارێزرابوون، بڵاو کردەوە.

کەرەستە فۆلکلۆرییە کۆکراوەکانی ڕۆدێنکۆ بەتایبەتی گرنگ و مایەی بایەخن بەر لە هەمووشیان گۆرانی لاواندنەوە، کە لە ئۆکتۆبەری ١٩٧٢ لە ئەرمەنستان، گورجستان و ئازەربایجان کۆی کردنەوە و لە دوای مردنی بڵاوکرانەوە، لەگەڵ وەرگێڕاندا بۆ زمانی ڕووسی و بە لێکۆڵینەوەیەکەوە لە چوارچێوەی کتێبێکدا بە ناونیشانی "شیعری ڕیتوێڵی کوردی - خوێندنی سەرقەبران ) لە ١٩٨٢.

ئۆردیخان جەلیلۆف (ئۆردیخانێ جەلیلی) شارەزایەکی فۆلکلۆری دیارە. ئەو خۆی بە داستانە مێژووییە کوردییەکانەوە خەریك دەکرد و لە سەر ئاستی ئەکادیمی لەو بوارەدا خاوەن پێگە و ناوبانگە. بە تایبەتی ئەو کەرەستانەی بەخۆی کۆی کردوونەتەوە، بەشێکیان لەگەڵ جەلیلێ جەلیلی برایدا لە کاتی سەردانە زۆرەکانیدا بۆ کۆمارەکانی یەکێتی سۆڤیەتی جاران لە قەوقاز و ناوەڕاستی ئاسیا. لێکۆڵینەوە دوور و درێژەکانی لەم بوارەدا ئەنجامەکەی بەرهەمێك بوو بە ناوی"گۆرانییە مێژووییە کوردییەکان" کە لە ساڵی ٢٠٠٣ بڵاو کرایەوە . چاپی ساڵی ٢٠٠٤ کتێبەکەی زارێ یوسوپۆڤا "دەقە فۆلکۆرییەکانی کوردانی باشوور" هەندێ دەقی زارەکی کوردانی عێراق، لەگەڵ وەرگێڕانیاندا بۆ سەر زمانی ڕووسی دەگرێتە خۆ.

ئامــانجی ســێیەمی توێژینــەوەکانی گرووپــی کوردۆلۆجیــا، لــە ســان پێتەرسبۆرگ، لە بواری مێژوو و مێژوونووسیدا بوو. توێژینەوەی مێـژوو، بـە هـۆی زانیـاری کەمـەوە لـە بـارەی سەرچـاوە مێژووییەکانـەوە لـە بـارەی سـەدەکانی ناوەڕاست و کۆنەوە، زیاتر چڕ بووەوە لەسەر کێشـە هاوچـەرخەکان و سـەردەمی نوێی مێژووی کورد. تەنها مێژووزانی گرووپی کوردناسان ئی. ئی. ڤاسیلێیڤا بـوو، ئەویش گرنگییەکی زۆری دا بە پەیدۆزی، وەرگێڕان و توێژینەوە لە چەند دەقێکـی مێـژوویی سـەدەکانی ناوەڕاسـت و سـەردەمی نـوێ. ئـەو یەکـەمین وەرگێڕانـی شـەرەفنامەی لـە فارسـییەوە بـۆ ڕووسـی ئـەنجام دا. ئـەو سەرچـاوە مێژووییـە گرنگەی سەدەی شازدەهەم، کـە لـە لایـەن شـەرەفخانی بدلیسـییەوە نووسـراوە، تەنها سەرچاوەی مێژووییە لە بواری خۆیدا. دواتر ڤاسیلێیڤا لەسەر کرۆنیکەکانی (تۆمارە مێژووییەکانی) ئەردەڵان لە کوردستانی ئێران کـاری کـرد، کـە لـە لایـەن مێژوونووسانی کوردەوە لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا نووسراون.

چاپکردنی تاقە دەستنووسی پـارێزراو لـە کتێبخانـەی نیشـتمانی وەرگێڕانـی شـەرەفنامەی شـەرەفخانی بدلیسـی بـوو بـۆ کـوردی (کرمـانجی) لـە لایـەن مـەلا مـەحموودی بایەزیدییـەوە. ئـەم کـارە دەسـتکەوتێکی مـەزن بـوو لـە بـواری لێکۆڵینـەوەی سەرچـاوە مێژووییەکانـدا. ئـەو دەستنووسـە لـە لایـەن کـوردۆ و موسائیلیانەوە لـە سـاڵی ١٩٨٦ لـە ژێـر ناونیشـانی "مێـژووی کـۆنی کوردسـتان" بڵاوکرایەوە.

مێژووی نوێی کوردستان لە چەند تێزێکی دکتۆرادا توێژینەوەی لەسەر کـرا و زیـاتر تـەرخان کرابـوون بـۆ بزووتنـەوەی ڕزگـاریخوازی کـوردان لـە سـەدەکانی نۆزدەهەم و بیستەم، وەکـو ئەوانـەی سـەید عـەزیز شـەمزینی، جـەلیلێ جـەلیل و کاوس قەفتان.

ئیتنـۆ– کولتـوور و ئیتنـۆ– سۆسـیال، یـەکێ لـەو بوارانـە بـوون کـە هەنـدێ نووسین و بڵاوکراوەیـان بـۆ تـەرخان کـرا وەکـو " کوردەکـان" لـە لایـەن قـەناتێ کوردۆوە کە هەوڵی ڕوونکردنەوەی لایەنی ماددی و ڕۆحیـی کولتـووری کـوردی دا. هـەروەها هەنـدێ پرسـی بزووتنـەوەی ڕزگـاریخوازی نەتـەوەیی (١٩٧٥)، مـەلا مەحموودی بایەزیدی (خوو و نەریتی کوردان) کە ڕۆدێنکۆ لـە سـاڵی ١٩٦٣ ڕێکـی

خست و بڵاوی کردەوە. هەروەها تێزی دکتۆرای ئە. مەمەد نەزارۆف (بەسەرپەرشتی قەناتیێ کوردۆ) " لێکۆڵینەوەیەکی ئیتنۆگرافی مێژوویی کوردانی تورکمانستان" لە ساڵی ١٩٦٤.

پڕۆژەی دوور و درێژی ڤاسیلێیڤا و موسائیلیان بە دەستپێشخەریی قەناتیێ کوردۆ لە بارەی پرۆسەی ئیتنۆ – مێژووییەوە، بەرهەمەکەی دەستنووسێکە کە زیاتر لە ٩٠٠ لاپەڕەیە و ئامادەیە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە. یەکێك لە ئامانجەکانی گرووپەکە ئامادەکردن و بڵاوکردنەوەی بیبلیۆگرافیایەك بوو لە بارەی کوردناسییەوە. ئەمە ئەرکی موسائیلیان بوو و بە چاکی تەواوی کرد و لە دوو بەرگدا لە ساڵی ١٩٩٦ بڵاوی کردەوە. ئەمە دەوڵەمەندترین لیستی ئەو نووسراوانەیە کە لە بارەی کورد و هەموو لایەنەکانی کۆمەڵگەی کوردییەوە نووسراون و سەردەمێك دەگرێتە خۆ کە سەدەی شازدەهەم تاوەکو ساڵی ١٩٨٥ دەگرێتەوە.

لە ساڵی ٢٠٠٥دا بونیادی ئینستیتوتەکە سەرلەنویێ ڕێکخرایەوە. گرووپی کوردناسی خرایە سەر بەشی ڕۆژهەلاتی نزیك لە لایەن ( ئۆ. ف. ئاکیمۆشکین) بەڕێوە دەبریێ. لەم کاتەدا واتە لە ساڵی (٢٠٠٥) چەند کوردناسێك لەم بەشەدا کار دەکەن، ئەوانیش ئێلینا ڤاسیلێیڤا، ژاکە موسائیلیان، سافۆنەڤا و زاریێ یوسوپۆڤایە.

**ئەم وتارە لە لایەن زاریێ یوسوپۆڤاوە بە زمانی ڕووسی نووسراوە و لە لایەن: زۆرینەوە کراوە بە ئینگلیزی و ویکهام – سمیت پێیدا چووەتەوە. دوا تازەکردنەوەی لە سەر تۆڕی ئینتەرنێت لە ٢٠٠٨/١١/٦دا بووە.**

# رۆڵی پێگەیاندنی خێزانی
# لە جیاوازیی ڕەگەزیدا
## ( توێژینەوەیەکی مەیدانییە لە شارۆچکەی کەسنەزان )

م. ئەسرین زرار قادر

### پێشەکی

بابەتی جیاوازیی ڕەگەزی یەکێکە لەو پرسە هەستیار و گرنگانەی کە لە پانتایی توێژینەوەی زانستە مرۆڤایەتییەکان جێگایەکی فراوانی گرتۆتەوە بۆ شیکردنەوە و وردبوونەوەی زیاتر لە جیاوازییە بایۆلۆژی و کۆمەڵایەتییەکانی نێوان نێر و مێ. لەو کاتەوەی جیاوازییە بایۆلۆژییەکان کرانە بنەما و هۆکاری جیاوازیی کۆمەڵایەتی، واتە دابەشکردنی کار، ڕۆڵ، پێگە و دەستنیشانکردنی مافەکان لە نێوان ژن و پیاودا لە قۆناغە سەرەتاییەکانی ژیانی مرۆڤایەتی بەسترانەوە بەجۆر و ڕۆڵی بایۆلۆژی. ئەمە بووە سەرچاوەیەك بۆ پەیدابوونی بابەت و پرسی جیاوازیی ڕەگەزی. لەسەردەمی ئێستادا لەگەڵ هەموو ئەو گۆڕانکاری و پێشکەوتنەی کە لە جیهان ڕوویداوە لە بواری فیکری، داهێنان، زانست و تەکنۆلۆژیا، سەرەڕای زیاتر پێشکەوتنی بارودۆخی ئافرەتان بەگشتی و بەشدارییان لە بوارە جیاوازەکاندا، کەچی هێشتا جیاوازیی نێوان ژن و پیاو بەگەڕانەوە بۆ سروشتییان بوونی هەیە. ئەم جیاوازیکردنە کەم تا زۆر وادەکات ئافرەتان لە ڕاپەڕاندنی هەندێ ئەرك بێبەش و دوورە پەرێز بوەستن، یان خۆیان لەو کارانە ببوورن کە تایبەت دەکرێن بە پیاوان هەروەها هەستی بەرپرسیارێتی بەرامبەر بەیەکتر لەنێوانیان دروست نەبێت. لەم توێژینەوەیەدا هەوڵدراوە تیشك بخرێتە سەر بەشێك لە جیاوازییە بایۆلۆژییەکانی هەردوو ڕەگەز، کە لەڕێگای شێوازی پێگەیاندنی خێزانی بوونەتە بنەمای جیاوازیی کۆمەڵایەتی لە نێوانیان. چوارچێوەی گشتیی ئەم توێژینەوەیە بەم شێوەیەی لای خوارەوەیە:

**یەکەم/ گرفتی توێژینەوە**

یەکەمین هەنگاوی هەر توێژینەوەیەکی زانستی بەبوونی گرفتێك دەست پێدەکات. پرسی جیاوازیی رەگەزی یەکێکە لە گرفتە کۆمەڵایەتییە کۆن و باوەکانی ئێستا، لەگەڵ ئەوەی کە مێژوویەکی هەیە لە دروستبووندا و مۆرکی بە دیاردەبوونی پێدەبەخشێت، لە هەمان کاتدا بەردەوامبوونی وەك دیاردەیەکی مێژوویی، وای کردووە ببێتە کولتوورێکی جیهانی و لە ئاست و بواری جیاواز و جۆراوجۆردا دەربکەوێت. ئەگەر لەکۆمەڵگای رۆژهەڵاتیدا پێگەیاندنی خێزانی سەرچاوەی یەکەمی دروستکردنی جیاوازیی نێوان نێر و مێ بێت، ئەوە لە کۆمەڵگا رۆژئاواییەکاندا رۆڵی خێزان بەو ئاستە کاریگەر نییە، بەڵکو جیاوازییەکە لە بوارەکانی تری کۆمەڵگا زیاتر هەستی پێدەکرێت. کەواتە لە هەردوو باردا جیاوازیی رەگەزی گرفتێکە و پێویستی بەچارەسەری هەیە، ئەمەش خۆی لە یەکسانی رەگەزی بە رووە کۆمەڵایەتییەکەی دەبینێتەوە. دەکرێت گرفتی توێژینەوەکە لەو پرسیارانە کورت بکەینەوە: بۆچی جیاوازیی بایۆلۆژی نێر و مێ کراوەتە بنەما بۆ جیاوازییان لە ژیانی کۆمەڵایەتی؟ بۆچی خێزانی کوردی لە پێگەیاندنی نێر و مێدا شێوازی جیاواز دەگرێتەبەر؟

**دووەم/ گرنگی توێژینەوە**

گرنگی ئەم توێژینەوەیە لەدوو ئاست دەردەکەوێت، یەکەم: لەسەر ئاستی تیۆری هەوڵدراوە تیشك بخرێتە سەر بابەتی جیاوازیی رەگەزی و رۆڵی جیاوازییە بایۆلۆژییەکان وەك بنەمایەك لە جیاوازیی رۆڵ و پێگە لەبەر چاو گیراوە، سەرەڕای رۆڵی پێگەیاندنی خێزانی لە دروستکردنی ئەو بارودۆخە جیاوازەدا. لەسەر ئاستی مەیدانی بەشێوەیەکی راستەوخۆ و زیندوو، بەپشت بەستن بەزانیاری لەبارەی رەوشی خێزانی کوردی سەبارەت بەم بابەتە، ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستی بەکارێکی نوێ و گرنگ دادەنرێت.

**سێیەم/ ئامانجەکانی توێژینەوە**

ئەنجامدانی ئەم توێژینەوەیە بۆ بەدیهێنانی دوو ئامانجی سەرەکییە:

١- دیاریکردنی رۆڵی جیاوازیی بایۆلۆژی نێر و مێ لە دروستکردنی جیاوازیی کۆمەڵایەتی.

٢- دەستنیشانکردنی شێوازی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتیی نێر و مێ لە خێزانی کوردیدا.

ئەم توێژینەوەیە لە دوو دەروازە پێکدێت: یەکەمیان لایەنی تیۆرییە و لەو بەشانە پێکهاتووە: بەشی یەکەم/ دیاریکردنی چەمکەکان و جیاوازیی بایۆلۆژی وەك بنەمایەك بۆ جیاوازیی کۆمەڵایەتی دەگرێتەوە، بەشی دووەم/ تایبەتە بە جیاوازیی شێوازی پێگەیاندنی نێر و مێ لەخێزانی کوردیدا. دەروازەی دووەمیان لایەنی مەیدانییە و لەو بەشانە پێکدێت: بەشی سێیەم/ چوارچێوەی میتۆدیی توێژینەوە، بەشی چوارەم/ خستنەڕوو و شیکردنەوەی زانیاری و ئەنجامەکان دەگرێتەوە جگە لە کورتەی توێژینەوەکە بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزی و پاشکۆکان.

**دەروازەی یەکەم: لایەنی تیۆری**

**بەشی یەکەم: دیاریکردنی چەمکەکان و جیاوازیی بایۆلۆژی وەك بنەمایەك بۆ جیاوازیی کۆمەڵایەتی**

**باسی یەکەم- دیاریکردنی چەمکەکان**

**یەکەم/ ڕۆڵ** Role

لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا گرنگییەکی زۆر بە چەمکی ڕۆڵ دەدرێت، چونکە پەیوەندی ڕاستەوخۆی بەلایەنی کرداری ژیانی کۆمەڵایەتی تاکەکەسەوە هەیە. واتە ڕۆڵ بەمانای لایەنی کرداری ڕەفتاری تاکەکەس دێت لە بارودۆخێکی کۆمەڵایەتیی دیاریکراودا. ڕۆڵی کۆمەڵایەتی بریتییە لە ڕەفتاری چاوەڕوانکراوی کەسێکی خاوەن پێگە، کە پێگە کۆمەڵایەتییەکە سروشتی ڕۆڵی کۆمەڵایەتی دەستنیشان دەکات[١]. واتە ڕۆڵ ئەو ڕەفتارەیە کە خەڵکی لە ئێمەی چاوەڕێ دەکەن بەهۆی لە ئەستۆگرتنی ئەرکێکی تایبەت یان داگیرکردنی پێگەیەکی دیاریکراو. کەواتە ڕۆڵ چەمکێکی (پێوەرییە) لەسەر ئەو شتانە بونیادنراوە کە چاوەڕێ دەکرێت تاکەکەس ئەنجامی بدات[٢]. ئاشکرایە تاکەکەس لەیەك کاتدا چەندین ڕۆڵی جیاواز دەگێڕێت بۆ نموونە: ئەو ئافرەتەی لەخێزاندا ڕۆڵی دایکی هەیە لە دەرەوە ڕۆڵی مامۆستا، فەرمانبەر... دەبینێ. کەواتە بەجیاوازی ئەرك و پێگەکان، ڕۆڵەکانیش جیاواز دەبن. پێناسەی ئیجرائی ڕۆڵ بریتییە لەو پرۆسە

کۆمەڵایەتییەی کە خێزانی کوردی پێی هەڵدەستێت لە رێگای پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی ئەندامەکانی، بەمەبەستی گونجاندنی کەسایەتییان لەگەڵ ژینگەی دەوروبەر.

**دووەم/ پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی** Socialization

مەبەست لە پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی، بەکۆمەڵایەتیبوونی تاکەکەسە. ئەم پرۆسەیە گشت هەوڵ، چالاکی و ئامرازە گرووپی و تاکەکەسییەکان دەگرێتەوە، کە کاردەکەن لەسەر گۆڕینی بوونەوەر لە بایۆلۆژییەوە بۆ کۆمەڵایەتی[٣]. تاك دوای لەدایکبوون و بەر لەوەش بە دوو قۆناغی پێگەیاندنی جیاوازدا رەت دەبێت، کە بریتین لە پێگەیاندنی راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بەهۆیەوە ئاشنا دەبێت بە بەها، کولتوور و ئاکارە کۆمەڵایەتییە باوەکانی کۆمەڵگاکەی. کەواتە ئەو پرۆسەیە کە تیایدا کولتوور لە نەوەیەکەوە دەگوازرێتەوە بۆ نەوەیەکی دی، ئەو رێگایەیە کە تاکەکان هەر لە منداڵییەوە تیایدا دروست دەبن تابتوانن لەو کۆمەڵگایە بژین کە خاوەن کولتوورێکی دیاریکراوە، لەوەشدا خێزان، قوتابخانە و کۆمەڵگا، تاك تەلقین دەکەن بە زمان، ئایین، نەریت، بەها، زانیاری و کارامەیی و تد..[٤]. یەکێك لەگرنگترین جۆرەکانی بەکۆمەڵایەتیبوون فێربوونە لەپاڵیشیدا پێگەیشتنی کۆمەڵایەتی روودەدات، کە تیایدا تاك لەهەر قۆناغ و هەلومەرجێکی کۆمەڵایەتی بێت کۆمەڵێك رۆڵی کولتووری پەسندکراو وەردەگرێت و فێریان دەبێت[٥]. بۆیە ئەم پرۆسەیە تایبەت نییە بە تەمەنێکی دیاریکراو، بەڵکو لە هەر قۆناغە تەمەنێکدا جۆرە بەکۆمەڵایەتیبوونێکی جیاواز هەیە. پێناسەی ئیجرائی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی بریتییە لە پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیکردنی تاکی کوردی لەرێگای خێزان و دامەزراوەکانی دیکە بۆ فێربوون و گونجان لەگەڵ بەها، نۆڕم و توخمە کولتوورییەکان کە کۆمەڵگا لەسەری رێککەوتووە.

**سێیەم/ خێزان** Family

خێزان سەرەکیترین یەکەی کۆمەڵایەتییە کە کۆمەڵگای لەسەر بونیاد نراوە. سەبارەت بە وشەی خێزان بۆچوونێك هەیە کە وشەی (Family) لە بنەڕەتدا لاتینییە و لە وشەی ( Familia) وەرگیراوە و بەمانای ژمارەی ئەو کۆیلانە دێت کە پیاوێك خاوەنییەتی[٦]. بەڕای (ئۆگبرن و نیمکۆف) خێزان رێکخراوێکی

بەردەوامە و  لە ژن، مێرد و منداڵەکان پێکدێت یان بەتەنها لە پیاو و ئافرەتێك پێکدێت لەگەڵ پێویستێتی بوونی منداڵ[٧]. واتە خێزان ڕێکخراوێکی کۆمەڵایەتییە لەو کەسانە پێکدێت کە پەیوەندی خوێنی، ڕۆحی و ئەخلاقی کۆیان دەکاتەوە لەڕێگای ئەو پەیوەندی و کارلێکە کۆمەڵایەتییانەی کە لەنێوانیاندا ڕوودەدات هەروەها ئەو ڕۆڵ، ئەرك، ماف و بەرپرسیارێتییانەش دەستنیشان دەکات کە پێویستە لەسەر ئەندامەکانی پابەندبن پێوەی. هەروەك کۆمەڵناسی فەڕەنسی (ئەمیل دۆرکهایم) جەختی لێدەکاتەوە کە پێی وایە دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتییە و بۆ هۆکاری کۆمەڵایەتی دروست بووە، ئەندامەکانی بە ژمارەیەك ئەرك و ماف بەیەکەوە بەستراونەتەوە [٨]. پێناسەی ئیجرائی بۆ خێزان بریتییە لەو یەکە کۆمەڵایەتییەی کە تاکی کوردی لەڕێگای پرۆسەی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتییەوە فێری بەرپرسیارێتی، ڕۆڵ، ئەرك، ماف و  پابەندییەکان دەکات و بنەما ڕەفتاری و ئەخلاقییەکانی کۆمەڵگای پێدەدات.

**چوارەم/ جیاوازیی ڕەگەزی**   Gender difference

مەبەست لە وشەی ڕەگەز جۆری مرۆییە، کە نێر و مێ دەگرێتەوە. نێر و مێ هاوبەشن لە خەسڵەتە هاوبەشەکان، لەگەڵ ئەوەشدا نێر وەك مێ نییە ((ولیس الذکر کالانثی))[٩] هەروەك لە قورئاندا جەختی لێکراوەتەوە هەر یەکێکیان خاوەن خەسڵەت و جیاکەرەوەی تایبەتە و پێکهاتەی ئەندامی و ئەرکەکانی جیایە لەوی دی [١٠]. مەبەست لە جیاوازیی ڕەگەزی، جیاوازییە کۆمەڵایەتییەکانە کە دروستکراوی مێژووی مرۆڤایەتی، بارودۆخی کۆمەڵایەتی، ئابووری، سیاسی و سروشتی پێکهاتەی هەردوو ڕەگەزە. لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە ڕەگەز بریتییە لە مانای لێکدراوی پەیوەست بە مێبوون یان نێربوون، ئەم لێکدانەوەیەش لە تاکێك بۆ یەکێکی دی و لەکۆمەڵێك بۆ یەکێکی دی دەگۆڕڕێت[١١]. جیاوازیی ڕەگەزی بەو مانایە نزیك دەبێتەوە لە چەمکی جیاوازیی کۆمەڵایەتی، کە بریتییە لە جیاوازیی نێوان نێر و مێ، بەهۆی باڵادەستی ڕەگەزێك و پەسندکردنی تاك نەسەبی بەسەر ڕەگەزەکەی تر، کە ئافرەتە، سەری هەڵداوە[١٢]. کەواتە جیاوازی لەسەر بنەمای ڕەگەز سەرەڕای هۆکارە بایۆلۆژییەکان، بەرهەمی کۆمەڵگا و بارودۆخێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراوە، کە وای کردووە ڕەگەزێك لە بەرامبەر باڵادەستیی

ڕەگەزێکی دیدا لەهەندێ ئەرك و ماف بێبەش بێت. پێناسەی ئیجرائی بۆ جیاوازیی ڕەگەزی بریتییە لەو هەڵوێست یان بارودۆخە ناهاوتایەی، کە تیایدا نێر و مێ لە ململانێدان لە پێناو بەشداریکردنی ژیانی کۆمەڵایەتی، لەو بارودۆخەشدا باڵادەستیی پیاو لەبەرامبەر نزمی پێگە و دەسەڵاتی ئافرەت کە دروستکراوی کۆمەڵگایە، ڕەنگی داوەتەوە.

**باسی دووەم – جیاوازیی بایۆلۆژی وەك بنەمایەك بۆ جیاوازیی کۆمەڵایەتی**

ئاشکرایە نێر و مێ لە ڕووی بایۆلۆژییەوە خاوەن دوو سروشتی جیاوازن، بەهۆی جیاوازی هەندێ ئەرکی فسیۆلۆژی، واتە لەشێوەی دروستکردن و ڕۆڵە بایۆلۆژییەکاندا جیاوازن، بەڵام لەبووندا یەکسانن، هەروەك لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە (اتقوا ربکم الذي خلقکم من نفس واحدة)[١٣]. ئەگەرچی قسەکردن و لێکۆڵینەوە لەبابەتی جیاوازیی ڕەگەزی– کۆمەڵایەتی، باسکردنی جیاوازییە بایۆلۆژییەکان ناگرێتەوە، بەڵام بەهۆی کاریگەرییان لەسەر دروستبوونی تێڕوانینی جیاواز بۆ هەردوو ڕەگەز و دواجار جیاوازی لە ڕۆڵی کۆمەڵایەتی، پێگە و دابەشکردنی کار لەنێوانیان، وادەکات ئاماژەدان بەهەندێ جیاوازی لەپێکهاتەی جەستەیی نێر و مێ پێویست بێت.

لێکۆڵینەوە دەروونناسییە ئەزموونکارییەکان، ئاماژە بەبوونی کۆمەڵێك جیاوازیی بایۆلۆژی دەکەن لەنێوان نێر و مێ هەر لەسەرەتای لەدایکبوونەوە. بۆنموونە (گارای و شاینفلد) لێکۆڵینەوەیەکیان لەسەر ژمارەیەك منداڵی تەمەن چواردە مانگی ئەنجامداوە ، سەبارەت بە مەیلیان بۆ وروژێنەرە بینراو و بیستراوەکان، دەرکەوت کوڕان زیاتر بە وروژێنەرە بینراوەکان بەئاگادێنەوە، بەڵام کچان بۆ وروژێنەرە بیستراوەکان بە ئاگاترن، بۆی هەیە گرنگیدانی کچ بە دەنگ پەیوەندیی زۆری هەبێت بە گرنگیپێدانی مێینە بەخەڵکی وەك خەسڵەتێکی بایۆلۆژی[١٤]. بۆنموونە گرنگیدانی دایك بە پەروەردە و بەخێوکردنی منداڵ ئەم ڕاستییە دەسەلمێنێت. کەواتە کچان گرنگی بەوە دەدەن کە دەیبیستن زیاتر لەوەی کە دەیبینن، بەپێچەوانەی کوڕان، دەکرێت ئەمەش هۆیەك بێت لەوەی کە کچان زووتر فێری زمانی قسەکردن دەبن. سەبارەت بە گوزارشتەکانی هەست و

روخسـار مـێ بـەوە جیادەکرێنـەوە کـە بـەتواناترن لـە شـرۆڤەکردنی گوزارشـتی روخسـار (زمـانی جەسـتە). سـەبارەت بـە لایـەنی عـەقڵی بـە بۆچـوونی هەنـدێ دەروونـاس جیـاوازیی توانـای عـەقڵی لـەنێوان هـەردوو رەگـەز دەگەڕێتـەوە بـۆ جیـاوازیی پێکهاتـەی مێشـك و قەبارەکـەی، بـەڵام لـە واقیعـدا زیرەکـی و توانـا عەقڵییەکان بەتەنها پشت بە قەبارە و کێشی مێشك نابەستن، بەڵکو دەکەونە ژێـر کاریگەریی ژینگەی دەوروبەر. دەکرێت قەبارەی مێشك گـەورەبێت، بـەڵام ژینگـە بـواری گەشـەکردنی ئاسـایی و تـەواوی پـێ نـەدات[15]. زانسـتی نـوێش نـەبوونی جیـاوازی لـە گەشـەی عـەقڵی نێـر و مـێ دەرخسـتووە، کەواتـە ئـەوە شـێوازی پـەروەردە و بـارودۆخی کۆمەڵگایـە جیاوازییـەکان دروست دەکـات. جگـە لەوانـە رەگەزی مێ بەسۆزدار و نێریش بە بابەتی و لۆژیکی وەسف دەکرێت. واتـە پیـاو لە رووبەڕوو بوونەوەی هەڵوێستەکاندا پشت بە بیرکردنەوە و ئافرەتیش پشـت بـە هەستەکان دەبەستن، لەکاتێکدا دەستکەوتە عەقڵییەکانی ئـافرەتی سـەردەم ئـەو بۆچـوونە دەخاتـە ژێـر پرسـیارەوە و گومـان لـە بـوونی جیـاوازیی لـە رەفتـاری سۆزداری و عەقڵی لەنێوانیان دەکرێت. کەواتە جیاوازییەکە لەوەدانییە، کە پیاوان عـاقڵترن و بیردەکەنـەوە و ئافرەتـانیش پشـت بەهەسـت دەبەسـتن، بـەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ئاستی ئازادییەی کە بە هـەردوولایان دراوە بـۆ گوزارشـتکردن لە توانا و بۆچوونەکانیان بەدرێژایی مێژوو[16].

ئەوەی جێگای ئاماژەپێدانە، جیاوازییە بایۆلۆژییەکانی نێر و مـێ کاریگـەری هەبووە لە دروستکردنی جیاوازیی کۆمەڵایەتی. زۆربەی بیروڕاکان دەچـنەوە سـەر ئەو بۆچوونەی، کـە جیاوازییـەکانی نێـوان هـەردوو رەگـەز بریتییـە لـە جیاوازییـە کولتوورییەکان، کە ئەزموونێکی مرۆیی دوور و درێژ پاڵپشتی کردووە[17]. تەنانەت دەروونناسی ئەزموونکاری گەیشتە ئـەو راسـتییەی، کـە جیـاوازیی نێـوان هـەردوو رەگـەز لـە قۆنـاغی زوو و لـە تەمـەنی داینگـا، دروسـتکراوی جیاوازییـە کۆمەڵایەتییەکانـە، واتـە ئـەو تایبەتمەندییانـەی کۆمـەڵگا دەیبەخشـێتە هـەردوو رەگـەز[18]. جیاوازییـە بایۆلۆژییـەکان بەڕادەیـەك کاریگـەری خسـتۆتە سـەر رۆڵ، پێگـە و کەسـایەتی مـێ، کـە زانـا و لێکۆڵـەرەوانیش لـە بۆچـوونەکانیاندا لـەو کاریگەرییـە بەدەرنـەبوون. (ئەلێکسـیس کـارل) پێـی وایـە پێویسـتە کچـانیش

رۆشنبیری عەقڵی، شێوازی ژیان و نموونە باڵاکانیان پێبدرێت هەروەك چۆن بەكوڕان دەدرێت، بەڵام دەبێ بەخێوکەران و پەروەردەکاران جیاوازییە ئەندامی، دەروونی و رۆڵە بایۆلۆژییەکانی نێوانیان لەبەرچاو بگرن. بۆیە زانایان (هوکسلی و هادون) پێیان وایە جیاوازی نێوان هەردوو رەگەز بەپلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ پەروەردە[19]. لێرەوە بەو راستییە دەگەین کە لەپێدانی ئەرك و گێڕانی رۆڵەکان، جیاوازییە بایۆلۆژییەکان لەبەرچاو گیراوە، لەوەشدا شێوازی پەروەردە و پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی هۆکار بووە. فەیلەسووف و بیریاران بۆچوونی جیاوازیان هەیە دەربارەی جیاوازیی رەگەزی و کاریگەریی بایۆلۆژی بەسەر ئەو جیاوازییەدا. هەریەکە لە (سوقرات، ئەفلاتوون و ئەرستۆ) لەگەڵ (لۆك) دا یەك دەگرنەوە، کە دەڵێت ((سروشت جیاوازی نێوان ژن و پیاوی دروست کردووە و پیاوی کردۆتە باڵادەست، نەوەك عورف و داب و نەریت وەکو ئەوەی سۆفیستەکان پێیان وابوو))[20]. (بروکا) ی ئەنترۆپۆلۆژیست پێی وابوو ئافرەت ئیدراکی لە پیاو کەمترە، کە لەوەدا هاوڕایە لەگەڵ (داروین)[21]. ئەمانە لە بۆچوونەکانیاندا سروشت بەهۆکاری جیاوازییەکان دادەنێن، بەپێچەوانەی (مارکس) کە پێی وایە ژێردەستەیی و پاشکۆیی ئافرەت لە سروشت و پێکهاتە بایۆلۆژییەکەی سەرچاوە ناگرێت کە نەگۆڕن، بەڵکو بەرهەمی ئەو میکانیزمە کۆمەڵایەتییەیە کە مێژوو و پێشینەیەکی ئاشکرا و دیاریان هەیە و شیاوی گۆڕانن[22]. (مل) یش، پێی وایە ئەو کەلەپوورەی حوکمی پەیوەندی نێوان نێر و مێ دەکات، کەلەپوورێکی دواکەوتووە و دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی هێزی جەستەیی[23]. هێزی جەستە لەکۆندا پێوەری مرۆڤبوون و ئازادییەکان بوو، لەوەدا رەگەزی نێر بەهۆی پێکهاتە جەستەییەکەی پلەی یەکەمی بەرکەوت لە ئازادی، رۆڵ، پێگەی باڵا و موڵکدارییەتی لەبەرامبەردا رەگەزی مێ بەهۆی پێکهاتە بایۆلۆژییەکەیەوە لەو مافانە بێبەش کرا. کەواتە هەر لەسەردەمانی زووەوە لەنێو کایەکانی کارکردن و رۆڵبینیندا هێزی جەستەیی کاریگەری هەبووە لەسەر تێڕوانین لە تواناکانی مێ. بۆیە ئەگەر جیاوازیی رەگەزی بەرهەمی بارودۆخێکی کۆمەڵایەتی بێت، ئەوە پێویستە گۆڕانی بەسەر دابێت، لێرەوە چەمکێکی دی دێتە پێشەوە کە بریتییە لە یەکسانیی رەگەزی، واتە رەخساندنی دەرفەتی

یەکسـان بـۆ نێـر و مـێ لـە راپەڕانـدنی ئەرکـە کۆمەڵایەتییـەکان و گەشـەپێدانی کۆمەڵگا.

(قەدیس ئۆگستینۆس) بۆچوونێکی دەربارەی یەکسانی نێرومێ هەیە و پێـی وایە ئەگەر خودا مەبەستی بوایە ئافرەت حوکمی پیاو بکات، ئەوە لەسەری ئـادەم دروسـتی دەکـرد و ئەگـەر مەبەستیشـی بـەدیلکردنی بوایـە، ئـەوە لـە پێیـەکانی دروستی دەکرد، بەڵکو لە پەلـەکانی دروسـتی کـردووە تـا هاوبەشـی پیـاو بێـت و یەکسان بێت لەگـەڵی[٢٤]. ئەگەرچـی ئـەو بۆچـوونە بـەو مانایـەش دێـت، کـە پیـاو رەگەزی سەرەکییە و ژن لەو دروست کراوە، بەڵام مەبەستی ئێمە لـەو بۆچـوونە جەختکردنەوەیەتی لە یەکسانی و هاوبەشـبوونی نێـر و مـێ، بـەبێ ئامـاژەدان بـە جیاوازییە بایۆلۆژییەکانی نێوانیان، لەکاتێکدا فەیلەسـووفەکانی وەك (ئـەفلاتوون و سـوقرات) بـۆ نەهێشـتنی جیاوازییـەکانی نێـوان هـەردوو رەگـەز و هێنانـەدی یەکسانی، دابڕانـی ئـافرەت لـە جەسـتە و سروشـتی مێینـەیی (وەچەخسـتنەوە و سۆزی دایکایەتی) بەچارەسەری گونجاو دەبینن[*]. واتە بۆ ئەوەی ئـافرەت بگاتـە پلە و پێگەی پیاو، دەبێ واز لە سروشتی مێینەیی خـۆی بهێنـێ، لەکاتێکدا ئەمـە لەگەڵ واقیعدا یەك ناگرێتەوە، چونکە هیچ کات سروشتی مێینـەیی رێگـر نـەبووە لـە رۆڵبینینـی ئـافرەت لـە دەرەوەی خێـزان، چـونکە بەتوانایـە لـە دروسـتکردنی هاوسـەنگی لـەنێوان رۆڵـە جیاوازەکـانی، بـەڵکو ئـەوە تێڕوانینـی کۆمەڵگایـە بەپاسـاوی هۆکـاری بـایۆلۆژی لـە هێـز و کاراییەکـەی کـەم دەکاتـەوە. کەواتـە جیاوازییە بایۆلۆژییەکان نابێ بکرێنە بنەمایەك بۆ دروستکردنی جیاوازی لـەنێوان نێر و مێ لەژیانی کۆمەڵایەتییاندا.

بۆگەیشتن بەیەکسانی کۆمەڵایەتی–رەگەزی، پێویستە هەردوو رەگەز دان بـەبوونی یـەکتر و پێویسـتبوونی هەریەکـەیان بۆئـەوی دی بنـێن، چـونکە ژیـانی کۆمەڵایەتی پێویستی بەئامادەبوونی هەردووکیان هەیە و هیچ کامیـان بـێ ئـەوی دی ناتوانێت ئەرکە کۆمەڵایـەتی و بایۆلۆژییـەکانی تـەواو بکـات. (غانـدی) دەڵێـت ((بۆچوونی سـەرەکی بریتییـە لـەوەی رۆحـی پیـاو و رۆحـی ژن لەیـەکتر دەچـن، هـەردووك هـەمان سـۆزیان هەیـە، هـەردووکیان یـەکتر تـەواو دەکـەن و یـەکێکیان ناتوانێت بێ ئەوی تر بژیێت لەژیانی کارکردن و خزمەتدا.))[٢٥]. بۆ ئەوەی بەهەڵە

لە یەکسـانی ڕەگـەزی تێنەگـەین (جیهـان و سیڤینوشـن) وایـان پـێ باشـترە، کـە بەرگریکردن لە یەکسانی بریتی نەبێت لە لێکچوون، بـەڵکو وەك بـەها و ڕێزگرتنـی یەکسـان، دادپـەروەری و راسـتی لـەنێوان هـەردوو ڕەگـەز بێـت، کـە بیرمەنـدی فیمینیستی (ڤیت جیرهارد) ئەم بیرۆکەیەی بەزمانی بیرکـاری دەربڕیـوە لـەکتێبی (یەکسـانی بــەبێ لێکچــوون– ١٩٩٠) بــەم شــێوەیە: لێکچــوون بریتییــە لــە (ئـەلف)=(ئـەلف)، لەکاتێکـدا یەکسـانی بریتییـە لـە (ئـەلف)=(بـێ)[٢٦]. ئـەو بارودۆخەی کـە بـاس کـرا کۆمـەڵگای کـوردی لێـی بەدەرنییـە، چـونکە تێڕوانینـی عـەقڵی کـۆ بـۆ ئـافرەت لـە پێکهاتـەی بایۆلۆژییـەوە سەرچـاوەی گرتـووە. واتـە بوونێکە بەپێی مێبوونی تێڕوانینی بۆ دەکرێت. ئەگەرچی کەم تـا زۆر توانیویـەتی بەسەر ئەو گرفت و بەربەستانە زاڵ بێت، کە تێڕوانینـی کۆمەڵایـەتی لـە خێـزان و کۆمەڵگا بۆی دروست کردووە، بەڵام سەرەڕای هەموو هەوڵەکانیشـی لـەبارودۆخی گشتیدا هەروەك لەو پەندە کوردییەدا ڕەنگی داوەتەوە (ژن، ژنە و پیـاویش پیـاو) لە لێکدانەوەی ناوەڕۆکەکەی دەگەینە ئـەو ئەنجامـەی، کـە ئـیتر پێویسـت ناکـات ئافرەت خۆی لە قەرەی بابەت و کارێك بـدات کـە پیـاو ئـەنجامی دەدات، چـونکە تێڕوانین و تێگەیشتنی بـاو بـۆ تواناکـانی ئـافرەت مـەودای بەشـدارییپێکردنی و هەوڵدان بۆ یەکسانی و نەهێشتنی جیاوازییەکان بەرتەسك دەکاتەوە.

**بەشی دووەم: جیاوازیی شێوازی پێگەیاندنی نێر و مێ لە خێزانی کوردیدا**

خێـزان کاریگـەرترین یەکـەی کۆمەڵایەتییـە لـە بونیادنـانی کەسـایەتی تـاك، بەهۆی ئەو ڕۆڵە گرنگەی دەیگێڕێت لە پەروەردە و پێگەیاندن، کە ڕاستەوخۆ ئـەو تاکـە دوای لـەدایکبوونی تیایـدا فێـری بـەها، داب و نـەریت، شـێوازی ڕەفتـار و هەڵسوکەوت نواندن، زانیاری، شـارەزایی و کولتـووری کۆمەڵگاکـەی دەبێـت. بـەو هۆیەوە دایـك ڕۆڵێکـی مـەزن و گـرنگ دەبینێـت لـە پـەروەردەکردنی منداڵەکـەی، سەرکەوتنی کەسایەتی هەر تاکێکیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پەروەردەیەی کـەخێزان پێی هەڵدەستێت. ئەگـەر شـێوازی پێگەیاندنەکـە ئـەرێنی و دروسـت بێـت، ئـەوە کەسـایەتییەکی تەندروسـت لـە ڕووی کۆمەڵایـەتی و دەروونییـەوە بەرهـەم دێـت، پێچەوانەی ئەوەش ڕاستە. لە کۆمەڵگا هاوچەرخ و ئاڵۆزەکاندا خێزان بەتەنها بـەو

ئەرکــە هەڵناســتێت، بــەڵکو لەپاڵیــدا دامــەزراوەی دیکــە ڕۆڵ دەبیــنن وەکــو: قوتابخانە، گرووپی کار، ڕاگەیاندن و تد..، ئەو دامەزراوانـە دەکـرێ یارمەتیـدەری باشـبن لـە هـەمان کاتیشـدا بـۆی هەیـە ئـەرکی خێـزان زەحمـەتتر بکـەن بـەهۆی جیاوازیی شێوازی پێگەیاندنیان. بەرپرسیارێتی خێزان بریتییە لەوەی ئەندامەکانی بەشێوەیەکی یەکسان بە پرۆسەی پەروەردە و پێگەیاندنی دەروونی و کۆمەڵایەتی دروسـتدا ببـات. واتـە جیـاوازیی نـەکردن لـە شـێوازی پێگەیانـدنی نێـر و مـێ بەتایبەتیش لە بابەتی مـاف و ئەرکدا، بـۆ ئـەوەی نەبنـە خـاوەن دوو کەسـایەتی جیاواز لە ڕووی کۆمەڵایەتی و دەروونییەوە. دیارە مەبەست ئەوە نییە تاکـەکان یەك جۆر کەسایەتییان هەبێت، چـونکە هـەر تاکێـك خـاوەنی کۆمـەڵێك خەسـڵەتی تایبەتـە کـە جیـای دەکاتـەوە لـەوانی دیکـە، بـەڵکو دروسـتنەبوونی کەسـایەتی جیاواز، واتە ڕێگرتن لە دروستبوونی ئەو خەسڵەتانەی کـە تێڕوانینـی کۆمەڵایـەتی کۆمەڵگا بەهەردوو ڕەگەزی بەخشیوە.

دەکرێـت هۆکـاری دروسـتبوونی جیاکـاری لـە پێگەیاندنـدا بگەڕێتـەوە بـۆ خەسڵەتەکانی خێزان. ئایا تایبەتمەندی و خەسڵەتەکانی خێزانی کوردی چییە، کە بەبەشـێك یـان درێـژکراوەی هـەمان خەسـڵەتی خێزانـی عێراقـی دادەنرێـت؟ لـە دیارترین خەسڵەتەکانی خێزانی عێراقی ئەو دەسەڵاتە ڕەهایەیە کـە ڕەگـەزی نێـر ومارەسەی دەکات لەخێزاندا و نەبوونی یەکسانی کۆمەڵایەتییـە لـەنێوان هـەردوو ڕەگەز. بەو شـێوەیە بـاوك یـان سـەرۆکی خێـزان کـۆنترۆڵی تـەواوی کاروبارەکـان دەکـات و بەتـەنها بڕیـارە پەیوەسـتەکان بـەداهاتووی خێـزان دەردەکـات، دایـك دەرفەتی ڕێکخستنی کارەکان و بڕیاردانی گرنگی خێزانی پـێ نادرێـت[٢٧]. هـەمان ئەو بارودۆخە لـەخێزانی کوردیشـدا بەرچـاو دەکـەوێت، تەنانـەت ئەگـەر لەهەنـدێ خێزاندا دەسەڵاتی پیاو نیمچە ڕەهاش بێت، ئەوە لەبوونی ئەو ڕاستییەی سەرەوە کـەم ناکاتــەوە. بابــەتی ســەرەکی ئــەم بەشــە لێــرەوە دەســت پێــدەکات کــاتێ دەسەڵات و بڕیار لەدەسـت ڕەگـەزێك بێـت و ڕەگەزەکـەی دی لێـی بێبـەش بێـت، ئەمە بۆ خۆی سەرچاوەیەکی سەرەکیی دروستکردنی جیاوازی دەبێت لە شـێوازی پێگەیانـدن و پـەروەردەی نێـر و مـێ، کـە خێـزان پێـی هەڵدەسـتێ و دایـك ڕۆڵـی سـەرەکی تێـدا دەبینـێ. دەبیـنین دایـك کچ و کوڕەکـانی بەشـێوەیەکی جیـاواز

پەروەردە دەکات، کە گونجاو بێت لەگەڵ ڕۆڵە بایۆلۆژییەکانی هەریەکەیان بەبێ گوێدانە ژیانی کۆمەڵایەتی هاوبەشیی نێوانیان، ئەم جیاکارییە کاردانەوە لەسەر کەسایەتی هەردوو ڕەگەز جێ دێڵێ کە لە داهاتوودا دەبنە خاوەن دوو کەسایەتی جیاواز لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە. لە خێزانی ڕۆژهەڵاتیدا منداڵ لەسەر بنەمای مرۆڤبوون گرنگی پێ نادرێت، بەڵکو جۆری ڕەگەزی ئاست و ڕێژەی ئەو گرنگیپێدانە دەستنیشان دەکات.

شێوازی پێگەیاندنی کچ و کوڕ بەو ڕادەیە جیاوازە، کوڕ ناتوانێت بڕوا و متمانە بە خوشکی بکات و وێنای ئەوە بکات کە یەکسانە بەو[٢٨]. بەهۆی ئەو خەسڵەتە باوانەی کە خێزان و کۆمەڵگا بەهەریەکە لە نێر و مێی بەخشیوە، ئەوە کوڕ لە کولتووری تەقلیدیدا مانای هێز، دەستبەسەرداگرتن، کۆنترۆڵکردن و سەرۆکایەتی دەبەخشێت، بەڵام کچ واتە لاوازی، ملکەچی، پەرستن و دەستەمۆبوون[٢٩]. ئەو خەسڵەتە بەرزانەی لە کوڕدا کورتکراوەتەوە وای کردووە کۆمەڵگا ڕێزی لێبگرێت و بەرپرسیارێتی گەورە و مەترسیداری پێ بسپێرێت، کە گونجاوە لەگەڵ ناوبانگی ئەو لەخێزان و کۆمەڵگادا[٣٠]. بەرزیی پێگە و ڕۆڵی کوڕ وای کردووە ببێتە ڕەگەزێکی پەسندکراو و خوازراو، تەنانەت لەلای مێینەش زۆرجار خۆزگەی نێربوون دەخوازرێ. بۆنموونە هەندێ کچ لەتەمەنی منداڵی و بەتایبەتیش هەرزەکاری لە شێوازی ڕەفتار، جلوبەرگ و قژدا لاسایی کوڕ دەکەنەوە. دەکرێ ئەم جۆرە ڕەفتارە بگەڕێنینەوە بۆ دوو هۆکار یەکەمیان: لە بیری کچدا ئەو لاساییکردنەوەیە هەمان ڕۆڵ و پێگەی کوڕی پێ دەبەخشێت، کە ئەو لێی بێبەشە. دووەمیان: شاردنەوەی هەست و سۆزی مێینەیی بۆ ڕەگەزی بەرامبەر لەژێر دەمامکی خۆ بەکوڕکردندا، کچ دوور دەخاتەوە لە چاودێری و کۆنترۆڵی خێزان بەتایبەتیش باوك و برا.

دەکرێت جیاوازییەکانی نێوان نێر و مێ لە هەندێ ڕەفتاری سادەی نێو خێزان تێبینی بکرێت. بۆنموونە لە هەڵبژاردنی جۆری ڕەنگی جلوبەرگ، دایك و باوك بە ئارەزووی خۆیان کامە ڕەنگیان لەلا جوان بێت بۆ منداڵەکانیان هەڵیدەبژێرن بەبێ گوێدانە حەزیان، بۆیە دەبینین ڕەنگەکان لە نێوان هەردوو ڕەگەز دابەش کراوە، مێ ڕەنگە کراوەکان لەبەر دەکات، لەکاتێکدا ڕەنگە

تاریکەکان تایبەت کراوە بە نێر. ئەم دابەشکردن و جیاکردنەوەیە بۆ رەنگەکان لە تەمەنی منداڵییەوە تا گەورەبوون کاریگەری خۆی جێ هێشتووە لەسەر تێڕوانینی خێزان و کۆمەڵگا بۆ رەنگ و جۆری رەگەز. دەکرێ لەتەمەنی منداڵیدا جاروبار هەندێ لە رەنگەکان لەلایەن هەردوو رەگەزەوە بەکار بێت وەك شینی کاڵ، زەرد، سەوز و سوور، تەنانەت لە تەمەنی لاوێتیشدا هەندێ جار ئەو جیاکردنەوەی رەنگە رۆڵ ناگێڕێت، بەلام لەتەمەنی گەورەییدا زۆر بەدەگمەن دەبینرێت پیاوێك کراسێکی سوور یان پەمەیی لەبەر بکات، چونکە بەرەنگی پیاوانە دانانرێت لە تێڕوانینی خەڵکیدا. لە لایەکی دیکەوە جۆری ئەو کەلوپەلانەی بۆ یاریکردنی منداڵان بەکاردێت جیاکراوەتەوە. (ئیلینا جیانینی بیلۆتی) ئاماژە بۆ جیاوازی شێوەی ئەو یارییانە دەکات کە بۆ کچ و کوڕ دەکڕدرێت لەلایەن خێزانەوە، پێی وایە بۆ کچ گوڵ، بووکەڵە، ئاژەڵە پەڕۆینەکانی وەك: مریشك، مراوی و تد.. دەکڕدرێت، بەلام بۆ کوڕ ئەو کەلوپەلانەی کە لەداهاتوودا بەکاری دێنێت وەك: کەشتی، ئۆتۆمبێل، فڕۆکە، چەك، ئەسپ و تد..[٣١]. زۆرجار رێگا بە کچ دەدرێت، یاری بەو کەلوپەلانە بکات کە بۆ کوڕ دانراون لەوانە: پایسکیل، ئۆتۆمبێل، تۆپ، بەلام نابینرێت کوڕ یاری بە بووکەڵە بکات، چونکە یارییەکی کچانەیە. لە هەڵبژاردن و دیاریکردنی ئەو یارییانە لەلایەن خێزانەوە بەئاگایی بێت یان بێ ئاگا، گرنگی بەمانای ناوەڕۆکی یارییەکان دەدرێت، کە گونجاوە لەگەڵ مانا کۆمەلایەتییەکەی. بۆنموونە کڕینی بووکەڵە بۆ کچ مانای رۆڵی دایك دەبەخشێت، کە لە داهاتوودا دەبێ بەو ئەرکە هەڵبستێ، بەلام کڕینی ئۆتۆمبێل بۆ کوڕ مانای راپەڕاندنی ئەرکەکانی دەرەوەی خێزان دەبەخشێت.

جگە لەمانەی سەرەوە لەخێزاندا سنووری هەڵسوکەوت و شێوازی قسەکردنی کچ بەرتەسك کراوەتەوە، هەمیشە تێبینی و ئامۆژگارییەکانی دایك و باوك بۆ کچ ئەوەیە، کە پێویستە بەدەنگێکی نزم بدوێت و لە قەرەباڵغیدا پاڵ نەکەوێت و هەڵبەزودابەز نەکات، بەلام بۆ کوڕ دەنگی بەرز مانای بوێری، خۆسەلماندن و کۆنترۆڵکردن دەگەیەنێت، ئەوە جگەلەو ئازادییەی لەئەنجامدانی رەفتار پێی دراوە. تەنانەت زمانی گفتوگۆی دایك و باوك لەگەڵ کچ و کوڕ جیاوازە. ئەم جیاکارییە لە هەڵسوکەوتدا وادەکات کچ لە داهاتوودا کەسایەتییەکی

بێ بڕوا و شەرمنی هەبێت، ئەمەش کاریگەری لەسەر رۆڵ و ئەرکەکانی دەبێت و ناتوانێت هەموو بەرپرسیارێتییەك وەربگرێت، لەبەرئەوە جیاوازی لەنێوان خۆیی و رەگەزی بەرامبەر دروست دەبێت. ئەم جیاوازییە وای کردووە نێر و مێ لەتەمەنی پێگەیشتوویش لە بیرکردنەوە و بڕیارداندا جیاواز بن. بۆنموونە لە هەڵبژاردنی هاوسەردا کوڕ دەتوانێ داوای هاوسەرگیری بکات، بەلام داب و نەریت رێگە بە کچ نادات ئەو داوایە بکات. دەکرێ هەندێ جار کچ لەلای دایکی ئەو باسە بدرکێنێت، بەلام لێرەدا دووبارە شێوازی پەروەردەی خێزانی رۆڵی هەیە، ئەگەر دایك نەتوانێت هاوڕێی کچەکەی بێت، کچیش ناتوانێت متمانە بەدایکی بکات بۆ پشتگیری لەهەڵبژاردن و بڕیاردانی هاوسەرگیری.

کەواتە جیاوازییە کۆمەلایەتییەکانی نێوان نێر و مێ شێوازی پێگەیاندنی خێزانی دروستی دەکات، چونکە کاتێ تاك لەدایك دەبێت هیچ شتێك دەربارەی جۆری رەگەزی نازانێت، بە جیاوازییە بایۆلۆژییەکانیشەوە، بەڵکو بەخێوکەرانن نێر لە مێ جیادەکەنەوە. بۆیە بێبەشکردنی رەگەزی مێ لە هەندێك ماف و ئەرك بەهۆی واقیعی مێبوونی، تاوانێکە و هەڵەی خێزان و کۆمەڵگاش لەوەدایە، کە بە پێی ئەزموونی کەسی بڕیار لەسەر هێز و توانای نێر و مێ نادات، بەڵکو هەر لە سەرەتای لەدایکبوونیانەوە تێڕوانینی کۆمەلایەتیی باو رۆڵ و پێگەی کۆمەلایەتی دیاریکراویان پێدەبەخشێت. بۆ گۆڕینی ئەو بارودۆخە دروستکراوە پێویستمان بە گۆڕانکاری لەبیرکردنەوەی عەقڵی باو هەیە، بەوەی مێ بەرلەوەی بوونەوەرێکی بایۆلۆژی بێت، دەبێت وەکو مرۆڤ سەیر بکرێت ، تەنانەت لەو دۆخە نوێیەش کە پێویستە بێتەدی ئافرەت دەبێت خۆی بیربکاتەوە و بڕوا بەشتەکان بێنێت، لەبری ئەوەی بەزۆر وای لێ بکرێت بیربکاتەوە، هەروەك فەیلەسووف (سۆمەرز) وای دەبینێت[٣٢]. واتە پێویستمان بە هۆشیاری رەگەزی هەیە، بەمانای سەیرکردنی مرۆڤ لەسەر بنەمای مرۆڤبوون بەدەر لەبنەمای رەگەزی، تێڕوانینی تاك لەسەر بنەمای لێهاتوویی و بوێری بێ ئەوەی رەگەز کاریگەری بەسەر ئەو تێڕوانینە هەبێت[٣٣]. کەواتە ئەگەر بمانەوێت گۆڕانکاری لە ژیانی کۆمەلایەتی نێر و مێ دروست بکەین، ئەوە دەبێ لە نێو خێزان لە ئاستی تاکەکەسەوە دەستپێبکەین لە

ڕێگـای ئـەو پێگەیاندنـە کۆمەڵایەتییـەی پێـی دەدرێـت بـۆ نەهێشـتنی جیـاوازی ڕەگەزی، بەچاو پۆشین لەجیاوازییە بایۆلۆژییەکان.

**دەروازەی دووەم : لایەنی مەیدانی**

**بەشی سێیەم: چوارچێوەی میتۆدیی توێژینەوە**

**یەکەم/ میتـۆدی توێژینـەوە:** لـەم توێژینەوەیـەدا سـوود لـە بـەکارهێنانی ئـەم میتۆدانەی خوارەوە بینراوە:

١- **میتۆدی بەراوردکاری:** ئەم میتۆدە بەکاردێت بۆ بەراوردکردنی دیاردەکان لەنێو خۆی یەك کۆمەڵگا لەدوو زەمەنی جیاواز، یان لێکۆڵینەوەی گرفت و بابەتێك لە دوو کۆمەڵگای جیاواز لە یەك کاتدا. واتە بریتییە لە دیاریکردنی ڕووە جیاواز و لێکچـووەکانی نێـوان دیاردەکـان بـۆ دیـاریکردنی هۆکارەکـانی سـەرهەڵدان، پەرەسـەندن و دۆزینـەوەی پەیوەنـدی نێوانیـان[٣٤]. لـە بەشـی دووەمـی ئـەم توێژینەوەیە بەراوردێك کراوە لەڕووی شێوازی پێگەیانـدنی کۆمەڵایـەتی لـە نێـوان نێـر و مـێ لـە خێزانـی کـوردی، کـە هەوڵـدراوە لایەنـە جیاوازەکـانی پرۆسـەی پێگەیاندن دەستنیشان بکرێت.

٢- **میتۆدی ڕووپێوی کۆمەڵایـەتی:** بریتییە لـە لێکۆڵینـەوەی لایەنـە خـراپ و تێکچووەکانی بارودۆخی کۆمەڵایەتی هەبوو لە ناوچەیەکی جـوگرافی دیـاریکراو، بەوپێیەی دەکرێ ئەو بارودۆخە بپێورێت و بەراورد بکرێت بـە بارودۆخـەکانی دی بەمەبەستی پێشکەشکردنی پرۆگرامی چاکسازی کۆمەڵایەتی[٣٥]. لەلایەنی مەیدانی ئەم توێژینەوەیە هەڵساوین بە ڕووپێـوکردنی شارۆچـکەی کەسـنەزان بەمەبەسـتی دیـاریکردنی شـێوازی پێگەیانـدنی خێزانـی و ڕۆڵـی دایـك و بـاوك لـە چـۆنییەتی پەروەردەکردنی کچ و کوڕەکانیان، لە ڕێگای وەرگرتنی نموونە.

**دووەم/ بوارەکـانی توێژینـەوە:** ئـەم توێژینەوەیـە لـە سـێ بـوار پێکـدێت کـە ئەمانەی خوارەوەن :

١- بواری شوێنی/ ئەم توێژینەوەیە لـە شارۆچـکەی کەسـنەزان ئەنجامـدراوە، گەڕەکەکانی (خۆڕاگر، کارێزی نوێ، سەروەران، یەکی شوبات) لەکۆی (٧) گەڕەك کە وەك نموونە وەرگیراون بواری شوێنی توێژینەوە پێکدێنن.

٢- بواری مرۆیی/ ئەو دایك و باوكانە دەگرێتەوە كە وەك نموونە وەرگیراون و ژمارەیان (٢٠٠) كەسە.

٣- بواری كاتی / ئەم توێژینەوەیە لە ٢٠١٠/١٢/١٥ تا ٢٠١١/١١/٢٨ی خایاندووە بە هەردوو لایەنی تیۆری و مەیدانی.

**سێیەم/ كۆمەڵگا و نموونەی توێژینەوە**

كۆمەڵگای توێژینەوە بە كرۆكی لایەنی مەیدانی دادەنرێت. ئەو خێزانانەی كە دانیشتووی چوار گەڕەكن لە شارۆچكەی كەسنەزان، كۆمەڵگای توێژینەوەكە پێكدێنن. بۆنموونەی توێژینەوەكەش بەمەبەستی گەیشتن بەزانیاریی ورد و دروست، ڕێگای هەڵبژاردنی نموونەمان بەكارهێنا بەپشتبەستن بەم هەنگاوانەی خوارەوە:

- **هەڵبژاردنی جۆری نموونە:** جۆری ئەو نموونەیەی لەو توێژینەوەیە هەڵبژێردراوە، نموونەی ( هەڕەمەكی چینایەتی- الطبقیة العشوائیة)یە، كە بریتییە لەو نموونەیەی لە كۆمەڵگایەكی ناهاوتا وەردەگیرێت، لە ژمارەیەك توێژ یان چین پێكدێت كە هەر توێژێك بەخەسڵەتی دیاریكراو و جیاواز لەوانی دی دەناسرێت[٣٦]. یەكەكانی نموونەی توێژینەوەكەمان لەو دایك و باوكانە پێكدێت كە كۆمەڵگای توێژینەوەكە دەیگرێتەوە، بەمەبەستی وەرگرتنی ڕاو بۆچوونیان سەبارەت بەشێوازی پێگەیاندنی نێر و مێ لەخێزانی كوردی هەروەها هەڵسەنگاندنی ڕۆڵی خێزان لە دروستكردنی جیاوازی ڕەگەزی.
- **هەڵبژاردنی قەبارەی نموونە:** بۆ دیاریكردنی قەبارەی نموونە هەڵساین بە دابەشكردنی نموونەی توێژینەوەكە بەسەر (٤) گەڕەك لە كۆی (٧) گەڕەك لە شارۆچكەی كەسنەزان، كە بریتین لە (خۆڕاگر، كارێزی نوێ، سەروەران و یەكی شوبات) بەهەڵبژاردنی (٢٠٠) كەس ڕەگەزی نێر بەڕێژەی (٥٧٪) واتە (١١٤) باوك و مێینەش بەڕێژەی (٤٣٪) واتە (٨٦) دایك، بەوەرگرتنی ماڵ نا ماڵێك بەشێوەی هەڕەمەكی.

**چوارەم/ ئامرازەكانی كۆكردنەوەی زانیاری:** ئەو ئامرازانەی كە بەكارهێنراون ئەمانەی خوارەوەن :

- **فۆڕمی ڕاپرسی:** بریتییە لە ژمارەیەك پرسیاری كراوە یان داخراو یاخود هەردووكیان، كە بەشێوەی ڕاستەوخۆ ئاراستەی نموونەی توێژینەوە دەكرێت. پێویستە ئەو پرسیارانە بە زمانێكی ڕوون بنووسرێت بۆ گەیاندنی هەمان مانا لەلای هەموو حاڵەتەكانی توێژینەوە.[٣٧] ئەو فۆڕمەی لەم توێژینەوەیە بەكارهاتووە لە (١٧) پرسیار پێكدێت[*] لەهەردوو جۆری پرسیاری كراوە و داخراو و نیشانی ژمارەیەك شارەزا لە بواری كۆمەڵناسی و دەروونناسی[**] دراوە بەمەبەستی سوود وەرگرتن لە ڕا و سەرنجەكانیان بۆ كەمكردنەوەی هەڵەكان. بەپێی ئەو پێوەرەی كە تاقیكراوەتەوە دەركەوت بەڕێژەی (٨٢,٢٢٪)ی پرسیارەكان گونجاوە.[****]
- **چاوپێكەوتن:** جۆری ئەو چاوپێكەوتنەی كە لەم توێژینەوەیە بەكارهاتووە بریتییە لەچاوپێكەوتنی (المقننة) كە لە ژمارەیەك پرسیاری ئامادەكراو و دیاریكراو پێكدێت، بەپێی ڕیزبەندییان ئاڕاستەی نموونەی توێژینەوە دەكرێت، كە دوای دڵنیابوون لەوەڵامی یەكەكانی نموونەكە توانای بەراوردكردن لەنێوان وەڵامەكان دەبەخشێت بەتوێژەر.[٣٨] لەم توێژینەوەیە لەپاڵ بڵاوكردنەوەی فۆڕمی ڕاپرسی چاوپێكەوتنیشمان ئەنجامداوە لەگەڵ نموونەی توێژینەوە، بەتایبەت كە ڕێژەیەكیان نەخوێندەوار بوون و پێویستییان بەخوێندنەوە و ڕوونكردنەوەی پرسیارەكان هەبوو.
- **ئامرازە ئامارییەكان:** ئەو ئامرازانەی بەكارهێنراون بریتین لەمانەی خوارەوە[٣٩]:
- ڕێژەی سەدی (٪) كە یاساكەی بریتییە لە (بەها ( بەش)) × ١٠٠
  كۆی بەهاكان
- ناوەندی ژمارەیی (الوسط الحسابي) كە یاساكەی بریتییە لە س‾ مج م ك
  مج ك
- لادانی پێوەری (الانحراف المعیاري)

كە یاساكەی بریتییە لە ع٢ = مج س‾ ٢ ـ (مج س)٢
ن
( ن ـ ١ )

**بەشی چوارەم: خستنەڕوو و شیکردنەوەی زانیاری و ئەنجامەکانی توێژینەوە**

**یەکەم- خستنەڕووی خشتەی زانیارییە گشتییەکان**

**١- ڕەگەز**

ڕەگەز یەکێکە لەو گۆڕاوە کاریگەرانەی، کە ئاستی جیاوازی تێڕوانینی تاکەکەسمان بۆ دەردەخات دەربارەی بابەت و هەڵوێستەکان. بۆیە بە پێویستمان زانی نموونەکە لەهەردوو ڕەگەز پێکبێت، کە بەڕێژەی لە(٥٧,٥٪) ڕەگەزی نێر و بەڕێژەی لە(٤٣,٥٪) ڕەگەزی مێ دەگرێتەوە. خشتەی (١) ئەمە ڕوون دەکاتەوە:

خشتەی (١)

ڕەگەزی نموونەی توێژینەوە ڕوون دەکاتەوە

| جۆری ڕەگەز | دووبارەبووەکان | ڕێژەی سەدی ٪ |
|---|---|---|
| نێر | ١١٤ | ٥٧,٥ |
| مێ | ٨٦ | ٤٣,٥ |
| کۆی گشتی | ٢٠٠ | ١٠٠ |

**٢- تەمەن**

هەر تەمەنێك جۆرێك هەڵسوکەوت و تێڕوانینی تایبەت بەخۆی هەیە لەسەر بابەتەکانی دەوروبەر، کە جیاوازە لە تەمەنێکی تر. تەمەنی یەکەکانی نموونەی توێژینەوەکە دابەشکراوەتە سەر (٩) کۆمەڵە تەمەنی جیاواز، کە پێکدێت لە (٢٠- ٢٥، ٢٦- ٣٠ ، ٣١- ٣٥، ٣٦- ٤٠، ٤١- ٤٥، ٤٦- ٥٠، ٥١- ٥٥، ٥٦- ٦٠، ٦١- ٦٥). بەپێی ئەم کۆمەڵە تەمەنانە ڕێژەی لە (١٧,٥٪) یەکەکانی نموونەکە دەکەونە کۆمەڵە تەمەنی (٤١- ٤٥)ساڵی و بەڕێژەی لە (١٥,٥٪) لەنێوان تەمەنی (٢٦- ٣٠) ساڵی و ڕێژەی لە(١٥٪) لەنێوان تەمەنی (٣٦- ٤٠) ساڵی و بەڕێژەی لە(١٤٪) لەنێوان تەمەنی (٣١- ٣٥) ساڵی و بەڕێژەی لە(١٣,٥٪) سەربە کۆمەڵە تەمەنی (٢٠- ٢٥) ساڵی و بەڕێژەی لە(٧,٥٪) سەربە هەردوو کۆمەڵە تەمەنی (٤٦- ٥٠ و٥٦- ٦٠) ساڵین و بەڕێژەی لە(٥٪) لە نێوان

تەمەنی (٦١– ٦٥)ساڵی و بەڕێژەی لە(٤,٥٪) سەربە کۆمەڵە تەمەنی (٥١– ٥٥) ساڵین. ناوەندی ژمارەیی تەمەنی یەکەکانی نموونەکە (٢٢) ساڵە بە لادانی پێوەری (٩,٩٠). خشتەی (٢) ئەمە روون دەکاتەوە:

خشتەی (٢)

تەمەنی نموونەی توێژینەوە روون دەکاتەوە

| کۆمەڵەکانی تەمەن | دووبارەبووەکان | ڕێژەی سەدی ٪ |
|---|---|---|
| ٢٠– ٢٥ | ٢٧ | ١٣,٥ |
| ٢٦– ٣٠ | ٣١ | ١٥,٥ |
| ٣١– ٣٥ | ٣٨ | ١٤ |
| ٣٦– ٤٠ | ٣٠ | ١٥ |
| ٤١– ٤٥ | ٣٥ | ١٧,٥ |
| ٤٦– ٥٠ | ١٥ | ٧,٥ |
| ٥١– ٥٥ | ٩ | ٤,٥ |
| ٥٦– ٦٠ | ١٥ | ٧,٥ |
| ٦١– ٦٥ | ١٠ | ٥ |
| کۆی گشتی | ٢٠٠ | ١٠٠ |

ناوەندی ژمارەیی= (٢٢) ساڵ، لادانی پێوەری (٩,٩٠)

### ٣- ئاستی خوێندەواری

بە هەمان شێوەی تەمەن و رەگەز، ئاستی خوێندەواریش گۆڕاوێکی ترە کاریگەری دەخاتە سەر بیرکردنەوەی مرۆڤ. لەم توێژینەوەیەدا بەڕێژەی لە (٢٨,٥٪) یەکەگانی نموونەکە خاوەنی بڕوانامەی سەرەتایین و بەڕێژەی لە (٢٢,٥٪) نەخوێندەوارن و بەڕێژەی لە (٢٠٪) بڕوانامەی ناوەندی و بەڕێژەی لە (٩,٥٪) بڕوانامەی بەکالۆریۆسیان هەیە هەروەها بەڕێژەی لە(٨,٥٪) تەنها

خوێنــدەوارن و بەرێــژەی لــە(٦٪) خــاوەن بڕوانامــەی ئامــادەیی و بەرێــژەی لە(٥٪)یشیان خاوەن بڕوانامەی دبلۆمن. خشتەی (٣) ئەمە روون دەکاتەوە:

خشتەی (٣)

ئاستی خوێندەواری نموونەی توێژینەوە روون دەکاتەوە

| ئاستی خوێندەواری | دووبارەبووەکان | ڕێژەی سەدی ٪ |
|---|---|---|
| نەخوێندەوار | ٤٥ | ٢٢,٥ |
| خوێندەواری هەیە | ١٧ | ٨,٥ |
| سەرەتایی | ٥٧ | ٢٨,٥ |
| ناوەندی | ٤٠ | ٢٠ |
| ئامادەیی | ١٢ | ٦ |
| دبلۆم | ١٠ | ٥ |
| بەکالۆریۆس | ١٩ | ٩,٥ |
| کۆی گشتی | ٢٠٠ | ١٠٠ |

**دووەم– خستنەڕوو و شیکردنەوەی زانیارییەکانی تایبەت بە رۆڵی پێگەیاندنی خێزانی کوردی لە جیاوازیی رەگەزی**

**٤- ئارەزووکردن لە منداڵی کچ یان کوڕ**

منداڵ کچ بێت یان کـوڕ جیـاوازی نییـە، بـەڵام هەنـدێك دایـك و بـاوك ئەگـەر منداڵی کچیان هەبێت حەزیان لە کوڕە و بەپێچەوانەوەش راستە، لـەلای هەنـدێکی تر بوونی خودی منداڵەکە گرنگترە نەوەك جۆری رەگەزی. بۆیە لـەم توێژینەوەیـە دەگەینە ئەو راسـتییەی کـە بەرێـژەی لـە(٧٣,٥٪) یەکـەکانی نموونەکـە جیـاوازی ناکەن لە نێوان منداڵی کچ و کوڕ. واتە ئارەزوویان بـۆ هـەردوو رەگـەز وەك یەکـە، بەڵام رێژەیەکیشیان جیاوازی دەکەن و بەرێژەی لە(١٣,٥٪) حەزیان لەمنداڵی کوڕ و بەرێژەی لە(١٣ ٪) حەزیان لە منداڵی کچە، کەواتە رێژەی زۆرینە دەمانگەیەنێتە

ئەو دەرئەنجامەی کە لە ئێستادا دایك و باوك کەمتر جیاوازی لەنێوان منداڵی کچ و کوڕ دەکەن. بڕوانە خشتەی (٤):

**خشتەی (٤)**

ئارەزووی نموونەی توێژینەوە بۆ منداڵی کچ یان کوڕ روون دەکاتەوە

| جۆری منداڵ | دووبارەبووەکان | ڕێژەی سەدی ٪ |
|---|---|---|
| کچ | ٢٧ | ١٣,٥ |
| کوڕ | ٢٦ | ١٣ |
| هەردووکیان | ١٤٧ | ٧٣,٥ |
| کۆی گشتی | ٢٠٠ | ١٠٠ |

**٥- هۆکاری ئارەزووکردن لە منداڵی کوڕ**

لەهەندێك کاتدا خێزان حەزی زیاتری بەلای رەگەزێکدایە، ئەمەش هەستێکی ئاساییە تا ئەو ئاستەی کە ئەو حەزە جیاوازە کاریگەری نەبێت لەسەر جیاوازیکردن لەنێوان ماف و ئەرکەکانی هەردوو رەگەز. هەندێکجار ئەم حەزە جیاوازە پەیوەستە بە تێڕوانینی کۆمەڵگا نەك تێڕوانینە کەسییەکان. حەزی زیاتری خێزان بۆ منداڵی کوڕ هۆکاری خۆی هەیە. بۆنموونە بەڕێژەی لە (٤٦,١٥٪) هۆکارەکەی دەگەڕێننەوە بۆ ئەوەی، کە کوڕ یارمەتیدەری باوکە لەکاروباری دەرەوە و بەڕێژەی لە(٣٤,٦١٪) نەریتی بەباشتردانانی کوڕ لە کچ و بەڕێژەی لە(٧,٦٩٪) پاراستنی میراتی خێزان دەکەنە هۆکار و بەڕێژەی لە (٣,٨٤٪) هەریەکە لە هۆکارەکانی کوڕ پێکهێنەری خێزانە، بەتوانایە لە ئەنجامدانی هەموو کارێك و بەخێوکەری دایك و باوکە لەداهاتوودا دەکەنە پاساو. لەدەرئەنجامی ئەو ڕێژانەوە، ئەگەرچی بە بەراورد بە کۆی گشتی نموونەکە رێژەیەکی زۆر نییە، بەڵام تا ئێستاش منداڵی کوڕ بە پاڵپشت و یارمەتیدەری سەرەکی خێزان دادەنرێت لەدوای باوك، ئەمەش بۆ خۆی توانا و دەسەڵاتی پێدەبەخشێت. بڕوانە خشتەی (٥):

خشتەی (٥)

هۆکاری هەڵبژاردنی منداڵی کوڕ لای نموونەی توێژینەوە روون دەکاتەوە

| هۆکارەکان | دووبارەبووەکان | ڕێژەی سەدی ٪ |
|---|---|---|
| یارمەتیدەری باوك لە کاروباری دەرەوە | ١٢ | ٤٦ |
| نەریتی بەباشتردانانی کوڕ لە کچ | ٩ | ٣٤ |
| کوڕ پێکهێنەری خێزانە | ١ | ٤ |
| بەتوانا لە ئەنجامدانی هەموو کارێك | ١ | ٤ |
| بەخێوکەری دایك و باوك لەداهاتوو | ١ | ٤ |
| وەرگرتن و پاراستنی میرات | ٢ | ٨ |
| کۆی گشتی | ٢٦ * | ١٠٠ |

### ٦- هۆکاری ئارەزووکردن لە منداڵی کچ

لە توێژینەوەکە دەرکەوتووە بەڕێژەی لە(٣٧,٠٣٪) هۆکاری هەڵبژاردنی کچ دەگەڕێننەوە بۆ ئەوەی کە دڵسۆز و نزیکی دایکە و بەڕێژەی لە(٢٥,٩٢٪) نەریتی بەباشتردانانی کچ و بەڕێژەی لە(٢٢,٢٢٪) یارمەتیدەری دایکە لە کاروباری ماڵەوە و بەڕێژەی لە(١٤,٨١٪) جوانی و سروشتی ڕەگەزی مێینە دەکەنە هۆکار. ئەگەر لەم دەرئەنجامەوە بەراوردێك بکەین لەنێوان ئەو هۆکارانەی پاڵنەرن بۆ حەزی خێزان بەلای منداڵی کچ و کوڕ، جیاوازییەك بەدی دەکەین، کە جیاوازیی بایۆلۆژی نێوان نێر و مێ ڕۆڵی سەرەکی تێدا بینیوە، بەوەی کوڕ دەبێ ڕۆڵی سەرەکی ببینێ و داهاتووی خێزان بێت، لەبەرامبەردا ڕۆڵی کچ ئەنجامدانی کاروباری ماڵە و جوانی، نەرمی و دڵسۆزیش کە بەشێکن لەسروشتی مێینە ڕۆڵیان لەو جیاوازییەدا هەیە. خشتەی (٦) ئەمە روون دەکاتەوە:

خشتەی (٦)

هۆكاری هەڵبژاردنی منداڵی كچ لای نموونەی توێژینەوە روون دەكاتەوە

| هۆكارەكان | دووبارەبووەكان | ڕێژەی سەدی ٪ |
|---|---|---|
| یارمەتیدەری دایك لەكاروباری ماڵەوە | ٦ | ٢٢,٢٢ |
| نەریتی بەباشتردانانی كچ لە كوڕ | ٧ | ٢٥,٩٢ |
| دڵسۆز و نزیكە لەدایك | ١٠ | ٣٧,٠٣ |
| جوان و ناسكە | ٤ | ١٤,٨١ |
| كۆی گشتی | ٢٧ * | ٩٩,٩٨** |

٧- پەیوەندیی ڕەگەز بە هەڵبژاردنی منداڵی كچ یان كوڕ

بەگشتی وا باوە، كە باوك ئارەزووی لە منداڵی كوڕە و دایكیش ئارەزووی لە كچە. بۆ گەیشتن بە راستی ئەو بۆچوونە، لەتوێژینەوەكە گەیشتین بەوەی بەڕێژەی لە(٤٤٪) نموونەكە لە ڕەگەزی نێر ئارەزوویان بۆ منداڵی كچ و كوڕ هەیە و بەڕێژەی لە(٢٩,٥٪) لە ڕەگەزی مێ هەمان هەڵبژاردنیان هەیە، بەڵام بەڕێژەی لە(١١,٥٪) لە ڕەگەزی مێ ئارەزوویان لە كچە و بەڕێژەی لە(١١٪) لە ڕەگەزی نێر ئارەزووی منداڵی كوڕ دەكەن و بەڕێژەی لە(٢٪) بۆ هەریەكە لە ڕەگەزی نێر و مێ ئارەزوویان لە منداڵی كچ و كوڕە. لەمەوە بەو دەرئەنجامە دەگەین، ئەگەرچی ئەو بۆچوونەی سەرەوە بەشێكە لە راستی، بەوەی نێر و مێ حەزیان بەلای هاوڕەگەزی خۆیاندایە، بەڵام زۆرینەی نموونەی توێژینەوەكە سەرەڕای جیاوازی جۆری ڕەگەزییان، لە تێڕوانینیان بۆ منداڵی كچ و كوڕ هەمان هەڵبژاردنیان هەیە. خشتەی (٧) ئەمە روون دەكاتەوە:

خشتەی (٧)

پەیوەندیی رەگەزی نموونەی توێژینەوە بەهەڵبژاردنی منداڵی کچ و کوڕ روون دەکاتەوە

| منداڵ / رەگەز | کوڕ | کچ | هەردووکیان | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|
| نێر | ٢٢<br>٪١١ | ٤<br>٪٢ | ٨٨<br>٪٤٤ | ١١٤<br>٪٥٧ |
| مێ | ٤<br>٪٢ | ٢٣<br>٪١١,٥ | ٥٩<br>٪٢٩,٥ | ٨٦<br>٪٤٣ |
| کۆی گشتی | ٢٦<br>٪١٣ | ٢٧<br>٪١٣,٥ | ١٤٧<br>٪٧٣,٥ | ٢٠٠<br>٪١٠٠ |

## ٨- دابینکردنی پێداویستییەکان

منداڵ کچ بێت یان کوڕ کۆمەڵێك پێداویستی جۆراوجۆری هەیە، کە دەبێت بێ جیاوازیی لەلایەن خێزانەوە دابین بکرێت. لەنموونەی توێژینەوەکە دەرکەوتووە بەرێژەی لە(٩٢٪) جیاوازی لە نێوان منداڵە کچ و کوڕەکانیان ناکەن لەدابینکردنی پێداویستییەکانیان و بەرێژەی لە(٨٪) جیاوازیی لە نێوانیان دەکەن، کەواتە لەو دەرئەنجامەوە دەردەکەوێت دایك و باوکان لەدابینکردنی پێداویستییەکانی منداڵەکانیان، سەرەڕای جیاوازیی جۆری رەگەزیشیان، جیاوازی ناکەن. بڕوانە خشتەی (٨):

خشتەی (٨)

جیاوازیکردن لەدابینکردنی پێداویستییەکانی کچ و کوڕ لەلای نموونەی توێژینەوە روون دەکاتەوە

| جۆری وەڵام | دووبارەبووەکان | رێژەی سەدی ٪ |
|---|---|---|
| بەڵێ | ١٦ | ٨ |
| نەخێر | ١٨٤ | ٩٢ |
| کۆی گشتی | ٢٠٠ | ١٠٠ |

**٩- پێدانی سۆز و خۆشەویستی**

سۆز و خۆشەویستی لەو پێداویستییە مەعنەوییە گرنگانەن کە تاك سەرەتا لە خێزانەوە بەرجەستە و هەستی پێدەکات هەروەها رۆڵێکی بەرچاو دەبینن لە بونیادنانی کەسایەتییەکی تەندروست لە رووی دەروونی و کۆمەڵایەتییەوە. ئایا دایك و باوك هەمان هەستیان هەیە بەرامبەر بەکچ و کوڕەکانیان لە پێدانی سۆز و خۆشەویستی؟ توێژینەوەکە بەو دەرئەنجامە گەیشت کە بەرێژەی لە(٨٧,٥٪) یەکەکانی نموونەکە جیاوازی لە نێوان کچ و کوڕەکانیان ناکەن لەدەرخستنی ئەو هەستە و بەرێژەی لە(١٢,٥٪) جیاوازی دەکەن. بەپێی ئەو دەرئەنجامە جیاوازیکردن لە نێوان کچ و کوڕ لە پێدانی سۆز و خۆشەویستی لە خێزاندا لە ئاستێکی نزمدایە، ئەو راستییەش هەیە کە هەندێك ناتوانن هەستە جیاوازەکانیان بەرامبەر بەوانی تر بشارنەوە. بڕوانە خشتەی (٩):

خشتەی (٩)

رای نموونەی توێژینەوە لە جیاوازیکردنی کچ و کوڕ لەپێدانی سۆز و خۆشەویستی روون دەکاتەوە

| جۆری وەڵام | دووبارەبووەکان | رێژەی سەدی ٪ |
|---|---|---|
| بەڵێ | ٢٥ | ١٢,٥ |
| نەخێر | ١٧٥ | ٨٧,٥ |
| کۆی گشتی | ٢٠٠ | ١٠٠ |

**١٠- جۆری کەلوپەلی یاریکردن**

کەلوپەلی یاریکردن زۆر و جۆراوجۆرن، هەرجۆرێکیان بخرێتە بەردەستی منداڵ، بێ ئەوەی گرنگی بە جۆر و ماناکەی بدات، یاری پێدەکات. لەم توێژینەوەیە دەرکەوتووە بەرێژەی لە(٤١,٢٥٪) یەکەکانی نموونەکە بۆ منداڵی کچ بووکەڵە و بێشکە هەڵدەبژێرن، بۆ منداڵی کوڕ پایسکیل بەرێژەی لە(٢٠٪) و تۆپ بەرێژەی لە(٩,٧٥٪) و ئۆتۆمبێل بەرێژەی لە(٨,٥٪) ئەتاری بەرێژەی لە(٧٪) و چەکیش بەرێژەی لە(٣,٧٥٪) هەڵدەبژێرن هەروەها بەرێژەی لە(٣٪) پایسکیل و بەرێژەی لە(٢٪) بۆ هەریەکە لە کەلوپەلی چێشتخانە و ئامێری میوزیك و بەرێژەی لە(١٪) میکانۆ بۆ منداڵە کچەکان و بەرێژەی لە(٠,٥٧٪) میکانۆ و بەرێژەی

لـە(٠,٢٥٪) ئـامێری میوزیـك بـۆ منداڵـە کوڕەکـان هەڵدەبـژێرن، لەکاتێکـدا هـیچ یەکێکیان بووکەڵە، بێشکە و کەلوپـەلی چێشـتخانەیان بـۆ کوڕەکـان و ئۆتۆمبێـل، چـەك و ئـەتارییان بـۆ منداڵـە کچـەکان هەڵنەبـژاردووە، بۆیـە هـیچ ڕێژەیـەکیان بەرنەکەوتووە، کەواتە لەم دەرئەنجامە دەگەینە ئەو ڕاستییەی، کە منداڵ بۆخۆی جۆری کەلوپەلەکان دیـاری ناکـات، بـەڵکو گـەورەکان بـۆی هەڵدەبـژێرن و جـۆری ڕەگەز لەسەر بنەمای جیاوازییە بایۆلۆژییەکان لەبەرچاو دەگرن، بۆنموونە: کڕینی بووکەڵە و کەلوپەلی چێشتخانە بۆ کچ بۆ گێڕانی ڕۆڵی مێینەیی و پایسکیل، چـەك و... بۆ کوڕ تا بـەڕۆڵی نێرینـەیی خـۆی هەڵبسـتێت، لـە جیـاوازیی بـایۆلۆژی وەك بنەمایـەك بـۆ جیـاوازیی کۆمەڵایـەتی سەرچـاوەی گرتـووە. تەنانـەت ئـەو جـۆرە کەلوپەلانەی تایبەت کراون بـە کچـان لەلایـەن کوڕانـەوە بـەکار نایـەن، ئەگەرچـی جاروبار کچان کەلوپەلی یاریکردنی کوڕان بەکاردێنن. بڕوانە خشتەی (١٠):

**خشتەی (١٠)**

جۆری کەلوپەلی یاریکردن بۆ کچ و کوڕ لەلای نموونەی توێژینەوە روون دەکاتەوە

| جـۆری کەلوپـە لەکان / منداڵ | بووکەڵە و بێشکە | پایسکیل | تۆپ | ئۆتۆمبێل | چەك | کەلوپەلی چێشتخانە | میکانۆ | ئامێری میوزیك | ئەتاری | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| کچ | ١٦٥<br>٪٤١,٢٥ | ١٢<br>٪٣ | ٣<br>٪٠,٥٧ | ٠<br>٪٠ | ٠<br>٪٠ | ٨<br>٪٢ | ٤<br>٪١ | ٨<br>٪٢ | ٠<br>٪٠ | ٢٠٠<br>٪٥٠ |
| کوڕ | ٠<br>٪٠ | ٨٠<br>٪٢٠ | ٣٩<br>٪٩,٧٥ | ٣٤<br>٪٨,٥ | ١٥<br>٣,٧٥ ٪ | ٠<br>٪٠ | ٣<br>٪٠,٥٧ | ١<br>٪٠,٢٥ | ٢٨<br>٪٧ | ٢٠٠<br>٪٥٠ |
| کـــۆی گشتی | ١٦٥<br>٪٤١,٢٥ | ٩٢<br>٪٢٣ | ٤٢<br>١٠,٣٢٪ | ٣٤<br>٪٨,٥ | ١٥<br>٪٣,٧٥ | ٨<br>٪٢ | ٧<br>٪١,٥٧ | ٩<br>٪٢,٢٥ | ٢٨<br>٪٧ | ٤٠٠*<br>٪** ٩٩,٦ |

## ١١- ڕەنگی جلوبەرگ

لە کۆمەڵگای کوردی تاڕادەیەك ڕەنگی جلوبەرگی نێر و مێ دیاریکراوە، ڕەنگە کراوەکان بۆ مێ و ڕەنگە تاریکەکانیش بۆ نێر پەسند کراوە. لەم توێژینەوەیە دەرکەوتووە بەڕێژەی لە(١٥,٧٥٪) ڕەنگی سوور و بەڕێژەی لە(١١,٧٥٪) ڕەنگی پەمەیی بۆ کچ بەپەسند دادەنێن و بەڕێژەی لە(٩,٧٥٪) ڕەنگی خۆڵەمێشی و بەڕێژەی لە(٨,٢٥٪) ڕەنگی ڕەش بۆ کوڕ و بەڕێژەی لە(٦,٧٥٪) بۆ هەریەکە لە ڕەنگی سپی بۆ کچ و ڕەنگی زەرد و شین بۆ کوڕ هەڵدەبژێرن و بەڕێژەی لە(٦٪) ڕەنگی سپی و بەڕێژەی لە(٤,٧٥٪) ڕەنگی قاوەیی بۆ کوڕ و بەڕێژەی لە(٣,٥٪) ڕەنگی پرتەقاڵی و بەڕێژەی لە(٢,٧٥٪) ڕەنگی مۆر بۆ کچ و بەڕێژەی لە(٢,٥٪) بۆ هەریەکە لەڕەنگی شین بۆ کچ و ڕەنگی سەوز بۆ کوڕ پەسند دەکەن و بەڕێژەی لە(١,٧٥٪) ڕەنگی زەرد بۆ کچ و بەهەمان ڕێژەش لەڕەنگی سوور بۆ کوڕ و بەڕێژەی لە(١,٢٥٪) ڕەنگی قاوەیی بۆ کچ و ڕەنگی مۆر بۆ کوڕ هەڵدەبژێرن و بەڕێژەی لە(١,٥٪) ڕەنگەکانی خۆڵەمێشی و سەوز بۆ کچ و پرتەقاڵی بۆ کوڕ و بەڕێژەی لە(١٪) ڕەنگەکانی ڕەش بۆ کچ و پەمەیی بۆ کوڕ پەسند دەکەن. لەو دەرئەنجامەوە دەردەکەوێت ڕەنگەکان زیاتر لەلایەن دایك و باوکەوە دیاری دەکرێن. واتە ئەوەی کۆمەڵگا پەسندی کردووە زۆربەی کات بەسەر ئارەزووی منداڵەکان دەسەپێنرێ. بە بەراوردکردنی ڕێژەی ڕەنگەکانیش لەنێوان منداڵی کچ و کوڕ ئەو راستییە زیاتر ئاشکرا دەبێت، کە تا ڕەنگەکان کراوەتر و دیارتر دەبن، بۆ منداڵی کچ ڕێژەکەی بەرزتر دەبێتەوە، پێچەوانەی ئەمەش بۆ منداڵە کوڕەکان ڕاستە. بڕوانە خشتەی (١١):

خشتەی (١١)

ڕەنگی جلوبەرگی پەسندکراو لەلای نموونەی توێژینەوە بۆ منداڵی کچ و کوڕ ڕوون دەکاتەوە

| جۆری ڕەنگ / منداڵ | سپی | سوور | پەمەیی | پرتەقاڵی | زەرد | شین | قاوەیی | مۆر | خۆڵەمێشی | ڕەش | سەوز | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| کچ | ٢٧ ٪٦,٧٥ | ٦٣ ٪١٥,٧٥ | ٤٧ ٪١١,٧٥ | ١٤ ٪٣,٥ | ٧ ٪١,٧٥ | ١٠ ٪٢,٥ | ٥ ٪١,٢٥ | ١١ ٪٢,٧٥ | ٦ ٪١,٥ | ٤ ٪١ | ٦ ٪١,٥ | ٢٠٠ ٪٥٠ |
| کوڕ | ٢٤ ٪٦ | ٧ ٪١,٧٥ | ٤ ٪١ | ٦ ٪١,٥ | ٢٦ ٪٦,٥ | ٢٧ ٪٦,٧٥ | ١٩ ٪٤,٧٥ | ٥ ٪١,٢٥ | ٣٩ ٪٩,٧٥ | ٣٣ ٪٨,٢٥ | ١٠ ٪٢,٥ | ٢٠٠ ٪٥٠ |
| کۆی گشتی | ٥١ ٪١٢,٧٥ | ٧٠ ٪١٧,٥ | ٥١ ٪١٢,٧٥ | ٢٠ ٪٥ | ٣٣ ٪٨,٢٥ | ٣٧ ٪٩,٢٥ | ٢٤ ٪٦ | ١٦ ٪٤ | ٤٥ ٪١١,٢٥ | ٣٧ ٪٩,٢٥ | ١٦ ٪٤ | ٤٠٠* ٪١٠٠ |

**١٢- یاریکردن**

یاریکردن بە قۆناغێکی گرنگ دادەنرێت لە ژیانی منداڵ. یاریکردنی تێکەڵاو لە نێوان کچ و کوڕ دەرفەتێك دەبێت بۆ ئاشنابوون بەتایبەتمەندییەکانی یەکتر. بەڕێژەی لە(٥٢,٥٪) نموونەی توێژینەوەکە پێیان باشە منداڵی کچ و کوڕ بە تێکەڵاوی یاری بکەن و بەڕێژەی لە(٤٧,٥٪) ئەو جۆرە یاریکردنەیان لەلا پەسند نییە. ئەگەر سەرنج بدەین جیاوازییەکی زۆر لە نێوان هەردوو ڕێژەکەدا نییە، هەڵبەت ئەمەش هۆکاری خۆی هەیە. بڕوانە خشتەی (١٢):

خشتەی (١٢)

ڕای نموونەی توێژینەوە بەرامبەر یاریکردنی تێکەڵاوی کچ و کوڕ ڕوون دەکاتەوە

| جۆری وەڵام | دووبارەبووەکان | ڕێژەی سەدی ٪ |
|---|---|---|
| بەڵێ | ١٠٥ | ٥٢,٥ |
| نەخێر | ٩٥ | ٤٧,٥ |
| کۆی گشتی | ٢٠٠ | ١٠٠ |

**١٣- نەبوونی ڕەزامەندی دایك و باوك لە یاریکردنی تێکەڵاو**

هەندێ دایك و باوك ڕێگە نادەن منداڵە کچەکانیان لەگەڵ کوڕ و منداڵە کوڕەکانیان لەگەڵ کچ یاری بکەن لەبەر کۆمەڵێك هۆکار بۆنموونە: بەڕێژەی لە(٢٩,٤٧٪) نموونەکە هۆکارەکەی دەگەڕێننەوە بۆ ئەوەی یاریکردنی تێکەڵاو کاریگەری خراپی دەبێت لەسەر داهاتووی منداڵەکان و بەڕێژەی لە(٢٦,٣١٪) پێیان وایە منداڵەکانیان فێری ڕەفتاری خراپ دەکات و بەڕێژەی لە(١٤,٧٣٪) تێڕوانینی کۆمەڵایەتی و داب و نەریتی کۆمەڵگا و بەڕێژەی لە(١٢,٦٣٪) جیاوازیی سروشتی نێوانیان دەکەنە هۆکار و بەڕێژەی لە(١١,٥٧٪) ئایین بە ڕێگر دادەنێن و بەڕێژەی لە(٥,٢٦٪) پێیان وایە شێوازی یاریکردنی کچ و کوڕ جیاوازە. لەم دەرئەنجامەوە دەردەکەوێت دایك و باوکان تێکەڵاوبوونی منداڵی کچ و کوڕ بەهۆکاری دروستبوونی کێشە کۆمەڵایەتی و ئەخلاقییەکان لەداهاتوو دادەنێن. بڕوانە خشتەی (١٣):

خشتەی (١٣)

هۆکاری ڕازینەبوونی نموونەی توێژینەوە بە یاریکردنی تێکەڵاو ڕوون دەکاتەوە

| هۆکارەکان | دووبارەبووەکان | ڕێژەی سەدی ٪ |
|---|---|---|
| ئایین ڕێگە نادات | ١١ | ١١,٥٧ |
| داب و نەریت ڕێگرە | ١٤ | ١٤,٧٣ |
| جیاوازی سروشتی نێوانیان | ١٢ | ١٢,٦٣ |
| فێربوونی ڕەفتاری خراپ | ٢٥ | ٢٦,٣١ |
| کاریگەری خراپ لەداهاتوو | ٢٨ | ٢٩,٤٧ |
| جیاوازی شێوازی یاریکردن | ٥ | ٥,٢٦ |
| کۆی گشتی | ٩٥ * | ٩٩,٩٧** |

**١٤-بەباشتردانانی کچ یان کوڕ لە خێزان**

منداڵ کچ بێت یان کوڕ ئەگەر بەشێوەیەکی باش و دروست پەروەردە بکرێت، کەسایەتییەکی باشی دەبێت. بۆیە باشیی منداڵ پەیوەست نییە بە جۆری ڕەگەزییەوە، بەڵکو شێوازی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی ڕۆڵی سەرەکی تێدا دەبینێت. لەم توێژینەوەیەدا بەڕێژەی لە(٤٥٪) نموونەکە پێیان وایە هەردوو ڕەگەز، باش و بەسوودن بۆ خێزان و بەڕێژەی لە(٣٤٪) منداڵی کچ و بەڕێژەی لە(٢١٪) منداڵی کوڕ بە باشتر دادەنێن، کەواتە زۆرینەی نموونەکە هەردوو ڕەگەز بە باش دادەنێن بۆ خێزان، سەرەڕای ئەوەی ڕێژەیەکیان جیاوازیی دەکەن. بڕوانە خشتەی (١٤):

خشتەی (١٤)

ڕای نموونەی توێژینەوە دەربارەی بە باشتردانانی کچ یان کوڕ لە خێزان ڕوون دەکاتەوە

| جۆری منداڵ | دووبارەبووەکان | ڕێژەی سەدی ٪ |
|---|---|---|
| کچ | ٦٨ | ٣٤ |
| کوڕ | ٤٢ | ٢١ |
| هەردووکیان | ٩٠ | ٤٥ |
| کۆی گشتی | ٢٠٠ | ١٠٠ |

### ١٥- هۆكاری بەباشتردانانی كچ لە كوڕ

كۆمەڵێك هۆكار هەیە وا لە خێزان دەكات منداڵی كچ بەباشتر دابنێت، كە هەندێكیان پەیوەندی بە سروشتی مێینەوە هەیە. لەم توێژینەوەیە دەركەوتووە بەڕێژەی لە (٣٨,٢٣٪) پێیان وایە كچ یارمەتیدەری دایكە و بەڕێژەی لە (٣٦,٧٦٪) هۆكارەكە دەگەڕێننەوە بۆ سۆز و بەزەیی كچ بۆ دایك و باوك و بەڕێژەی لە (١١,٧٦٪) زیاتر مانەوەی كچ لە ماڵ و بەڕێژەی لە (٧,٣٥٪) كچ بە پاڵپشتی دایك دادەنێن و بەڕێژەی لە (٥,٨٨٪) پێیان وایە كچ زیرەك و هەستیارترن. لەو دەرئەنجامەوە دەردەكەوێت كاروباری ماڵ، كە تایبەت كراوە بەڕەگەزی مێ و سۆز و بەزەییش كە بەشێكن لە سروشتی مێینە، دوو هۆكاری سەرەكین لە بەباشتردانانی كچ لە كوڕ. بڕوانە خشتەی (١٥):

خشتەی (١٥)

هۆكاری بەباشتردانانی كچ لە كوڕ بۆ خێزان لای نموونەی توێژینەوە روون دەكاتەوە

| هۆكارەكان | دووبارەبووەكان | ڕێژەی سەدی ٪ |
|---|---|---|
| دڵسۆزە بۆ دایك و باوك | ٢٥ | ٣٦,٧٦ |
| یارمەتیدەری دایكە لە كاری ماڵەوە | ٢٦ | ٣٨,٢٣ |
| زیاتر لە ماڵەوەن | ٨ | ١١,٧٦ |
| زیرەك و هەستیارن | ٤ | ٥,٨٨ |
| پاڵپشت و جێگری دایكە | ٥ | ٧,٣٥ |
| كۆی گشتی | ٦٨ * | ٩٩,٩٨ ** |

### ١٦- هۆکاری بەباشترداناني كوڕ لە کچ

لە هەندێك خێزاندا منداڵی کوڕ پێگەیەکی تایبەتی هەیە لەبەر کۆمەڵێك هۆکار، کە وای کردووە لە کچ بە باشتر دابنرێت. لەم توێژینەوەیە دەرکەوت بەڕێژەی لە (٤٠,٤٧٪) توانای کوڕ لە ئەنجامدانی کاروباری دەرەوە و بەڕێژەی لە (٣٠,٩٥٪) توانای لەچاودێری و بەخێوکردنی دایك و باوك و بەڕێژەی لە (٢١,٤٢٪) هێز و دەسەڵاتەکەی بەهۆکار دادەنێن و بەڕێژەی لە (٧,١٤٪) پێیان وایە کوڕ پاڵپشت و جێگرەوەی باوکە. کەواتە دووبارە جیاوازییە بایۆلۆژییەکان، جیاکاری دەخاتە نێوان هەردوو ڕەگەز، چونکە کاری دەرەوەی ماڵ لە توانا و ڕۆڵی ڕەگەزی نێر کورت دەکاتەوە و هێز و دەسەڵاتیش دەکاتە بەشێك لە سروشتی نێرینە بەهۆی توانا جەستەییەکەیەوە، بەردەوامبوون و مانەوەی ئەم جۆرە تێڕوانینەش ڕۆڵی کچ لە هاوکێشەی هێزی کۆمەڵایەتی کەم دەکاتەوە. بڕوانە خشتەی (١٦):

خشتەی (١٦)

هۆکاری بە باشترداناني كوڕ لە کچ بۆ خێزان لای نموونەی توێژینەوە ڕوون دەکاتەوە

| هۆکارەکان | دووبارەبووەکان | ڕێژەی سەدی ٪ |
|---|---|---|
| دەتوانێ لە دەرەوە کار بکات | ١٧ | ٤٠,٤٧ |
| بەخێوکەری دایك و باوکە لە داهاتوو | ١٣ | ٣٠,٩٥ |
| پاڵپشت و جێگری باوکە | ٣ | ٧,١٤ |
| خاوەن هێز و دەسەڵاتە | ٩ | ٢١,٤٢ |
| کۆی گشتی | ٤٢ * | ٩٩,٩٨ ** |

## ١٧- پەیوەندیی ئاستی خوێندەواری بە بەباشتردانانی کچ یان کوڕ لە خێزان

لەکاتێکدا هەندێك خێزان تێڕوانینی جیاوازیان هەیە بەرامبەر کچ و کوڕ، ئایا ئاستی خوێندەواری تا چەند  پەیوەندی بەو بابەتەوە هەیە؟ لەم توێژینەوەیە دەرکەوت بەرێژەی لە (١١,٥٪) نموونەکە کە خاوەن بڕوانامەی سەرەتایین هەردوو رەگەز بە باش دادەنێن و بەرێژەی لە (١١٪) کە هەمان بڕوانامەیان هەیە کچیان پێ باشترە و بەرێژەی لە (٩,٥٪) بۆ هەریەکە لە نەخوێندەوار منداڵی کچ و خاوەن بڕوانامەی ناوەندیش کچ و کوڕ و  بەرێژەی لە (٧,٥٪) کە خاوەن بڕوانامەی بەکالۆریۆسن کچ و کوڕ بەباش دادەنێن و بەرێژەی لە (٧ ٪) کە بڕوانامەی  ناوەندییان هەیە کچ و بەرێژەی لە (٦,٥٪) کە نەخوێندەوارن کوڕ و بەهەمان رێژەش کچ و کوڕ بەباش دادەنێن و بەرێژەی لە (٦٪) لە بڕوانامەی سەرەتایی کوڕ بەباشتر دادەنێن و بەرێژەی لە (٤,٥٪ ) لە خاوەن بڕوانامەی ئامادەیی و بەرێژەی لە (٤٪) لەوانەی کە تەنها خوێندەوارییان هەیە کچ و کوڕ و بەرێژەی لە (٣,٥٪) لە خاوەن بڕوانامەی ناوەندی و بەرێژەی لە (٣٪) لەوانەی کە تەنها خوێندەوارن کوڕ بەباشتر دادەنێن و بەرێژەی لە (٢,٥٪) کە خاوەن بڕوانامەی دبلۆمن و بەرێژەی لە (١,٥٪) کە تەنها خوێندەوارییان هەیە کچیان پێ باشتر و بەهەمان  رێژەش کە خاوەن بڕوانامەی دبلۆمن کچ و کوڕ و بەرێژەی لە (١٪) کە خاوەن بڕوانامەی ئامادەیی و بە هەمان رێژەش کە دبلۆمیان هەیە هەریەکە لە منداڵی کچ و هەردووکیان بە باش دادەنێن و بەرێژەی لە (٠,٥٪) لە خاوەن بڕوانامەی ئامادەیی و بەکالۆریۆس منداڵی کوڕ  بەباشتر دادەنێن. لەو رێژانە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە تا ئاستی خوێندەواری بەرزتر بێتەوە، جیاوازیی لە نێوان کچ و کوڕ کەمتر دەبێتەوە و پێچەوانەی ئەمەش راستە. واتە بەرزبوونەوەی ئاستی خوێندەواری کاریگەری ئەرێنی هەیە لە کەمکردنەوەی جیاوازیی رەگەزی. بڕوانە خشتەی (١٧):

**خشتەی (١٧)**

**پەیوەندیی ئاستی خوێندەواری نموونەی توێژینەوە بەباشتردانانی کچ یان کوڕ لەخێزان روون دەکاتەوە**

| ئاستی خوێندەواری / منداڵ | نەخوێندەوار | خوێندەواری هەیە | سەرەتایی | ناوەندی | ئامادەیی | دبلۆم | بەکالۆریۆس | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| کچ | ١٩ | ٣ | ٢٢ | ١٤ | ٢ | ٥ | ٣ | ٦٨ |
| | ٪٩,٥ | ٪١,٥ | ٪١١ | ٪٧ | ٪١ | ٪٢,٥ | ٪١,٥ | ٪٣٤ |
| کوڕ | ١٣ | ٦ | ١٢ | ٧ | ١ | ٢ | ١ | ٤٢ |
| | ٪٦,٥ | ٪٣ | ٪٦ | ٪٣,٥ | ٪٠,٥ | ٪١ | ٪٠,٥ | ٪٢١ |
| هەردووکیان | ١٣ | ٨ | ٢٣ | ١٩ | ٩ | ٣ | ١٥ | ٩٠ |
| | ٪٦,٥ | ٪٤ | ٪١١,٥ | ٪٩,٥ | ٪٤,٥ | ٪١,٥ | ٪٧,٥ | ٪٤٥ |
| کۆی گشتی | ٤٥ | ١٧ | ٥٧ | ٤٠ | ١٢ | ١٠ | ١٩ | ٢٠٠ |
| | ٪٢٢,٥ | ٪٨,٥ | ٪٢٨,٥ | ٪٢٠ | ٪٦ | ٪٥ | ٪٩,٥ | ٪١٠٠ |

### ١٨- هەستی جیاوازیکردن لە نێوان کوڕ و کچ

هەڵبەت مرۆڤ ناتوانێت لەیەک کاتدا و بەهەمان ئاست هەستی یەکسانی هەبێت بۆ ئەوانەی لە دەوروبەریدان، بەڵام ئەم بارە بۆ دایک و باوک جیاوازە. واتە پێویستە دایک و باوک بەبێ جیاوازیی مامەڵە لەگەڵ منداڵەکانیان بکەن. لەم توێژینەوەیە دەرکەوت بەرێژەی لە (٪٩٣) نموونەکە جیاوازیی لەنێوان کچ و کوڕەکانیان ناکەن و بەرێژەی لە(٪٧) دان بە و راستییە دەنێن کە مامەڵەی جیاوازیان هەیە لەگەڵ منداڵەکانیان بە جیاوازیی جۆری رەگەزییان. ئەگەرچی

زۆرینەی نموونەکە پێیان وایە جیاوازیی لە نێوان کچ و کوڕەکانیان ناکەن، بەڵام بەگەڕانەوە بۆ دەرئەنجامی خشتەکانی پێشوو ئەو راستییە دەردەکەوێت کە بەشێکیان لە هەندێ بواردا جیاوازییان کردووە، بۆنموونە لە پێدانی سۆز و خۆشەویستی، دابینکردنی پێداویستییەکان، بەباشتردانان و ئارەزووکردن بۆ منداڵی کچ یان کوڕ، رازینەبوون بەیاریکردنی تێکەڵاو، هەڵبژاردنی رەنگی جلوبەرگ و جۆری یارییەکان کە لەمەیاندا تەنها دایك و باوك هۆکاری جیاکارییەکە نین، بەڵکو تێڕوانینی کۆمەڵایەتی کاریگەری و رۆڵی بەرچاوی هەیە و لە سەرووی ئەمانەش رۆڵی جیاوازییە بایۆلۆژییەکان لە دروستکردنی ئەو تێڕوانینە کۆمەڵایەتییەدا. بڕوانە خشتەی (١٨):

خشتەی (١٨)

هەستی نموونەی توێژینەوە سەبارەت به جیاوازیکردن لە نێوان کچ و کوڕ روون دەکاتەوە

| جۆری وەڵام | دووبارەبووەکان | رێژەی سەدی ٪ |
|---|---|---|
| بەڵێ | ١٤ | ٧ |
| نەخێر | ١٨٦ | ٩٣ |
| کۆی گشتی | ٢٠٠ | ١٠٠ |

**سێیەم: ئەنجام، پێشنیاز و راسپاردەکانی توێژینەوە**

**١- ئەنجامەکانی توێژینەوە**

- چەندی ئاستی خوێندەواری بەرزتر ببێتەوە ئاستی جیاوازیی رەگەزی کەمتر دەبێت، پێچەوانەی ئەمەش راستە. واتە بەرزی و نزمی ئاستی خوێندەواری کاریگەریی هەیە لەدروستکردنی جیاوازیی رەگەزی.
- بەپێی ئەنجامەکان زۆرینەی نموونەکە ئارەزوو لە هەردوو منداڵی کچ و کوڕ دەکەن بێ جیاوازی، ئەگەرچی رێژەیەکیان حەزیان زیاتر بەلای منداڵی کوڕ یان کچدا دەچێت، ئەم جیاوازیکردنەش دەگەڕێننەوە بۆ هۆکاری جیاواز، کە بە پلەی

یەکـەم بـۆ کـوڕ پارمەتیـدانی بـاوك لـەکاروباری دەرەوە و بـۆ کچـیش دڵسـۆزی و نزیکبوونی لە دایك دەکەنە پاساوی جیاکارییەکان.

- لە هەڵبژاردنی جـۆری کەلوپـەلی یـاریکردن بـۆ منـداڵی کـچ و کـوڕ، جـۆری رەگەزی و جیاوازییـە بایۆلۆژییـەکان لەبەرچـاو دەگیرێـت، واتـە لەهەڵبژاردنەکـەدا خێــزان گرنگــی بــە مانــای نــاوەڕۆکی کۆمەڵایــەتی یارییــەکان دەدات، نــەوەك شێوەیان، لە هەڵبژاردنی رەنگی جلوبەرگیشدا تێڕوانینی کۆمەڵگا لە پەسندکردنی رەنگەکان سـەپێنراوە بەسـەر ئـارەزووی منداڵـەکان. لەسـەر ئـەو بنەمایـە رەنگـە کراوەکان بۆ رەگەزی مێ و رەنگە تاریکەکانیش بۆ رەگەزی نێر دیاری کراوە.
- زۆربەی دایك و باوکان رێگە بەیاریکردنی تێکەڵاو لەنێوان کچ و کوڕ نادەن، بە هۆکاری ئـەوەی کـە لـە داهـاتوودا کاریگـەری خراپـی بـۆ سـەر بـیر و رەفتـاری منداڵــەکانیان دەبێــت، هەنــدێکی تریشــیان داب و نــەریت، جیــاوازی سروشــتیی نێوانیان و ئایین بەهۆکاری ئەو ناڕازیبوونە دادەنێن.
- زۆربەی دایك و باوکان جیاوازی لەنێوان منداڵە کچ و کوڕەکانیان ناکەن لـە دابینکردنـی پێویسـتییەکان و پێـدانی سـۆز و خۆشەویسـتی، بەچـاو پۆشـین لـەو رێژەیـەی کـە نـاتوانن هەسـتی جیاوازییـان بەرامبـەر بـە منداڵـەکانیان بشـارنەوە. سەبارەت بـە بەباشـتردانانی کـچ یـان کـوڕ بـۆ خێـزان توێژینەوەکـە گەیشـتە ئـەو ئەنجامەی، کە هەردووکیان بەسوود و باشن سەرەڕای ئەوەی کـە هەنـدێك منـداڵی کــچ و هەنــدێکی تــریش کــوڕ بەباشــتر دادەنــێن بــەهۆی ئــەو هۆکارانــەی کــە رەنگدانەوەی تێڕوانینی باوی کۆمەڵگان بە لەبەرچاو گرتنی جۆری رەگەزی، بەڵام ئەمـە لـەو راسـتییە کـەم ناکاتـەوە کـە لـە ئێسـتادا تێڕوانینـی خێـزان و کۆمـەڵگا بەرامبــەر بــە منــداڵی کــچ و کــوڕ گــۆڕاوە، بەتایبــەتیش بـۆ کـچ ئاڕاسـتـەیەکی ئەرێنییانەی وەرگرتووە.
- بەپێی ئەنجامەکان دایك و باوکان هەست بەوە ناکەن جیاوازییان کردبێت لەنێوان کچ و کوڕەکانیان، ئەگەرچی رێژەیەکیان جیاوازی دەکەن، لەمەشـدا جگـە لـە خـودی خێـزان تێڕوانینـی کۆمەڵایـەتی بـاو بـە لەبەرچـاو گرتنـی جیاوازییـە بایۆلۆژییەکانی نێوان هەردوو رەگەز ، رۆڵی تێدا بینیوە.

٢- پێشنیازی توێژینەوە

پێویستە زیاتر بایەخ بە بابەتی جیاوازیی کۆمەڵایەتی- ڕەگەزی بدرێت بۆ کەمکردنەوەی کاریگەریی تێڕوانین لە نێر و مێ لەسەر بنەمای جیاوازیی بایۆلۆژی، لەپێناو هێنانەدی دادپەروەریی کۆمەڵایەتی، لە ڕێگای ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستیی ورد و فراوان و وردبوونەوە لە ئاکامە دەروونی، کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانی جیاوازیی ڕەگەزی و کاریگەریی ئەم ئاکامە لەسەر کەسایەتی تاک.

٣- ڕاسپاردەکانی توێژینەوە

- لەسەر ئاستی خێزانی پێویستە تێڕوانینی جیاکارییانە بۆ نێر و مێ کۆتایی پێ بهێنرێت و لەسەر بنەمای مرۆڤبوون تێڕوانینیان بۆ بکرێت. بۆیە دەبێ لەوێوە گۆڕانکارییەکان بۆ کۆمەڵگا دەست پێبکات.
- لەسەر ئاستی پەروەردە پێویستە گرنگی بە بابەتی یەکسانی کۆمەڵایەتی- ڕەگەزی بدرێت لە پرۆگرامەکانی خوێندن هەروەها گرنگیدان بە زیاتر نزیکبوونەوە و تێکەڵاوبوونی هەردوو ڕەگەز بەمەبەستی دروستکردنی هاوڕێیەتی و متمانە بەیەکبوون، تا لەداهاتوودا نەبنە خاوەن دوو کەسایەتی نامۆ بەیەکتر.
- بەهۆی باڵادەستی مەعریفەی ئایینی لە کۆمەڵگای کوردی پێویستە دامەزراوە ئایینییەکان ڕۆڵی سەرەکی بگێڕن لە هۆشیارکردنەوەی کۆمەڵگا بە چەمکی یەکسانی کۆمەڵایەتیی ڕەگەزی و کەمکردنەوەی ئەو تێڕوانینە هەڵەی بەرامبەر بە ماف و ئەرکەکانی ڕەگەزی مێ دروست بووە، بە پشتبەستن بە جیاوازییە بایۆلۆژییەکانی لەگەڵ ڕەگەزی نێر.

## پەراوێز و سەرچاوەکان:

١- دينكن ميشيل، معجم علم الاجتماع، ت:د. احسان محمد الحسن، دار الرشيد للنشر، بغداد، ص٢٥٣.
٢- د. مەنوچێهر موحسنی ، دەروازەکانی کۆمەڵناسی، و: رێبوار سیوەیلی و ئەوانی تر، چ٢، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر،٢٠٠٦،ل٢٥٠.
٣- د.ابراهيم عثمان، مقدمة في علم الاجتماع، ط١، دار الشروق للنشر والتوزيع، عمان- الاردن، ٢٠٠٤، ص١٨٢١٩٨٠، ص٢٥٣.
٤- د. احمد زكي بدوي، معجم مصطلحات العلوم الاجتماعية، مكتبة لبنان، بيروت،١٩٨٢،ص٤٠٠.
٥- د. مەنوچێهر موحسنی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٩.
٦- د. ليلى عبدالوهاب ، العنف الاسري (الجريمة والعنف ضد المرأة) ،دار المدى للثقافة والنشر، سوريا ، ٢٠٠٠،ص٢١ .
٧ د. احسان محمد الحسن، علم اجتماع العائلة ، دار وائل للنشر، عمان ، ٢٠٠٥ ، ص٤٤.
٨- هەتاو كريم ، ظاهرة العنف الاسري ، ط١ ، المديرية العامة للصحافة والطباعة والنشر، اربيل ، ٢٠٠٨ ، ص ٣١
٩- سورەتی (آل عمران) ئايەتی ( ٣٦) .
١٠- د. حسين عبدالحميد احمد رشوان ، علم اجتماع المرأة ، المكتب الجامعي الحديث ، االاسكندرية، بدون سنة طبع ، ص ٢،١.
١١- پرۆسەی ئەکوایەر (بەشداری پێکردنی کوڕان و پیاوان لە نەهێشتنی توندوتیژی وابەستە بەجێندەر و تەندروستی زاوزێ و بارودۆخەکانی ململانێ و بەدەنگەوە هاتنی ئیمرجێنسیدا)، و: رێکخراوی cdo، ٢٠٠٨، ل ١٨
١٢- دیار عەزیز شەریف ، چەمکە ئەنترۆپۆلۆژییەکان ، چ١ ، چاپخانەی ئۆفسێتی مەحوی، هەولێر، ٢٠٠١ ، ل ٣٨.
١٣- سورەتی (النساء)، ئايەتی (١).
١٤- اورزو لا شوى، اصل الفروق بين الجنسين، ت:بوعلي ياسين، دار التنوير للطباعة والنشر ودار الفارابي ، بيروت ، ٢٠٠٦، ص٦٥.
١٥- د. حسين عبدالحميد احمد رشوان، سەرچاوە ی پێشوو، ل٣٢.

١٦– د. سـناء الخـولی، الـزواج والعلاقـات الاسـرية، دار النهضـة العربيـة للطباعـة والنشر،بيروت، بدون سنة طبع ، ل٢٤ .
١٧– هەمان سەرچاوە ، ل٢٠ .
١٨– اورزو لاشوی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٥ .
١٩– اوتوكلينبرغ، علم النفس الاجتماعي، ت: حـافظ الجمـالی، ط ٢، دار المكتبـة الحيـاة، بيروت، ١٩٦٧، ص ٣٨٤ .
٢٠– د.ئیمـام عبـدالفتاح ئیمـام، جـۆن لـۆك و ئـافرەت، تێڕوانینێـك لـە فەلسـەفەی كۆمەڵایەتی، چ١، و:ئەژین عبدالخالق، دەزگای ڕێبین بۆ چاپ وپەخشی كتێب ،٢٠٠٤، ل ٧٦.
٢١– لجنة من الباحثين، في قضايا المـراة ، ط ١، موسسـة ناصـر للثقافـة، بـيروت،١٩٨٠، ص ٩٨.
٢٢– نەسرین حەسەن ، من و تۆ یەكسانین ، چاپخانەی رۆژهەلآت، هەولێر، ٢٠١٠، ل١٨.
٢٣– جون ستيورات مـل ، اسـتعباد النسـاء ، ت/د.امـام عبـدالفتاح امـام ، ط١ ، مكتبـة مدبولی، القاهرة، ١٩٩٨، ص ١٥.
٢٤ – لجنة من الباحثين ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٦.
*– بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە بۆ:د.امام عبدالفتاح امـام ، افلاطـون والمـرأة، دار التنـوير للطباعة والنشر والتوزيع، بيروت، ٢٠٠٩، ص٦٠، ١٠٤–١٠٦
٢٥–كاميليا دريظة ، غانـدي والمـرأة ، ت/ بهـيج شـعبان ، دار بـيروت للطباعـة والنشـر، بيروت، ١٩٥٩، ص ٤٤ .
٢٦– ريـان ڤـوت، النسـوية والمواطنـة، ت: ايمـن بكـر وسمـر الشيشـكلی، ط ١، المجلـس الاعلی للثقافة، القاهرة ، ٢٠٠٤، ص ١٣٨،١٣٩
٢٧–د.احسان محمد الحسن، العائلة والقرابة والـزواج، ط١، دار الطليعـة للطباعـة والنشـر، بيروت ، ١٩٨١، ص٦٨.
٢٨–الصـادق النيهـوم، الحـديث عـن المـراة والـديانات ، ط٢، دار تالـة للطباعـة والنشـر، بيروت–لبنان ، ٢٠٠٥،ص١٠٠.
٢٩–د. سامية حسن الساعاتي، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٨.
٣٠–د.احسان محمد الحسن، علم اجتماع العائلة، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٧.
٣١– اورزو لاشوی ، سەرچاوەی پێشوو، ل٦٤.

٣٢–ماری لیفکۆ ویتـز، کـێ فێمینزمـی دزی؟ لـە کتێبـی ((چـۆن ئـافرەت خیانـەتی لـە ئافرەت کرد؟))، و:گۆران سـەباح غـەفوور، چ١، چـاپخانەی هێڤـی ، هـەولێر، ٢٠٠٨، ل٧٢.
٣٣–کۆمەڵـەی خـەڵك بـۆ گەشـەپێدان PDA ، راپـۆرتی تایبـەت بەهەڵسـەنگاندن و شیکاری جێندەری، ٢٠٠٩–٢٠١٠، ل١٠.
٣٤–د. شاکر مصطفى سـليم ، قـاموس الانثروبولوجيـا ، ط١،جامعـة الكويـت ، كويـت ، ١٩٨١، ص ١٩٤.
٣٥–د.احسان محمد الحسن ود.عبدالمنعم الحسني، طـرق البحـث الاجتمـاعى، دار الكتـب للطباعة والنشر، جامعةالموصل، الموصل،١٩٨٢، ص ١٥٧.
٣٦–د.محمد ازهر سعيد السماك واخرون ، اصول البحث العلمى ، ط١، دار الكتب للطباعة والنشر، جامعة الموصل ، موصل ،١٩٨٦، ص٦٤.
٣٧–د. ابراهيم عثمان، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٣.

*– بڕوانە پاشکۆی ( ١).
**١– پ.د.صـباح ئەحمـەد نـەجار، بەشـی کۆمەڵناسـی، کۆلێـژی ئـەدەبیات، زانکـۆی سەلاحەددین – هەولێر.
٢– پ.د. یوسـف حەمـە صـالح، بەشـی دەروونناسـی، کۆلێـژی ئـەدەبیات، زانکـۆی سەلاحەددین – هەولێر.
٣– پ.د. طاهر حسـۆ میرزێبـاری، بەشـی کۆمەڵناسـی، کۆلێـژی ئـەدەبیات، زانکـۆی سەلاحەددین – هەولێر.
٤– پ.ی.د. عومـــەر پـــەتی، بەشـــی دەروونناســـی، کۆلێـــژی ئـــەدەبیات، زانکـــۆی سەلاحەددین – هەولێر.
٥ – د . رەشید مەلاحسێن بەرواری، بەشی دەروونناسی، کۆلێژی ئەدەبیات، زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر.
٦– د . سـلیم بطـرس االیـاس ، بەشـی کۆمەڵناسـی، کۆلێـژی ئـەدەبیات، زانکـۆی سەلاحەددین – هەولێر. *** – بڕوانە پاشکۆی(٢).
٣٨–د. احسان محمد الحسن ود.عبدالمنعم الحسنى، طرق البحث الاجتماعي، سەرچاوەی پێشوو، ل. ٢١٥،٢١٤
٣٩–د. محمد ازهر سعيد السماك وآخرون، سەرچاوەی پێشوو، ل١٣١،١٣٩.

*– کۆی گشتی لەم خشتەیە (٢٦) لەبری (٢٠٠)، چونکە تایبەتـە بەوانـەی لـە خشـتەی (٥) دا ئارەزوویان لە منداڵی کورە .

*– کۆی گشتی لەم خشتەیە (٢٧) لەبری (٢٠٠)، چونکە تایبەتـە بەوانـەی لـە خشـتەی (٥) دا ئارەزوویان لە منداڵی کچە. **– ≅ ١٠٠ ٪

*– کۆی گشتی لەم خشتەیە (٤٠٠) لەبری (٢٠٠) چونکە لە دوو پرسیاری جیـادا داوا لـە نموونەکە کراوە جۆری کەلوپەلەکان دەستنیشان بکات. ** - ≅ ١٠٠ ٪

*کۆی گشتی لـەم خشـتەیە(٤٠٠) لـەبری (٢٠٠) چـونکە لـەدوو پرسـیاری جیـادا داوا لـە نموونەکە کراوە جۆری رنگەکان بۆ کوڕ و کچ دیاری بکات.

*– کۆی گشتی لەم خشتەیە (٩٥) لەبری (٢٠٠)، چونکە تایبەتـە بەوانـەی لـە خشـتەی (١٥) وەڵامیان بە (نەخێر) داوەتەوە. **– ≅ ١٠٠ ٪

*– کۆی گشتی لەم خشتەیە (٦٨) لەبری (٢٠٠)، چونکە تایبەتە بەوانـەی لـە خشـتەی (٢١) کچیان پێ باشترە لە کوڕ. ** ≅ ١٠٠٪

*– کۆی گشتی لەم خشتەیە (٤٢) لەبری (٢٠٠)، چونکە تایبەتـە بەوانـەی لـە خشـتەی (٢١) کوڕیان پێ باشترە لە کچ. ** ≅ ١٠٠٪

## پاشکۆی (١)

وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی          بابەت/ فۆڕمی ڕاپرسی

زانکۆی سەلاحەددین/ هەولێر

کۆلێژی ئەدەبیات/ بەشی کۆمەڵناسی

ناونیشانی توێژینەوە

**ڕۆڵی پێگەیاندنی خێزانی لە جیاوازی ڕەگەزیدا**

**( توێژینەوەیەکی مەیدانییە لە شارۆچکەی کەسنەزان )**

دایك و باوکی بەڕێز.....

ئەم فۆڕمەی لەبەر دەستتە بۆ مەبەستی ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستییە، هاوکاریکردنت بە وەڵامدانەوەی ڕاستیی پرسیارەکان، جێگای ڕێز و سوپاسە.

لەگەڵ ڕێزدا          توێژەر/ م. ی. ئەسرین زرار قادر

**یەکەم: زانیارییە گشتییەکان**

- ڕەگەز:  نێر(  ) مێ (  )
- تەمەن: (  ) ساڵ
- ئاستی خوێندەواری: نەخوێندەوار(  ) خوێندەواری هەیە(  ) سەرەتایی(  ) ناوەندی(  ) ئامادەیی (  )دبلۆم(  ) بەکالۆریۆس (  )

**دووەم: زانیارییە تایبەتییەکان**

- پێش ئەوەی منداڵتان ببێت حەزتان دەکرد کچ بێت یان کوڕ؟ کچ( ) کوڕ (   ) هەردووکیان (   )
- ئەگەر حەزتان لە کوڕە بۆچی؟(                                        )
- ئەگەر حەزتان لە کچە بۆچی؟(                                        )
- لەدابینکردنی پێداویستییەکان جیاوازی لەنێوان کچ و کوڕەکانت دەکەی؟ بەڵێ (   ) نەخێر(   )
- لە پێدانی سۆز و خۆشەویستی هەستت کردووە جیاوازیت کردبێت لە نێوان کچ وکوڕەکانت؟ بەڵێ(   ) نەخێر(   )
- کام جۆرە کەلوپەلی یاریکردن بۆ منداڵی کچ بە پەسند دەزانی؟ (          )
- کام جۆرە کەلوپەلی یاریکردن بۆ منداڵی کوڕ بەپەسند دەزانی؟ (          )

- کام جۆرە رەنگ بەپەسند دەزانی بۆ جلوبەرگی منداڵی کچ؟ سپی( ) سوور( ) پەمەیی( ) پرتەقاڵی( ) زەرد( ) شین( ) قاوەیی( ) مۆر( ) خۆڵەمێشی( ) رەش( ) سەوز( )
- کام جۆرە رەنگ بەپەسند دەزانی بۆ جلوبەرگی منداڵی کوڕ؟ سپی( ) سوور( ) پەمەیی( ) پرتەقاڵی( ) زەرد( ) شین( ) قاوەیی( ) مۆر( ) خۆڵەمێشی( ) رەش( ) سەوز( )
- پێت باشە منداڵی کچ و کوڕ بەتێکەڵی یاری بکەن؟
بەڵێ( ) نەخێر( ) بۆچی؟ ( )
- ئایا منداڵی کچ یان کوڕ باشتر و بەسوودترە بۆ خێزان؟ کچ( ) بۆچی؟ ( ) کوڕ( ) بۆچی؟ ( ) هەردووکیان( )
- ئایا هەست دەکەی جیاوازیت کردووە لەنێوان کچ و کوڕەکانت؟ بەڵێ( ) نەخێر( )

**پاشکۆی** (٢) خشتەی (١٩)

را و بۆچوونی شارەزایان سەبارەت به ئاستی راستیی بڕگەکانی فۆڕمی راپرسی روون دەکاتەوە

| ژ. | ژ. بڕگە گونجاوەکان | ژ. بڕگە نەگونجاوەکان | ژ. ئەو بڕگانەی داوای چاککردنی کراوە |
|---|---|---|---|
| ١ | ١٣ | ٨ | ٤ |
| ٢ | ٢٩ | ١ | ٠ |
| ٣ | ٢٤ | ٤ | ٢ |
| ٤ | ٣٠ | ٠ | ٠ |
| ٥ | ٢٧ | ٠ | ٢ |
| ٦ | ٢٥ | ٠ | ٥ |
| کۆی گشتی | ١٤٨ | ١٣ | ١٣ |

کۆی گشتی بڕگەکانی پێوانەکردن (٣٠)ە و ژمارەی شارەزایانیش (٦)ە.

کەواتە کۆی گشتی بڕگەکان = ژمارەی بڕگەکانی ئامرازی پێوانەکردنەکە× ژمارەی شارەزایان

واتە ٣٠×٦= ١٨٠ راستیی گشتی فۆڕمەکە= کۆی گشتی بڕگە راستەکان (گونجاوەکان) ÷ کۆی گشتی بڕگەکانی ئامرازی پێوانەکردنەکە. واتە ١٤٨ ÷ ١٨٠ = ٨٢,٢٢٪.

## ملخص البحث

موضوع التميز على أساس الجنس أو التميز على أساس النوع الأجتماعي (الجندر) هو من أحد المواضيع المهمة والحساسة في مجال دراسات العلوم الأجتماعية التي تشغل مساحة واسعة للتحليل والتمحص والتعمق في حالة الأختلاف البايولوجي والتميز على اساس النوع الأجتماعي بين الذكر والأنثى. حكايات تاريخ التميز على أساس النوع الاجتماعي تعود الى المراحل البدائية للأنسان عندما حولت الاختلافات البايولوجية سببا للتميز الاجتماعي ، أي تقسيم العمل ، الدور، المكانة، تحديد الحقوق، الأمتيازات والواجبات وكل هذا أدى الى ظهور التميز على اساس الجنس والنوع الأجتماعي. الى جانب ذلك النضال النسوي وظهور الحركة النسوية "فيمينيزم" في القرن التاسع عشر والنضال من أجل المساواة في المجالات الاقتصادية، الاجتماعية، السياسية، الثقافية والفكرية كلها نتاج ظروف التميز والتي صنعتها المجتمع البشري خلال عصور من الزمن. تهدف هذه الدراسة الى تحقيق هدفين رئيسيين هما:

١- تحديد دور الأختلاف البايولوجي في ظهور التميز على أساس الجنس والنوع الأجتماعي.

٢- تحديد شكل التنشئة الاجتماعية للذكر والأنثى في العائلة الكوردية.

هذه الدراسة توصلت الى مجموعة من نتائج ابرزها:

- رفع مستوى التحصيل الدراسي كان سبب في تقليل التميز على أساس الجنس والنوع الاجتماعي.
- الوالدين اثناء اختيار الالعاب لأطفالهم يهتمون بمعنى والمضمون الأجتماعي للألعاب وكذلك عند أختيار لون الملابس للأطفال يفرض رأي المجتمع على رغبة الأطفال وذلك حسب الرأي السائد بأن الألوان الفاتحة للأنثى والغامقة للذكر.
- الأختلافات البايولوجية ، الدين، العادات والتقاليد، الثأثيرات السلبية على فكر وسلوك مستقبل الأطفال هي من أبرز أسباب منع أو رفض اللعب المشترك والجماعي بين أطفال كلا الجنسين من قبل الوالدين.
- في العائلة الكوردية تختلف التنشئة الأجتماعية للأطفال حسب جنسها.

## Abstract

Subject of discrimination based on the sex or discrimination based on gender, this subject is considered the most important subject and critical in the field of social sciences studies which engage a wide space of analysis, examination, and deepen in the case of biological difference and discrimination based on (gender) between male and female. Historical tales based on gender date back to the early stages of human life when the biological differences made a reason for social discrimination. This means the work division, role, and statue, specifying privileges and rights, and duties. All these things led to what is called discrimination based on sex kind and gender. Besides the women's struggle and the rise of feminist movement in the nineteenth century and struggling for equality in the economic, social, political, educational, and cultural fields which are all resulted from discrimination circumstances made by the human communities.

**This study aims to achieve two main goals:**

- Indicating the role of biological differences between male and female in creating social differences.
- Pointing out the styles of male and female socialization in Kurdish family.

**This study reached to group of results which are the following:-**

1. Raise the level of academic achievement caused to minimize the discrimination that based on sex and gender.
2. Parents always care in choosing games and dolls for their children and care in the meaning and content of these games, also when they are choosing clothes for their children always care in color and social opinions that means social opinion imposed to choose the light color for girls and dark ones for boys.
3. The biological and natural differences, religion, habits, and negative effects on the thought affect the future behavior of children. These are the most important reasons why imposing parents reject male and female game play.
4. In the Kurdish family, the socialization for children is different according to the sex.

# ئەم سێ کتێبەم خوێندەوە

**محەمەد عەلی قەرەداغی**
**ئەندامی کارای ئەکادیمیای کوردی**

صدیقی بۆرەکەیی دەڵێن: کتێبخانەیەکی دەوڵەمەندی لە دەستخەتی کوردیدا هەیەو، پشت بەو دەسخەتانە گەلێ کاری ئەنجام داوە و تا ئێستە چەند کتێبی بلاوکردووەتەوە.

لەمەوبەر من نەچوومەتە بواری هەڵسەنگاندنی ئەو بەرهەمانەیی و بە چاوێکی رەخنەگرانەوە سەرنجیانم نەداوە، ئەگەر لە کاتی تاوتوێکردن و سەیرکردنیشیاندا شتێکم دیبێ خۆم لەوە نەداوە لەسەری بنووسم و بیخەمە بەر رەخنە.

لەم ڕۆژانەدا سێ کتێبی بەسەر یەك و بەدەم یەکەوە بە ناوەکانی:

١. هەورامان باشتر بناسن
٢. کەرکوك یەکەمین شاری کوردستان
٣. مەل نامەی میر سادقی دینەوەری

لە ناو بلاوکراوەکانی ساڵی ٢٠١٢ ی ئەکادیمیای کوردیدا چاپ و بلاوبوونەوە.

کە بینیم سێ کتێب بۆ یەك کەس و لە سێ چوار مانگی سەرەتای ساڵێکدا بۆ کەسێکی دەرەوەی ئەکادیمیای کوردی چاپ کراون، سەرنجیان ڕاکێشام و گوتم: دەبێ ئەمانە شاکار بن و ئەم پیاوە کارگەلێکی گەلێ گەورەی ئەنجام دابێت و داهێنانێکی نوێ بن لە کەلەپوور و مێژووی کورددا.

نایشارمەوە و نهێنیش نادرکێنم ئەگەر بڵێم من هەشت ساڵە ئەندامی ئەکادیمیای کوردیم لەم ماوەدا ئەم دەزگایە سێ کتێبی بۆ چاپ کردووم.[1] بۆیە دەستمدایە کتێبەکان و چاوێکم پێدا گێڕان تا بزانم چییان تێدایە و چ خزمەتێك بە ڕۆشنبیری کوردی دەکەن تا ئەکادیمیای کوردی بەو شێوە بایەخیان پێدەدات و رز بە چاپکردنیاندا دەگرێت؟

بەڵێ دوای سەرنجدانیان و خوێندنەوەی چەند بەشێك لە هەر یەکێکیان

ئـەنجامێکم لێ بەدەسـت هێنـان و گەیشـتمە قەناعـەتێك کـە دەبـێ خوێندنـەوە و هەڵسەنگاندنێك بۆ ئەم بەرهەمانە ئەنجام بدەم.

بـە ڕاسـتی دوای هەڵسـەنگاندنێك و سـەرنجدان و بـەراوردکردنێك تووشـی حەپەسان و سەرسامی بووم. ئەمـەش لـەوەوە سـەری هەڵدا ئـەم دەزگایـە نـاوی خۆی بە خۆیەوەیـە و پێـی دەگـوترێ: (ئـەکادیمیای کـوردی) ئـەم نـاوەیش جگـە لـەوەی کـە ئـەم دەزگـا لـە کوردسـتاندا بـە باڵادەسـترین دەزگـای ڕۆشـنبیری دادەنرێت — ئەم دەزگا دەباتە ئاستێك کە هیچ بەرهەمێکی لێوە دەرنەچێت یان تیایـدا بڵاونەکرێتـەوە ئەگـەر مەرجـەکانی نووسـینی ئـەکادیمی — بـا لـە صـەدا صەدیش نەبێت— تێدا پەیڕەو و ڕەچاو نەکرێت.

منیش لەو چاوەوە و بەو بۆ ڕوانینە کتێبەکانی بۆرەکەییم دایە بـەر شـەماڵی هەڵسەنگاندن، بەڵام دوای شەنوکەو سووری خەرمانی کارەکانی بۆرەکەیی مایەدار نەبوو و بەرهەمێکی بە پێز و جێگەی دڵخۆشی لێ وەبەرنەهات.

ئەگەر بمەوێ چەوت و چێڵیی ناو کتێبەکان دیـاریی بکـەم و هەڵـەکان ڕاسـت بکەمەوە و لاپەڕە ڕەش بکەمـەوە زۆری دەوێـت و زۆریشـی پـێ ناچێت قـەوارەی نووسینەکە قەبە دەبێت. لەبەر ئەوە وام بە بـاش زانـی کـورت و پوخـت لـە چـەند نموونەیەکدا ئەنجامی هەڵسەنگاندنەکەم بە خوێنەر بگەیەنم و، خۆم لە درێـژدادڕی و کـات بـە فیڕۆدانـی خـۆم و خوێنـەر لابـدەم. هـەر لەبـەر ئەمـەیش بەشـی زۆری سەرنجەکانم بە گشتی لە سەر هەر سێ کتێبەکەن.

یەکەم: یەکەم خاڵ و خاڵی سەرەکی بەوە دەست پێدەکەم کە بۆرەکـەیی — وابـزانم لەبـەر چـاوڕاوکردن لـە خوێنـەر— ئامـاژەکردنی بـۆ سەرچـاوە پشـتگوێ خستووە.

ئاشـکرایە بڕبـڕەی پشـتی کـاری ئـەکادیمی ئەوەیـە کـە نووسـەر لـە هێنـان و نووسـینی زانیاریـدا زۆر ئـەمین و دەسـتپاك و بـێ لایـەن بێـت، ئەمـەیش بـەوە دەردەکەوێت کە نووسەر — هەر نووسەرێك— هەر زانیارییەك یان بابەتێکی نووسی — کـە ڕا و بۆچـوونی خـۆی نـەبوو— لـە پـەراوێزەوە بـە ژمارەیـەکی دیـار و روون خوێنەر ڕێنومایی بکا بۆ لای ئەو سەرچاوەی بابەتەکـەی لـێ وەرگرتـووە. ئـەوەی کە لەم سێ کتێبـەی بۆرەکەییدا نییـە ئەوەیـە. ئـەوەتا لـە سەرانسـەری هەرسـێ




كتێبەكـەدا یـەك پـەراوێز نابینیـت و یـەك ئامـاژە بـۆ سەرچاوە ناخوێنیتەوە !

دووەم: چەواشـەكردنی خوێنــەر: بۆرەكـەیی لـە كۆتـایی ئــەم كتێبانــەوە نـاوی دەیـان سەرچـاوەی عەرەبی و كـوردی و فارسـی رز كـردووە، كـە گوایـە كتێبەكـــەی لەبـــەر رۆشـــنایی ئـــەو سەرچـــاوانەدا نووسـیوە، ئەمـە جگـە لـەوەی – وەك نووسـیم– لـە هەموو كتێبەكەدا ئاماژە بۆ یەك زانیاریی نەكراوە كـە بڵێـت لــە فــلان سەرچــاوەم وەرگرتــووە. بەڵگــەی چاوڕاوكردن لەو سەرچاوانەدا زۆر ئاشـكرایە و، خوێنـەر بـە سـەرنجدانێكی خێـرا بۆی دەردەكـەوێت كـە بۆرەكـەیی جگـە لـەوەی لـە كارەكەیـدا نازانسـتییانە و نـا ئەكادیمییانە هەڵسوكەوتی كردووە، لـە تـەك خۆیشـی و خوێنەریشـدا دەسـتپاك و ڕاستگۆ نەبووە. نموونەی ئەمە بە یەك خاڵ روون دەكەمەوە:

كـە پێشـەكیی كتێبـی ( **هـەورامان باشـتر بناسـن**)ی نووسـیوە لـە كۆتـایی پێشـەكییەكەیەوە مێـژووی سـاڵی ٢٠٠٠ی دانـاوە، واتـە لـەو مێـژووەدا لـە كـاری نووسینی ئەو كتێبە بووەتەوە، بەڵام كە سەرنجی لیستی سەرچاوەكانی دەدەیـن وەك لە لاپەڕە (١١٦) دا دەیخوێنینەوە سەرچاوەی مێژووی ٢٠٠٤و ٢٠٠٥ و ٢٠٠٦ی هێناوە.

سێیەم: زانیاری نادروست و بێ بنەما و هەڵە و پەڵە: بە روونكردنـەوەی ئـەم خاڵە خوێنەر گومانی بۆ ئەوە دەچـێت بۆرەكـەیی دەیـەوێت – بـا بـە نـاڕەواییش بێـت– هـەموو بـەرایی و یەكـەمی و سـەرەتایی دەسـتبەكاربوونێك لـە ڕۆشـنبیری كوردیدا بۆ خۆی قۆرخ بكـات و كـەس پـێش ئـەو كـارو شـیاوی جێگـەی بایـەخی ئەنجام نەدابێت. بۆ زیاتر روونكردنەوەی ئەم خاڵە با بەیەكەوە ئەم چـەند دێـڕەی بۆرەكەیی لە قەڵەمی خۆیەوە بخوێنینەوە:

(( بە داخەوە نووسەرانی كورد تا ئێستا لە بارەی هەورامانەوە شـتێكی وایـان نەنووسـیوە و ئەوەشـی نووسـرابێ جگـە لـە چـەند دێـڕ و پـەراوێز سـەبارەت بـە هەورامان یا هێنانی چەند هۆنراوی هەورامی شتێكی تـر نەنووسـراوە و خۆرهـەڵات

ناسانیش لە گەشت و نامەکانیاندا هەر چەند دێڕێکیان لە بارەی هەورامان و زاراوەی هەوراميیەوە بە هەڵە نووسیوە کە کەڵکێکی وایە نییە و مێژوونووسانی کوردیش هەر کام کورتە باسێکیان دەربارەی هەورامان نووسیوە و ئیتر نووسراوێکی بە کەڵك لە بارەی هەورامانەوە تا ئێستا نە نووسراوە..........)) (هەورامان باشتر بناسن، ل: ٣).

بە پێچەوانەو نادروست دەرخستنی ئەم نووسراو و ئیددیعا فش و فۆڵ و ناڕەوایە زۆری ناوێت، بەڵام باشتر وایە هەر لە نووسین و قەڵەمی بۆرەکەیی خۆیەوە ئەم قسانە پووچەڵ بکرێنەوە. بۆ ئەمەیش دەچمە لاپەڕە (١٨) و ئەم نووسینەی بۆرەکەیی وەکو خۆی دەگوێزمەوە: ((سەبارەت بە مێژووی دەوری ئیسلامەتی هەورامان بەڵگەمان پەرتووکی مێژووی هەورامان نووسراوی مەلا عەبدوڵڵای هەورامانی و شەرەفنامە دانراوی میر شەرەفخانی بتلیسی و عالەم ئارای عەباسی و نووسینی ئەسکەندەر بەگی تورکمانە.....)).

لێرەیشەوە دەگوێزمەوە بۆ لیستی سەرچاوەکانی بۆرەکەیی خۆی کە لە لاپەڕە (١١٦) دا باسی چەند سەرچاوەی مێژووی هەورامانی کردووە کە هەر یەکێکیان بەسە بۆ ئەوەی بە بۆرەکەیی بگوترێ: کاکی برا! ئەها بزانە پێش تۆ و چەند پێش تۆ کەسانی دی بە درێژی و دروستی باسی هەورامانیان بە کتێب نووسیوە.

٧٢- محەمەد ئەمین هەورامی، مێژووی هەورامان- تاران ٢٠٠٠.

٧٣- هادی رەشید بەهمەن- پەیامی هەورامان- هەولێر ٢٠٠١.

٧٤- جەلیلی عەباسی- ئاڤێستا- هەولێر ٢٠٠٣.

٧٥- قاضی عبدالله شیدا- تأریخ سلاطین هورامان- سنندج- ١٣٨٤ هەتاوی.

٧٨- منظفر بهمن سلطانی هورامی - تأریخ هورامان- تهران- ١٣٨٦ هەتاوی.

ئەمانە جگە لە چەند سەرچاوەی دیش کە بۆ هەورامان تەرخان کراون، وەك کتێبەکەی محەمەد رەشیدی ئەمینی و ، کتێبە قەبە و گەورەکەی عبدالرزاق.... و چەندی دی.

چوارەم: شپرزەیی و بێ سەروبەری نووسینەکان: بۆرەکەیی کە نووسینەکانی خستوونەتە سەر کاغەز بە شێوەیەکی وای نەنووسیون رێکخستن و رێکوپێکییان پێوە دیار بێت و، بابەتبەندی و خاڵبەندیی دروستی بۆ نەکردوون، ئەمەیش شێوەی زۆری نووسینەکانیەتی بۆ نموونە تەماشای لاپەڕە (١٨) بکە کە باسی گوندی (هانە نەوتی) و (تەوێڵە) و (بیارە) و (باخە کۆن) دەکات — لە پێش ئەوانیشەوە چەند شوێنی دی — ناونیشانی بۆ هیچیان دانەناوەو تەنانەت بە فۆنتێکی رەش و جیایش نەنووسراون.

جگە لەوە کە دەبوو لە تەك باسی ئەو شوێنانەدا لە رووی جوگرافی و بیوگرافی و شتگەلی دیکەوە خوێنەریان لێ شارەزا بکرایەت.

وا بزانم ئەمەندە بەسە بۆ دەرخستنی بایەخی ئەم نووسراوە و ئەکادیمی نەبوونی ناوەرۆکەکەی.

کتێبی **(کەرکوك یەکەمین شاری کوردستان)**یش دەکرێت بە هەمان پێودان هەڵبسەنگێنرێت و دروستی و نادروستیی کارەکە پیشان بدرێت .

بەڵام بێ تۆمارکردنی دوو سەرنجی کورت بە سەر ئەم کتێبەدا ناڕۆم:

یەکەم: ناونیشانەکەی. بە چ بەڵگەیەك ئەوە دەسەلمێنرێت کە کەرکووك یەکەم شاری کوردستان بێت؟ ئەی هەولێر کە لە کوردەواریدا بووە بە پەند و ئیدیۆم و بە شتێك زۆرکۆن بێت بۆ موبالەغە دەڵێن ( لە هەولێر کۆنترە ! )؟ ئەی شار و شوێنەکانی دی کوردستانی تورکیا و ئێران؟.

دووەم: با پێکەوە ئەم چەند دێرە هەلەق و مەلەقەی بۆرەکەیی بخوێنینەوە و دوایی بپرسین ئەرێ براله ئەم زانیارییانە لە کام لەو سەرچاوانەدا کە رزت کردوون نووسراون؟




(( بۆ وێنە لە دەوری تیریگاندا کە دوایین پادشای گۆتییەکانە لە سالی ٢١٠٩ی پێش زایین کاتێ ئووتوهگای ئەکەدی هێرشی هێنایە سەر شارەکە و تیریگانی تێ شکان، ئەوی لە دار دا گەلێ لە خەڵکەکەشی کوشت و گەلێکیشی لێیان شاربەدەر کرد و لەدەوری ئیسلامەتیشا لەبەر ئەوەی

خەڵکەکەی بەرگرییان لە شارەکە کردو نەیاندا بەدەستەوە گەلێکیان لێ کوژراو گەلێکیشیان لێ ئاوارە بوو، لە دەوری قەرەقۆینلوەکان گەلێ لە کوردەکانی کەرکووك ئاوارە کران و لە جێی ئەواندا هەندێ تورکیان داناو عوسمانییەکانیش گەلێك لە خەڵکەکەیان کوشت و گەلێ تورکمانیان جێنشین کرد و ئەمەش بۆ ئەوەی کە کەرکووك کانگای نەوتە)) (کەرکووك یەکەمین شاری کوردستان. ل:٧)

لەم قسە هەڵەج و بەڵەجانەی بۆرەکەیی تەنها بڕگەیەك هەڵدەبژێرم کە دەڵێ (لە دەوری ئیسلامیشا لەبەر ئەوەی خەڵکەکەی بەرگرییان لە شارەکە کردو نەیاندا بە دەستەوە گەلێکیان لێ کوژراو....) خۆزگە بۆرەکەیی ناوی ئەو جەنگەی پێ دەوتین کە لە کەرکووکدا کراوە! هەروەها خۆزگە مێژووی جەنگەکە و ناوی سەرکردەکانی بۆ دەستنیشان دەکردین!؟.

**مەل نامە:**




ئەگەر بمەوێ لە بارەی کتێبی سێیەمی بۆرەکەییەوە کە (مەل نامە)یە شتێکی کورت بنووسم دەڵێم:

بێ بەرنامەیی و نا ئەکادیمییەتی مۆری تەختی تەوێڵی ئەم کتێبەیشە. بۆرەکەیی ئەگەر لەو دوو کتێبەی دیدا - بە ڕەوا و ناڕەوا- کۆمەڵێك سەرچاوەی ریز کردبوو، لەم کتێبەیاندا تاکە سەرچاوەیەکیش چییە نەینووسیوە و ناوی نەهێناوە!

بۆیە بۆرەکەیی لەم کتێبەبەیاندا رووبەڕووی ئەم پرسیارانە دەبێتەوە: ئەم کتێبە تا ئێستە چاپ بووە یا نە؟ دەستخەتی ئەم کتێبە لە کوێیە؟ چەند لاپەڕەیە؟ کێ نووسیویەتییەوە؟ ساڵی چەند و لە کوێ نووسراوەتەوە؟ ئەو زانیارییانەت لە بارەی ژیانی میر سادقی دانەریەوە لە کوێ هێناوە؟ چەندین پرسیاری تریش.

دوای ئەمە دەڵێم: لە پێشەکییە بێ سەروبەرو بزرکاوەکەیدا چەند قسەی بێ رێوشوێنی کردووە، وەك لە لاپەڕە (٣) دا نووسیویە:

((.... ناوی: هەڵۆ و سیمرخ و شاهێن و کەڵەشێر ئەبیسین کە هەر کام ئەفسانەییێکیان هەیە کە هەمووتان بیستووتانە)).

خوێنەر بۆی هەیە بڵێت : ئەو ئەفسانانە لە کوێ کۆکراونەتەوە؟ لای کێ دەستدەکەون؟ بە خوا کاکی برا من ئەو ئەفسانانەم نەبیستووە، تۆ چۆن لە خۆتەوە دەنووسی: ( کە هەمووتان بیستووتانە)؟

ماوەیەك دوای ئەوە نووسیویە:

(( کوردەکان هەر لە مێژەوە حەزیان لە باڵندە و پەلەوەر کردووە و لەم بارەوە گەلێ پەرتووك و نامیلکە سەبارەت بە پەلەوەرەکان نووسراوە)) (مەل نامە . ل:٤).

خۆزگە بۆرەکەیی لەو (گەلە پەرتووك.....) چەند دانەیەکی دیاری دەکرد، یان سەرچاوەی ئەو قسەی خۆی پێ دەگوتین!

بێ بەرنامەیی و بێ بابەتبەندی خاڵێکی دیکەی ئەم کتێبەی بۆرەکەییە. ئەوەتا دوای پێشەکییەکی بێ ناونیشان دەچێتە سەر چەند باس و خواسی دی و، دوو لاپەڕە بەو شێوە دەنووسێ. دوای ئەوە و بێ جیاکردنەوە و بێ ناونیشان دەست بە کتێبەکە دەکات .

ئەوەیش کە دەچێتە پاڵ بێ بەرنامەیی ئەوەی بۆرەکەیی ئەوەی نەکردووە (مەل نامە)کە بە جیا بنووسێت و نووسینەکانی خۆیشی لە پەراوێزەوە بە جیا بنووسێت .

لە کۆتایی ئەمانەشەوە دەڵێم: کوردییەکەی بۆرەکەیی وەك ناوەڕۆکی کارەکانی بێ قۆرت و گرێ نین و زمانی کوردی سفتوسۆڵ و ڕەوان نییە و لە گەلێ جێگەیدا بزرکاوی زمانەکەی سەرباری بێ بەرنامەیی و نا ئەکادیمیایی کارەکەیەتی!

دوا وتەشم دەڵێم: کورد دەڵێ ئەگەر جارێ فێڵت لێ کردم خوا بتگرێ. ئەگەر بوو بە دوو جار خوا خۆم بگرێ! ئەی ئەگەر بوو بەسێ جار چی بە (ئەکادیمیای کوردی) بڵێین؟

**پەراوێز:**

(١) ئەوەیش نەبووە لەم ماوەدا بەرهەمی دیکەم وەك کتێب جگە لەو سێ کتێبە نەنووسیبێت، بەڵکو لەم ماوەدا بە قەوارەی گەورە و بچووك لەو ماوەدا (٢٢) بیست و دوو کتێبم لە کوردستاندا– کە بەشی زۆریان لە ئاراس بوون– چاپ کردووە.

# له ماڵئاوایی ژنه کوردناسی ئیتالیایی میریلا گالیتی دا
## (١٩٤٩-٢٠١٢/٩/٤)

د.نەجاتی عەبدوڵلا*



داخەکەم کە مەرگ هات نە لە دەرگا دەدات و نە پرسیش بە کەس دەکات، بەڵکو زۆر بە خشپەیی ئەوەی بیەوێ بینی لێ دەگرێ و دەیباتەوە بۆ ئەو دونیایەی کە دواجار هەموو بوونەوەرێك، چ زوو و چ درەنگ هەر دەبێ پێی بگات. ئەو سپێدەیەی ئەندریای کوڕەزاکەی لە نامەیەکی ئەلیکترۆنی بە ئیتالیایی و ئینگلیزی هەواڵی مەرگی گالیتی بۆ نووسیبووم، زۆر خەمبار بووم. حەزم دەکرد هەواڵەکە ڕاست نەبێت، بەڵام زۆر هەواڵ هەیە مرۆ حەز دەکات هەرگیز ڕاست نەبێت کەچی بە پێچەوانەوە ڕاست دەردەچێت. لەگەڵ خوێندنەوەی ئەم نامەیە یادەوەریم بردمییەوە بۆ پاریس، دروست بۆ نەورۆزی ئەمساڵ، کاتێك داوەتی پاریس کرابووم. لەوێ یەکێکی دیکە لەو کەسایەتییانەی، کە وەك ئەندامی دەستەی ئەنیستیتووی کوردی داوەت کرابوو، د.میریلا گالیتی بوو، ڕێکەوت وابوو گالیتی و د.حەمید بۆزئەرسلان و د.کریستین ئالیسۆن و د.جەلیلی جەلیل و د. ئەفرام عیسا یووسف و بەندە و کۆمەڵێك ناوی دیکە، هەر هەموومان ئەندامی بەشی زانستە کۆمەڵایەتییەکانی ئەنیستیتووی کوردی بووین. ئەو ڕۆژە هەڵبژاردنی هەموو بەشەکان کرا و تەواوی ئەم ڕۆژە هەر هەموومان، تا نزیکەی نیوەی شەو، لە ئێوارەیەکی پاریسیدا بەیەکەوە بووین. دواتر بۆ چەند

---

* سکرتێری ئەکادیمیای کوردی

جارێك مـن و گـالیتی لـه بارەگـای ئەنیسـتیتووی کـوردی لـه پـاریس یەکـدیمیان بینییـەوە، لەبیرمـە لـە دوایـین چـاوپێکەوتنمان لـە پـاریس دوو دانـە لـە کتێبـە تازەکـەی خـۆی لەسـەر عێـراق (عێـراق دڵـی جیهـان) بـە زمـانی ئینگلیـزی و نامیلکەیەکی خۆی بە ئیتالیایی لەسەر کورد بۆ کتێبخانەی ئەکادیمیای کوردی بە دیـاری پێـدام، گوتیشـی بـەم نزیکانـە سـەردانی کوردسـتان دەکـەم و سـەری ئەکادیمیای کوردی دەدەم، تەنانەت دڵی هێندە خۆشبوو، وەکو منـداڵ لەبـەردەم دەرگـای کتێبخانـەی ئەنیسـتیتووی کـورد هەڵدەپـەڕی، ئـەو ڕۆژەی هـەواڵی مردنەکەیم بۆ هات یەکسەر ئەم هەڵپەڕین و دڵخۆشییەی ئەوم بیرکەوتـەوە و قـەت بیرم بۆ ئەوە نەدەچوو بەم ناوەختە کۆچی دوایی بکات، بۆیـە ئێسـتەش لام وایـە ئەم هەواڵە ڕاست نییە، بەڵام ئەفسووس، ڕاستیان گوتووە ئـادەمی شـیری خـاوی خواردووە !

میریلا گالیتی، ساڵی ١٩٤٩، لە بۆلۆنیا (بۆلۆن)ی ئیتالیا لە دایك بـووە. لـە سـاڵی ١٩٧٠-ەوە لـە سـۆنگەی نووسـینی کارنامـەی دکتۆراکەیـەوە سـەردانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاسـت، بەتایبـەتیش سـەردانی کوردسـتانی کـردووە. سـاڵی ١٩٧٤ کارنامەی دکتۆرا لە زانستە سیاسییەکان لە زانکۆی بۆلۆنیا (بۆلۆن) لە ئیتالیـا بـە ناوونیشانی (*سـترەکتووری سیاسـی و بـەها کولتوورییـەکانی کۆمەڵگـەی کـوردی*) بەدەست دەهێنێ. دوای تەواوکردنی کارنامەی دکتۆرایەکەی ماوەیـەك لـە بەغـدا و قاهیرە و جەزائیر دەخوێنێ. لە حوزەیرانی ١٩٨٨دا، یەکەمین ئەورووپایی بوو، لە لوبنـان چـاوی بـە عەبـدوڵڵا ئۆجـەلان کـەوت. لـە ئـەیلوولی ١٩٨٩ دا لـە تورکیـا سەردانی ئەو کوردانەی کرد، کە لە دەست شاڵاوی بەدناوی ئەنفال ڕایان کردبـووە تورکیا. لە ساڵی ١٩٩٠دا وانەی مێژوو و شارستانییەتی کوردیی لە زانکۆی بۆلۆنیـا و ترێسـت وتووەتـەوە، سـاڵی ١٩٩٤یـش لـە زانکـۆی سـەلاحەددین و سـلێمانی سیمیناری پێشکەش کردووە. هەروەها ساڵی ٢٠٠٠ وانەی کۆمیونیتەی ئیسلامی لە زانکۆی کافۆسکاری وتووەتەوە، دواتریش لە فـاکولتی لێکۆڵینـەوەی سیاسـیی لـە زانکـۆی دووەمـی نـاپۆلی وانـەی مێـژووی وڵاتـانی ئیسـلامی وتووەتـەوە. بیبلیۆگرافیای نووسین و بەرهەمەکانی زۆرن و زۆربەیشی لەسـەر مێـژووی کـورد و کۆمەڵگەی کوردەوارین، بەشێکیشـی لەسـەر کەمینـە نەتـەوەکانی ڕۆژهـەڵاتن، بـە

تایبەتیش لەسـەر کریسـتیانەکانی عێـراق. هـەروەها چـەند کتێـب و لێکۆڵینـەوەی لەسەر مێژووی عێراق و سوریا هەیە. نووسیاری (٢٠) کتێب و زیاتر لە (١٥٠) وتـار و لێکۆڵینـەوەی زانسـتییە، کـە بەشـێکیان وەرگێڕدراونەتـە سـەر زۆر لـە زمانـان. داخەکەم ڕۆژی ٢٠١٢/٩/٤ لە ڕۆما کۆچی دوایی کرد، ڕۆژی ٨ ی مانگیش، کاتژمێر چوار و نیوی ئێوارە لەناو ئاپۆرای دۆستان و خزم و مامۆسـتایانی زانکـۆ بـە خـاك سپێردرا.

## بیبلیۆگرافیای بەشێك لە بەرهەمەکانی

**1974**

1-*Struttura politica e valori culturali nella società curda : tesi di laurea,* di Mirella Galletti, [Bologna] : [Univ. degli studi], 1974., xvii, 387 leaves : map ; 29 cm. ; Tesi di Laurea, Università degli Studi di Bologna, 1973-74.

١-"سترەکتووری سیاسی و بەها کولتوورییەکانی کۆمەڵگەی کوردی"، کارنامـەی دکتـۆرا لـەژێر چـاودێری ئـەنتۆنیۆ مـەرازی، زانکـۆی بۆلۆنیـا، ئیتالیـا، (٣٨٧ لاپەڕە).

**1975**

2-«L’ultima rivolta curda in Iraq», in *Oriente Moderno* LV, 9-10, Rome, pp:462-472.

٢- "دوایین شۆڕشی کورد لە عێراق"، گۆڤاری ڕۆژهـەڵاتی نـوێ، بـەرگی پـەنجا و پێنج، (٩-١٠)، ڕۆما، لا: ٤٦٢-٤٧٢.

**1978**

3-«Curid e Kurdistan in opere italiane del XIII-XIX secolo», in *Oriente Moderno*, anno LVIII, 11, Rome, pp:563-596.

٣- "کـورد و کوردسـتان لـه نووسـراوه ئیتالیاییـەکان لـه سـەدەکانی سـێزده- نۆزدەدا" گۆڤاری ڕۆژهەڵاتی نوێ، ساڵی ٥٨، ژماره١١، ڕۆما، لا:٥٦٣-٥٩٦.




**1990**

4- *I Curdi nella storia*, Ed. Chieti : Vecchio Faggio, (351p).

٤-کورد له مێژوودا، فاگیۆ، (٣٥١ لاپەره)

1991

5-«I Curdi nella il guerra del Golfo», in *Oriente Moderno nuova serie*, anno X, 1-6, Rome, pp:1-23.

٥- "کـورد لـه جـەنگی کەنـداودا"، گۆڤـاری ڕۆژهـەڵاتی نـوێ زنجـیره نـوێ، سـاڵی دەیـەم، (١-٦)، ڕۆما، لا:١-٢٣.

**1993**

6-«Kurdistan, un mosaico di sei popoli», in *ARES, Revue de Politique Intenrationale et Conflits Ethniques*, 1, pp:26-34.

٦-"کوردستان مۆزایکی شەش گەل"، گۆڤاری سیاسەتی نێودەوڵەتی و تەنگژەی ئیتنیکی، ژماره ١، لا:٢٦-٣٤.

7-Cenni sulla letteratura curda, trad. de «Bâzne», in *Almanaco letterario*, Edizioni della Lisca, Milan, pp:47-54.

٧-"تێبینی دەربارەی ئەدەبیاتی کوردی".ساڵنامەی ئەدەبی، میلانۆ، لا:٤٧-٥٤

**1994**

8-«Kurdistan : I giochi regionali proseguono : I Curdi in Iran, intervista a Mustafa Hijri» in *Politica Internazionale* nº 3, Rome, pp:75-92.

٨-"کوردستان: گەمە هەرێمییەکان بەردەوامن: کورد لە ئێران چاوپێکەوتن لەگەڵ مستەفا هیجری". گۆڤاری سیاسەتی نێودەوڵەتیی، ڕۆما، ژمارە ٣، لا:٧٥-٩٢.

9-«La politica italiana verso assiri e curdi» in *Storia contemporanea* nº 3, pp:391-419.

٩-"سیاسەتی ئیتالیایی لە هەمبەر کورد و ئاسوورییەکان" گۆڤاری مێژووی هاوچەرخ، ژمارە ٣، لا:٣٩١-٤١٩.

10-«Kurdistan : A Mosaic of Peoples», in *Acta Kurdica*, the International Journal of Kurdish & Iranian, pp:43-52.

١٠-"کوردستان: مۆزایکی گەلان". گۆڤاری ئاکتا کوردیکا، لا:٤٣-٥٢.

11-«Ahmad Khânî 'Mem û Zîn' : L'amore per la patria», In *Forma di Parole*, 3e série, 2e année, 4, Crocetti Editore, pp:47-65.

١١-"مەم و زینی ئەحمەدی خانی: خۆشەویستی نیشتمان". گۆڤاری فۆرما دی پارۆل، لا:٤٧-٦٥.

12-«Kurdistan, polveriera dimenticata : un popolo in cerca di una patria sicura. Minoranze in pericolo : gli assio-caldei. 'Noi, vasi di coccio tra arabi e curdi ?» , in *Mondo e Missione*, pp:488-492.

١٢-"کوردستان وڵاتێکی فەرامۆشکراوی پارچەپارچەکراو: گەلێك بە دوای نەوایەکی ئارامدا دەگەڕێ"، لا:٤٨٨-٤٩٢.

**1995**

13-«Italian Policy Toward Assyrians and Kurds», in *Journal of the Assyrian Academic Society*, vol. IX, 2, Santa Barbara, pp:3-24.

١٣-"سیاسەتی ئیتالیا بەرانبەر ئاسووری و کوردەکان"، لە گۆڤاری ئەکادیمیای زانستیی ئاسووری، بەرگی نۆیەم، لا:٣-٢٤.

14-«The Woman's Role in the Kurdish Society according to European Literature», in *Iran-Nameh*, 1 (11), pp:18-19.

١٤-"ڕۆلی ژنان له كۆمه‌ڵگه‌ی كوردی به‌گوێره‌ی ئه‌ده‌بیاتی ئـه‌ورووپی"، گۆڤـاری ئێران-نامه ١(١١)، لا:١٨-١٩.

15-« The Italian Contribution to Kurdology (13th to 20th Century) », In *Journal of Kurdish Studies,* Volume 1, pp. 97 – 112.

١٥-"به‌شداری ئیتالیاییه‌كان له كوردناسی (سه‌ده‌كانی ١٣ تا ٢٠)، له گۆڤاری لێكۆڵینه‌وه‌ی كوردی، به‌رگی یه‌كه‌م، لا: ٩٧-١١٢

**1999**

16-I *curdi : un popolo transnazionale* / a cura di Mirella Galletti., Roma : EdUP,109 p

١٦-كورده‌كان گه‌لێكی ترانس ناسیۆنال"، ڕۆما، (١٠٦ لاپه‌ڕه).

17-"The Kurdish issue in Turkey ». In: *International Spectator*, (special issue- Parti des travailleurs du Kurdistan (31), vol.34: n°1, pp. 123-134.

١٧- "پرسی كورد له توركیا"، گۆڤاری ئه‌نته‌رناشیۆنال سپێكتاتۆر، ژماره ١، لا: ١٢٣-١٣٤

**2000**

18-« Deux lettres de Chérif Pacha à Benito Mussolini », In : *Études kurdes*, Paris, L'Harmattan, n° (2.), 2000, p. 65–82.

١٨- "دوو نامه‌ی شه‌ریف پاشا بۆ مۆسۆلینی"، گۆڤـاری لێكۆڵینـه‌وه‌ی كـوردی، ژمـاره (٢)، لا: ٦٥-٨٢

**2001**

19-Le relazioni tra Italia e Kurdistan. In *Quaderni di Oriente Moderno*. anno. 20, no. 3,. n.s.; Roma : Istituto per l'Oriente, (223p)

١٩-پێوه‌نـدی نێـوان ئیتالیـا و كوردسـتان.



گۆڤـاری لاپـەڕەکانی ڕۆژهـەڵاتی نـویێ، ژمـارە ٣، ڕۆمـا، ئەنیسـتیتووی ڕۆژهەڵات.

20-« Western images of the woman's role in Kurdish society » In: *Women of a non-state nation :* the Kurds Shahrzâd Mojab. Costa Mesa : Mazda, pp. 209-225.

٢٠- "ئیماژی ڕۆژئاوایی بۆ ڕۆڵی ژن لە کۆمەڵگەی کوردیدا"، کتێبی: *کوردەکان: ژنانی وڵاتانی بێ دەوڵەت*، شەهرزاد موجاب، مازدا، لا: ٢٠٩-٢٢٥

21-"Kurdish cities through the eyes of their European Visitors", In: *Mirella Galletti, Le relazioni tra Italia e Kurdistan*, [Roma], Istituto per l'Oriente C.A. Nallino, pp. 109-148.

٢١- "شارە کوردییەکان لە ڕوانگەی گەشتیارە ئەوروپاییەکاندا"، کتێبی: پێوەندی نێوان ئیتالیا و کوردستان، ڕۆما، لا: ١٠٩-١٤٨

**2002**

22- *Incontri con la società del Kurdistan*, Fiesole : Name, 251 p

٢٢- ژوان لەگەڵ کوردستانی سەربەخۆ، (٢٥١ لاپەڕە).

**2003**

23- *Cristiani del Kurdistan : assiri, caldei, siro-cattolici e siro-ortodossi*, di Mirella Galletti ; con contributi di Alessandro Mengozzi ; introduzione di Franco Cardini, Roma : Jouvence, . 331 p




٢٣- کریسـتیانەکانی کوردسـتان: ئاسـووری، کلـدانی، ئاسـووری کاتۆلیـک و ئاسـووری ئۆرتۆدۆکس، ڕۆما، (٣٣١ لاپەڕە).

**2005**

24-«Kirkuk : The Pivot of Balance in Iraq. Past and Present», in *Journal of Academic Assyrian Studies*, vol. 19, 2, pp : 21-51

٢٤-"کەرکووك: خاڵی پاراسەنگە لە عێراقدا. دوێنی و ئێستا". گۆڤاری ئەکادیمیای زانستی ئاسووری، بەرگی ١٩، ٢، لا: ٢١-٥١

**2007**

25-« La bataille de Čālderān dans un tableau du XVIe siècle », In : *Studia iranica* (Paris), ISSN 0221-5004 (2007) vol. 36, n° 1, p. 65-86.

٢٥-"جەنگی چاڵدێران لە تابلۆیەکی سەدەی شانزەهەمدا"، گۆڤاری ستادیا ئیرانیکا، بەرگی ٣٦، لا: ٦٥-٨٦




26-«I Curdi da vinti a vincitori ?» in *Il Ponte* nº 11, Rome, pp:39-51.

٢٦-"کورد لە دۆڕاندنەوە بۆ بردنەوە"، ئەل پۆنتا، ژمارە ١١، ڕۆما، لا:٣٩-٥١.

**2008**

27-*Kurdistan. Cucina e tradizioni del popolo curdo*, Ananke, Turin, (111p).

٢٧- کوردستان: نانەدین و ترادسیۆنی گەلی کورد، (١١١ لاپەڕە).

28-«Some Catholic Sources on Jazira (1920-1950), *Kervan - Rivista Internazionale di Studi afroasiatici*, pp : 15-28

٢٨-"چەند سەرچاوەیەکی کاتۆلیکی لەسەر جەزیرە(١٩٢٠-١٩٥٠)"، کێرڤان، لا: ١٥-٢٨.

**2009**

29-«Cuisine and Customs of the Kurds and their Neighbors» in *Journal of Assyrian Academic Studies*, vol. 23, nº1, pp : 40-63

٢٩-"نانەدین و داب و نەریتی کورد و هاوسێکانیان"، گۆڤاری لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی ئاسووری، بەرگی ٢٣، ژ ١، لا: ٤٠-٦٣




**2010**

30- *Le Kurdistan et ses chrétiens* ; traduit de l'italien par Jacqueline Martin-Bagnaudez et Noël Lucas ; préface de Louis Sako,... ; postface de Jean-Marie Mérigoux, Paris : les Éd. du Cerf, (399p).

٣٠-کوردستان و کریستیانەکانی کوردستان، وەرگێڕانی لە ئیتالیاییەوە بۆ فرەنسی، پاریس، (٣٩٩ل)

31-*Kürt yemek kültürü*, Avesta yayinlari, Istanbul, (144p).




٣١- کولتووریناندینی کوردی، بڵاوکراوەی ئاڤێستا، ئیستانبوول، (بە زمانی تورکی)، (١٤٤ لاپەڕە).

32-«L’âne dans la société et la culture kurde - passé et présent », in *Revue d’Ethnozootechnie*, 87, pp:95-98.

٣٢-"کەر لە کۆمەڵگە و کولتووری کوردی دا"، گۆڤاری ئیتنۆزوتێکنی، ژمارە ٨٧، ل:٩٥-٩٨.

**2011**

33-«Correspondance between Eugenio Pacelli, Secretary of State and Angelo Giuseppe Roncalli, Apostolic Delegate to Turkey (1935-1939)» in *Surdi sull’Oriente Cristiano*, 15, Academia Angelica-Costantiniana di Lettere, Aerti e Scienze, Rome, pp: 98-131 & in: *The Journal of the Kurdish Academy*, Kurdistan, Erbil, Vol 22, pp: 7-25.

٣٣-"نامەکاری نێوان ئۆژینۆ پاسێلی، سکرتێری دەوڵەت و ئەجیلۆ گیوسپی رۆنسالی لە تورکیا (١٩٣٥-١٩٣٩)" Surdi sull'Oriente Cristian، ژمارە ١٥، لا: ٩٨-١٣١ هەروەها لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی، کوردستان، هەولێر، ژمارە ٢٢، لا: ٧-٢٥ دووبارە بڵاوکرایەوە.

34-*Iraq, il Cuore del Mondo*, Ambassade d'Iraq en Italie, Rome.

٣٤- عێراق دڵی جیهان، ڕۆما، ئیتالیا. (بە ئیتالیایی).

35-*Iraq, the Heart of the World*, Ambassade d'Iraq en Italie, Rome, (190p).

٣٥- عێراق دڵی جیهان، ڕۆما، ئیتالیا، ١٩٠ لاپەڕە، (بە زمانی ئینگلیزی).

**سەرچاوە:**

1-« Décès du Professeur Dr. Mirella Galletti », in www.institutkurde.org.

٢-ماڵپەری کتێبخانەی بریتانی (British Library)، لەندەن.

٣- نەجاتی عەبدوڵڵا، *بیبلیۆگرافیای کوردناسی، کورد و کوردستان لە سەرچاوە فەرەنسییەکاندا*، لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، هەولێر، ٢٠٠٩

٤- نەجاتی عەبدوڵڵا، *بیبلیۆگرافیای کوردناسی، کورد و کوردستان لە سەرچاوە ئینگلیزییەکاندا*، لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، هەولێر، ٢٠٠٩

# پوختەی کار و چالاکییەکانی
# ئەکادیمیای کوردی
# لە ساڵی یەکەمی خولی دووەمیدا

**سکرتێری ئەکادیمیای کوردی**

**ئەکادیمیای کوردی میوانداری ئیسماعیل بێشکچی دەکات**

لە دەستپێکی مانگی داهاتوودا، لە چوارچێوەی گەشتەکەیدا بۆ هەرێمی کوردستان، ئەکادیمیای کوردی میوانداری نووسەر و سۆسیۆلۆگی گەورەی تورك ئیسماعیل بێشکچی دەکات. لە نامەیەکی ڕەسمییدا، کە سەرۆکی ئەکادیمیای کوردی بە تایبەت بۆ بێشکچی ڕەوانەکردبوو، تێیدا داوای کردبوو لە کاتی سەردانەکەیدا بۆ هەرێمی کوردستان میوانداری ئەکادیمیای کوردی قەبووڵ بکات، بێشکچی وەڵامی لە سەرۆکی ئەکادیمیا گێڕاوەتەوە، کە بە شانازییەوە داواکە پەسند دەکات. لە کاتی خۆیدا ئاگاداری زۆرتر بڵاودەکەینەوە.

لە دەستپێکی مانگی ئەیلوولی ئەمساڵ، ساڵێکی تەواو بەسەر کار و چالاکییەکانی تەمەنی یەکەم ساڵی خولی دووەمی ئەکادیمیای کوردی تێدەپەڕێ. لەگەڵ پێنانە ناو تەمەنی دووەمین ساڵی خولی دووەمیدا، پوختەی کار و چالاکییەکانی ئەکادیمیای کوردی دەخەینە بەرچاوی خوێنەرانی خۆشەویست.

**یەکەم: کۆڕ و سیمینیارەکان**

لە درێژەی مانگەکانی (ئادار–ئەیلوول)[1]ی ئەمساڵدا، ئەکادیمیای کوردی لە هۆڵی مەلا مەحموودی بایەزیدی لەناو تەلاری ئەکادیمیای کوردی، زنجیرەیەک کۆڕ و سیمیناری بۆ ژمارەیەک پسپۆر و مامۆستای زانکۆ ئەنجام دا. وا لە خوارەوە باسێکی کورتی ئەم کۆڕ و سیمینارانە دەخەینە بەرچاو:

١– ئێوارەی ( ڕۆژی چوارشەممە ٢٨ ی ئادار، کات: ٤ ی ئێوارە) کۆڕێکی هاوبەش بۆ بەڕێز فەلەکەدین کاکەیی و د. عیرفان مستەفا ڕێکخرا. لە بەشی یەکەمی کۆڕەکەدا بەڕێز فەلەکەدین کاکەیی لەژێر ناونیشانی (پەیوەندی فەرهەنگی یارسان بە فەرهەنگی زەردەشتییەوە) باسێکی پێشکەش کرد، دواتر د. عیرفان مستەفا لەژێر ناونیشانی (*ئیسلام و ئاینی حەقیقەت، خاڵی هاوبەش و پەیوەندییان*) باسەکەی خۆی پێشکەش کرد.

٢– ئێوارەی (ڕۆژی چوارشەممە ١١ی نیسان، کات: ٤:٣٠ ی ئێوارە) کۆڕێك بۆ د. محەمەد عەلی سوڵتانی ) لەژێر ناونیشانی (*بنچ و بنەوانی فەرهەنگی یارسان و کاریگەری لەسەر فەرهەنگی ئێران* ) سازکرا.

٣– ئێوارەی (ڕۆژی دووشەممە ١٦ ی نیسان، کات: ٤:٣٠ ی ئێوارە) کۆڕێك بۆ محەمەد تۆفیق عەلی ئەندامی ئینستیوتی زمانەوانیی میری لە بەریتانیا بە ناونیشانی (*بەسەرهاتی زمانی کوردی لە ڕابردوو و ئێستا و ئایندە*) سازکرا.

٤– ئێوارەی (ڕۆژی چوارشەممە ٢٥ ی نیسان، کات: ٤:٣٠ ی ئێوارە) کۆڕێك بۆ د. ئەفرام عیسا یووسف بە ناونیشانی ( *سەلاحەددینی ئەیووبی، لە ڕوانگەی مێژوونووسە ئاسوورییەکاندا*) ساز کرا.

٥– ئێوارەی (ڕۆژی چوارشەممە ٩ی ئایار، کات: ٥: ی ئێوارە) کۆڕێك بۆ پرۆفیسۆر. د موحسین محەمەد حوسێن بە ناو و نیشانی (*ڕۆژهەڵاتناسی، پردێك لەنێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا* ) سازکرا.

---

[1] بۆ کۆڕ و سیمینارەکانی (ئەیلوولی ٢٠١١–شوباتی ٢٠١٢) بگەڕێوە بۆ ڕاپۆرتی کار و چالاکییەکانی ئەکادیمیای کوردی، گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی، ژمارە ٢١، ٢٠١٢، لا: ٥٩٧–٦٠٢

٦- ئێوارەی (ڕۆژی چوارشەممە ٢٣ ی ئایار، کات: ٥: ی ئێوارە) کۆڕێك بۆ د. زرار سدیق تۆفیق بە بە ناونیشانی (*تێڕوانینی کورد لەبارەی مێژوو و نەژادی خۆیەوە، لە سەرەتاوە تا سەدەی بیست* ) سازکرا.

٧- ئێوارەی (ڕۆژی چوارشەممە ٣٠ ی ئایار، کات: ٥: ی ئێوارە) کۆڕێك بۆ دکتۆر کەندالْ نەزان بە بە ناونیشانی (*چاوپێداخشانێك بۆ سەر خەباتی زمانەوانیی ٢٥ساڵەی "کورمانجی" لە ئەورووپادا* ) سازکرا.

٨- ئێوارەی (ڕۆژی چوارشەممە ٢٠ ی حوزەیران، کات: ٥:٣٠ ی ئێوارە) کۆڕێکی بۆ دکتۆر حەیدەر لەشکری بە بە ناونیشانی (*وێنەی کورد لە گوتاری ئایینی شیعەدا*) سازکرد.

٩- ئێوارەی (ڕۆژی سێشەممە ١٨ ی ئەیلوول، کات:٥ ی ئێوارە) کۆڕێك بۆ دکتۆر محەمەد شەریف لەژێر ناونیشانی ( *بۆچوونەکانی کۆڕبەندی هزری ئیسلامی لە کوردستان*) سازکرا.

**دووەم: چاپکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی**

ئەو چاپکراوانەی کە ئەکادیمیای کوردی لەماوەی یەکەم ساڵی خولی دووەمی خۆیدا بڵاوی کردوونەتەوە ئەمانەن:

١- سەرکەوت سەعدی قادر، *نامۆیی لە ڕۆمانەکانی (سەلاح عومەر)دا*، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١١، (١٩٥ ل).

٢- بابا ڕەسول نووری ڕەسول، *پێکهاتەی ژمارە لە زمانی کوردیدا*، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١١، (٦٥ ل).

٣- د. محسن محمد حسین، بحوث *في التأريخ الكردي*، م حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١١ (٣٨٤ ل)

٤- سەفەر کەریم هاواری، *پێشمەرگە لە دیرۆك و ئەدەبیات و هونەری کوردیدا*، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١١، (١٢٤ ل).

٥-پیرداود مەخمووری، *سۆرێ چاوشین*، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، (٢٦٥ل)

٦– د. جەبار ئەحمەد حوسێن، *بینای ساتیرا لە کورتە چیرۆکی کوردی کوردستانی عیراق ( ١٩٧٠ – ١٩٩٠ )*، چ حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، (٣٠١ ل)

٧– کۆمەڵێك مامۆستای زمانی کوردی، فەرهەنگی هەرزە، چ حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، (٢٦٨ ل).

٨– د. خانزاد عەلی، *زمانی شیعری حاجی قادری کۆیی و مەحوی و شێخ ڕەزای تاڵەبانی*، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، (٥٧٩ ل ).

٩– د.عوسمان دەشتی، *دیوانی وەفایی*، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، (٥٢٣ ل)

١٠– حەمدیە حەسەن محەمەد، *لایێ هونەری و ناڤەرۆکا هۆزانا سەبری بۆتانی*، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، (٣٠١ل).

11- Dr.Nouri Talabany, Arabization Of The Kirkuk Rejion, Imp: Haji Hashim, Erbil, (138 p)

١٢–د. عەبدوڵلا غەفوور، *جوگرافیای کوردستان*، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، (٣٧٨ ل).

١٣– دەروون عەبدولڕەحمان ساڵح، *ئیکۆنۆمی لەئاستەکانی زمانی کوردیدا*، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، (٢١٤ ل ).

١٤ – لێژنەی فەرهەنگ لە ئەکادیمیای کوردی، *زاراوەی کارگێری*، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، (٢٨٦ ل).

١٥ – د. ئازاد عوبێد ساڵح، *ڕۆڵی سیاسی و کارگێڕی و ڕووناکبیریی مەعرووف جیاووك ( ١٨٨٥ – ١٩٥٨ )*، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، (٤٢٨ ل ).

١٦– محەمەد عەبدولکەریم ئیبراهیم، *پێکهاتەی زمانی شیعری لە ڕوانگەی ڕەخنەی ئەدەبی نوێوە*، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، (٢٣١ ل ).

١٧– هاوکار محێدین جەلیل، *دۆزی کورد لە تورکیا لە ساڵانی ( ١٩٨٠– ١٩٩٩)*، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، (٢٦٥ ل )

١٨ – جەمال عەبدول، *ڕێبەری زاراوە ئامارییەکان*، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، (٢٠٠ ل)

١٩-د. موحسین ئەحمەد عومەر، *لێکۆڵینەوە کوردییەکان*، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢ (٣٦٤ ل)

٢٠ - د. پەخشان سابیر ئەحمەد، *ڕەمز لەشیعری هاوچەرخی کوردی کرمانجیی خوارووی کوردستان ( ١٩٧٠- ١٩٩١ )*، چ حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، (٤٥٠ ل).

٢١- د. ئەحمەد قەرەنی، ڕەخنەی *ئایرۆنی لە شیعری نوێی کوردیدا (١٩٢٥-١٩٧٠ )*، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، (٤١٥ ل).

٢٢- د. عوسمان دەشتی، *لە بارەی بنیاتی زمان و شێوازی شیعر*، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢ ، (٣٠٢ ل)

٢٣- ئاوارە کەمال سالح، *ڕەخنەی کۆمەڵایەتی و پراکتیزەکردنی لە شیعرەکانی گۆراندا*، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، (٢٢٩ ل ).

٢٤- د. کەمال مەعرووف، *لالەزار دیوانی حوسێنی ١٨٨٨- ١٩٣٣*، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢ (٣٢٥ ل).

٢٥- د. نشوان شكرى هروري، سكان محافظة دهوك ١٩٤٧- ٢٠٠٦ ، م حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، (٢٥٢ ل).

٢٦- سینان هاکان، *کورد و بەرخودانەکانی ١٨١٧- ١٨٦٧ لە بەڵگەنامەکانی ئەرشیفی عوسمانیدا*، و: لە تورکییەوە بەکر شوانی، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢ ، (٤٣٧ ل).

٢٧- کامەران عەزیز عەبدوڵڵا، *هۆکارەکانی سەرهەڵدان و ڕووخانی میرنشینە کوردییەکان لە سەردەمی عەباسییەکاندا*، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، (١٩٢ ل).

٢٨ - ئەحمەد حەیران، *کانی خومارۆکێ*، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، (١٥٣ ل).

٢٩ - محەمەد ڕەشید ئەمینی، *کەشکۆلی هەورامان*، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، (٢٤٤ ل).

٣٠- د. محسن محمد حسين، *قلائد الجمان*، م حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، (٩١ ل).

٣١- سەید نەجمەدین ئەنیسی، *چاوەش*، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، (١٦٠ ل).

٣٢- اكو برهان محمد، *الحياة الثقافية في ديار بكر في العصر العباسي*، م. حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، (٢٥٩ ل).

٣٣-محمود شيخ سين حسو الريكانى، *شنگال (سنجار) فى العهد الملكى ( ١٩٢١ - ١٩٥٨ )*، م حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، (٢٦٦ ل).

٣٤ - بێریڤان یووسف عەبدوڵڵا، *مۆزانا ئافرەتان*، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، (١٥٩ ل).

٣٥- د.نەجاتی عەبدوڵڵا، *سەفەرنامەی ولیەم هیوود بۆ کوردستان ساڵی ١٨١٧*، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، (١٣١ ل).

٣٦ - کامەران جەمال بابان زادە، *دامەزراندنی چەند میرنشینێکی کوردی لە هەردوو سەدەی ( ٨و ٩ك - ١٤و ١٥ز) دا*، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، (٢٢٣ ل).

٣٧ - هلبين رفيق محمد سعيد **باجلوري**، ***الكورد الحميدية***، م حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، (٢٠٣ل).

٣٨- ماجید خەلیل فەتاح، *ڕێکخستنە سیاسییەکانی باکوری کوردستان*، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢ ، (٤٠٠ ل).

٣٩- عبدالرحيم احمد على الجاف، *الشعر التعليمي والاتجاه الوطني في الشاعرين معروف عبدالغني الرصافي و فائق بيكەس: دراسة مقارنة*، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، (١٧٦ ل)

٤٠- پشتیوان شەفیق ئەحمەد، *شیکردنەوەیەکی جوگرافیایی بۆ دابەشبوونی دانیشتوان لە شارۆچکەی ڕانیە ( ١٩٥٧- ٢٠٠٦ )*، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢ ، (٢٣٩ ل).

**سێیەم: گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی**

گۆڤاری ئەکادیمیای کوردیش، یەکێکە لە گۆڤارە زانستی و ئەکادیمییەکانی کوردستان، لەگەڵ دەستپێکی خولی دووەمی ئەکادیمیای کوردی، بە بەرگێکی تازە و بە ناوەڕۆکێکی دەوڵەمەندەوە بێ دواکەوتن لە وادەی خۆیدا بەشێوەیەکی

وەرزیی بڵاوکراوەتەوە و لەماوەی ئەم ساڵەی تەمەنیدا چوار ژمارە (ژمارەکانی ٢٠، ٢١، ٢٢ و ٢٣)ی لیَ بڵاوکراوەتەوە

**چوارەم: یەکخستنی زاراوە و تیرمەکانی گەشتیاری**

دەستەی گەشت و گوزاری سەر بە وەزارەتی شارەوانی و گەشت و گوزار، بەپێی نووسراوی ژمارە ٢٣٣٨، لە ڕێکەوتی ٢٠١٢/٧/١٧، لیستی کۆمەڵێك زاراوەی گەشتیاری بە زمانی ئینگلیزی و عەرەبی بۆ ئەکادیمیای کوردی ناردبوو، بە مەبەستی دۆزینەوەی هاوتا کوردییەکان و یەکخستنی زاراوەکان لە زمانی کوردیدا. لیستی ئەم زاراوانە کە نۆبەرەی کاری لێژنەی زاراوەیە لەم خولەدا بە شێوەیەکی ڕەسمی بۆ هەموو دامەزراو و لایەنە پەیوەندیدارەکان نێردراوە و لیستی تەواوی ئەم زاراوانەش لەم ژمارەیەی گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی بڵاوکراونەتەوە.

**پێنجەم: دیدار و چاوپێکەوتنەکان**

١- ڕۆژی چوارشەمەی ٤/٨/ ٢٠١٢ شاندێکی ڕۆژهەڵاتناسیی سەر بە ئەکادیمیای زانستیی ڕووسیا، کە پێکهاتبوون لە ئەندامی ئەکادیمیای زانستی ڕووسیا پ. فیتالی نوعنکین، بەڕێوەبەری پەیمانگای ڕۆژهەڵاتناسی لە مۆسکۆ، یاریدەدەرەکەی پ. ڕەمەزان دافرف و کریی گۆریف پ. لە لەگەڵ د. نووری تاڵەبانی سەرۆکی ئەکادیمیا و د. ئازاد ئەحمەد جیگری سەرۆك و د.نەجاتی عەبدوڵلا سکرتێری ئەکادیمیا و د. موحسین محەمەد حوسێن و د. جەبار قادر ئەندامانی کارای ئەکادیمیای کوردی کۆبوونەوە. لە دیدارەکەدا باس لە پەیوەندی زانستیی نێوان ئەکادیمیای کوردی و پەیمانگای ڕۆژهەڵاتناسی لە ئەکادیمیای زانستیی ڕووسیا کرا، لە بوارەکانی: ئینسکلۆپیدیای کوردستان، کۆنفرانسی کوردناسی و هەروەها پێگەیاندنی قوتابیانی دکتۆرا لەو بوارانەی، کە جێگەی بایەخی هەردوولا بێت. دواجار تیشك خرایە سەر کێشەکانی زانستی کوردناسیی لە ڕووسیا و گێڕانەوەی ڕۆڵی مێژوویی ڕووسیا لە بواری کوردناسی.

٢- پێشنیوەڕۆی پێنجشەممە ٢٤/ ٥/ ٢٠١٢، سەرۆکی پەرلەمانی کوردستان، د. ئەرسەلان بایز سەردانی ئەکادیمیای کوردی کرد و لەلایەن د. نووری تاڵەبانی سەرۆکی ئەکادیمیای کوردی و د. ئازاد ئەحمەد جێگری سەرۆك و د. نەجاتی عەبدوڵلا سکرتێری ئەکادیمیا، پێشوازی لێکرا، لەو دیدارەدا کە ژمارەیەك لە ڕاوێژکارانی سەرۆکی پەرلەمان ئامادەی بوون بەدوور و درێژی باسی پرۆژە

قانوونی دووەم هەموارکردنەوەی ئەکادیمیای کوردی و کێشە و پرسەکانی تایبەت بە ئەکادیمیا باسکران و دیدارەکە نزیکەی کاتژمێرێکی خایاند.

٣- سەرلەبەیانی ڕۆژی دووشەممە ٢٨/ ٥ / ٢٠١٢، بەڕێز د. کەندال نەزان سەرۆکی ئەنستیتووی کورد لە پاریس، سەردانی ئەکادیمیای کوردی کرد و لەلایەن سەرۆك و جێگر و سکرتێری ئەکادیمیا بە گەرمی بەخێرهاتنی لێوەکرا، لەو دیدارەدا کە نزیکەی کاتژمێریکی خایاند باسی پرسی زمان و کولتووری کوردی کرا و لەسەر پێشنیاری ئەکادیمیای کوردی د. کەندال، ڕەزامەندی لەسەر ئەوە نیشاندا ڕۆژی چوارشەممە ٣٠ / ٥ / ٢٠١٢ سیمینارێك سەبارەت بە ( خەباتی ٢٥ ساڵەی گۆڤاری کورمانجی ) پێشکەش بکات

**شەشەم: چالاکیی کولتووری**

**١**-شاندێکی ئەکادیمیای کوردی بەشداری لە کۆڕی نەتەوەیی ئەردەڵان ناسی کرد، کە ڕۆژانی ٢٣-٢٤ ی نۆڤەمبەری ساڵی ٢٠١١ لەلایەن زانکۆی کوردستان لە شاری سنە بەڕیوەچوو. لەو کۆڕەدا د.ئازاد ئەحمەد، جێگری سەرۆکی ئەکادیمیا، باسێکی بەناونیشانی (*ڕۆڵی ئەکادیمیای کوردی لە بووژاندنەوەی کەلتووری کوردیدا*) پێشکەش کرد. ئەندامی کارای ئەکادیمیای کوردیش مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی،، باسێکی بەناونیشانی (*دەوری کاریگەری ئەردەڵان بەسەر ڕۆشنبیری کوردستانەوە* ) پێشکەش کرد.

٢- لە شاری سنە لە ڕۆژانی (٢/١١) تاوە کو (٢/١٦) بۆ ماوەی پێنج ڕۆژ ئەکادیمیای کوردی بەشداری لە پێشانگای کتێبی کوردی کرد، کە تێیدا زۆربەی دەزگاکانی چاپ و بڵاوکردنەوە حکومی و ئەهلییەکانی هەرێمی کوردستان بەشدارییان تێدا کرد. شایانی گوتنە لەم پێشانگایەدا ژمارەیەکی زۆری کتێب و چاپکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی خرانە ڕوو.

**حەوتەم: کۆبوونەوەکانی ئەنجومەن**

لە دوای هەڵبژاردنی دەستەی نوێی خولی دووەمی ئەکادیمیای کوردی لە ٢٠١١/٩/١٣-ەوە تاوەکو کۆتایی ئەیلوولی ئەمساڵ، ئەنجومەنی ئەکادیمیای کوردی تا ئێستا (١٧) کۆبوونەوەی ئەنجام داوە، شایانی گوتنە کۆبوونەوەی ژمارە (١٣) ڕێکەوتی ٢٠١٢/٥/٦ لە شاری کۆیە، لەناو تەلاری سەرۆکایەتی زانکۆی کۆیە ئەنجام درا. هەرچی دەستەی سەرۆکایەتیی ئەکادیمیای کوردییە (٣٥) کۆبوونەوەی ئەنجام داوە.

# تعليمات النشر
# في مجلة الأكاديمية الكردية

١. مجلة الأكاديمية الكردية، مجلة فصلية تعني نشر البحوث العلمية عن الكرد وكوردستان. يجب أن تكون البحوث المرسلة الى المجلة مستوفاة لشروط البحث العلمي وتخضع للتقييم العلمي من قبل المتخصصين. من الضروري أن يتضمن البحث دراسة مشكلة علمية محددة ويتضمن أفكارا وتحليلات جديدة ولايكون منشورا أو مقبولا للنشر في أية مجلة أخرى.

٢. لغة النشر الأساسية في المجلة هي اللغة الكردية، ولامانع من نشر بحوث علمية تخص الكرد وكوردستان باللغتين العربية أو الأنجليزية.

٣. يكتب عنوان البحث وإسم الباحث ومركز عمله، ومرتبته العلمية و وظيفته على الصفحة الأولى من البحث.

٤. من الضروري أن يلحق البحث بملخص باللغتين الأخريين، على ألا تزيد كلماته عن ١٥٠ كلمة ويوضح فيها الكاتب أهمية البحث والنتائج الأساسية التي توصل أليها.

٥. يعد البحث مقبولا للنشر ويزود الباحث بقرار هيئة التحرير بقبوله بعد تقييمه إيجابيا من قبل الخبراء والمحكمين المتخصصين.

٦. ما ينشر في المجلة يعبر عن وجهة نظر الباحث، وليس بالضرورة تعبيرا عن وجهة نظر المجلة.

٧. تحتفظ هيئة التحرير بحقها في أن تحذف أو تعيد صياغة بعض الألفاظ والتعابير، بما يتلائم مع أسلوبها في النشر، مع مراعاة الحفاظ على الفكرة الأصلية دون المساس بها.

٨. يعتمد المنهج العلمي المعمول به في إختيار عنوان البحث ودراسته وأسلوب ترتيب المصادر والهوامش وإقتباس النصوص، وتعتذر هيئة التحرير عن نشر أية دراسة تهمل هذه الجوانب .

٩. حين يكون البحث تحقيقا لمخطوطة تتبع القواعد والمناهج العلمية المعمول بها في هذا المجال، وترفق البحث بست صفحات من المخطوطة.

١٠. يرسل البحث بثلاث نسخ ورقية على (A4) وعلى قرص مدمج (CD)، على أن لا يزيد عدد الصفحات الكلية للبحث عن (٢٥ ) صفحة بضمنها الأشكال والجداول وقائمة المصادر. يفضل أن يكتب البحث بالحروف (١٥) Ali-A-Sahifa .

١١. في حالة كون الموضوع مترجماً، من الضروري ان يكون ذا صلة بأحد جوانب الثقافة الكردية (الأدب، اللغة، التأريخ... الخ). ومن الضرورة بمكان أن يكون مترجماً من اللغة الأصلية مع إرفاق النص الأصلي للموضوع المترجم.

١٢. تخصص مجلة الأكاديمية الكردية عدداً من صفحاتها لعرض وتقييم الكتب الصادرة باللغة الكردية او اللغات الأخرى عن الكرد والثقافة الكردية مع مراعاة المنهج العلمي المتبع في هذا المجال.

# دور العلماء الكورد في المؤسسة الدينية والادارة العثمانية في القرنين السادس عشر والسابع عشر

أ.د.عماد عبدالسلام رؤوف
كلية الآداب- قسم التاريخ

نازدار جليل مصطفى
كلية الآداب- قسم التاريخ

## توطئة:

ارتبط التاريخ العثماني منذ الحقبة المبكرة لها بتاريخ كوردستان، فبعد الاكتشافات الجديدة الخاصة عن تاريخ تاسيس الإمارة العثمانية الأولى، أثبتت أن هذه الإمارة لم تنشأ كما روَت المصادر العثمانية التقليدية في غربي الإناضول، بل نشأت في شرقها، حيث كوردستان تركيا الحالية، فبعد انتصار السلاجقة على البيزنطيين في معركة ملازگرد سنة (٤٦٣هـ/١٠٧١م)، انساحت قبيلة قايي من جوار مرو، حيث استقرت مؤقتا هناك، إلى المراعي المجاورة لمدينة أخلاط (خەلات) على ساحل بحيرة وان، فقد وُجِدت أحجار وقبور كثيرة لأجداد بني عثمان الذين هم أمراء (بگات) هذه القبيلة. وحتى بعد أن تحركت هذه القبيلة من مواطنها هذه نحو سنة (٥٢٤هـ/١٢٢٩م) فإنها اتجهت إلى ماردين لأسباب عسكرية، ولم تنتقل إلى غرب الأناضول إلاّ سنة (٦٢٩هـ/١٢٣١م) حيث وضعت أسس الإمارة العثمانية على ما تذكره الروايات العثمانية التقليدية، ويعني هذا أن أسلاف عثمان عاشوا في بيئة كوردية، أو غالبها الكورد، مدة قرن ونصف قرن تقريباً، أي نحواً من خمسة أجيال كاملة، وهي مدة تكفي لأن تتأثر تلك القبيلة الرعوية– العسكرية بالبيئة التي استقرت فيها[1].

فضلاً عن نشوء الامارة العثمانية في منطقة كوردية، والتي تثبت وجود العلاقات بين الجانبين، هناك عامل آخر كان له دور في تكوين تلك العلاقات بين العثمانيين والكورد، وهو فرض الصفويين المذهب الشيعي الإثني عشري في مناطق

